مەریوان وریا قانیع

# دەسەڵات و جیاوازی

# دەسەڵاتوجیاوازی

## مەریوان وریا قانیع

ENDESE

ناوی کتێب: دەسەڵات و جیاوازی
ناوی نووسەر: مەریوان وریا قانیع
بابەت: کۆمەڵە وتار
دیزاینی بەرگ: ناوەندی دیزاینی ئەندێشە-باسم رەسام
دیزاینی تێکست: ناوەندی دیزاینی ئەندێشە-دانا حەسەن
نۆبەتی چاپ: سێهەم ٢٠١٣
چاپخانە: تاران-ئێران
تیراژ: (١٥٠٠) دانە
نرخ: (١١٠٠٠) دینار
ژمـارەی سـپاردن: لـە بەڕێوەبەرایـەتی گشـتی کتێبخانـە گشـتییەکان ژمـارە(٢٧١٧)ـی ساڵی (٢٠١٢)ـی دراوەتێ.

ناوەندی رۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە/ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
سلێمانی-شەقامی مەولەوی-تەلاری سیروانی نوێ-نهۆمی چوارەم
www.endeshe.org ● andesha.library@yahoo.com
http//www.facebook.com/Andeshacenter
07501026400

پێشکەشە بە ڕۆحی بەفرینی هاوڕێ شەهیدەکانم: زاهیر و ستار و
دەشتی و ئەکرەم، لەگەڵ هەندێکیاندا ژوورێک لە زانکۆ و لەگەڵ
ئەوانیتریاندا ژوورێکم لە شاخ، بەشکرد.

# ناواخن

پێشەکی چاپی سێیەم ........................................ ٧
لەباتی پێشەکی ........................................ ٣٣
شەڕی ناوخۆ: خێڵ، حیزب، سیاسەت ........................ ٤١
بۆ شەڕی ناوخۆ بە "شەڕی براکان" ناودەبرێت؟ .................. ١٣٥
هاوکێشەکانی دەسەڵات: سزا، کۆنترۆڵ، کاریزما ................ ١٥٥
یەکگرتن، یان جیاوازبوون، پێداچونەوەیەک بە گوتاری یەکگرتندا ...... ٢٢١
ئەنفال و مۆدێرنە، ڕوداوێک لەدوامانەوە، یان ئەگەرێک لەپێشمانەوە.... ٢٧٧
جاڕی گەردوونی مافی مرۆڤ، بانگەوازێکی گەردوونییە، یاخود بەرهەمێکی خۆرئاواییە؟ ........................................ ٣٤٥
ئەخلاقناسی جیاوازی لە دونیای پۆست ـ مۆدێرندا ................ ٣٦٥

# پێشەکی نوێی دەسەڵات و جیاوازی

-١-

دوای دوازدە ساڵ لە چاپی یەکەمی کتێبی دەسەڵات و جیاوازی بە خۆشحاڵییەکی زۆرەوە چاپی سێهەمی ئەم کتێبە دەخەمە بەردەستی خوێنەران. ئەم کتێبە جگە لەوەی یەکەمین کتێبە من وەک نووسەر بڵاومکردۆتەوە، هاوکات یەکێکە لەو کتێبانەش، کە هێڵە هەرە گشتییەکانی فیکر و بیرکردنەوەی منی تێدایە. بەشی زۆری ئەوەی من لە کتێبی دەسەڵات و جیاوازیدا نووسیومە بنەمای سەرەکی برێکی زۆری تری ئەو نووسینانەی تریشە، کە لە ساڵانی دواتردا نووسیومن. لەڕووی فیکری و میتۆدییەوە ئەم کتێبە بەرگری لەوەدەکات، کە ئینسان بکەرێکی کۆمەڵایەتییە و هەمیشە توانای کارکردنی لەسەر ئەو دونیا و ژینگەیە هەیە، کە تیایدا دەژی، هەمیشە دەتوانێت کۆمەڵێک ئەگەری نوێ بۆ گۆڕان و دەسکاریکردنی دونیای خۆی دابهێنێت، تەنانەت لەو کاتانەشدا، کە دونیای کۆمەڵایەتی وادەردەکەوێت خۆی دووبارەبکاتەوە و نەتوانێت بگۆڕێت. لە دیدی ئەم کتێبەوە خودی ئەو خۆدووبارەکردنەوە و نەگۆڕانە، دەرەنجامی کردەی مێژوویی تایبەتن و بەناو ژمارەیەکی زۆر لە بڕیار و پلان و چالاکی ئینسانیدا تێدەپەڕن. بەکورتی

کتێبی دەسەڵات و جیاوازی هەڵگری دونیابینی و پاشخانێکی فیکری و میتۆدییە، کە من لە بەشی هەرەزۆری بەرهەمەکانی دیکەمدا سەرلەنوێ بەکارمهێناونەتەوە و پەرەمپێداون و دەوڵەمەندمکردوون. شتێکی دیکە، کە لە کتێبی دەسەڵات و جیاوازیدا بەشێوەیەکی بەرچاو ئامادەیە و لەوێشەوە لەبەشێکی زۆری نووسینەکانی مندا ڕەنگیداوەتەوە، مەسەلەی ئامادەگی گەشبینییەکی ڕێژەییە لەو نووسینانەدا، باوەڕبوونە بە ئینسان وەک بکەرێکی وشیار و چالاک و بیرکەرەوە، دیتنی ئەگەری بەرپاکردنی گۆڕانکارییە تەنانەت لەداخراوترین ساتەوەختی مێژوویدا. بەمانایەکی دیکە ئەو دیدەی، کە ئاراستەی خوێندنەوە و ڕاڤەکردنەکانی ناو ئەم کتێبە دەکات باوەڕبوونە بەو ڕاستییەی، کە گۆڕان و تازەبوونەوە هەمیشە بەشێکی گرنگن لە ژیانی کۆمەڵایەتی و ئەرکی فیکریش ئەوەیە ئەو گۆڕان و تازەبوونەوانە ببینێت و هەوڵبدات ڕوویەرەکانیان گەورەتربکات. وتارەکانی ئەم کتێبە لەناو ساڵە تاریکەکانی شەڕی ناوخۆ و ئاشتی درۆزنانەی دوای شەڕدا نووسراون، بەڵام ئەو دیدەی لەپشتی ئەو وتارانەوەیە ئەو دیدەیە، کە دونیا لە جوڵە و گۆڕانێکی بەردەوام و هەمیشەییدا دەبینێت.

بۆ ئامادەکردنی ئەم چاپە تازەیە سەرلەنوێ هەموو کتێبەکەم خوێندەوە و بەڕێنووس و برێک لە زاراوەکان و دارشتنی هەندێک لە ڕستە و پەرەگرافەکانیدا چوومەوە، هاوکات هەوڵمداوە برێکی زۆری ئەو هەڵە زۆرانەی چاپیش، کە لە چاپەکانی پێشوتردا هەبوون، چاکبکەمەوە. بەدەر لەمانە خوێندنەوەی تازەی کتێبەکە توشی سەرسوڕمانێکی گەورەی کردم، پێم سەیربوو برێکی زۆری ئەو بۆچوون و تێزانەی لەم کتێبەدا پێشکەشمکردون، تا ئەمڕۆکەش ڕاستن و ئێستاییبوونی خۆیان نە لە ئاستی سیاسی و نە لە ئاستی کۆمەڵایەتی و نە لە ئاستی ئەخلاقی و فەرهەنگیدا، لەدەستنەداوە. هەندێک لەو نووسین و تێزانەی لەم کتێبەدا هەن وەک ئەوە وان ئەمڕۆکە نووسیبێتم، یان تەنانەت سبەینێ بیاننووسم.

ئەمەش هەم مایەی دڵخۆشی و هەم مایەی خەمبارییە، مایەی دڵخۆشییە چونکە ڕاستی و دروستی برێکی زۆری ئەو بۆچوون و تێزانە دەسەلەمێنێت، کە من لەسەر کێشەکانی کۆمەڵگای کوردی پێشکەشمکردون، مایەی خەماریشە، چونکە نیشانیدەدات ئەو واقیعەی ئەم تێکستانەی بە من نووسیوە، تا ئێستاش نەیتوانیوە بەو ڕادەیە بگۆڕێت و تازەببێتەوە، یان بەو ئاڕاستەیەدا بگۆڕێت و تازەببێتەوە، بتوانێت تێز و بۆچوونی ناو تێکستەکان تێپەڕێنێت. بەداخەوە دوای ئەو هەموو ساڵانە لە جەنگی نێوان تێکست و واقیع لە کتێبی دەسەڵات و جیاوازیدا، تێکست لە واقیعی بردۆتەوە. لە لاپەڕەکانی داهاتوودا من کەمەکێک درێژتر لەسەر هەندێک لەو تێزە سەرەکی و بنەڕەتییانە ئەدوێم، کە ئەم کتێبە لەخۆیگرتون و پێشمواییە تا ئەمڕۆ تێزی گرنگ و سەرەکی خوێندنەوە و دڕخاندنی ڕەخنەیی دونیای ئێمەن. کۆمەڵێک تێز، کە کتێبی دەسەڵات و جیاوازی شەرەفی ئەوەی هەیە بۆ یەکەمجار لە ڕۆشنبیری ئێمەدا بەوشێوەیە پێشکەش و نمایشیکردبێت.

ئەو پرسیارەی حەزدەکەم هەر لەم سەرەتاییەدا بیکەم و ڕاستەوخۆش وەڵامیبدەمەوە پرسیاری ئەوەیە من بۆ دەنووسم؟ بۆ دەمەوێت وەک نووسەرێک بژیم؟ وڵە لێرەدا دەمەوێت بۆ پرسیاری سەرەتای سەرەتاکان بگەڕێمەوە، ئەو پرسیارەی، کە دەپرسێت ئینسان بۆ بڕیاردەدات ببێت بە نووسەر. بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دەمەوێت هێما بۆ وەڵامی دوو نووسەری دیکە بکەم، کە من ڕێزێکی تایبەتم بۆ نووسین و شێوازی بیکردنەوەیان هەیە و لەزیاد لە نووسین و لێکۆڵینەوەیەکیشدا سوودم هەم لە هەندێک لە بیر و ڕا و بۆچوونەکانیان وەرگرتوە، هەم لەو شێوازی بیکردنەوە و ڕوانیانەی ئەوان بۆ دونیا و ئینسان و کۆمەڵگا و نووسین هەیانبووە، مەبەستم لەو دوو نووسەرەش فەیەلسوفی فەرەنسی میشێل فۆکۆ و نووسەری بریتانی جۆرج ئۆرویلە.

میشێل فۆکۆ یەکێکە لەو نووسەرانەی زۆرجار باسی ئەوەی کردووە بۆ دەنووسێت.

وەڵامی سەرەکیشی بەم پرسیارە ئەوەبووە نووسین بەر لەهەمووشتێک هۆکار، یان ئامرازێکی گرنگە بۆ دروستکردن و گۆڕینی خودی خۆی، بۆ داهێنانی شوناسی نوێ بۆ خۆی و بۆ بوون بە ئینسان و کەسێکی تازە و جیاواز لەوەی هەیە. بەبۆچوونی فۆکۆ نووسەر لەڕێگای نووسینەوە بەر لەهەمووشتێک خۆی دەگۆڕێت، خۆی دەکات بەکەسێک جیاواز لەوەی، کە کۆمەڵگا و دین و ئایدیۆلۆژیا و دەزگا و ئەخلاق و بۆچوونە باڵادەستەکان چاوەڕوانیدەکەن، کە هەبێت. فۆکۆ لە کتێبی ئارکیۆلۆژیای مەعریفەدا ئەم دیدە ئاشکراتر بەیاندەکات و دەنووسێت: "من گومانم لەوە نییە، کە تاقە نووسەرێک نیم دەنووسم بۆئەوەی ڕوخسارێکی جێگیرم نەبێت. لێم مەپرسە من کێم و داواشم لێمەکە نەگۆڕێم و هەمیشە هەمان کەس بمێنمەوە. ئەم داوایانە وازلێبێنە بۆ پۆلیس و بیرۆکراتەکان، کە تەماشای ناسنامەکانمان دەکەن بۆئەوەی بزانن ساختەن، یان نا. لانیکەم، کە دەنووسین دەبێت خۆمان لە ئەخلاقیاتی پۆلیس و بیرۆکراتەکان ڕزگاریکەین" (Foucault 1969: 17). ئەگەر کۆمەڵگا و دەسەڵات و دین و ئەخلاق و زانستەکانی وەک دەروونناسی و پزیشکی ڕۆحی و کۆمەڵناسی و زۆرشتیتریش، بیانەوێت ئینسان بکەن بەوەی، کە ئەوان دەیانەوێت، ئینسان وا دروستبکەن و وا دابڕێژن وەک ئەوەی ئەوان دەیخوازن، ئەوا کاری نووسین ئەوەیە ئینسان، دژ بەو شتانەی باسمکرد، خۆی بەوجۆرە دروستبکات و بەوجۆرە دابهێنێت، کە خۆی دەیەوێت. واتە ئەرکی نووسین لای ئەم فەیلەسوفە ئەرکی دروستکردنی شوناسێکی پرجوڵە و ناجێگیر و کراوەیە بۆ خودی نووسەرەکە خۆی، شوناسێک لەسەر ئازادی و ویست و ئارەزووی ئینسان بۆ گۆڕان دروستبوبێت، نەک کۆپی، یان دووبارەکردنەوە و سەلماندنی ئەو شوناسانەبێت، کە لەدەرەوەڕا بەسەریدادەسەپێنرێت. فۆکۆ ئەم ئەرکی خۆدروستکردنە لەڕێگای نووسینەوە وەک ئەرکێکی ئەخلاقی و ئیستاتیکی و سیاسی دەبینێت، چونکە لە بنەڕەتدا هەوڵدانە بۆداهێنانی خودێک لەدەرەوەی

جەبر و فشارەکانی دەسەڵاتدا، ئیدی لە دەسەڵاتی دینی و سیاسییەوە بیگرە، بۆ دەسەڵاتی ئەخلاق و بەها و ئیستاتیکای باڵادەست. بەمانایەکی دیکە نووسین لای فۆکۆ یەک مانای سەرەکی هەیە: بەرگریکردنی بەردەوام لە ئازادی و لە مافی ئەوەی ئینسان خۆی بتوانێت خۆی دروستبکات و ببێت بەو شتەی، کە خۆی دەیەوێت ببێت. نووسین لەم ئاستەدا یەکێکە لەو ئامرازە سەرەکییانەی یارمەتی ئینسان دەدات ببێت بەوەی، کە خۆی دەیەوێت ببێت، نەک ئەوەی، کە کۆمەڵگا و دین و ئەخلاقی باڵادەست لێی چاوەڕواندەکەن، کە ببێت. بەبۆچوونی فۆکۆ یەکێک لە ئەرکە هەرەسەرەکییەکانی نووسین ئەوەیە، کە نووسەرەکە بکات بە ئینسانێکی تر، بە ئینسانێکی تازە، ئینسانێک خۆی لەسەر خۆی کاریکرببێت و خۆی خۆی داهێنابێت. فۆکۆ لە کۆتاییەکانی ژیانیدا و لە چاوپێکەوتنێکی بەناوبانگدا هەمان دید دووپارەدەکاتەوە دەڵێت " من باوەڕم وایە تاکە ئەرکێک، کە نووسەر هەیەتی ئەوە نییە، کە کتێبەکەی بنووسێت، بەڵکو کاری هەرە سەرەکی و گەورەی بریتییە لە خودی خۆی لە کردەی نووسینی کتێبەکانیدا" ( Ashbery 1986: 186)
به کورتی دەمەوێت لەگەڵ فۆکۆدا پێ لەسەر ئەو ڕاستییە دابگرم، کە نووسینی هەر کتێبێک ڕەهەندێکی شەخسی هەیە، کە پەیوەندی بەکارکردنی نووسەرەکەوە لەسەر خودی خۆییەوە هەیە، پەیوەندی بەدارشتنی شوناسی خۆی و بەبەخشینی ماناوە هەیە بە ژیانی خۆی وەک ئینسان. واتە هەمیشە ڕەهەندێکی تاکەکەسی لە نووسین و بوون بە نووسەردا هەیە بەو مانایەی لەسەرەوە باسکرا. بەڵام هاوکات دەبێت ئەوە بڵێم، کە ئەمە هەموو هۆکارەکانی نووسین نییە، لای میشێل فۆکۆ خۆشی ئەمە تاقە پاڵنەرێکی نووسین نەبووە و نییە. نووسین هەمیشە ڕەهەندێکی گشتیشی هەیە، کە لەخەمی تێکەڵبوونەوە بە دونیا و بە کۆمەڵگا و بە پرۆسە مێژووییەکانەوە لەدایکدەبێت. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم ڕەهەندەی نووسین دەمەوێت چەند سەرنجێکی کورت لەهەندێک لە بۆچوونەکانی نووسەری بەریتانی جۆرج

ئۆرویل بدەم لەسەر ئەم بابەتە. ئۆرویل لە کتێبێکی بچووکدا بەناونیشانی "من بۆ دەنووسم" باس لەم بابەتە دەکات و بەوردی ڕەهەندە جیاوازەکانی نیشان دەدات. ئۆرویل لەو کتێبەدا باس لە بوونی چوار پاڵنەری سەرەکی دەکات، کە پاڵ بە نووسەرەوە دەنێن بۆ نووسین. ئەو پاڵنەرانەش بریتین لە خۆخۆشویستن، یان ئەنانیەت، حەماسەتی ئیستاتیکی، پاڵنەری مێژوویی و مەبەستی سیاسی. من دەمەوێت لێرەدا تەنها لەسەر پاڵنەری چوارەمیان بوەستم، کە "مەبەستی سیاسی"یە، چونکە پێموایە لەپشتی نووسینی کتێبی دەسەڵات و جیاوازی و لەپشتی بەشێکی زۆری نووسینەکانی تریشمەوە ئەو "مەبەستە سیاسی"یە ئامادەیە، کە ئۆرویل باسیدەکات. بەڵام ئەوەی دەبێت لای خوێنەر ئاشکرابێت ئەوەیە، کە ئۆرویل ئەو مەبەستە سیاسییە بەمانا ڕۆژانەییەکە سیاسەت باسناکات، ولتە باس لە بەرگریکردن لەم سیاسی، یان لەویتر، لەم پارتی سیاسی، یان ئەویتریان ناکات، بەڵکو باس لە ئارەزوو و حەز و ویستی گۆڕانی دونیا دەکات. باس لە سیاسەت دەکات وەک یەکێک لە ئامڕازە گرنگەکانی گۆڕانی دونیا بەرەو باشتر. ئۆرویل سیاسەت وەک هێزێکی سەرەکی بۆ گۆڕان و تازەکردنەوەی دونیا دەبینێت. ئۆرویل سیاسەت وەک: "ئارەزووی پاڵنان بە دونیاوە بۆ گۆڕان بە ئاراستەیەکی دیاریکراو" دەبینێت، هاوکات سیاسەت دەبەستێتەوە بە هەوڵدان بۆ "گۆڕینی بیرو بۆچوونی خەڵک بەرامبەر بەو کۆمەڵگایەی پێویستە خەبات بۆدروستکردنی بکەن" (Orwell 2004: 5). هەر لەم ئاستە سیاسییەدا ئۆرویل دەڵێت ئەو بۆیە دەنووسێت "چونکە هەمیشە هەندێک درۆ هەن، کە دەبێت ئاشکرابکرێن و هەندێک ڕاستی هەن، کە دەبێت گرنگیانپێبدرێت" (Orwell 2004: 8). بە کورتی ئۆرویل لەپاڵ ئەو مەبەستە شەخسییەی فۆکۆ بە کردەی نووسینی دەدات، مەبەستێکی دەستەجەمعی و کۆمەڵایەتی بە نووسین دەدات، کە خۆی لە ویست و ئارەزووی بەرپاکردنی گۆڕانکاری لە دونیادا بەرجەستەدەکات، گۆڕان

بەئاراستەی دونیایەکی ئینسانتر و هێمنتر و کراوەتر.

لەهێنانەوەی بۆچوونەکانی فۆکۆ و ئۆرویلدا سەبارەت بە نووسین دەمەوێت ئەو ڕاستییە بە خوێنەر بڵێم، کە لەپشتی سەرجەمی نووسینەکانی منەوە هەم ئەو مەبەستە فۆکۆییە و هەم ئەم مەبەستە ئۆروێلییە بە خەستی ئامادەن، نووسین بۆ من هەوڵدانێکی بەردەوام و بێوەستانە هەم بۆ دەسکاریکردنی خودی خۆم و داڕشتنەوەیە بەشێوەیەکی نوێ، هەم بۆ دەسکاریکردنی ئەو دونیایەی تیایدادەژیم، دونیایەک بە دونیای خۆمی دەزانم و بەلامەوە گرنگە بەشداریم لە داڕشتنی چوارچێوە و گوتار و خەون و چاوەڕوانییەکانیدا. بەم مانایە کتێبی دەسەڵات و جیاوازی کتێبێکە بۆ هەردوو مەبەستەکە نووسراوە.

-٣-

کتێبی دەسەڵات و جیاوازی کتێبی نیشاندانی ئەو مەترسییانەیە، کە لە دونیای دوای ڕاپەڕینی ئێمەدا ئامادەن، ئەم کتێبە ڕاپۆرتێکی درێژە دەربارەی ئەو هەڕەشە قووڵانەی لە ئینسان لە کۆمەڵگای ئێمەدا ئەکرێت، ئیتر لە هەڕەشە و مەترسی خراپ بەکارهێنانی دەسەڵاتەوە تا ڕادەی بەرپاکردنی جەنگ دژ بە کۆمەڵگاوە بیگرە، تا مەترسی خراپ ئیدارەدانی دونیا و ئیدارەدانی ژیان، لە مەترسی تێکەڵبوونی دەسەڵاتی کۆنترۆڵ و دیسپلینکەرەوە بە دەسەڵاتێکی کاریزمی نابەپرسیارەوە بیگرە، بۆ مەترسی گۆڕینی هەموو دژیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی بۆ هەقیقەت. لەهەموو ئەو دۆخانەشدا مەترسی دەستدرێژیکردنێکی بەردەوام و تاوانبارانە بۆسەر ژیانی تاکەکەسی و ژیانی گشتی کۆمەڵگا. کتێبی دەسەڵات و جیاوازی سەرجەمی ئەم مەترسییانە لەژێر ناونیشانی قبووڵنەکردن و

ڕێزنەگرتنی جیاوازیدا کۆدەکاتەوە. جیاوازی چەمکی هەرەسەرەکی و هەرە گرنگی ئەم کتێبەیە، هەم لەبەرامبەر شێوە جیاوازەکانی دەسەڵاتدا دانراوە و هەم وەک ئەلتەرناتیف بۆ شێوازی ئیشکردنی وێرانکەرانەی ئەو دەسەڵاتانە گریمان و پێشنیارکراوە. بەم مانایە کتێبی دەسەڵات و جیاوازی کتێبی بەرگریکردنە لە جیاوازی، کتێبی بەرگریکردنە لە ئینسان وەک بوونەوەرێکی جیاواز، کتێبی بەرگریکردنە لەهەموو ئەو شوناسە جیاوازانە، کە شوناسی باڵادەست دەیەوێت پەلاماریانبدات. لە ژینگەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی ئێمەدا ئەم کتێبە کتێبی بەرگریکردنە لە هەموو ئەو شوناسانەی دەیانەوێت لەدەرەوەی ویستی براگەورەکانی ناو حیزب و ناو سیاسەت و ناو دین و ناو ئەخلاقی باڵادەستدا دروستبین و بژین.

ئەو ئاسۆیەی کتێبی دەسەڵات و جیاوازی تەماشایدەکات ئاسۆیەکی پڕ جیاوازییە، جیاوازی بەمانای چەمک و پراکتیکێکی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و ئەخلاقی، کە ڕێ لەدروستبوونی هەموو جۆرە کۆمەڵگا و دەسەڵاتێکی تۆتالیتاری بگرێت. نەهێڵێت دونیایەک دروستببێت تیایدا کۆمەڵێک کەس دروستبین و دەسەڵاتی ئەوەیان هەبێت بتوانن بە ئێمەبڵێن چۆن بژین، ئەوەی ئەوان بە هەقیقەتی ئەزانن و ئەوەی ئەوان بە تاکە شێوەی ژیان و بەتاکە شێوەی پەیوەندی و بەتاکەشێوەی بیرکردنەوەی ئەزانن، بەسەر هەمومواندا بیسپەێنن. نایشارمەوە من، کە وتارەکانی ئەم کتێبەم دەنووسی ئەو وێنەیەی بەردەوام لەبەرچاومدابوو، وێنەیەک، کە پێموابوو دونیای ئێمە بەنیازی کۆپیکردن و دووبارەکردنەوەیەتی، وێنەی ئەو دونیا تۆقێنەرە بوو، کە جۆرج ئۆرویل لە ڕۆمانی "١٩٨٤"دا، بەهەستێکی مێژوویی کەموێنەوە، باسیدەکات. وێنەی دونیایەک، کە ئێمە لە ساڵانی هەشتاکانی سەدەی بیستەمدا و لە ئەزموونی حیزبی بەعسی سەردەمی سەدام حوسەیندا لەناو جەهەنەمەکەیدا ژیاین و لە دونیای دوای ڕاپەڕینیشدا خەریکبوو سەرلەنوێ

دروستبکرێتەوە. خەمی من لە سەرەتای ڕاپەڕینەوە خەمی دروستکردنی حوکمڕانییەکی دیموکراسی و کراوە و ڕێزبەخش بوو، کە بتوانێت ڕێزی جیاوازییە سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکان بگرێت، دەسەڵاتێک نەک تەنها مەیل و ئاکاری تۆتالیتاریانە نەبینێت و بەڵکو بەبەردەوامی هەر دەرکەوتێکی ئەم مەیل و ئاکارە لەناوخۆیدا بکوژێت. خەونی من ئەوەبوو دونیایەک دروستبێت تیایدا ڕێز لە ئینسان و ڕێز لە ژیان وەک دوو دیاردەی پڕ جیاوازی و فرەڕەنگ، یاسای سەرەکیبێت. سەرجەمی ئەو نووسینانەی لەم کتێبەدا ئامادەن، لەم خەمەوە سەرچاوەیانگرتوە. بەم مانایە کتێبی دەسەڵات و جیاوازی کتێبی بەرگریکارە، بەرگری نەک تەنها بە مانا سیاسییەکەی، بەڵام بەمانا فیکری و تیۆریی و فەرهەنگی و ئەخلاقییەکەشی.

ئەگەر بمەوێت کتێبێک بدۆزمەوە، کە تەواو ئاکۆبێت بە کتێبی دەسەڵات و جیاوازی، ئەوا دەتوانم تەنها بیر لە ڕۆمانی "١٩٨٤" جۆرج ئۆرویل بکەمەوە. لەم ڕۆمانەی ئۆرویلدا وێنەی دونیایەک دەکێشرێت، کە لەسەر کوشتنی هەموو دەنگێک و هەموو ڕەنگێک و هەموو بوونێکی جیاواز کاردەکات، کە دەسەڵاتداران نەیانەوێت هەبن. دونیایەک تیایدا حەزێکی نەخۆشانە لە دەسەڵات ڕووداوەکانی بەرهەمدەهێنێت و کۆمەڵگایەک دروستدەکات لەهەموو ئاستێکدا بەشێوەیەکی تۆقێنەر کۆنترۆڵ و چاودێرکراوبێت. کۆمەڵگایەک لەسەر درۆ و فێڵ و دروستکردنی هەقیقەتی ساختە کاربکات. حیزب نەک تەنها کۆنترۆڵی ئێستا بکات، بەڵکو دەستنیشانی ڕابردووش بکات، پێمانبڵێت مێژوو چی بووە و چۆن بووە، کێ پاڵەوان و کێ ناپاک و خائین بووە، هەموو ئەمانەش لەڕێگای پرۆسەیەکی گەورەی ساختەکارییەوە، کە حیزب دەزگای تایبەت و سەدەها فەرمانبەری چالاکی بۆتەرخاندەکات. بەمانایەکی دیکە لەم دونیا ئۆروێلیەدا تەنها ئێستا کۆنترۆڵ و چاودێریناکرێت، بەڵکو بیرکەوتنەوە و یادهاتنەوەش کۆنترۆڵدەکرێت. لەم دونیایەدا

حیــزب و ســەرۆکێک ئامــادەن، کە بڕیــار لەســەر هەمووشــتێک ئەدەن و هەمووشتێکیش بەڕێوەدەبەن، حیـزب و سـەرۆکێک، کە هەردووکیـان موقەدەسـن، هەرگیز هەڵەنـاکەن و هەرگیـز هەڵەشـیان نەکـردووە، چییـان وت هەقـیقەتە، نەک تەنها بۆ ئێستا، بەڵکو بۆ ڕابردووش. لەم کۆمەڵگـایەدا هەمـوو ئینسـانەکان لەژێـر چـاودێری و کـۆنترۆڵی ئەو حیـزبە و سـەرۆکەکانی ئەو حیـزبەدان، نەک تەنهـا کۆنترۆڵی ئەو شتانە دەکرێت، کە کەسـەکان دەیـانکەن و پێیانهەڵدەسـتن، بەڵکـو کۆنترۆڵی دونیای ناوەکییشیان و کـۆنترۆڵی هەسـت و بیرکردنەوەشـیان دەکرێـت. واتە سەپاندنی ئیرادەی حیزب و بـراگەورە تەنهـا بەسـەر واقیعـی دەرەکیـدا نییە، بەڵکـو بەسـەر قـووڵترین ئاسـتەکانی کەسـایەتی ئینسانەکانیشـدایە. لەم دونیـا ئۆرویلییەدا دووشت بەبەردەوامی لەناودەبرێن، یان دەسەڵات دوو دوژمنی سـەرەکی و هەمیشەیی هەیە: جیاوازی و سەربەخۆبوون. لەم دونیایەدا ئینسان نەبـۆی هەیە لەوانیتـر جیاوازبێـت، نە بـۆی هەیە سەربەخۆشـبێت. ئینسـانی خـاوەن شوناسـی تـایبەت و ئینسـانی سـەربەخۆ دوژمـنە سـەرەکییەکانی ئەو حیـزب و سـەرۆک و دەســەڵاتەن، کە هەوڵــی بەردەوام ئەدەن نەهــێڵن هــیچ واقیعێکــی ســەربەخۆ لەدەرەوەی ویسـتی حیزبـدا دروسـتببێت. هەم جیـاوازی و هەم سـەربەخۆیی دوو تەحەدای گەورەن بۆ حیزب و بۆ براگەورەکان.

ڕێکەوت نییە، کە کتێبی دەسەڵات و جیاوازی لە لاپەڕەی یەکەمییەوە تا دواهەمین لاپەڕەی دژ بەو دونیا ئۆرویلییەیە. دەڵێم ڕێکەوت نییە، چونکە ئەزمـوونی دونیـای دوای ڕاپەڕین و شێوازی حوکمڕانی لەو دونیایەدا، ڕووی لە دروستکردنی دونیایەکی ئۆرویلی بـوو. دونیـایەک دوو حیـزب دەیانویسـت وای دروسـتبکەن و وای دابڕێـژن لەگەڵ خواست و ویست و قازانجی براگەورەکانـدا بگونجێـت. بـۆ ئەم مەبەستەش هەوڵبـدەن سـەرلەبەری ئەو ئەگەر و ڕەهەنـدە جیـاوازانە کـۆنترۆڵبکەن، کە لەگەڵ ویسـت و قـازانج و عەقڵەیەتـی ئەوانـدا ناگونجێـت. لەمەشـدا هەم کـارێکی زۆر و

هەوڵێکی بێشوماریان دا و هەم بەشی هەرەزۆری وزەی مادی و سیاسی و کۆمەڵایەتی خۆیان و هەوادارەکانیان بۆ پیادەکردنی ئەم پرۆژە ئۆرویلیە تەرخانکرد. کتێبی دەسەڵات و جیاوازی یەکێکە لەو کتێبانەی سەرسەختانە لەبەردەمی پرۆژەی دروستکردنی ئەم دونیا ئۆرویلیەدا وەستا. هەم بابەتەکانی ئەم کتێبە و هەم تێزەکانی و هەم زمانەکەی و هەموو ئەو وێنانەی ئەم کتێبە بۆ دونیا و کۆمەڵگا و ئینسانیان دەکێشێت، دژ بە ورد و درشتی ئەو دونیا ئۆرویلییەن، کە بەڕێوەبوو. بە مانایەکی دیکە کتێبی دەسەڵات و جیاوازی بەشێکبوو لەو هەوڵە بێوچانەی بەرگریکردن لە دونیای ئێمەدا دژ بەم پرۆژە ئۆرویلیە دروستبوو، ئەم کتێبە دەنگێکە لە پاڵ ئەو دەنگانەدا، کە نەیانهێشت دونیای ئێمە، سەرباقی هەموو ناشیرینییەکانی، ببێتە دونیایەکی ئۆرویلی. ئەم کتێبە هەوڵێکە لەپاڵ هەوڵەکانی تری کۆمەڵگای ئێمەدا بۆ گۆڕکردنی ئەو پرۆژە ئۆرویلییەی بەناوی دامەزراندنی دەسەڵاتی خۆماڵی و ئەزموونی ڕەسەن و تازەپێگەیشتووەوە ئەدرا. ئەگەر دەسەڵات و جیاوازی نرخێکی مێژوویی هەبێت، ئەوا بەشداربوونی ڕاستەوخۆیەتی لەم پرۆسەی بەرگریکردنە لە ئینسان و لە کۆمەگا، دژ بەو مەیل و تەماح و خەون و ئاکارە تۆتالیتارییانەی دەسەڵاتی سیاسی لە کوردستانی دونیای دوای ڕاپەڕیندا هەڵگرییوو. وێنەی ئەو کۆمەڵگایەی ئەم کتێبە بەرگریلێدەکات، وێنەی کۆمەڵگایەکی بێ شەڕوشۆڕ و بێ پێکدادانی کۆمەڵایەتی بێ توندوتیژییە، کۆمەڵگایەکە ڕێزی جیاوازییەکانی ناو هەناوی خۆی دەگرێت و چوارچێوەیەکی گشتی یەکسانخوازیش بۆ جێگیرکردنی ئەو جیاوازییانە لەپاڵیەکدا دروستدەکات، واتە وێنەی کۆمەڵگایەکی نائۆرویلییە.

-٣-

وەک لە پێشەکی چاپی یەکەمدا هێمای بۆکراوە، بەرپابوونی شەڕی ناوخۆ لەپشتی نووسینی بەشێکی زۆری نووسینەکانی ناو ئەم کتێبەوەیە. شەڕ بۆ من لە ئاستە فیکری و تیۆرییەکەیدا، وەک لە وتاری یەکەمدا پێناسەکراوە، بریتییە لە هەڵنەکردنی دوو جیاوازی بەیەکەوە، یان لە پەلاماردانی دوو هێز بۆسەریەکتری لەبەرئەوەی ناتوانن و نایانەوێت جیاوازییەکانی یەکتری قبووڵبکەن، ئیتر لە قبووڵنەکردنی جیاوازی دید و بۆچوون و بیرکردنەوەوە بیگرە، بۆ قبووڵنەکردنی سود و قازانج و پلانی جیاواز. واتە قبووڵنەکردنی جیاوازی ژێرخانی ئەو ڕۆحە مۆنۆپۆڵخواز و دەستبەسەراگر و قۆرخکارەیە، کە جەنگ بەشێکە لە شێوازی کارکردنی لەناو دونیا و دیاردەکاندا. ئەم ڕۆحە مۆنۆپۆڵخوازانە لەدۆخی پەلاماردان و تەقینەوەیان بەڕوورییەکتردا هاوکات هەوڵی ئەوەیاندا هەموو ئەو خاڵی بەرگریکردن و تەسلیمنەبوونانەی لە دونیای ئێمەدا هەبوون، ئەو خاڵانەی دید و ئەخلاق و ویست و خەونی جیاوازیان هەبوو، یان تەواو کۆنترۆڵبکەن، یان بخەنە ژێرپێوە تا ڕادەی لەناوبردن و وێرانکردنی تەواوەتیان. وەک لە نووسینەکانی ئەم کتێبەدا دەردەکەوێت توێژێکی کۆمەڵایەتی نوێ و کایەیەکی سیاسی پڕ تەقینەوە و دابەشبوون و عەقڵیەتێکی سیاسی مۆنۆپۆڵخواز و کولتورێکی سیاسی دیاریکراو و ئیرادە و ویست و بڕیاری کۆمەڵێک سیاسی لەپشتی بەرپابوونی جەنگەوەبوو. جەنگ بەشێک بوو لەم پێکهاتە نەخۆش و ترسناکە. بۆئەوەی لێرەدا زیاد لە پێویست درێژە بەم باسە نەدەم، چونکە وەک وتم بەشی زۆری کتێبکە تەرخانە بۆ باسکردنی ئەم مەسەلەیە، هەوڵدەدەم لێرەدا هەندێک لە گرنگترینی ئەو تێزانە کۆبکەمەوە، کە ئەم کتێبە لەناوەڕاستی ساڵانی نەوەدەوە خستویەتییە بەر دیدی خوێنەران و بەردەم هێزە کۆمەڵایەتییەکانی کوردستان.

یەکێک لە تێزە سەرەکییەکانی ئەم کتێبە لە پەیوەندیدا بە شەڕی ناوخۆ ئەوەیە، کە ئەم شەڕە وابەستەی دروستبوونی توێژێکی کۆمەڵایەتی نوێییە لە کوردستاندا، کە پێشتر بوونیان لەناو نەخشەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای ئێمەدا نەبووە: مەبەستم لەمەش بوونی بەرپرسە سیاسی و سەربازی و حیزبییەکانی کوردستانە بە توێژێکی سەرمایەداری گەورە و بەهێز. شەڕ یەکێک بوو لە ئامرازە هەرەسەرەکییەکانی دروستبوون و بەهێزبوون و گەورەبوونی ئەم توێژە. شەڕی ناخۆی ژینگەیەکی سیاسی پڕ پشێوی و نائارامییەکی کۆمەڵایەتی وای دروستکرد، ئەم توێژە بتوانێت هەموو دەسەڵاتەکان لە کوردستاندا لەدەستی خۆیدا کۆبکاتەوە، لە دەسەڵاتی سیاسییەوە بۆ دەسەڵاتی سەربازی و لە دەسەڵاتی بیرۆکراسییەوە بۆ دەسەڵاتی ئابوری. بەتایبەتی دەستگرتن بەسەر ئابوری کوردستاندا و ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی ئەم ئابوورییەش بەشێوەیەک خۆیان ببنە هێزی ئابوری ژمارە یەک لە کوردستاندا. شەڕی ناوخۆ ئەو ژینگە پڕ ترس و توندوتیژی و بێچاودێرییەی بۆ خولقاندن بتوانن تیایدا ببنە سەرمایەدارە گەورەکانی دونیای ئێمە. بتوانن، وەک لە وتاری یەکەمدا باسکراوە، "مەوقیعی سیاسی" خۆییان بگۆڕن بە "مەوقیعێکی ئابووری"، کەسایەتی سیاسی و کەسایەتی بازرگان لەناو یەککەسدا کۆبکەنەوە. بەکورتی ئەو جێگۆڕکێ کۆمەڵایەتییە گەورەیە، کە دروستبوو بەبێ شەڕی ناوخۆ نەدەکرا بەو ئاسانییە دروستببێت. کۆمەڵگای ئێمە تا ئەمڕۆ باجی ئەم جێگۆڕکێ کۆمەڵایەتییە کوتوپڕ و تا ڕادەیەکی زۆر مافیاییە دەدات. بەزۆر ماناش ئەم تێزە، کە لە ساڵی ١٩٩٥دا بۆ لێکدانەوەی شەڕی ناوخۆ پێشکەشکراوە، تا ئەمڕۆش بۆ لێکدانەوەی بڕێکی زۆری ململانێ گەورەکانی ناو کوردستان دروستە.

تێزێکی دیکەی سەرەکی ئەم کتێبە ئەوەیە، کە شەڕ لە کوردستاندا هەرزوو لە شەڕ لە سەر دەسەڵاتی سیاسییەوە گۆڕا بۆ شەڕ لەسەر هەموو دەسەڵاتەکانی دیکە، هاوکات لە مۆنۆپۆڵکردنی پەیوەندییەکانی ناو حیزبەوە پەڕییەوە بۆ

داگیرکردن و کۆنترۆڵکردنی حیزب بۆ زۆریەی هەرەزۆری کۆمەڵگا و ئەو پانتاییە کۆمەڵایەتییانەی لەدەرەوەی حیزبدا ئامادەبوون، بەتایبەتی دروستکردنی هەوادارانێکی توندڕە و جەنگاوەر. هەر لەساڵی ١٩٩٥ مەترسییەکانی ڕۆڵی حیزب بەمشێوەیە باسکراوە: "لە ڕۆژگاری ئێستاماندا گروپی هەرە گرنگ لە کۆمەڵگای ئێمەدا حیزبە، حیزبە، کە دەتوانێ گروپەکانی دیکە بنرخێنێ، حیزبە شوناسەکان دابەشدەکات، حیزبە ئەرێ و نەرێکان بەرهەمدەهێنێ، حیزبە لەناو "بەرزەمندا" جێگیرە، حیزبە پەیوەندیی نێوان "ئەستی کۆ" و "من" ی کۆمەڵایەتی دەستنیشان و کۆنترۆڵدەکات، حیزبە پرۆسەکانی تەماهیکردن بەرێوەدەبات و چاودێریشیاندەکات. بەکورتی دەکرێ قسە لە "عوسابێکی کۆمەڵایەتی" گشتی بکەین، کە حیزب سەرچاوە و ئامرازی هەرە سەرەکی ئەو عوسابەیە، عوسابێک، کە بەجەنگ و پێکدادانی خوێنای تەعبیر لەخۆی دەکات." وەک دەبینین حیزب تەنها وەک هێزێک بۆ داگیرکردنی کۆمەڵگا وێنانەکراوە بەڵکو وەک سەرچاوەییەکی سەرەکی بۆ شێواندنی وشیاری و دروستکردنی بیماری دەروونی و گرێی ڕۆحی گەورە و دەستەجەمعی. پێموایە بەشێک لەم تێزە تا ئەمڕۆش مانا و قورسایی خۆی لەدەستنەداوە.

تێزێکی دیکەی سەرەکی لەم کتێبەدا پەیوەندی بە تێگەیشتن بۆ سیاسەت و چۆنیەتی کارکردنی "کایەی سیاسی"یەوە هەیە لە کوردستاندا. وتاری یەکەمی ئەم کتێبە بەرگری لەوەدەکات، کە سیاسەت لەکوردستاندا، نەک تەنها خەریکی چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمەڵگا نییە، بەڵکو خۆی ڕێگرێکی گەورەیە لەبەردەم چارەسەرکردنی زۆر کێشەدا و ڕێگرێکی گەورەشە لەبەردەم گەشە و بەرەوپێشەوەچوونی کۆمەڵگا. هاوکات "کایەی سیاسی کوردی" خۆیشی ئەوەندەی "کایەی خولقاندنی کێشەی نوێ" و کایەی "قوڵترکردنەوەی کێشە کۆنەکان"ە لە کوردستاندا، ئەوەندە کایەی چارەسەری هیچ کێشەیەک نییە. بەمانایەکی دیکە

سیاسەت لە کوردستاندا هونەری چارەسەری بیماری و کێشەی کۆمەڵایەتی نییە، بەڵکو ئامرازی دروستکردنی بیماری و کێشەی زیاترە. هەر لەو نووسینەدا تێزێکی دیکە ئامادەیە، کە پێیوایە "کایەی سیاسی" ناعەقڵانی، نەک تەنیا خودی سیاسییەکان نەخۆش و ناعەقڵانی دەکات، بەڵکو زۆربەی خانە کۆمەڵایەتییەکانی دەرەوەی سیاسەتیش نەخۆشدەخات. بەکورتی ئەم کتێبە ئاوا باس لە کایەی سیاسی لە کوردستاندا دەکات: "کایەی سیاسی لە دنیای ئێمەدا هەنجن هەنجنە بە هەڵەکانی ڕابردوو، بە هەڵەکانی ئێستا، بە دەستێوەردانی شێوێنەوارانەی داگیرکەران، بە پەیوەندی نهێنی و ژێرپەردەی حیزبەکان، بە کڕینی خەڵک، بە پاڵەوانکردنی خائینەکان، بە دروستکردنی ڕەمز و قارەمانی وەهمی، بە بەخشین و بڵاوکردنەوەی لێکدانەوەی هەڵە، بە درۆکردن لەگەڵ خود و لەگەڵ خەڵک و لەگەڵ دنیادا".

ئەو تێزەی سەرەوە هاوکات بەرگری لەوەدەکات لە کۆمەڵگایەکی وەک کۆمەڵگای ئێمەدا ئیفلیجبوونی سیاسەت مانای ئیفلیجبوونی خودی کۆمەڵگا و بەفیڕۆدانی ئەو وزەی گۆڕان و تازەبوونەوەیە دەگەیەنێت، کە کۆمەڵگا لەهەناوی خۆیدا هەڵیگرتووە. لە کوردستاندا ئەم دۆخە پەیوەندی بەوەوە هەیە سیاسەت دەستیگرتووە بەسەر زۆربەی هەرەزۆری کایە کۆمەڵایەتییەکاندا، چووتە ناو هەموو شوێنێکەوە لە هونەرەوە بۆ ئابوری و لە میدیاوە بۆ وەرزش، لە ڕێکخراوی منداڵان و پیرانەوە بۆ ڕێکخراوی کەمئەندامان و نووسەران. هەر لەم بوارەدا یەکێک لە گرنگترین تێزەکانی ئەم کتێبە دێتەپێشەوە، کە پێیوایە سروشتی ئەو دەسەڵاتەی لە دونیای ئێمەدا ئامادەیە ئەوەیە کایەکان لەناوەوە وێراندەکات، لێناگەڕێت ئەو کایانە بە پێی یاسا و مەرج و بەها تایبەتەکانی خۆیان بژین. لەباتی ئەمە سیاسەت لەدەرەوەڕا دەستدەخاتە ناو کایەکان و لۆژیکی تر بەسەر کایەکاندا دەسەپێنێت، کە لۆژیکی خۆیان نییە. بۆ نموونە گەر کایەی سەربازی وەرگرین، ئەو لۆژیکەی

لەم کـایەیەدا کارنەکـات ئەوە نیـیە، کە لێهـاتوترین و لێزانتـرین و بەتوانـاترین کەسایەتی سەربازی ببێتە بەرپرسی سوپاس، بەڵکو کەسێکی نەخوێندەواری نزیک بە بەرپرسەکانی حیزب دەبێتە بەرپرسی سوپا. گەر کایەی رۆژنامەوانی وەرگرین، لێرەشدا بەرپرسی سەندیکای رۆژنامەنووسان کەسێک نییە، کە چالاکی و شارەزایی و بەتوانایی خۆی لەبواری رۆژنامەنووسیدا ردبێتییە ئەو شوێنە، بەڵکو وەفـای بـۆ حیـزب و بـۆ تـوێژە باڵادەستەکەی نـاو حیـزب بـرنوویەتییە ئەو جێگەیە. ئەمەش وایکـردووە نەک تەنهـا حیـزب زورپەی کـایە کۆمەڵایەتییەکـان داگیربکـات، بەڵکـو واشبکات کایەکان بە لۆژیکی ناوەکی خۆیان نەجوڵێن و ئەو لـۆژیکە وەرگـرن، کە لەدەرەوەڕا بەسـەریاندا دەسـەپێت. بەمەش وێرانکـارترین شـێوازی دەسـتێوەردانی حیزبە لە کۆمەڵگای ئێمەدا.

ئەو دۆخەی سەرەوە دەمانخاتە بەردەم یەکێکیتر لە تێزە گرنگەکـانی ئەم کتێـبە: ڕێگـرتن لە دروسـتبوونی نەتەوە بەمانـا سیاسـییەکەی لە کوردسـتاندا. لەئاسـتی سیاسـی و کۆمەڵایەتیـدا ئەمە مانـای واتە ڕێگـرتن لەدروستبوونی ئەو چوارچێـوە نەتەوەییە گشتییە، کە شوێنی هەموو جیاوازییەکـان و هەمـوو هێزەکـان و هەمـوو تێڕوانینەکانی تێدابێتەوە. ڕێگرتن لە دروستبوونی نەتەوەیەکی سیاسـی لەپێنـاوی دروستکردن و سەپاندنی دەسەڵاتێکی سیاسی داخراودا، ئەو یاسا سیاسییەیە، کە سەرجەمی ئیشـکردنی نـاو کـایەی سیاسـی و ئیشـکردنی دەزگاکـان و ئیشـکردنی کۆمەڵگای مەدەنی و ئیشکردنی میدیای دەسەڵاتی لە کوردستاندا ئاراستەکردووە. ئەم تێزە تا ئەمڕۆش هیچ قورساییەکی سیاسی و فیکری نەدۆڕاندووە، ئەگەرچـی ئەمڕۆ لەهەمووکات زیاتر باس لە پلان و سـتراتیژ و خەونـی نەتەوەیـی و تەنـانەت دامەزرانـدنی دەوڵەتـی سـەربەخۆش بـۆ کوردسـتان دەکرێـت. لە ڕێگـرتن لە دروستبوونی نەتەوەدا وەک بکەرێکـی سیاسـی، بە پـلەی یەکەم، کـایەی سیاسـی کوردی بەرپرس و تاوانبارە. بەر لە هەفدە سـاڵ لەمەوبەر وتـاری یەکەمـی کتێبـی

دەسەڵات و جیاوازی ئاوا باس لە پێکهاتەی ئەم کایەیە دەکات: "کایەی سیاسی لە دنیای ئێمەدا هەنجن هەنجنە بە هەڵەکانی ڕابردوو، بە هەڵەکانی ئێستا، بە دەستێوەردانی شێوێنەوارانەی داگیرکەران، بە پەیوەندی نهێنی و ژێرپەردەی حیزبەکان، بە کڕینی خەڵک، بە پاڵەوانکردنی خائینەکان، بە دروستکردنی ڕەمز و قارەمانی وەهمی، بە بەخشین و بڵاوکردنەوەی لێکدانەوەی هەڵە، بە درۆکردن لەگەڵ خود و لەگەڵ خەڵک و لەگەڵ دنیادا".

بێگومان خوێنەر ئەمڕۆکە ئەو ڕاستییە دەزانێت، کە بەشێکی زۆری ئەم تێزانە دوای زیاد لە پازدەساڵ لە نووسینیان، هەم بوون بە بەشێک لە زمانی سیاسی زۆرێک لە خوێنەران خۆیان و هەم بەتێزی هەندێک لە هێزە سیاسییەکان و هەم بەتێزی سەردەمی هەندێک ڕۆشنبیر، کە تا ئێستا بەدەربڕینی جیاواز، بەڵام بەهەمان مانا و ناوەڕۆکەوە، ئەو شتانەی لە کتێبی دەسەڵات و جیاوازیدا هاتوون دووبارەدەکەنەوە. لەم ئاستەدا کتێبی دەسەڵاتی جیاوازی یەکێکە لەو کتێبانەی کاریگەرییەکی بەرچاوی لەسەر زمانی سیاسی و لەسەر چۆنیەتی تێگەیشتن و وێناکردن خوێندنەوەی پەیوەندی نێوان حیزب و سیاسەت، حیزب و کۆمەڵگا و حیزب و ئابوری، هەروەها بۆ خوێندنەوە و تێگەیشتنی ڕۆڵی ئەو توێژ، یان نوخبە حیزبییە تازەیە لە کوردستانی دوای ڕاپەڕیندا دروستبوو.

-٤-

بەشێکی دیکەی کتێبی دەسەڵات و جیاوازی تەرخانە بۆ شیکردنەوەی ئەو مۆدێلە لە دەسەڵات، کە لە کوردستانی دوای ڕاپەڕیندا دروستکراوە. خوێندنەوە و شیکردنەوەی ئاکارەکانی ئەم دەسەڵاتە بەشێکە لەو هەوڵە فیکرییانەی ئەم کتێبە لەناوەڕاستی نەوەدەکانەوە گرتوویەتییە ئەستۆی خۆی. تێزی سەرەکی ئەم کتێبە سەبارەت بە دەسەڵات لە کوردستاندا ئەوەیە، کە دەسەڵات لە کوردستاندا قاچێکی لەناو تەقلیدییەت و قاچێکی لەناو دەزگا مۆدێرنەکاندایە، جۆرێک لە دەسەڵاتدارێتییە تیایدا دید و بۆچوون و تەکنیکی تەقلیدی دەسەڵات تێکەڵە بە نوێترین تەکنۆلۆژیا و دەزگای مۆدێرنی پیادەکردنی دەسەڵات. بەکورتی هەم خەڵک وەک ڕەعیەت تەماشادەکرێن و بەڕێوەدەبرێن، و هەم حیزب وەک دەزگایەکی سیاسی مۆدێرن لەهەناوی ئەو "ڕەعیەت"انەدا ئامادەیە.

یەکێک لە تێزە سەرەکییەکانی دیکە ئەوەیە ئەم شێوازە لە دەسەڵات، دەسەڵاتی ئەو هێزانەیە، کە ناتوانن خاوەنی "هەیمەنە" بن، دەسەڵات لە کوردستاندا، دەسەڵاتێک نییە خاوەنی هەیمەنەبێت. بەڵام دەبێت وریابین چەمکی هەیمەنە لێرەدا بەهەڵە لێکنەدەینەوە، ئەو هەیمەنەیەی، کە دەسەڵات و جیاوازی باسیدەکات هەیمەنەیە بەمانا گرامیشییەکەی، کە دەڵێین هیچ هێزێک لە کوردستاندا خاوەنی هەیمەنە نییە، واتە هیچ هێزێک نەیتوانیوە بیر و بۆچوون و لێکدانەوەکانی خۆی بۆ سیاسەت و بۆ کۆمەڵگا و بۆ دونیا، بکات بە بیروبۆچوونی باڵادەست و خەڵک خۆبەخۆ باوەڕیانپێبهێنن و وەک بەشێک لە بیرکردنەوە و تێڕوانینی خۆیان مامەڵەیبکەن. هەیمەنە لای گرامشی وەک ئەلتەرناتیف بۆ فشارێۆهێنان و ترساندن و بەکارهێنانی توندوتیژی باسدەکرێت. هەر هێزێک هەیمەنەی فیکری و ئایدیۆلۆژی و کولتوری هەبێت، پێویستی بەوە نییە فشار بۆ

کۆمەڵگا بهێنێت، خەڵک بترسێنێت و پەنا بۆ توندوتیژی ببات بۆئەوەی بیروبۆچوون و سیاسەتەکانی خۆی بسەپێنێت. هەیمەنە لێرەدا مانای قبوڵکردنی خەڵک بۆ سەرکردایەتی هێزێک لە کۆمەڵگادا وەک جۆرێک لە بەڵگەنەوسیت، وەک دیاردەیەکی سروشتی و ئاسایی، نەک لەڕێگای کڕین و فێڵ و تەڵەکە و خڵەتاندن و ترساندن و هەڕەشە و بەکارهێانی توندتیژییەوە. بەمانایەکی دیکە بوونی هەیمەنە مانای توانای هێزێک بۆئەوەی بتوانێت ڕۆڵی سەرکردایەتییەکی کولتوری و ئەخلاقی ببینێت و کۆمەڵگاش ئەو هێزە بەڕاستی وەک سەرکردەی کولتوری و ئەخلاقی ببینێت. ئەوەی لەدونیای دوای ڕاپەڕیندا ئاشکرایە ئەوەیە هێزە دەسەڵاتدارەکانی کوردستان نەک تەنها وەک هێزێک نەبیرلون، کە سەرکردایەتییەکی کولتوری و ئەخلاقی کۆمەڵگا بکەن، بەڵکو پێشتر وەک هێزی مافیایی داخراو و بیرتەسک و بێفیکر و نەخوێندەوار و شەڕانی وێناکراون. هەیمەنە لەڕێگای دانوسان و گوێگرتن و ڕێکەوتن لەگەڵ کۆمەڵگا و لەگەڵ هێزە کۆمەڵایەتییەکاندا دروستدەبێت، هێزێک دەتوانێت هەیمەنە پەیدابکات توانای ئەوەی هەبێت لەگەڵ زۆربەی هەرەزۆری هێزە کۆمەڵایەتییەکاندا ڕێکبکەوێت و بەشێک لە خەون و ویست و سودوقازانجەکانی ئەوان لەناو دونیابینی و کردەوە و سیاسەتەکانی خۆیدا بەرجەستەبکات، نەک ئەوەی خۆی بچێتە شوێنی کۆمەڵگا و هەموو هێزەکانی تر لەڕێگای فشار و هەڕەشە و توندوتیژییەوە ناچار بەبێدەنگی بکات.

باشە ئەم دەسەڵاتە، کە ناتوانێت خاوەنی هەیمەنەبێت، کەناتوانێت ڕۆڵی سەرکردەیەکی ئەخلاقی و کولتوری ببینێت، کە ناتوانێت دونیابینی هیچ هێزێک لەدەرەوەی دونیابینی توێژە باڵادەستەکەی ناو حیزبدا لەناو خۆیدا کۆبکاتەوە، ئەی چۆن کاردەکات، لە واقیعدا چ جۆرە تەکنیک و چ جۆرە شێوازێکی پیادەبوونی هەیە؟ میکانیزمەکانی ئیشکردنی کامانەن؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە بەشێکی

گرنگی کتێبی دەسەڵات و جیاوازییە. من لێرەدا زۆر بەکورتی لەڕێی یەکێک لە تێزە سەرەکییەکانی تری کتێبەکەوە، لەپاڵ هەندێک لە بۆچوونەکانی میشێل فۆکۆدا، هەوڵدەدەم هەندێک لەو مەسەلانە ڕوونبکەمەوە. بەبۆچوونی فۆکۆ ستراتیژیەتی دەسەڵات لە کۆمەڵگا تەقلیدییەکاندا لەسەر سزادان کاریکردووە، پادشا، یان دەسەڵاتدار ڕاستەوخۆ ئەو کەسەی، کە تەحەدای دەسەڵاتەکەی کردووە، کوشتوە. بەڵام لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا دەسەڵات لەسەر سزا کارناکات، بەڵکو هەوڵدەدات ئینسانەکان دیسپلین و کۆنترۆڵبکات. ئەمەش لەڕێگای ئەو هەموو دەزگایانەوە، کە لە دونیای مۆدێرندا دروستدەبن، ئیدی لە بەندیخانە و کارخانە و سەربازگە و قوتابخانەوە بیگرە تا بە حیزب و ڕێکخراوی سیاسی دەگات. تێزەی سەرەکی لە کتێبی دەسەڵات و جیاوازیدا ئەوەیە، کە دەسەڵات لە دونیای ئێمە لەسەر هەردوو تەکنیکەکە کاردەکات، واتە هەم سزادەدات و دەکوژێت، هەم دیسپلین و کۆنترۆڵدەکات، هەم میلیشیای حیزبی و گروپی ئیغتیالات دروستدەکات، هەم ئەو هەموو دەزگای ئاسایش و پۆلیس و سەرباز و قوتابخانە و بنەکەی حیزبی و ڕێکخراوی قوتابیان و ژنان و لاوان و دەزگاکانی چاودێریکردن و سانسۆرکردنی ئینتەرنێت و گوێگرتن لە تەلەفۆن هتد... بەمانایەکی دیکە دەسەڵات لە دونیای ئێمەدا هەم هەموو ئامرازەکانی دیسپلینکردنی لەبەردەستایە و کاریانپێدەکات، هەموو دڵڕەقی و توندوتیژییەکانی دەسەڵاتی ناو کۆمەڵگا تەقلیدییەکانیش. مرۆڤ لەکاتێکدا لە کۆمەڵگای ئێمەدا نووقمە لەناو پرۆسەی چاودێریکردنێکی سەرتاسەریدا، هاوکات گەمارۆشدراوە بە سیاسەتی کوشتن و بڕین و لێدان و فەلاقەکردن و پەلاماردان. شێوازی کارکردنی دەسەڵات لە دونیای ئێمەدا لەسەر تێکەڵکردنی ئەو دوو تەکنیکە بەیەکتری کاردەکات، هەم دیسپلین و چاودێرکردن، هەم سزادان و کوشتن. پێموایە ئەم تێزە تا ئێستاش هیچی لە ئێستاییبوونی خۆی نەدۆڕاندووە.

تێزێکــی گرنگــی تــری کتێبــی دەســەلآت و جیــاوازی بــریتییە لە تێــزی "بەجەستەییکردنی دەسەلآت" و بە "کاریزماکردنی جەستەکان". لە دونیـای دوای راپەریندا بڕێکی زۆری دەسەلآت لەناو هەندێک جەستەی دیاریکراودا کۆکرانەوە و تا ئێستاش بەهەمانشێوە کۆکراونەتەوە، ئەمانەش جەستەی پیاوانی ژمارە یەکی نـاو حیـزب و هەنـدێک لەو کەسـانەن، کە لێیـانەوە نـزیکن. ئەم بەجەسـتەییکردنەی دەسەلآت وادەکات حیزب خۆشی، سەرباری ئەو رۆڵە گەورەیەی لە چاودێریکردن و دیسپلینکردندا دەیبینێت، دەزگـایەکی کەم دەسـەلآتبێت و بە ئەمـر و نەهییەکـانی ژمارەیەکی کەمی بەرپرسانی حیزب بجوڵێتەوە. ئەم شێوازە لە دەسەلآت لەسەر بە کاریزمــایکردنی کەســەکان کاردەکــات، واتە هەمیشــە هەوڵــی دروســتکردنی کەســایەتییەک دەدات، کە بەنــاوی کاریزمــاوە دەســەلآتێکی هێجگــار گەورەی لەلاکۆببێتەوە، کاریزماش لێرەدا پێدراوێکی سروشتی نیـیە، بەڵکـو دروسـتکراوێکی سیاسییە و میدیای مۆدێرن رۆڵێکی سەرەکی لەدروستبوونیدا دەبینێت. میـدیایەک دەتوانێت کەسێکی نەزان و بێناست و بێفیکر و بێبیرکردنەوە، وەک سەرکردەیەکی مێژوویی پێشکەشبکات.

-٥-

دواهەمین رەهەندێکی کتێبی دەسەلآت و جیاوازی بمەوێت لێرەدا بە کورتی قسەی لەســەربکەم رەهەنــدە فەلســەفییەکەیەتی. ئەم کتێـبە گەرچـی زیـاتر ســەر بە سۆسیۆلۆژیای سیاسی و کولتورییە، بەلآم هاوکات کتێبێکە بەدەر نییە لەکۆمەڵێک دیدگای فەلسەفی. دەکرێت ئەم دیدگایەش لەدوو ئاستدا نیشـانبدەین. یەکەمیـان چـۆنیەتی وێنـاکردن و مـامەڵەکردنی چەمکـی جیـاوازییە. دووهەمیـان چـۆنیەتی

وێناکردنی چەمکی هەقیقەتە. کتێبی دەسەڵات و جیاوازی چەمکی جیاوازی بە بنەمای ژیانی کۆمەڵایەتی و بنەمای فیکر دەزانێت. لەڕاستیدا ئەم کتێبە جیاوازی وەک ژێرخانێکی گەورە، وەک لۆژیکێکی گشتی دەبینێت، کە لەهەموو بوارێکی ژیان و بیرکردنەوە و هەڵسوکەوتی ئینسانیدا ئامادەیە. چەمکی جیاوازی لێرەدا وەک چەمکێک دژ بە شوناس پێشنیارکراوە، ئەگەر فەلسەفەی شوناس لەسەر بیرۆکەی لێکچوون و بیرۆکەی یەکێتی دروستبوبێت و هەمیشە بوونی جەوهەر و سروشتێکی تایبەت و نەگۆڕ پێشنیاربکات، ئەوا جیاوازی لەم کتێبەدا وەک ئەلتەرناتیڤێک بۆ ئەو چەمکە کاردەکات. واتە جیاوازی لەم کتێبەدا لە شوێنی بیرۆکەی لێکچوون و یەکگرتن کاردەکات، چ لە پەیوەندی ئینسان بە خۆیەوە، چ لە پەیوەندیدا بەوانیترەوە. لەم دیدەدا جیاوازی لەڕووی ئەنتۆلۆژییەوە دەکەوێتە پێش چەمکی شوناسەوە. ئەوەی لە جیاوازیدا گرنگە پێداگرتنە لەسەر پەیوەندی و لەسەر هەڵسوکەوت و پراکتیک، مەسەلەی سەرەکیش تەنها بینینی جیاوازییە گەورە و ڕادیکاڵەکان نییە، واتە تەنها بینینی ئەو جیاوازییانە نییە، کە هەموو کەسێک دەتوانێت بیانبینێت، جیاوازییەک لەپڕێکدا شتێکی تەولو نوێ دروستبکات، بەڵکو مەسەلەی بینینی ئەو هەموو جیاوازییە بچووکانەیە، کە دونیای کۆمەڵایەتی و پەیوەندی ئینسان بەخۆیەوە و بە دونیاوە ڕەنگڕێژدەکات. واتە مەسەلەی بینینی ئەو جیاوازییانەی زۆرجار فیکر نایەوێت وەک جیاوازی بیانبینێت.

ئەم دیدە بۆ جیاوازی داوامانلێدەکات دیدێکی هێجگار جیاوازمان بۆ هەقیقەت و بۆ مەسەلەی باشە و خراپە هەبێت، ئەمەش یەکێکی دیکە لە ڕەهەندە فەلسەفییەکانی ئەم کتێبەیە. ئەوەی ئەم کتێبە بەرگریلێدەکات ئەوەیە، کە نە هەقیقەت و نە باشە و نە خراپە شتگەلێکن نین پێشوەخت و بەکاملی و حازریەدەست بە ئینسان درابن، واتە خاوەنی بوونێکی بابەتی، یان ئۆنتۆلۆژی نین، شتێکنین لۆژیکێکی گریمانکراو بۆ مێژوو، یان زانست، یان خودا، بۆ ئێمەیان

دەستنیشانکرابێت و ئێمە ناچارین پەیڕەویانبکەین، بەڵکو بە پێچەوانەوە پێویستە هەم هەقیقەت و هەم چاکە و هەم خراپە، وەک شتگەلێک تەماشابکەین و ببینین، کە لە میانەی پەیوەندی و دەسەڵات و دیالۆگ و بەرخورد و دانوسان و گۆڕینەوەیەی ئەرگومێنتەوە دروستدەبن، واتە هەموویان ئاکارێکی کۆمەڵایەتی و مەعریفی مێژووییان هەیە. ڕێکەوتن لەسەریان و وەرگرتنیان وەک هەقیقەت، بەشێکە لەو شتەی، کە ئەوانەی کردووە بە هەقیقەت. بێگومان شێوازێکی تایبەتی بەرهەمهێنانی هەقیقەت لە شێوازێکی دیکەیان باشتر و کاریگەرتر و کراوەترە. بۆ نموونە ئەو هەقیقەتەی ئەمڕۆکە پێویستە وەک هەقیقەت بەرهەمبهێنین و مامەڵەی لەگەڵدا بکەین، دەبێت ئەو دروستکراوەبێت، کە دوای گفتوگۆ و گۆڕینەوەی ڕا و بۆچوون و بەرخورد دروستبووە، بەمەرجێک ئەوانەی لەو گفتوگۆ و ڕا و بۆچوون و بەرخوردەدا بەشدارن هەموویان توانا و مافی ئەوەیان هەبێت بە بەڵێ، یاخود بە نەخێر وەڵامی هەموو ئەوشتانە بدەنەوە، کە دەگوترێن و باسدەکرێن، واتە ماف و توانای ئەوەیان پێدرابێت ئەو شتانەی کەباسدەکرێن لە دیدی دیکەی تەولو جیاوازەوە ببینن و بەشێوەیەکی تر لێکیبدەنەوە (Regh & Bohman 2001: 55). بۆ دروستبوونی ئەم دۆخەش بۆ هەقیقەت و ئەم شێوازە لە پەیوەندی، هەمیشە دانپیانی کۆمەڵایەتی بەویتردا پێویستە، واتە مەرجی هەرەگرنگ ئەوەیە ئیعتراف بەو کەسە بکەیت، کە بەشدارە لە گفتوگۆکاندا وەک کەسێکی سەربەخۆ، کە دەتوانێت بەشێکبێت لە پەیوەندیکردنی ئازادانە لە نێوان کۆمەڵێک بکەری جیاوازدا. لەم دیدەدا هەر کردەیەکی مێژوویی، کە ئەنجامدەدرێت، یان هەر پلانێک، کە پێشنیاردەکرێت، ڕەوایەتی خۆیان لە هەندێک هەقیقەتی بابەتی و پرنسیپی موفاریقی دەرەوەی سیاقەکانەوە وەرناگرن، بەڵکو ئەم ڕەوایەتییە لە ڕازیبوون و ڕاگۆڕکێی هەموو ئەوانەوە وەردەگیرێت، کە ئەو پلان و کردانە کاریگەریان بۆسەر ژیانی ئەوان دەبێت. بەمانایەکی دیکە ئەو بەهایانەی، کە بە کارێک ڕەوایەتی

دەبەخشێت بەهای بابەتی نین و بەناوی هەقیقەتێکی بابەتییەوە قسەناکەن، بەڵکو بەناوی هەندێک ڕێکەوتنەوە قسەدەکەن، کە لایەنە جیاوازەکان دوای ڕاگۆڕکێ و بەرخورد و پەیوەندی کراوە و ئازاد پێیدەگەن، ئەو لایەنانەی، کە ئەو جۆرە بڕیار و پلانە کاریگەری لەسەر ژیانیان بەجێدەهێڵێت.

بەم مانایە کتێبی دەسەڵات و جیاوازی کتێبی بەرگریکردنە لە ئینسان و لە کۆمەڵگا، کتێبی بەرگریکردنە لە گفتوگۆ و ڕاگۆڕکێی ئازاد، کتێبی ڕێگرتنە لەدروستبوونی پرۆژەیەک تیایدا ئینسان بێحورمەتی بەرامبەریکرێت، لەباتی ئەو قسەبکرێت و خۆشی بێدەنگ و بێماف بکرێت. ئەم کتێبە کتێبێک نییە بیەوێت هەقیقەت نیشانبدات، چونکە هەر لەسەرەتاوە باوەڕی بەوەنییە، کە هەقیقەت شتێکبێت، نووسەر، یان خەڵک، یان تاکەکەس بگەڕێت بەدوایدا و لەشوێنێکدا بیدۆزنەوە، هەقیەت بەرهەمدەهێنرێت، دروستدەکرێت، دادەهێنرێت، بەڵام لە میانەی ئەو پەیوەندییانەدا، کە ئینسانەکان لەگەڵ یەک و لەگەڵ بیروبۆچوونە جیاوازەکاندا، دروستیدەکەن. ئەم کتێبە هەوڵدان نییە بۆ بەرهەمهێنانی هەقیقەتێکی دیاریکراو، بەڵکو کۆششێکە بۆ دروستکردنی هەلومەرجێکی کراوە بۆ بەرهەمهێنانی هەقیقەت.

-٦-

ئەوەی ئەم کتێبە لە ئاستی ئەخلاقیدا بەرگریلێدەکات ئەخلاقی ڕێزگرتنی جیاوازییە، ئەوەشی لە ئاستی سیاسیدا بەرگریلێدەکات سیاسەتی هاریکاری و بەدەمیەکەوەچوون و بڕیاردانی تاکەکەسی و دەستەجەمعی یاسا بۆدانراوە. لەگەڵ فۆکۆدا باوەڕم بەوە نییە مۆدێلێکی سیاسی هەبێت، کە دواهەمین مۆدێلبێت بۆ

داهاتووی مرۆڤایەتی، باوەڕم بەوە نییە تیۆرەیەکی سیاسی هەبێت وەلامی هەموو پرسیارەکان و هەموو تەحەداکان بداتەوە. بەلام لە ئێستادا باوەڕێکی گەورەم بە کۆمەڵگا و سیستمی دیموکراسی هەیە، باوەڕم بەوە هەیە دەکرێت دونیایەک دروستبکرێت بەشێکی زۆری ئازار و مەینەت و نەهامەتییەکانی ئەمڕۆکەی تیانەبێت. وەک فەیلەسوفی ئەمریکی، ریچارد رۆتی، باوەڕم بەوەیە ستراتیژیەتی ڕاستەقینەی گۆڕانی کۆمەلایەتی ئەوە نییە قسەی گشتی لەسەر گۆڕانی سیستم بکەین، بۆ نموونە بڵێین دەبێت سیستمی سەرمایەداری بگۆڕێت و شوێنی بە سیستمێکی دیکە بگیرێتەوە، ئەوەی من باوەڕم پێیەتی شتێکی سادەتر و واقیعتر و مێژوویتره، من باوەڕم وایە دونیای ئەمڕۆکەی ئینسانەکان دونیایەکە ڕەهەندی جوان و گرنگ و ئینسانی گەورە و فرەجۆری تێدایە، وەکچۆن ڕەهەندی نائینسانی و خراپ و وێرانکەر و دژ بە ئینسانی زۆریشی تێدایە. وێنەی من بۆ ئایندە وێنەی سیستمێک نییە لە ئێستادا وەک ئەلتەرناتیف دروستمانکردبێت، یان دلوای جێگرتنەوەی سیستمێک بە سیستمێکی تر بێت، وێنەی من بۆ ئاییندە وێنەی دونیای ئێستایە، بەلام بە زیادکردن و گەورەکردن و بەهێزکردنی ڕووبەرە جوانەکانی ئەم دونیایە و کەمکردنەوەی ڕووبەرە خراپ و ناشیرین و ترسناکەکانی ئەمڕۆ. ئەمەش مانای ئەوەی من باوەڕم بە ئاییندەیەکە بکرێت کاری بۆبکەین و یۆتۆپیایەکی ڕووت نەبێت. دیسانەوە وەک ریچارد ڕۆرتی دەڵێت، ئەو ئاییندەیە ئاییندەیەکە لە شتە باشەکانی ئەمڕۆ زۆرتر و لە شتە خراپەکانی ئەمڕۆ کەمتری تێدابێت(Rorty 1991: 175). بە زمانی فۆکۆ بدوێم باوەڕم بەوەیە، کە پێویستە کۆمەڵگاکانی ئاییندە کۆمەڵگایەکبن هەیمەنەی کەمتر و کاری پێکەوەیی زیاتری تێدابێت، کۆمەڵگایەکبن ئینسان تیایاندا ئینسانی تر ناچارنەکات دژ بە ویست و حەز و ئیرادەی خۆی شتێک بکات و شتێکی بووێت.

سەرچاوەکان:

1- Ashbery, John (1986). Michel Foucault, Death and the Labyrinth. Cromwell Press, Trowbridge, Wiltshire.
2-Foucault, M (1972). The Archaeology of Knowledge (1969), publ. Routledge.
3-Orwell, George (2004). Why I Write. Penguin Books, London.
4-Rehg, William and Bohman, James (2001). Pluralism and the Pragmatic Turn: The Transformation of Critical Theory, Essays in Honor of Thomas McCarthy. The MIT Press.
5- Rorty, Richard (1991), Essays on Heidegger and Others: Philosophical Papers Volume II, Cambridge University Press.

# لەباتی پێشەکی

-١-

شەڕی ناوخۆ ئەو ڕووداوەیە، کە لەپشتی نووسینی ئەم کتێبەوەیە. بەبێ شەڕی ناوخۆ ئەم کتێبە و بەشێکی زۆری وتارەکانی ناو ئەم کتێبە نەدەنوسران. ئەم شەڕە پرسیاری زۆری لەناو زۆربەی هەرە زۆرماندا ورووژاند، زۆربەمانی تووشی ترس و نائارامی و بێئومێدییەکی گەورە کرد. ئەو وەڵامانەش، کە بەرامبەر بە هۆکار و کاریگەری و ئەنجامەکانی ئەم شەڕە لەئارادابوون، بە قەبارەی پرسیار و گومان و نائومێدییەکانی ئێمە نەبوون. کارەسات و دەرەنجامی کوشندەی شەڕەکانیش لەو لێکدانەوە و ڕاڤەکردنە حیزبی و ئایدیۆلۆژییە سادانە گەورەتربوون، کە لایەنە شەڕکەرەکان و ڕۆشنبیرەکان و ئایدیۆلۆژیستەکانی ئەو شەڕە بە کۆمەڵگای کوردییان دەبەخشی.

شەڕ لە نیشتیمانی ئێمەدا دونیایەک وێراندەکات، کە هێشتا بەشێکی گەورەی پڕە لەو هەوا ژەهرلوی و ترس و هەڕەشانەی بەعس سادەترین ماناکانی ژیانی پێکوشتوە. ئەم شەڕە بە میلەتێکیش دەکرێت هێشتا جەستەی خوێنی برینەکانی ئەنفال و خوێنی زامەکانی شۆڕش و خوێنی ڕاپەڕینی لێدەڕژێت. نەدەکرا بە

لێکدانەوە سادەکان ڕازیبین، نەماندەتوانی باوەڕمان بە پڕوپاگەندەی هەمەجۆری حیزبەکان ببەخشین، گوتاری ڕۆژانەی ناو ئێزگەکان و حەماسەتی بێمانای ناو گۆڤار و ڕۆژنامەکان، نەیاندەتوانی ڕاستی ئەوبیوی تەقاندنی تفەنگەکانمان پێبلێن. بۆ تێگەیشتن لەشەڕ، کە بە پلەی یەکەم تێگەیشتنە لە خودی خۆمان، دەبوایە وردتر بڕوانین و قووڵتر بەدوای ماناکانی جەنگ و میکانیزمە جەهەنەمییەکانیدا بگەڕاینایە، دەبوایە دابەزینە ناو تاریکستانی مێژوو و کولتور و سیاسەتی کوردیی خۆیەوە و بۆ تێگەیشتن لە شەڕ بەر لە هەموو شتێک ئەو حەرامە سیاسی و کولتوری و سۆسیۆلۆژییانە بپشکنین، کە لەناوەوەڕا ڕۆح بەبەر شەڕ و تەقاندنی تفەنگەکاندا دەکەن. گەر کەسانێک هەبن بتوانن بۆ هەندێک لە خراپەکاری ناو جومگە تاریکەکانی مێژووی کوردی بڕێک لە شەرعیەت بدۆزنەوە، ئەوا شەڕی ناوخۆی نەوەدەکانی سەدەی بیستەم لە کوردستاندا، لەدەرەوەی هەموو شەرعیەتێک و هەموو ئەخلاقیەتێک و هەموو عەقڵانیەتێکی سیاسیدا بوو.

تێگەیشتن لە شەڕی ناوخۆ هەنگاوێکی گرنگی تێگەیشتنە لە خودی خۆمان و لە کۆمەڵگای کوردی و لەو پاڵنەر و هۆکارانەی دونیای ئێمە لە ناوەوەڕا بەرەو پێکدادان و بە ئاراستەیەکی دیاریکراوی گەشەکردنی ڕوودلوەکاندا دەبات. شەڕی ناوخۆ لە چەند ساڵی ڕابردوودا نیشاندەری ئەو ڕاستیەیە، کە کۆمەڵگای ئێمە بە گشتی و کایەی سیاسی کوردی بەتایبەتی تا سەر ئێسقان نەخۆشن، بەبێ ناسینی هۆکارەکانی ئەو نەخۆشییە و بەبێ دۆزینەوەی ڕێگاچارەی گونجا و بۆ دەرچوون لەو هەلومەرجە نەخۆشە، ناتوانین قسە لە چاکبوونەوەیەکی ڕاستەقینە بکەین.

ئەو گەلەی ڕابردووی خۆی نەناسێت و تێنەگات بۆ لە ناو مێژوویەکی نەخۆشدا ژیاوە و دەژی ناتوانێت لەدەرگای هیچ ئاییندەیەک بدات، بۆ ئەوەی دەرگاکانی ئاییندە بکەینەوە دەبێت شوراکانی ڕابردوومان ڕووخاندبێت. ئێمە میللەتێکین لە ساتەوەختێکی مێژوویی واوە گلاوین، کە شەڕ بەشێکە لە پێکهاتە ناوەکییەکەی،

تێپەڕاندنی ئەو ساتەوەختە و گواستنەوە بەرە و زەمەنێکی تەندروست، بەبێ ناسینی ئەو ڕابردووە مەحاڵە. لەڕاستیدا ئەو ڕابردووە شەڕانگێزە ئەوەندە نزیکە دەشێت هەمیشە وەک بەشێک لە ئێستا مامەڵەی لەگەڵدا بکەین و لە خوێندنەوەی ڕووداوەکانیدا قسە لە "مێژووی ئێستا" و لە ئامادەگی ئەو قورساییە مێژووییە لەناو ئێستادا بکەین. "مێژووی ئێستا" مێژوویەکە ئامادە لەناو جومگە گرنگەکانی دونیای ئێمەدا و لەناو هەناوی ئەو ڕووداوانەدا، کە لەئێستادا لەدەرگای واقیع و لەدەرگای "هەنووکەیی بوونی" ئێمە ئەدەن. لەم ڕووەوە من وای بۆ دەچم پێویستمان بە هێنانەکایەی گفتوگۆیەکی زیندو و زانستی هەمەلایەن و لەسەرخۆ هەیە دەربارەی هۆکار و دەرەنجامەکانی شەڕی ناوخۆ، پێویستمان بە خوێندنەوەیەکی وردی مێژوویی ئەم چارەکە سەدەیەی دوایی و ڕووداوە گەورە و بچووکەکانی ناو ئەم مێژووە هاوچەرخەیە، کە پڕە لە شەڕ و پێکدادانی کورد لەگەڵ کوردا. دەبێت نەترسین و بەچاوێکی کراوەوە تەماشای ئەو مێژووە و ڕوودلوە خوێناوییەکانی بکەین، بۆ ئەم مەبەستە پێویستمان بە بونیادنانی دەزگای تایبەت بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوویی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی و سایکۆلۆژی و ئابووری کۆمەڵگای خۆمان هەیە. دەبێت لێکۆڵینەوەی ئەو فەزا سیاسی و کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژی و کولتورییەی شەڕ بەرهەمدێنێت، ببێت بە بەشێک لەو وانانەی لە زانکۆکاندا دەخوێندرێن و لەم ڕووەوە کادری لێزان و قوتابی زیرەکی بۆ تەرخانبکرێت. بەبێ ئەم ناسینە هەمەلایەن و فرەڕەهەندە ناکرێت باس لە ئاشتییەکی جێگیر و باوەڕپێکراو بکەین.

ئەم کتێبەی لە بەردەستی خوێنەراندایە هەنگاوێکی سەرەتاییە بۆ خوێندنەوەی ئەو فەزایەی باسمکرد، هیوادارم لە ئاییندەدا چەندان کتێب و وتاری دیکە لە دید و بۆچوون و میتۆدین جیاواز لەوەی ئەم کتێبەوە بنووسرێت و هەریەکێک بەپێی توانا بەشێک لەم تاریکستانە ڕووناک بکاتەوە. بەڵام بێگومان بەبێ موزایەدەی

سیاسـی و بەڕۆحێکـی ڕۆشـنبیریی بەرپرسـیارەوە، کە بەپـلەی یەکەم هەوڵـی بنیادنانی دونیایەکی تەندروست بۆ خۆمان و بۆ نەوەکانی دوای خۆمان، ئاراسـتەی بکات.

-٧-

لەگەرمەی شـەڕەکاندا مـن قوتـابی بەشـی زانسـتە سیاسـییەکان بـووم لە زانکـۆی ئەمستەردام لە هۆڵەندا، ئەو مامۆستا و دۆست و شارەزایانەی کوردیان دەناسی بە سەرسـامییەوە سـەبارەت بەم شـەپۆلە تـازەیەی شـەڕی کـورد لەگەڵ کـوردا، پرسیاریان لێدەکردم و دەیانویست لەوە تێبگەن بە چ مانا و لۆژیکێک کورد خـۆی خوێنی خۆی دەڕێژێت و خۆی دونیای خۆی بەسەرخۆیدا وێراندەکات. من زۆرجـار بێدەنگ دەبووم و نەمدەزانی چ وەڵامێـک بدەمەوە. ئەو بێدەنگییەشـم پڕپڕبـوو لە شـەرم، شـەرم لەو مێـژووە ناشـیرینەی لەو سـاتەدا تفەنگـی کـورد دژی کـورد لاپەڕەکانی دەنووسیەوە. پرسیارەکان تا دەهاتن زیاتر دەبـوون و منـیش تادەهـات بێـدەنگتر و شـەرمنتر دەبـووم لەبەردەمیانـدا، تـا ئەوکـاتەی کوردسـتان بـووە سەرزەمینی داوەتکردنی دەبابەکانی بەعس و لەشکرکێشی ئایەتوڵاکان. لەو کـاتەدا بۆ یەکەمینجـار تێگەیشـتم بـزوتنەوەی سیاسـی کـوردی چـۆتە قۆنـاغی شـکاندنی هەموو شەرمێک و وێرانکردنی هەموو ئەو تابو و حەرامانەی هەر بزاوتێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی بۆ پاراستنی شەرعیەتی خۆی، پێویستی پێیەتی.
بەشێکی زۆری ئەم نووسینانە بەرهەمی کۆتاییهاتنی ئەو شەرمە و کۆتاییهاتنی ئەو سڵەمینەوانەیە، کە نەیدەهێشت دیوە جەهەنەمـی و شـەیتانییەکەی ناسـیۆنالیزمی کوردی لە ساتەوەختی ئێستایدا ببینین. ئەم کتێبە تا ڕادەیەکی زۆر بەرهەمـی ئەو

قۆناغی کۆتایهاتنی شەرمەیە، بەرهەمی تەماشاکردن و ڕاڤەکردنی ڕووداوەکانە بەبێهیچ سانسۆرێکی مەعریفی و سیاسی دەرەکی. لێرەوە ئەم کتێبە چاوەڕوانی ئەوەنییە هەمووان ئافەرینی لێبکەن، هەروەها باکی بە توڕەبوونی زۆرانیش نییە، ئەم کتێبە هەوڵدانێکە بۆ دواندن و قسەکردن، مافی بوونیشی لە مافی دواندن و قسەکردنەوە هەڵدەهێنجێت، ئەگەر سیاسەتی کوردی لەدوای ڕاپەڕینەوە لە هێڵە گشتیەکانیدا کوردستانی کردبێتە وێرانەیەکی مادی و سیاسی و ئەخلاقی، ئەوا یەکێک لە ئەرکە سەرەکییەکانی ڕۆشنبیران ئەوەیە باس لە دەرکەوت و ڕووخسار و ڕەهەندە جیاوازەکانی ئەو وێرانەیە بکەن. حیزبە کوردییەکان چەند مافی وێرانکردنی ئەم نیشتیمانەیان بە خۆیان بەخشیوە، بە هەمان ئەندازە ئێمەش مافی ئەوەمان هەیە باس لە ئینسان و خەون و حیکایەتە کوژراوەکانی ناو ئەو وێرانەیە بکەین. ئەم کتێبە هەوڵدانێکی تیۆری نووسینەوەی حیکایەتە کوژراوەکانی ناو ئەو جەهەنەمەیە، نەک باسکردنی مژدەی ئەو بەهەشتانەی ئەم بزوتنەوەیە بە میللەتی ئێمەی دەدات. بێگومان لەدوای ڕاپەڕینەوە هەندێک شتی باش لە کوردستاندا کراوە، بەڵام کێشەکە لەوەدایە هەم شەڕی ناوخۆ و هەم بەکردەوە دابەشکردنی کوردستانی عێراق بۆ دوو پارچەی لێکجیاواز، هەموو شتەکانی دیکەی داپۆشیوە. ڕەنگە بۆ هەندێک کەس من لەهەندێک شوێندا زیاد لەپێویست پێمداگرتبێت و زیاد لەپێویست ئاشکرا قسەمکردبێت، لەوەڵامی ئەمەدا ئەڵێم هیچ شتێک لە کوردستاندا بەقەد شەڕی ناوخۆ و داوەتکردنی داگیرکەرە جیاجیاکان بۆ ناو بێشەی برین و خوێن و خەونەکانی ئێمە ئاشکرا نییە، پێشموایە تا ئاشکرا قسە نەکەین و ڕاستەوخۆ کێشەکان نەناسێنین، زەحمەتە ڕێگاچارەیەک بۆ دەربازبوون لەو کێشانە بدۆزینەوە. ئێمە میللەتێکین کاتی چاوەڕوانی درێژمان لەبەردەمدا نییە، یان ئەوەتە ڕاستەوخۆ خەریکی چارەسەری کێشەکانمان دەبین، یان ئەوەتە دەبێت خۆمان یاسینی خۆمان بخوێنین.

لە ژێر سێبەری ئەو ڕاستییانەدا ئەم کتێبە هەوڵدانی دەرچوونە لەو شێوازە شەرمنەی لێکۆڵینەوەی سیاسی، کە دیاردەکان تەنها لە مانا سیاسیە سادەکانیاندا دەبینێت و یەکەمین و دواهەمین حوکمی لە بە پاڵەوانکردنی لایەنێک و بە خائینکردنی لایەنێکی دیکەدا بەرجەستە دەکات. لەهەمانکاتدا ئەم کتێبە هەڵگری جۆرێک لە دڵڕەقیشە بەرامبەر بە خۆمان، بەتایبەتی بەرامبەر بە عەقڵانیەتی سیاسی باڵادەست لە کوردستاندا، کە بەردەوام کارەساتی گەورە و نەهامەتی فرە لایەن بەرهەمدێنێت.

بۆمن زۆرگرنگ بوو لە سروشتی ئەو دەسەڵاتە تێبگەم، کە لەپشتی شەڕەکانەوە ئامادەیە. بۆ ئەم مەبەستە دەبوایە زۆر بە وردی لە کۆمەڵێک ڕەهەندی گرنگی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی ڕابمێنم، کە پێموایە پەیوەندییەکی بەهێزیان بە شەڕ و پێکدادانەکانی ناو مێژووی هاوچەرخی ئێمەوە هەیە. لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە لێکدانەوەی "بونیادی کۆمەڵایەتی" کۆمەڵگای کوردی و لە ڕووی سیاسیەوە دروستبوون و سەقامگیربوونی "کایەی سیاسی" کوردی و لە ڕووی فەرهەنگییەوە لەو دەزگا چەمکییە ڕابمێنم، کە ئەم دەسەڵاتە بۆ پایەداربوونی خۆی دەیانخاتەگەڕ. لێرەوە بۆ نموونە هەم بە "پەیوەندیەکانی خزمخواهی" وەک پەیوەندی کۆمەڵایەتی و هەم بە "دابەشبوونە سیاسیەکانی" ناو کایەی سیاسیدا و بە چەمکی "یەکگرتن" دا، وەک گرنگترین چەمکی سیاسی ناو کولتوری سیاسی کوردی، چوومەوە.

لەپاڵ ئەمانەشدا دەبوایە تەماشای ئەو گۆڕانە کۆمەڵایەتییانە بکەم، کە لە دوای ڕاپەڕینەوە لە نەخشەی سۆسیۆلۆژی کۆمەڵگای ئێمەدا ڕوویداوە، بڕوانمە ئەو میکانیزمە ئابووری و کولتوری و سیاسییانەی حیزبە کوردیەکان لەدوای ڕاپەڕینەوە لە وڵاتی ئێمەدا پیادەیانکردووە بۆ پاراستنی پایەداری ئەو گروهە سۆسیۆلۆژیە نوێیە، کە لەڕێگای سیاسەتەوە دروستبووە. جگە لەمانەش دەبوایە تەماشای ئەو

گوتارە چەپێنراو و بێدەنگکراوانە بکەم، کە ڕۆشنبیری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەدەبی ئێمە بەردەوام پەراوێزیان کردون و بەمەش هەلی بەرهەمهێنانی جۆرێکی تری ڕاستی و هەلی بەرهەمهێنانی سیاسەتێکی تری بەرهەمهێنانی هەقیقەتیان لەناوبردووە.

ئەم خاڵەی سەرەوە بەرەو قسەکردن لەسەر بابەتی دووەمی ئەم کتێبەم دەبات، کە بیرۆکە، یان چەمکی جیاوازییە. ئەگەر شەڕ، هەمووشەڕێک، پێکەوە هەڵنەکردنی دوو جیاوازبێت بەیەکەوە، ئەوکات گرنگیدان بە جیاوازیی و ناساندنی وەک چەمکێکی کولتووری و سیاسی دەبێتە بەشێکی دانەبڕاوی هەوڵدانی تێگەیشتنی بنەما کولتوریەکانی شەڕی ناوخۆ. لە خوێندنەوەی وتارەکانی ناو کتێبەدا خوێنەر ئەوەی بۆ ئاشکرائەبێت چەمکی جیاوازیی بە شێوەیەکی ئاشکرا و نائاشکرا لە هەموو وتارەکاندا ئامادەیە و یەکێکە لەو چەمکە سەرەکیانەی پایەکانی کتێبەکەی لەسەر بیناکراوە. دواهەمین وتاریش ڕاستەوخۆ تەرخانە بۆ لێدوان لەم چەمکە لەناو ئەخلاقناسی هاوچەرخ لە بیری فەلسەفی ڕۆژئاواییدا.

هیوادارم ئەمە کتێبە سەرەتایەکی تەندروستبێت بۆ گفتوگۆکردنێکی هێمن و لەسەرخۆ دەربارەی شەڕی ناوخۆ لە کوردستاندا و هەنگاوێکیش بێت بەرەو لەڕەگ و ڕیشەوە هەڵکەندنی ئەم دیاردە وێرانکەرە. مافی خۆمانە خەون بە نیشتیمانێکی ئارام و ئاسودە و بێشەڕەوە ببینین.

مەریوان وریا قانیع

ئەمستردام ١٩٩٩

# شەڕی ناوخۆ

## فێڵ ـ میزب ـ سیاسەت

-١-

ئایا شەڕی ناوخۆ، شەڕی وێرانکردنی ماڵی خۆمان بە دەستی خۆمان، شەڕی خوێنڕشتنی برا بۆ برا و دراوسێ بۆ دراوسێ و شار بۆ شار و ناوچە بۆ ناوچە لەکوێوە دێت؟ ئەم (با) ئەهریمەنییە لەکوێوە هەڵدەکات و فوو بە چرای داگیرساوی ناو ڕەفە و تاقەکانی مێژوومانەوە دەکات؟ ئەم وزە تێکدەرە چییە لە هەناوی مێژووی ئێمەوە بە بەرەدەوامی دێتەدەرەوە و پرۆژەکانی خۆمان بە دەستی خۆمان، بەر لە دەستی دوژمنەکانمان، وێراندەکات؟ چییە ئەم "نەگۆڕە"، کە ساڵ دوای ساڵ و ڕۆژ دوای ڕۆژ لەگەڵمان دێت و لە مێژووماندا چەندبارە دەبێتەوە؟

لەکوێوە دەست بەوەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە بکەین؟ لە تاوانبارکردنی دراوسێ ـ دوژمنەکانمانەوە، یان لەبێمتمانەیی هێزە ناوچەیی و نابەرپرسیارێتی هێزە نێودەوڵەتییەکانەوە؟ ئایا بۆ تێگەیشتن لە جەنگی ناوخۆ ئەوەندە بەسە بڵێین لەپشتی ئەم جەنگەوە بەغدا و ئەنقەرە و تاران و دیمەشق وەستاون و، عەرەب و

تورک و فارس لێناگەڕێن ماڵی خۆمان وەک چۆن خۆمـان دەمانەوێت ڕێکخەیـن و لەناویدا وەک زۆربەی گەلانی تری سەر ئەم ئەستێرەیە بە ئاسودەیی بژین؟ ئایا تەنیـا دەسـتی سـەدام حوسـەینەکان، ڕەفسـنجانیەکان، تشـیلەرەکان و ئەولنیتـر خۆشکەری ئاگری ئەم جەنـگەن، یـاخود جەنـگ هۆکـاری دیـکەی هەیە و بەتەنیـا ناتوانرێت لەپاڵ ئەم تاوانبارکردنە دەرەکییانەدا بخوێندرێتەوە؟

لە ماڵی خۆشماندا، ئایا ئەوەندە بەسە یەکتـری بە تـاوانی هەڵگیرسـاندنی جەنـگ مەحکومبکەین؟ ئایا جەنگ بڕیاری ئەم سەرکردە، یان ئەو سەرکردە بە تەنیا، ئەم حیـزب، یـان ئەویـدی، بەرژەوەنـدیی ئەم گروپـی سیاسـی، یـان هـی ئەویـدیکە، دەیخولقێنێت؟ بەمانایەکی دیکە، ئایا جەنگ تەنها بڕیاری ئەو بوونەوەرە نەخۆشـە دەیخولقێنێت، کە ناوی "سیاسـیی کـورد"ە، یـان دەشـێ خـودی ئەو بـوونەوەرە و بڕیارەکانیشـی ڕەگەزێکـبن لەڕەگەزەکـانی نـاو بونیـادێکی سۆسیۆسیاسـی و پێکهاتەیەکی ڕەوشـتی و کولتـورێکی سیاسـی نەخـۆش، کە کـۆی کـارکردنی ئەو بونیـاد و پێکهـاتەیە بەسـەریەکەوە، جەنـگ وەک بەرهەمێـک لە بەرهەمەکانیـان، تورڕەدلتە ناو دونیای ئێمەوە؟

ئایـا ناشـێ پێکهـاتەی کـۆمەڵایەتی ئـێمە و بونیـادی پەیوەنـدی هێـزە سۆسیۆلۆژییەکانی ناو ئەو پێکهاتەیە فـاکتەرێکی گرنگـی بەرپـابوون و تەقینـەوەی جەنـگ و سـەرلەنوێ بەرهەمهێنـانەوەی بێـت؟ ئایـا ناشـێ چەنـد ڕەهەنـدێکی دیاریکراوی کولتوریی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئێمە لە پێناسـەکردنیاندا بۆ کـۆمەڵێ چەمکـی گرنگـی وەک "جیـاوازی" و "لێبـوردن" و "یەکـدی قبـووڵکردن"، کە هاوسەنگی پەیوەندییەکان و ئارامبوونیـان ڕادەگـرن و جـۆرێکی تـایبەت لە بەهـا و نۆرم و ئەخلاقـیەت بەرهەمـدەهێنن، وەک فـاکتەرێکی دیـکەی گرنگـی بەرپـابوونی جەنگ تەماشابکەین؟ ئایا ناکرێ "کـایەی سیاسـیی کـوردیی" خـۆی، لە ڕۆژگـاری دروسـتبوون و پەیـدابوونیەوە و بەدرێژایـی قۆنـاغە جیاجیاکـانی دوای

دروستبوونەکەی، هۆکارێکی دیکەی بەتەقە هێنانی تفەنگەکان بن؟
بە کورتی ئایا جەنگ لەدەرەوەڕا دێت و بەسەر جەستەی سیاسی و کۆمەلایەتی و فیکریی ئێمەدا دەسەپێنرێت، یان دەشێ خودی ئەم جەستەیە هەلگری ڤایرۆسی جەنگ و ڤایرۆسی مالی یەکدی وێرانکردن و هەپروون بە هەپروونکردنی پرۆژە کۆییەکانی ئێمەبێت؟ ئایا ناشێ ئەو دەستە ناییارانەی لەهەناوی مێژووی خۆمانەوە دێنەدەر، بەهەمان ئەندازەی دەستە پیلانگێڕە دەرەکییەکان تێکدەر و جەنگهێنەرین؟ تەواو سادەتر بدوێین دەپرسین: ئایا جەنگ بەری پیلانە دەرەکییەکانە بەتەنیا، یاخود دەشێ لەسەرێک لەسەرەکانەوە بەرئەنجامی پیلانە ناوەکییەکانیش بێت؟
لەڕاستیدا ئاسانترین و نابەرپرسیارترین وەلام بە پرسیاری جەنگ لەکوێوە دێت ئەوەیە، کە تەنیا و تەنیا "ئەوانیتر"، تەنیا دوژمنەکان و دونیای دەرەوە بەهۆکاری تەقینەوەی ناکۆکییەکان، بۆ ئاستی فیشەک بەیەکدییەوەنان، تێبگەین. ڕاستە دوژمنان هەمیشە و هەردەم لەودیوو پەنجەرەکانەوە وەستاون و بۆن بەمالەکانمانەوە دەکەن. ڕاستە ئەوان لەودیو دەرگاکانەوە سەرقالی پیلانڕێژی و ئاژاوەگێڕی و خۆئامادەکردنن. ڕاستە ئەوان چاوەڕێ و خەریکی کردنەوەی دەرگاکان و پەنجەرەکان و کلاوڕۆژنەکانن، عەودالی دۆزینەوەی کونێک، کەلەبەرێک، درز و شەبەنگێکن، بۆ هاتنەژوورەوە و جێبەجێکردنی پیلانە هەمیشەییەکانیان ـ لە سزادانی دەستەجەمعی سادەوە بۆ جینۆسایدکردن ـ ڕاستە ئێمە لەناو کۆمەلێ هاوکێشەی سیاسی ناوەکی و ناوچەیی و نێودەولەتیی ئێجگار سەخت و ئالۆزدا دەژین و لەدونیایەکدا بەدوای ئازادی و مافی خۆماندا دەگەڕێین، کە دەستە نەوتاوییەکانی سەدام حوسێن و ڕیشی ئایەتولا خومەینی، لەخوێنی منالانی ئێمە و خوێنی مێژوو و خوێنی نیشتمانی هەنجن هەنجنکراومان، بەنرختر و گرانبەهاترن. بەلام هەموو ئەمانە بەرپرسیارێتی خۆمان، بەرپرسیارێتییەکی

گەورەش، لەبەرپابوونی جەنگە ناوخۆیی و بەردەوامەکانی خۆمان و ئامادەکردنی زەمینەی بەردەوامی تەقاندنەوەی ناکۆکیەکان و خولقاندن و بەخشینی فرسەتی سووک و ئاسان و کاڵفامانە بەدوژمنان، ناشارێتەوە.

بە بۆچوونی من، بۆچوونێک لەدرێژایی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا لایەنە جیاجیاکانی ئاشکرادەبێ، جەنگ لە دونیای ئێمەدا چەند لە دەرەوەڕا و لە ڕێی پیلانی دوژمنان و هێزە دژەکوردییەکانەوە دێت، ئەوەندەش لە ناوەوەڕا بونیاد و ژینگەیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فیکری و ئەخلاقی و فەرهەنگی و سایکۆلۆژی هەیە، کە نەک دژی ئەو مۆتیڤە دەرەکییانە کارناکەن و هەوڵی پەکخستنی پیلانەکان نادەن، بەڵکو بەپێچەوانەوە وزە و توانا و زەمینەیەکی لەباریشیان بۆ دەرەخسێنن و پرۆسەی جێبەجێکردن و پیادەکردنی ئەو پیلانانەش خێراتر و ئاسانتر و هەمەلایەنتر دەکەن. پیلانەکان لە دەرەوەڕا دێن، لە بەغدا و ئەنقەرە و تاران و شوێنانی تروە پۆستدەکرێن، بەڵام گرفتی سەرەکی لەوەدایە، کە دونیای ئێمە لە ئاستی جیاجیادا، لەکولتورەوە بۆ سیاسەت، لە بونیادی پەیوەندییەکانەوە بۆ بونیادی زەین، لە مەعریفەوە بۆ دەسەڵات، پڕن لەو پۆستەچییانەی ئەو پیلانانە بەسەر جەستەی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئێمەدا بڵاودەکەنەوە. ئەڵبەتە ئەو پۆستەچییانە بەتەنیا کۆمەڵێ مرۆڤی بەکرێگیراو و خۆفرۆش و لایەنی سیاسیی ترسنۆک و سازشکەرنین، بەڵکو لەپێش هەموو شتێکەوە کۆمەڵێ کۆنسێپت و میکانیزمی گۆڕانی کۆمەڵایەتی و بونیادێکی سۆسیۆلۆژی و پێکهاتەیەکی کولتوری و کۆمەڵێک کایە و عەقڵیەتێکی سیاسی و تێگەیشتنێکی دیاریکراو بۆ چەمکەکانی دەسەڵات و مەعریفە و پێکهاتەیەکی رەمزی و فانتازیایی و سایکۆلۆژییە بەسەریەکەوە، کە خودی ئەو کەسە خۆفرۆش و لایەنە ترسنۆک و سازشکارانە، ئاستێک لە ئاستەکانی کارکردن و دەرکەوتێک لە دەرکەوتەکانی کۆی کارکردنی ئەو پێکهاتە نەخۆشەن بەسەریەکەوە.

بەکورتی بۆ ئەوەی لە جەنگی ناو ماڵ و شار و ناوچەکانی خۆمان تێبگەین، ئەوە بەس نییە تەنیا دوژمنە دەرەکییەکانمان تاوانبارکەین، تەنیا پیاوانی ئەوبیو پەنجەرەکان و پیلانە هەمیشەییەکانیان بە تاقە بکەر و تاقە هۆکاری بەرپابوونی جەنگ بزانین. بەپێچەوانەوە کاری سەرەکی ئەوەیە هۆکارە ناوەکییەکانی جەنگ، ئاستە جیاجیاکانی بەرهەمهێنانی، جوومگە تاریک و نەناسراوەکانی، ڕەگەکانی لەناو عەقڵیەتی سیاسیدا، بە کورتی ڤایرۆسەکانی ناو واقیعی کوردی خۆی بدۆزێنەوە. تاهیچ نەبێت بتوانین ژینگەیەکی ناوەکی تەندروستی وا دروستبکەین، کە پیلانە دەرەکییەکان نەتوانن لە ناویدا بژین و ئازادانە هەناسەبدەن. خوڵقاندنی ئەو ژینگەیە یەکەمین هەنگاوی ڕاستەقینەی ئێمە دەبێ بە ڕووی قەبراندنی جەنگی ناوخۆ و دەرئەنجامە کوشندەکانیدا، دەنا هەموو ڕێکەوتنە سەرزارەکییەکان، هەموو ماچە درۆزنانەکان، هەموو ئیمزا نائومێدەکانی سەر ڕێکەوتنامە وەهمییەکان، جگە لە سوڕانەوەیەکی بێسەمەر بە دەوری پیلانەکانی جەنگدا، جگە لە خۆڵەمێشکردن بەچاوی یەکدیدا، شتێکی دیکە نییە و شتێکی دیکەشی لێ چاوەڕوان ناکرێت.

-٣-

کە دەڵێین هۆکارە ناوەکییەکانی جەنگ وابەستەی بونیادێکی سۆسیۆلۆژی و کۆمەڵێ کۆنسێپت و میکانیزمی فیکری و کولتوری و کایەیەکی سیاسی دیاریکراو و بونیادێکی عەقڵی و مەعریفی و پێکهاتەیەکی ڕەمزی و فانتازییە، ئەمە بەو مانایە نییە ئەم هۆکارانە کۆمەڵێ هۆکاری سەد دەرسەد سەربەخۆبن و بەتەواوی لە دەرەوەی دەسەڵات و وشیاری و ئەزموونەکانی مرۆڤدا ئامادەبن. بەمانایەکی دیکە مەبەستم نییە بڵێم ئەو هۆکارانەی سەرەوە کۆمەڵێ هۆکاری بابەتین و دواجار

جەنگ لەو دونیا بابەتییەوە دێت و بڵاودەبێتەوە و وزەی شێوێنەرانەی خۆی لە دونیای ئێمەدا بەرەڵادەکات، نەک لە کۆمەڵێ بڕیاری تایبەت و ویستی سیاسی دیاریکراوەوە، کە ئەم سەرکردە، یان ئەوی دی، ئەم گروپ، یان ئەوی دی، دەریدەکەن. ئاشکراتر دەڵێم، بە "بونیادگەراکردنی" کێشە و گرفتەکان بەو مانایە نییە، کە بونیادەکان تەواو سەربەخۆ و ئۆتۆنۆم، لەدەرەوەی وشیاری و ویست و ئیرادەی کەسەکاندا، کاردەکەن. سونەتێ، کە بونیادگەری لە چاپە "شتراوس" یە "لاکان" یە "ئەلتوسێر" یەکەیدا پێشنیاریدەکات.

مەسەلەی بەبونیادگەراکردنی ئەم کێشانە لەوێوە سەرچاوەدەگرێت، کە جەنگ وەک دەرئەنجامی کۆمەڵێ پەیوەندی دیاریکراوی ناو بونیادێکی تایبەتی هێز و دەسەڵات و مەعریفە ببینین، نەک وەک دەرەنجامی بڕیارە سیاسییەکان بە تەنها. واتە ناتوانین جەنگ بەتەنها وەک "مەبەستگەرایی" تاکێک، یان کەسێک تەماشابکەین و هەموو ئەو ڕەگەزە بونیادییانە فەرامۆشکەین، کە نادیارانە ئاگری جەنگ لە نیشتمانی ئێمەدا خۆشدەکەن. ناکرێ جەنگ تەنهاو تەنها بە مەبەستگەرایی کەسێک، یان گروپێک، یان حیزبێکەوە گرێبدەین و هەوڵدەین لەوێوە بیناسێنین و ڕاڤەیبکەین و شیبکەینەوە. بەمەبەستگەرایی کردنی جەنگ دەشێ هەندێک ڕاستی و ڕوویەک لە ڕووەکانی جەنگ و ڕەهەندێک لە ڕەهەندەکانی بەرپابوونی ئاشکراکات. دەشێ پێمان بڵێت ئەم حیزب، یان ئەوی دیکەیان، لەفڵانە مەسەلە و لە فڵانە ڕۆژ و لە فڵانە پێکداداندا خەتابارتر و تاوانبارترە لەوی دیکەیان. دەشێ بڵێین فڵان ڕووداو فڵانە کەس، یان گروپ، یان دەستە کەم تازۆر لێیبەرپرسیارە، نەک فڵان، یان فیسار حیزب، بەڵام با ئەوەمان لەیاد نەچێت ئەم مەبەستگەراییە هەرگیز ناتوانێت کۆی ئەو هۆکارە نادیارانە ببینێت، کە لە ناوەوەڕا مەبەستەکان بەرهەمدەهێنێت و پیلانەکان دەچێنێت و زەمینەی جەنگ و تەقاندنەوە هەمیشەییەکان دووبارە و دەبارە خۆشدەکاتەوە. بەداخەوە بە

مەبەستگەرالییکردنی جەنگ و دیتنی لە دیدێکی فینۆمینۆلۆژییەوە، تاقە لێکدانەوە و ڕاڤەکردنی باڵادەستی ئەم دیاردەیەیە، هەم لەناو ڕۆشنبیرانی ئێمەدا و هەم لەلایەن حیزبە سیاسییە کوردییەکان خۆیانەوە. بە بۆچوونی من ئەمجۆرە لێکدانەوەیە لێکدانەوەیەکی نوقسان و ناتەولوە و ناتوانێت زۆربەی ڕاستییەکانمان پێبڵێت و جەنگ وەک بەرهەمی بونیادێک، لە پەیوەندیدا بەکارکردنی مرۆڤەکانەوە لەناویدا، بناسێنێت و میکانیزمەکانی بەرپابوونی دەستنیشانکات.

وەک وتمان ئەگەر بەبونیادگەراکردنی کێشەکان بەو مانایە نەبێ، کە ڕۆڵی ئینسانەکان لەپلەی بەتەقاندنەوە گەیاندنی کێشەکاندا بسڕێتەوە؛ واتە بەو مانایە نەبێت، کە ئالتوسێر باس لە "لەبەرکردنی تاکەکەس بۆ بونیادەکان" دەکات و تاکەکان بە جەبری بونیادەکان مەحکوم دەکات.، یان بەو مانایەی گوایە "مێژوو لەدەرەوەی زاتەکاندا دروستدەبێت" و خودی ئینسانەکان جگە لە قبوولکردنی یاسا و جەبری بونیادەکان هیچ ڕۆڵێکی دیکەیان نییە، ئەوکات دەشێ بەساکاری بپرسین ئەی باشە چۆن لە بەردەوامی بەرپابوونی جەنگ و بە "نەگۆڕ" مانەوەی لە مێژووی ئێمەدا تێبگەین؟ ئەگەر جەنگ لە سەردەمانێکی دوورەوە، کە دەشێ بە شەڕی نێوان میرنشینە کوردییەکانی سەدەی نۆزدەهەم دەستپێبکەین، بەشێکی "نەگۆڕ" بووبێت لە مێژووی ئێمە، ئایا ئەمە ئەوە ناگەیەنێ، کە کەسەکان لێی بەرپرسیارنین و بونیادەکان دەیخولقێنن، یان دەیسەپێنن؟ ئایا ئەمە ئەوە ناگەیەنێ ئەو کەسانەی بەشەڕدێن خۆیان قوربانییەک لە قوربانییەکانی بونیادەکانن و جەبرێک، جەبری مێژوو، لە دەرەوەڕا تفەنگەکانیان پێدەتەقێنێت؟ وەک پێشتریش هێمامان پێکرد، نە چەمکی بونیاد و نە مەسەلەی بەبونیادگەراکردنی کێشەکان لەم باسەدا بەم مانایە بەکارنەهاتووە و هەرگیز ناکرێت لەژێر بەهانەی بەبونیادگەراکردنی ئەو کێشانەدا، مەسەلەی بەرپرسیارێتی ئەو سەرکردە و کەس و حیزب و گروپانە فەرامۆشکرێت، کە خاوەنی دواهەمین بڕیاری بەتەقە خستنی تفەنگەکانن. ئەی

کەوایە مەبەستمان لە بیرۆکەی بە بونیادکردنی جەنگ چییە؟
مەسەلەی بە بونیادکردنی جەنگ و دووبارەبوونەوە و بەردەوامبوونی لە مێژووی ئێمەدا لەم باسەدا بەمانای "سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەیەتی لەزەمەندا" دێت، سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی کوشتار و خوێنڕشتن و پەلامارەکان لە ساتە مێژووییە جیاوازەکاندا. بەڵام داخۆ مەبەستمان لە دەستەواژەی "سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوە" چییە؟ مەبەست لەم دەستەواژەیە ئەوەیە کۆمەڵێ هێز و تێڕوانین و عەقڵییەت لە مێژووی ئێمەدا دەستبەکار و ئامادەن، کە کێشەکانی دوێنێ بەهەمان ناوەڕۆک و بەهەمان ئاراستەوە لەمڕۆدا بەرهەمدەهێننەوە. ئەم هێزانە واقعێک دووبارە و دەبارەدەکەنەوە، کە ئەرکی سەرەکی ئەوان گۆڕین و تێپەڕاندن و تێکشکانی ڕەگەزە "نەگۆڕ" و دووبارەبووەوەکانییەتی. لێرەوە بەبونیادگەراکردنی ئەو کێشانە مانای غیابی عەقڵیەتێکی گۆڕانخوازە، نائامادەیی ڕەخنەیەکی ڕادیکاڵ و ناساندنێکی ڕاستەقینەی کێشەکان و داڕشتنی بەرنامەیەکی ڕادیکاڵە بۆ گۆڕینیان. هەموو ئەمانەش مانای کوشتن و زەلیلکردنی زەمەنە لە ڕێگای بەرهەمهێنانەوەی دوێنێ لەناو ئێستادا، مانای دۆڕاندنی ئێستاییبوون و هەموو هەستێکی ڕاستەقینەیە بەمێژوو و بەدونیای ناو ئەو مێژووە.

بۆ ئەوەی ئەم مەسەلەیە زیاتر ڕوونبکەینەوە و بۆ ئەوەی هیچ گومانێک بەرامبەر بەبونیادگەراکردنی جەنگ دروستنەبێت، هەوڵدەدەم لە ڕووی دوو زاراوەی ئەرستۆوە جارێکی تر ئەم مەسەلەیە ئاشکراتر و ئاسانتر نیشانبدەم ومەبەستەکانم بەخوێنەر بناسێنم. بونیاد لەم باسەدا زیاتر لەو جۆرە "بوونە" دەچێت، کە ئەرستۆ ناوی دەنێ "بوونی بەزەبر- الوجود بالقوه"، بەڵام جەنگ وەک ڕوودلو ئەو شێوازی بوونەیە، کە ئەرستۆ ناوی "بوونی بەکردەوە - الوجود بالفعل"ی لێدەنێت. وەک چۆن گواستنەوە لە "بوونی بەزەبرەوە" بۆ "بوونی بەکردەوە" لای ئەرستۆ بەناو چالاکییە ئینسانییەکاندا تێدەپەڕێ، ئاوا بەهەمان شێوە گواستنەوە لەبونیادەوە بۆ

ڕووداو، گواستنەوەیەکە بەبێ چالاکییە ئینسانییەکان دروستنابێت. لێرەوە ئەگەر جەنگ لە دونیای ئێمەدا بوونێکی بونیادییانەی هەبێت، ئەوکات ئەوەی دەیکاتە "ڕووداو" خودی کارکردنی بونیادەکە نییە وەک بونیاد، بەڵکو کۆی ئەو بڕیار و چالاکییە ئینسانییانەیە، کە جەنگ لەناو بونیادەکانەوە، بۆ ناو مێژوو پەلکێشدەکەن، لە "بوونی بەزەبرەوە" دەیکەن بە "بوونی بەکردەوە" و لە مەتبوونەوە دەیگۆڕنە سەر جووڵە. بۆیە هەرگیز ناکرێت بەبەهانەی بەبونیادگەراکردن بەرپرسیارێتی مرۆڤەکان لەبەرپاکردنی جەنگدا لەبیربکەین و کارەساتەکان بخەینە ئەستۆی بونیادەکان نەک بڕیارەکان.

بەمجۆرە ناکرێت ڕۆڵی کەسەکان و گروپەکان و حیزبەکان لەناو میکانیزم و کارکردنی بونیادەکاندا لەبیربکەین و ئەوە لەیادببەینەوە، کە دواجار مرۆڤەکان توانا و وزە پەنهانەکانی ناو بونیادەکان وەگەڕدەخەن و ئاڕاستەکانی دیاریدەکەن. ڕاستە بونیادەکان خۆیان هەڵگری جەبر و ناچاریی تایبەتن و لەوێشەوە سنورێک، یان چوارچێوەیەکی دیاریکراو بۆ ئیرادە و کاری ئیرادەگەرانە دەکێشن، بەڵام دوجار ئەوە ئیرادەی ئینسانەکانە وزەی مەتبووی ناو بونیادەکان و ئەگەرەکانیان دەکاتە ڕووداو و مێژوویەکی زیندوو، کە بەبەردەمماندا تێدەپەڕێت. دەکرێت لێرەدا ئەو قسەیەی مارکس، کە دەڵێت: "مرۆڤەکان مێژوو دروستدەکەن، بەڵام لە چوارچێوەی هەلومەرجێکی دیاریکراودا" پێچەوانە بکەینەوە و بڵێین: "ڕاستە هەلومەرجەکان ئامادەن و سنوردادەنێن بۆ کارە ئیرادەگەرییەکانی مرۆڤ، بەڵام دواجار ئەوە مرۆڤە ئەو هەلومەرجانە دەگۆڕێت و مێژوویەکی دیکە دروستدەکات".

ئەگەر ئەو دیدە میتۆدی و ئەو بۆچوونانەی سەرەوە کورتبکەمەوە دەکرێت بڵێم: جەنگ دیاردەیەکە کۆمەڵێ ڕەگەزی بونیادییانەی "نەگۆڕ" ئامادەیدەکەن و زەمینەیەکی لەبار و بەپێتیش بۆ تەقاندنەوە و بەرپابوونی بەرهەمدەهێنن، بەڵام هەمیشە کۆمەڵێ "بڕیاری سیاسی" دێت و ئەو ئامادەگییە بونیادییە، لەناو

پراکتیک و هەڵسوکەوتی ڕۆژانە و دونیای واقیعدا دەکاتە ئامادەگییەکی حەیاتی و جەنگ لە زەبرەوە بەرەو کردەوە، یان لە بونیادەوە بەرەو ڕووداو پەلکێشدەکات. هەر ئەم ڕاستییەیە وامانلێدەکات بۆ قسەکردن لەسەر جەنگ نە مەنهەجیەتی بونیادگەریی بەتەنیا و نە مەنهەجیەتی فینۆمینۆلۆژی بەتەنیا بەڕاست بزانین و بەدوای ڕوانینێکی فراوانتردا بگەڕێین لەیەککاتدا هەم هۆکارە بونیادییەکان و هەم هۆکارە ئینسانییەکان، هەم جەبری واقیع و کولتور و هەم ئیرادەی سیاسی، هەم خودی مێژوو خۆی و هەم خودی ئەو عەقڵەی لەگەڵ مێژوودا مامەڵە دەکات، هەر هەموویان بەسەر یەکەوە، لە گشتێتییەکی تایبەتدا، بە هۆکار و سەرچاوەی جەنگە بەردەوامەکانی خۆمان بزانین.

-٣-

ئەو هەڵوێستە میتۆدییەی سەرەوە بەرەو ئەوەمان دەبات سەرەتا هەوڵدەین تۆپۆگرافیای جەنگ لەناو پێکهاتەی هێزە سۆسیۆلۆژییەکان و لەناو پێکهاتەی فیکری و ڕۆشنبیری و سایکۆلۆژی مرۆڤەکاندا دەستنیشانکەین. بەمانایەکی دیکە بۆ ناسین و تێگەیشتن لە هۆکارەکانی جەنگ دەبێت هەوڵدەین ئەو شوێن و جێیە بدۆزینەوە، کە جەنگی لێوە هەڵدەقوڵێت و بەسەر جەستەی کۆمەڵایەتیدا بڵاودەبێتەوە. هەوڵدەین ئەو زەمینە پێشینەیە، ئەو ناوەندە، ئەو کایە دیاریکراوە شیبکەینەوە، کە "بوونی بەزەبر" و بوونی بوونیادییانەی جەنگی گرتۆتە خۆی. دەبێت هەوڵدەین ئەو هەڵقەیە بدۆزینەوە، کە "بوونی بەزەبر" و "بوونی بونیادییانە"، دەبەستێتەوە بە "بوونی بەکردەوە" و "بوونی ڕووداوییانەی" جەنگەوە. هەڵقەیەک کەهێزە پەنهان و وزە نادیارەکان دەگۆڕێتە سەر وزە و هێزی

دیار و ئامانە، وێناکردنەکان دەکاتە کردەوە، ئامادەگییەکان دەگۆڕێت بە پراکتیک، هێزە سایکۆلۆژییەکان دەکاتە جووڵەی ڕەوشتی و ناکۆکییەکان دەگۆڕێتە سەر فیشەکنان بە سەردڵی یەکتریەوە. بەکورتی دەبێت هەوڵدەین ئەو سەرزەمینە بارگاویە بناسین، کە نادیارانە پراکتیکەکان ئاراستە دەکات و یاساکانی خۆی دەسەپێنێ و فیکر و بۆچوونەکان دەگۆڕێتە سەر جووڵە و هەڵسوکەوت و شێوازێکی تایبەتی وشیاریش بەرهەمدێنێت، کە سڵ لە بەرپاکردنی جەنگ ناکاتەوە. دەشێت لێرەدا سود لەزاراوەی "هەبیتۆس" Habitus ی کۆمەڵناسی بەناوبانگی فەرەنسی بیار بۆردیۆ ببینین و لەوێوە بچینە ناو ئەو ناوەندەی هێمامان بۆکرد (١).

"هەبیتۆس" لای بۆردیۆ، ئامادەگی گشتی ئینسانە بۆ کردن، یان نەکردنی شتێک، ئەو سەرزەمینەیە، کە تیایادا ڕەوشت و کار و کردەوەکان ئاراستە دەکرێت. هەبیتوس ناوەندێکە وێناکردن و بۆچوونەکانی مرۆڤ دەربارەی دونیا و دیاردەکان دەگرێتەخۆی و ئەو ئامادەگییە نیشان دەدات، کە ئینسان بەهۆیەوە بڕیاردەدات کارێک بکات. بەمانایەکی دیکە هەبیتۆس ژێرخانی پراکتیک و ئامادەگییە گشتییەکانی ئینسانە بۆ ئەنجامدان، یان ئەنجامنەدانی شتێک. هەموو ئینسانێک ئامادەگییەکی تایبەتی تێدایە بۆ هەڵسان بە کارێک و جێبەجێکردنی بەو شێوەیەی بەڕاستی دەزانێت. بەباوەڕی بۆردیۆ هەبیتۆس سەرزەمین وماڵی ئەو ئامادەگییە گشتیە. لای بۆردیۆ ئەم "ئامادەگیە گشتییە" بەرهەمهێنەری "کۆمەڵێک وێناکردنی تایبەتە" لە ئینساندا و، ئەم وێناکردنانەش "لەمەیدانە جیاجیاکانی فیکر و کارکردندا" پیادەدەکرێت و هەڵسوکەوتەکانی ئینسان بەرهەمدەهێنێت. مەبەست لە وێناکردنیش کۆی بۆچوون و دید و تێڕوانینەکانی ئینسانە دەربارەی ژیان و کۆمەڵگا و هێز و دەسەڵات و پەیوەندییەکان. بەکورتی هەبیتۆس مانای ئەو ئامادەگییە گشتیەیە لە ئینساندا، کە تێڕوانینەکان و کار و کردەوەکانی ئینسان

نەستنیشاندەکات. بۆردیۆ ئەم زاراوەیە دەداتە پاڵ چینە کۆمەڵایەتییەکان و قسە لە هەبیتوسی تایبەتی چینەکان دەکات. بەبۆچوونی بۆردیۆ هەر هێزێکی کۆمەڵایەتی هەبیتوسی خۆی هەیە، ئەم هەبیتوسەش ئامادەییە گشتییەکان و بۆچوون و وێناکردنەکانی ئەو هێزە کۆمەڵایەتییە دەگرێتەخۆی، چ لەئاستی فیکر و ئایدیۆلۆژیادا چ لەئاستی پراکتیک و هەڵسوکەوتی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا. پرسیاری سەرەکی لای بۆردیۆ ئەوەیە چۆن هێزێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو ئامادەگییە گشتییەکان و وێناکردنەکانی دەگۆڕێت بۆ پراکتیک. چۆن بۆچوونەکانی بەرهەمدەهێنێت و دواجار چۆن ئەم بۆچوونانە دەکات بە بنەمای ڕەوشت و هەڵسوکەوت و هەڵوێستەکانی. هەبیتۆس ئەو "کۆمەڵە بنەمایانەیە، کە بەرهەمهێنی هەڵسوکەوتەکانە".

بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتری ئەم چەمکە با ئەو نموونەیەک بهێنینەوە، کە بۆردیۆ دەربارەی منداڵی کرێکارێک و منداڵی بۆرژوایەک دەیهێنێتەوە. بەبۆچوونی بۆردیۆ منداڵێکی سەر بەچینی کرێکار هەڵگری هەبیتوسێکە جیاواز لە هەبیتوسی منداڵێکی سەر بە چینی بۆرژوا، ئەم جیاوازییەش دەشێت لە پەیوەندی ئەو دوو منداڵەدا بە سیستمی خوێندن و بە وێناکردنی هەریەکێکیانەوە بۆ شەهادە بە ئاشکرا ببینین. منداڵی کەسێکی کرێکار هەڵگری هەبیتوسێکە پێیدەڵێت قوتابخانە زۆر گرنگ نییە و مرۆڤ تا زووتر پیشەیەک فێربێت باشترە. لێرەدا ئەم هەبیتوسە ئامادەگییەکی گشتی دیاریکراو لەو منداڵەدا دەچێنێت و وێناکردنێکی تایبەتی بۆ قوتابخانە و بڕوانامە و هەموو سیستەمی پەروەردەیی لادروستدەکات، کە تیایاندا بڕوانامە بە سێنتەر و هۆکار و ئامرازی سەرکەوتن و پێشکەوتن لە ژیاندا نابینێت. لەکاتێکدا منداڵێکی سەر بەچینەکانی سەرەوە لەگەڵ هەبیتۆسێکی دیکەدا مامەڵە دەکات، کە قوتابخانە بەبناغە و بنچینەی سەرکەوتن لە ژیاندا دەزانێت. لێرەوە منداڵی کرێکارەکە وێناکردنێکی تایبەتی بۆ قوتابخانە و سیستمی پەروەردەیی هەیە

و جۆرێکی دیکە لە ڕەوشت و هەڵوێست و تێگەیشتن بەرامبەر بە قوتابخانە و سیستمی پەروەردەیی دەنوێنێ، بە بەراوردکردنی بە منداڵی بۆرژوازییەک. ئەوەی من لەم زاراوەیەی بۆردیۆدا لە پەیوەندیدا بە جەنگ و شەڕەکانی دونیای خۆمانەوە دەیبینم مەسەلەی ئامادەگییە گشتییەکانی ئینسانی ئێمە و ئەو شێوازە تایبەتەی هەبیتوسە، کە وێناکردنەکانی ئینسانی ئێمە بۆ هەڵسوکەوت و کار و کردەوەکان دەستنیشاندەکات. ئەو پرسیارەی دەمەوێت بیکەم ئەوەیە داخۆ جەنگ نەبۆتە بەشێک لە ئامادەگییە گشتیەکانی ئینسانی ئێمە، یان ڕاستتر بدوێم ئایا جەنگ نەبۆتە بەشێک لە هەبیتوسی سیاسی ئێمە؟

-٤-

سەرەتا پێمان لەسەر ئەوە داگرت، کە جەنگ بەتەنیا لە دەرەوەڕا نایەت و بەتەنیا لەدەرەوەڕا بەسەر جەستەی کۆمەڵایەتی و سیاسی ئێمەدا ناسەپێنرێت. ئەوەشمان وت، کە جەنگ لە ناوەوەڕا شوێن و جێی تایبەتی خۆی هەیە و تاڕادەیەکی زۆریش ئەو دونیا ناوەکییە بەرهەمیدەهێنێت. ئێستا لەپاڵ سۆسیۆلۆژیای بۆردیۆدا هەنگاوێک زیاتر دەچینەپێشەوە و دەڵێین جەنگ لە دونیای ئێمەدا بوونێکی هەبیتۆسانەی هەیە. بە هەبیتۆسکردنی جەنگ مانای ئەوەی جەنگ چیدی ڕووداوێکی لابەلا و سەرپێی و لاوەکی نییە و هەروا بەتەنیا ناکۆکییەکی سیاسی دیاریکراو نایخولقێنێ، بەڵکو لەڕاستیدا بۆتە بەشێک لە هەبیتۆسی سیاسی کوردی و لەوێشەوە کراوە بە بەشێک لە هەبیتوسی کۆمەڵایەتی ئێمە. جەنگ بۆتە بەشێکی دانەبڕاو لە وێناکردنی سیاسی هێزە سیاسییەکانی ئێمە بۆ یەکتری و بۆ دونیا و بۆ دەورووبەر و پەیوەندییەکان. نەک هەر ئەمە، بەڵکو جەنگ بۆتە بەشێک

لەوێناکردنمان بۆ دەسەڵات. ئەگەر بمانەوێت بە زمانێکی سادەتر بدوێین دەکرێت بڵێین جەنگ لە دونیای ئێمەدا بۆتە کولتور و سایکۆلۆژیا و قووڵ دابەزیوەتە ناو پێکهاتەی سیاسیمانەوە.

بە هەبیتۆسکردنی جەنگ مانای بە جەنگاوییبوونی ئامادەگییە گشتیەکانی ئینسانی ئێمە، وردتر بدوێم مانای بە جەنگاوییبوونی ئامادەگییە گشتییەکانی هێزە سیاسیەکانی ئێمە. کێشەکەش لەوەدایە، کە جەنگ لە دونیای ئێمەدا بەتەنها لە کایەی سیاسەتدا پیادەناکرێت، بەڵکو بە حوکمی بوونی هەبیتوسیانەی پەرێنراوەتەوە بۆ ناو کۆی کایەکانی تری ئەو کۆمەڵگایە. ئەمەش مانای ئەوەی جەنگ لە جەنگی حیزبەوە گواستراوەتەوە بۆ جەنگی کۆمەڵگا و لە کۆمەڵگاشەوە بۆ جەنگی تاکەکەسەکان لەگەڵیەکتردا، دواتریش لە ڕێگای جووڵەیەکی پێچەوانەوە جارێکی تر لە تاکە کەسەکانەوە بۆ ناو کۆمەڵگا و لەناو کۆمەڵگاشەوە بۆناو حیزب. ئەم بازنە داخراوە ئەو کارەساتە نوێیەیە، کە کۆمەڵگای ئێمە لە دوای ڕاپەڕینەوە و لەژێر کاریگەریی کاری وێرانکارانەی حیزبە کوردییەکاندا کەوتۆتە ناوی و ئێستا لە هەموو کات زیاتر ئاسۆی گۆڕین و تێپەڕاندن و چارەسەرکردنی ون و نابینا و نائامادەیە.

ساکارتر بدوێین دەکرێت بڵێین شەڕ لە دونیای ئێمەدا لە شەڕ لەسەر دەسەڵاتی سیاسییەوە گۆڕاوە بۆ شەڕ لەسەر هەموو دەسەڵاتەکانی دیکە، لە مۆنۆپۆڵکردنی یەکلایەنەی پەیوەندییەکانی نێوان دەزگاکانی حیزب و دەزگاکانی کۆمەڵگاوە، پەڕیوەتەوە بۆ داگیرکردن و کۆنترۆڵکردنی حیزب بۆ کۆمەڵگا. هەر ئەم بەرفراوانبوونەی سەرزەمینی شەڕە وایکردووە شەڕ بوونێکی هەبیتۆسانە وەرگرێت و لە سیاسەتەوە دابەزێتە ناو ژیان خۆی، لە ڕەهەندی سیاسی کەسایەتی مرۆڤی ئێمەوە بگواسترێتەوە بۆ ڕەهەندە سایکۆلۆژی و کولتورییەکان. لە "جیاوازی" نێوان دوو دیدی سیاسییەوە، بکرێت بە جیاوازی نێوان دوو مرۆڤ، دوو کولتور، دوو

دیالێکتی زمان و دوو کوردستان لەیەکدی. ئەم پرۆسەی گۆڕانەش پرۆسەیەکە لەئاستێکی غەیبانی سەد دەر سەددا ڕوودەدات و هەڵگری هیچ ڕەهەند و مەودایەکی مەعریفی و فیکریی ساکاریش نییە، بە جنێو دەستپێدەکات و بەجنێو کۆتایی دێت. بەبۆچوونی من ئەم دۆخە لەزۆر ڕووەوە وابەستەی جێگۆڕکێیەکی کۆمەلایەتی نوێیە لە دونیای ئێمەدا، کە بەبێ جەنگ و خولقاندنی پشێوی و ناثارامی ناتوانێت دروستببێت، جێگۆڕکێیەک تیایدا دەسەلاتی سیاسی دەخوازێت پایەی ئابووری بۆخۆی دروستبکات و "سیاسیەکانی شاخ" تیایادا دەخوازن ببنە "سەرمایەدارانی شار".

بەکورتی، لەڕاپەڕین بەدواوە، جەنگ لە دونیای ئێمەدا چیدی بەتەنها هەڵگری خەسڵەتێکی سیاسی نییە، بەڵکو بۆتە خەسڵەتێک لە خەسڵەتە کۆمەلایەتییەکانی کۆمەڵگای ئێمە و قووڵ بەناو هەناوی ئەم کۆمەڵگایەدا ڕۆچووە و بنەما سایکۆلۆژییەکانی مرۆڤی ئێمەی ڕەنگرێژکردووە. ڕەنگە ئەم پرۆسەیە، مەبەستم پرۆسەی پەڕاندنەوەی جەنگە لە کایەی سیاسەتەوە بۆ ناو هەناوی کۆمەڵگا و لە ڕووداوێکی دەرەکییەوە بۆ ناو هەبیتۆس، پرۆسەیەک نەبووبێت حیزبە کوردییەکان بەئەنقەست و هۆشیارانە کاریان بۆکردبێت. دەشێت ئەم مەسەلەیە دەرەنجامی ململانێیەکی نابەرپرسیارانە و مەترسییەکی دەرکپێنەکراو و زنجیرەیەکی بەردەوامی کاری هەڵە و کوشندەبێت، کە حیزبە کوردییەکان ناثاگایانە و بەدەر لە ویستێکی وشیار و بەدەر لە چاوەڕوانکردنی دەرەنجامە کوشندەکانی ئەنجامیاندابێت. لەهەموو دۆخێکدا بەهەبیتۆسکردنی جەنگ دەرەنجامی پراکتیزەکردنی سیاسەتێکی کوێرانەیە، کە گومان و ڕق و قازانجی وەختی و بەرتەسک و ئابینابییەکی سیاسی گەورە لەپشتی دارشتنی هێڵە گشتیەکانییەوەیە.

-٥-

کـاری ناعەقڵانییـانەی "عەقڵیەتـی سیاسـی" لە غیـابی مەعـریفە و تـوێژینەوە و تێگەیشتنی زانستییانەدا، لەغیابی هەستکردنێکی ئەخلاقیدا بەرامبەر بە لانیکەمی ئەو قوربانییانەی بە درێژایی مێژووی ئێمە پێشکەشکراون، جۆرێکی تایبەت لە سیاسەت دروستدەکات، لەباتی چارەسەرکردنی کێشە سیاسیی و کۆمەڵایەتییەکان و لەباتی ڕزگارکردنی کۆمەڵگا لە کاریگەرە کوشندەکانیان، خۆی دەبێتە ڕێگرێکی کـۆمەڵایەتی و سیاسـی لەبەردەم چارەسـەری ئەو کێشـانەدا. لە دونیـای ئـێمەدا سیاسـەت نـایەت بـۆئەوەی کێشـەکانی کۆمەڵگـا چارەسـەربکات، بەپـێچەوانەوە سیاسـەت خـۆی دەبێـتە قەیـدێکی گەورە بەسـەر گەشـە و بەرەوپێشـەوەچوونی کۆمەڵگا و چارەسەرکردنی کێشەکانیەوە. سیاسەت لە دونیای ئێمەدا لەدەرگاکـانی مێژوو و ئایندە نادات و ئەگەرەکانیان گەورەناکات، بەپێچەوانەوە سیاسەت دێت بۆ ئەوەی مێـژوو دابخـات و ئاییـندە لە "ئێسـتادا" گیرپێبخـوات. بێگومـان لە "ئێستایەکدا"، کە بوونیادی دەسەڵاتی باو تیایدا سەروەر دەمێنێتەوە و ڕێ لەهەر گۆڕانێکی ڕاستەقینە دەگرێت. بەم شێوەیە "کایەی سیاسی" بە گۆڕانی لە کـایەی چارەسـەری کێشـەکانەوە، بـۆ "کـایەی خولقانـدنی کێشـەی نـوێ" و کـایەیەی "قـوڵترکردنەوەی کێشـە کۆنەکـان"، هەمـوو ئەو مانایـانە لەدەسـت دەدات، کە سیاسـەت بە هـونەری بنیاتنـانی ئاییـندە و زانسـتی ئۆرگـانیزەکردنی کۆمەڵگـا و کردنەوەی ئەگەرە داخراوەکان، یەکساندەکات.

"کایەی سیاسی" ناعەقڵانی، نەک تەنیا خـودی سیاسییەکان نـاعەقڵانی دەکـات، بەڵکـو زۆربەی خـانە کـۆمەڵایەتییە جیاجیاکـانی دیـکەش بە ڤایرۆسـەکانی خـۆی نەخۆشدەخات. ئەو کۆمەڵگـایەی سیاسـەت لەناویـدا کـوێرانە کاریکـات، زەحـمەتە یەکە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەی توانای چاوکردنەوەیان هەبێت و دونیا لە هەقیقەتی

خۆیدا ببینن.، کە سیاسەت کوێر بوو مانای ئەوەی کۆمەڵگا چیدی نەدەتوانێت خۆی، نە دونیای دەرەوەی خۆی، نە دۆست و نە دوژمنەکانی بناسێت، کە ئەمەشی نەکرد ئیدی بەجارێک هەموومان بۆ سەرخوانی خودکوژییەکی دەستەجەمعی داوەت دەکات. کۆمەڵگای ئێمە لە نەوەدەکاندا بەردەوام کۆمەڵگایەکی داوەتکراوبووە بۆسەر ئەو خوانە تۆقێنەرە، ئەوەشی داوەتیکردوین بە پلەی یەکەم سیاسیەکانی کورد خۆیان بوون، نەک دوژمنە دەرەکییەکان.
لە کۆمەڵگایەکی لە بابەتی کۆمەڵگای ئێمەدا ئیفلیجبوونی سیاسەت مانای ئیفلیجبوونی خودی کۆمەڵگا و بەفیڕۆچوونی ئەو وزەی گۆڕان و پێشکەوتنەی کۆمەڵگا لەهەناوی خۆیدا هەڵیگرتووە. لەم دۆخەدا داخستنی دەرگاکانی عەقلانییەت لەبەردەم سیاسەتدا، مانای داخستنی ئەگەرەکانی ئایندەیە لەبەردەم کۆمەڵگادا. ئەگەر سیاسەت سەرەتا و کۆتایی ئەو وزە کۆمەڵایەتییە بێت، کە دەیەوێت لە دونیای ئێمەدا فۆرم بەکۆمەڵگا و بەمێژوو بدات، لەبەر غیاب، یان کوشتن و مۆنۆپۆلیزەکردنی تواناکانی دیکە و تواندنەوەیان لەناو سیاسەتدا، ئەوا ئەوکات قەیرانی سیاسەت مانای قەیرانی هەموو توانا و وزە کۆمەڵایەتییەکانی تریش. بەمانایەکی دیکە، چونکە لە کۆمەڵگای ئێمەدا دەسەڵاتی سیاسی دەسەڵاتی بالادەستە و دەخوازێت بەتەنها و لە غیابی دەسەڵاتەکانی دیکەدا دەستنیشانی ئەوەبکات مێژووی ئێمە چ ئاڕاستە و شێواز و ناوەرۆکێک وەربگرێت، بۆیە قەیرانی ئەم سیاسەتە ڕاستەوخۆ دەبێتە قەیرانی سەرتاسەری کۆمەڵگا و کارەساتەکانی سیاسەت دەبێتە کارەساتی مێژوویی گەورە و هەڵەکانیشی دەبێتە هەڵەی کوشندەی ئەوتۆ، کە کاریگەری بۆ سەر زیاد لە هێزێکی کۆمەڵایەتی و زیاد لەنەوەیەک و زیاد لە ڕۆژگارێک دەبێت.
ئەگەر بمانەوێ وەسفێکی گشتی "کایەی سیاسی" لە کوردستاندا بکەین، بەو پێیەی ئەم کایەیە مێژووی کورد لەناویدا دەبزوێت و سەری بە دیوارەکانی ڕابردوو

و ئێستا و ئاییندەیدا دەکێشرێت، بەوپێیەی لەناو ئەم کایەیەدا بڕیارەکان دەردەچن و وێناکردنەکان بەرهەمدەهێنرێن و مێژووی ئێمە ئەزموونده‌کرێت. ئەوا ئەوکات ئەم وێنەیەمان لادروست دەبێت (٢): کایەی سیاسی کوردی لە ئێستادا کایەیەکە بارگاویە بە ڕۆحیەتێکی دوژمنکارانەی وا، کە بچووکترین ناکۆکی تیایدا قابیلە بۆ ئەوەی زۆر بەتوندی بتەقێتەوە و پەرەبستێنێ بۆ جەنگێکی گەورە و گشتگیر. دوو ڕای جیاواز لەسەر مەسەلەیەکی تایبەت، قابیلە بگۆڕێت بۆ شەڕی نێوان دوو حیزب و دواتر بۆ شەڕی نێوان ئەو لایەنگر و هەوادار و بنکە کۆمەڵایەتیاینەی ئەو دوو حیزبە لە هەناوی کۆمەڵگای کوردیدا دروستیانکردووە. لەپاڵ ئەمەدا کایەی سیاسیی کوردی کایەیەکە بێ مەعریفە، بێ زانست، بێ کادیری لێزان، بێ دیپلوماتی شارەزا. هەموو مێژووی سیاسی کوردی تائێستا یەک دیپلۆماتی پلە سێ و پلە چواریشی بەرهەمنەهێناوە - کایەیەکە بێ لێکۆڵینەوەی زانستی و بێ ناسین بێ هیچ تێز و تیۆرەیەک، کاردەکات. ئەم کایەیە لە ڕووی ڕادەی گەشەکردنی فیکری سیاسییەوە تا ئێستاش لە دوای پرنسیپە سەرەتاییەکانی میکیافیلیەت و سەرەتاکانی لەدایکبوونی سیاسەت، وەک زانستەوەیە.

کایەی سیاسەت لە کوردستاندا کایەیەکە بارگاویە ڕەمزەکانی جەنگ، بەتوندوتیژی ئاشکراو ڕەمزی، بە دابەشبوون، بە ناکۆکی و ململانێی خێڵەکییانە، بە نەرجسیەتێکی ترسناکی دەسەڵات و دەسکەوتی کاتی. بە کورتی ئەم کایەیە بارگاویە بەهەموو ئەو ڕەمز و قازانج و دیدانەی، کە دەکەونە بەر لە دروستبوونی نەتەوەوە وەک بکەرێکی سیاسی دەستەجەمعی. ئەم کایەیە پڕکراوە لە ڕەمزەکانی خێڵ، ناوچە، جیاوازی ڕەنگ، جیاوازی دیالێکتەکانی زمان، جیاوازی هاوپەیمانێتی و هەموو ئەو پێکهاتانەی دیکە، کە ڕێ بە لەدایکبوونی سیاسیانەی نەتەوە دەگرن و کۆمەڵگای ئێمە بەوە مەحکوم دەکەن نەتوانێت لە قۆناغی "بەر لەنەتەوەوە" بۆ قۆناغی "بوون بە نەتەوە" گەشەبکات. ئەم کایەیە بەردەوام ڕێگری سیاسی،

کولتوری، ئابووری و ڕەمزی لەبەردەم دروستبوون و بەرجەستەبوونی نەتەوە نەک تەنها بە مانا سیاسییەکەی، بەڵکو بەمان کولتورییەکەشی، دروستدەکات. ئەم کایەیە کۆمەڵگای ئێمە لەسەر مۆدێلی خێڵ، ناوچە، یان هەر پێکهاتێکی دیکەی "بەر لەنەتەوە" بەرهەمدەهێنێتەوە. کایەی سیاسی لە دونیای ئێمەدا هەنجن هەنجنە بە هەڵەکانی ڕابردوو، بە هەڵەکانی ئێستا، بە دەستێوەردانی شێوێنەرانەی داگیرکەران، بە پەیوەندی نهێنی و ژێرپەردەی حیزبەکان، بە کڕینی خەڵک، بە پاڵەوانکردنی خائینەکان، بە دروستکردنی ڕەمز و قارەمانی وەهمی، بە بەخشین و بڵاوکردنەوەی لێکدانەوەی هەڵە، بە درۆکردن لەگەڵ خود و لەگەڵ خەڵک و لەگەڵ دونیادا. ئەڵبەتە ئەم کایە سیاسییە، کە لەم کاتەدا و بەم ناوەڕۆک و ڕەگەزانەوە لەئارادایە و خۆی بەسەر ژیانی سیاسی کوردیدا سەپاندووە، کایەیەک نییە هەروا لەپڕێکدا و ناکاوانە لەدایکبوویێت. بەپێچەوانەوە ئەم کایەیە مێژوویەکی درێژی هەیە، مێژوویەکی درێژی پڕناکۆکی سیاسی چارەسەرنەکراو و کەڵەکراو بەسەریەکدا، مێژووی درێژی بێبەرنامەیی و هەڕەمەیی لە کاری سیاسیدا، مێژوویەکی درێژی پەیوەندیی دوژمنکارانە و خوێناوی، مێژوویەکی درێژی تێگەیشتنی هەڵە لە واقیعی کوردی و لە هێزە سۆسیۆلۆژی و بونیادە فانتازی و ڕەمزییەکانی مرۆڤی ئێمە، مێژوویەکی درێژی تێگەیشتنی هەڵە لە دراوسێی قەسابەکانمان، لە هێزە ناوچەییەکان، لە دونیا و ئاڕاستە جیهانییەکانی سیاسەت، مێژوویەکی درێژی تەماحی تاکەکەسی و نەرجسیەتی سەرکردەکان.

بەکورتی کایەی سیاسیی لە کوردستاندا، بەو پێکهاتەیەی لە سەرەوە هێڵە گشتیەکانیمان دەستنیشانکرد، کایەیەکە تا سەر ئێسقان نەخۆش، تاسەر ئێسقان ئیفلیج، تاسەر ئێسقان عەبەس، کایەیەکە بۆتە کارخانەی بەرهەمهێنانی بێهیوایی و بێهودەیی، کارخانەی بەرهەمهێنانی سیاسیی ئیفلیج و سەرکردەی نەخۆش و لەوێشەوە بەرهەمهێنانی کۆمەڵگایەکی نەخۆش، کۆمەڵگایەک ئیفلیج و بێ هیوا،

کۆمەڵگایەکی گیرخواردوو بە دەست کێشە چارەسەرنەکراوەکانی دوێنێ و ئەمڕۆ و بێگومان سبەینێشەوە. ئەم کایەیە نەک فەزای ڕزگاری و ئازادی نییە، بەڵکو فەزای قەبراندنی ئازادی و تیرۆرکردنی ڕزگارییە. ئەم کایەیە لە ناوەڕاستی شەستەکانەوە کایەیەکی دابەشبووە، بەشێوەیەکی ئاشکراو بەرچاو، بەسەر دوو بزاوتی سیاسیی سەرەکی و یەکدی ڕەتکەرەوەدا، لەپاڵیاندا کۆمەڵێ گروپ و ناو و کەسایەتی پەراوێزی و لاوەکیش دروستبوون، کە لە هیچ کاتێکی مێژووی سیاسیی ئێمەدا نەیانتوانیوە کاریگەرییەکی ڕاستەقینەیان لەسەر واقیعی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئێمە هەبێ. کارەساتی سەرەکیش لەوەدابووە ئەم دوالیزمە بەردەوام بارگاویبووە بەململانێی دەسەڵات، بەناکۆکی توندوتیژ، تیایدا بەردەوام ئەگەری جەنگ و پێکدادان، بە درێژایی ئەو مێژووە، ئەگەرێکی کراوە و زیندووبووە و هەمیشە جەنگ لەنێوان ئەو دوو هێزەدا، لەئاشتی ڕاستەقینەتر و واقیعیتربووە.

-٦-

بەبڕوای من خۆراکی سەرەکی بەردەوامی ئەو دوالیزمە سیاسییە و بەرهەمهێنانەوەی بەردەوامی بەو فۆرم و ناوەڕۆکەی سەرەوە، لە سەرێک لە سەرەکانەوە، وابەستەی ئەو دوالیزمە ئەنترۆپۆلۆژییە زیهنییەیە، کە زەینی ئایینی لە دونیای ئێمەدا هەڵگریەتی. مەبەست لەمەش ئەو دوالیزمە ئایینییەیە، کە دونیا دوولایەنانە بۆ لایەنێک خێر و لایەنێک شەڕ، لایەنێک باش و لایەنێک خراپ، لایەنێک بەموتڵەقی لەسەر هەق و لایەنێک بەموتڵەقی ناهەق، دابەشدەکات. ئەم شێوە ئایینییەی دابەشکردنی دونیا، کۆنترین شێوەی دابەشکردن و سەرەتاییترین و ساکارترین هەوڵی پۆلێنکردنی دونیایە، لە ڕاستیشدا پۆلینێکی ناڕاست و دوور لە

ئالۆزییەکانی دونیا و واقیع و مێژووەوە.

پـۆلێنکردی ئایینیـانەی دونیـا پـۆلێنێکی جەبـری و تاکڕەهەنـدە. ڕاسـتە هەمـوو پرۆسەی پۆلێنکردنێک هەڵگری جۆرێک لە جەبر و ناچارییە، بەڵام ئەوەی پـۆلێنی ئـاییـنی لە پۆلێنەکـانی تـر جیادەکـاتەوە سـنورداربوونیەتی. مەبەسـت لە سنووردارییون ئەوەیە لە پـۆلێنی ئایینیـدا جـگە لەیەک هەقـیقەت، یەک سـێنتەر، یەک ئاراستە، شتێکی دیکە لەئارادا نییە و هەموو لادانێک لەو هەقیقەت و سێنتەر و ئاراستەیەش، وەک کەوتنە ناو وەهم و هەڵە و گوناهبـاری وێنادەکرێت. پـۆلێنی ئایینی دونیا پۆلێنێکی ئەخلاقیی، دوولایەنەی باش بەرامبەر خـراپ، لە جەوهەردا هەوڵدانێکی ئەخلاقـیە بـۆ ئۆرگـانیزەکردنی کۆمەڵگا و پەیوەنـدییە کـۆمەڵایەتی و ئەخلاقییەکانی ناو کۆمەڵگا. ئاشکرایە بەخشینی ئەم بـارگە ئەخلاقیـیە بە پـۆلێنە ئایینیەکان، هەوڵدانێکی سەرەتایییە بۆئەوەی کۆمەڵگا لە دەرەوەی دەزگا و لەڕێـی نۆرم و بەها ئەخلاقییەکانەوە بەڕێوەببرێت و کۆنتڕۆڵبکرێت. هەرچـی سیاسـەتە، هـیچ نەبێـت لە سـەردەمی ماکیـاڤیلیەوە، بەوەی شـێوە ئـایینییەکەی ئەخلاقـی تەڵاقداوە، کەوتۆتە ناو کایە و ناوەنـدێکەوە جیـاواز لە کـایە و ناوەنـدی ئـایین. لە سەرزەمینی سیاسەتدا ئەو دابەشکردنە ئایینییە دوالیزمیە لاوازبووە و دونیا لەبـاتی یەکڕەهەندی هەبێت، بۆتە هەڵگری چەندان ڕەهەند، سیاسەت بەپێچەوانەی دینەوە لەباتی ئەوەی مۆنۆلـۆژێکی نـاوەکی داخراوبێـت، بـۆتە دیـالۆگی هێـزە جیاجیاکـان لەگەڵ یەکیـدا. لە ڕاسـتیدا هـاتنی سیاسـەت، بەتـایبەتی بە مانـا نەتەوەیـی و دیموکراسییەکەی، بەبێ گۆڕینی ڕۆڵی ئایین و تاڕادەیەکیش بەبـێ چـوونە شـوێنی ئایین، کارێکی مەحاڵە.

سادەترین و بەڵگەنەویسترین دابەشکردنی سیاسی لە دونیـای ئێمەدا دابەشـکردنە بۆ نیشتمانپەروەر/خائین، ئەم دابەشکردنەش دابەشکردنێکە هەر گروپ و هێزێکـی سیاسی، بەپێی ئایدیۆلۆژیا تایبەتەکانی خۆیان، لە دونیای ئێمەدا پیـادەیکردووە و

هێـزە کۆمەڵایەتییەکانیـان لەو ڕێگـایەوە خـانەڕێژی کـردووە. ئەم دابەشـکردنە سەرەکییە بەئامـادەبوونی ئایـدۆلۆژیا سیاسـییەکان لە دونیـای ئـێمەدا بـۆتە هـۆی ئەوەی زۆر هێز و ئایدیۆلۆژیا بە خائین و ناپاک ناوببرێن و زۆر هێز و ئایدیۆلۆژیای دیکەش، ئافەرین بکرێن. بەبۆچـوونی مـن زۆرجـار ئەم دابەشـکردنە دوالیـزمییە لە جەوهەردا سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی دوالیزمە ئایینییەکان بووە لەناو سیاسـەتدا. بەکـورتی بەرهەمهێنـانەوەی دوالیـزمە ئایینییەکـان لەنـاو سیاسـەتدا و بەخشـینی لۆژیکی ئایین بە لۆژیکی سیاسەت شایەتی لە لەدایکبوونێکی نالەباری سیاسەت لە دونیـای ئـێمەدا ئەدەن، لەدایکبوونێـک دواجـار جەنـگ و ڕەتکـردنەوەی مـوتڵەقی ئەویتری بەتاقە ئامرازی چارەسەرکردنی کێشە و گرفتە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان زانیوە و لەدەلاقەی لۆژیکی ئایین و گریمانەی ئـایین و پـۆلینکردنە ئایینییەکـانەوە تەماشـای سیاسـەت و کۆمەڵگـا و مێـژووی کـردووە. وەک ئاشـکرایە کـایەیەکی سیاسی لەم بابەتەش هەر لە بنەڕەتەوە هەڵگری هیچ دونیـایەکی دیالۆگی نیـیە و پرۆسەی "خۆ بە موتڵەقکردن" تیایـدا پرۆسـەی هەرە باڵادەسـت و هەرە بەهێـزە. ئەمەش وایکردووە هەر لە سەرەتاوە نەکرێت گوێمان لە زیـاد لە نەغـمەیەک بێـت، ئەگەرچـی سیاسـەت بە پـلەی یەکەم مانـای گـوێگرتنە لە هەمـوو نەغمەکـان و خولقاندنی هەلومەرجێکیی گونجاو بۆ بیستنی هەموو نەغمەکان.

-٧-

ئێمە وتمان جەنگ لەناوەندی سیاسی ئێمەدا بوونێکی هەبیتۆسـییانەی هەیە و ئەو بوونەش ناچارماندەکات بکەویـنە نـاو ئەو وێناکردنـانەی مرۆڤـی ئـێمە بـۆ دونیـا و دەوروبەر و دۆسـت و دوژمـن و سیاسـەت و مێـژوو و کۆمەڵگـا، هەیەتـی. وەک

هەنگاوی یەکەمیش ئەوەمان وت، کە زەینیەتی ئایینی زەینییەتی باڵادەست و دەستبەکارە لە دونیای سیاسی ئێمەدا و سیاسەت لەو نیگا ئایینییەوە بەشێکی زۆری وەڵامەکانی بۆ دونیا و مێژوو و کێشە کۆمەڵایەتییەکانی ئێمە بەرهەمدەهێنێت. خاڵی سەرەکی لەو بۆچوونانەی سەرەوەدا ئەوەیە، کە وێناکردنە سیاسییەکانی دونیای ئێمە لە جەوهەردا وێناکردنێکی ئایینین. پرۆسەی بەرهەمهێنانی وێنەکان، پرۆسەی ناونانی دیاردەکان، مەبەستم وێنە و ناونانە سیاسییەکانە، بە هەمان لۆژیکی بەرهەمهێنانی وێنە و ناونانی ئایینی کاردەکەن. بۆ فیکری ئایینی ناسینی دونیا گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە ئاسمان بناسین. لەفیکری ئایینیدا ناسینی دونیا دەبێ بەپلەی یەکەم بە مەبەستی ناسینی ئاسمان بێ، خودی دونیا خۆی ئاماژەیەکە بۆ ئاسمان و هیچیدی. لێرەوە کاتێک سیاسەت ئەم وێناکردن و میکانیزمە ئایینییانە قبوڵدەکات و دەیانکاتە بنەمای کارکردنی خۆی لەسەر دونیا و مێژوو و ناسینی واقیع و کێشەکانی، ئەوکات جگە لە نائومێدییەکی سیاسی و مەعریفی بەهیچ دەرەنجامێکی دیکە ناگەین. کاری سیاسەت ئەوەیە دونیا شیبکاتەوە، زۆرجاریش دژ شیکردنەوەکانی ئاسمان، سیاسەت دێت تا جۆرێک لە پراگماتیزم پیادەبکات، بچێتە ناو ململانێکانی سەر زەوییەوە، نووقمبێت لەناو کێشە و دەرەنجامە ساتەوەختییەکاندا، لەناو سیاقەکاندا مەلەبکات، گوێ لە دڵی زەمەن بگرێت، دەستبخاتە سەر نەبزی مێژوو، بە کورتی سیاسەت دەبێت کۆمەڵێ کار جێبەجێبکات، کە ئایین و لۆژیکی ئایینیی کەمنرخ، یان بێبایەخیان، دەکات.

بەبۆچوونی من، یەکێ لە گرنگترین دەرەنجامەکانی کاریگەری عەقڵیەتی دینی لەسەر سیاسەت لە دونیای ئێمەدا مانەوەی ئەو دوالیزمەیە، کە ژیانی سیاسی کوردیی شاقوڵییانە دابەشکردووە بەسەر دوو هێزدا و بۆتە هۆکاری ئەوەی تائێستاش لە دونیای سیاسی ئێمەدا "ئیجماعێکی سیاسی" دروستنەبێت. ئەگەر

لە سەدەی نۆزدەهەمدا ئایین توانیبێتی "ئیجماعێکی فەرهەنگی"، یان هیچ نەبێ ئیجماعێکی بەهێزتری لەئیجماعی سیاسی خوڵقاندبێت و میری میرنشینێک، یان شێخێ لە شێخەکانی تەریقەت، لەسەر بنەمای ئەو ئیجماعە ئایینیە ڕێژەییە توانیبێتی ژمارەیەکی بەرچاوی خێڵە جیاجیاکان و کەسانی سادەی ناو گوند و شارە کوردییەکان بەیەکەوە کۆبکاتەوە و حوکمیانبکات، ئەوا کێشەی سەرەکی لەم سەدەیەدا ئەوەیە ئیجماعی سیاسی نەیتوانیوە بچێتە شوێنی ئەو ئیجماعە ئایینیە و حیزبە کوردییەکان نەیانتوانیوە ئەو پرۆسەیە جێبەجێبکەن، کە میرنشینە کوردییەکانی سەدەی نۆزدەهەم، کەم تازۆر جێبەجێیاندەکرد.

ئایین بەوەی وێناکردنێکی گشتیتر بۆ ڕەمزە سەرەکییەکانی دەخولقێنێت، مەبەستم وێناکردنەکانی (خودا، بەهەشت، جەهەنم، فریشتە، شەیتان)ە، هەروەها ڕەهەندێکی ئەبەدی و ئەزەلیش بەو وێناکردنانە دەبەخشێت، بۆیە ئاسانترە کەسانێکی زۆر لە ژێر چەتری ئەو وێناکردنانەدا کۆبکاتەوە و وایان لێبکات خۆیان وەک هاوڕەگەز و هاوچارەنووس و هاودین ببینن. ئەمە جگەلەوەی فیکرەی مردن و لێپرسینەوە، هەمیشە دەیانخاتە بەردەم مەسەلەی "لەیەکبوردن" و "گەردن ئازادییەوە" و وایالێدەکات کێشە ناوەکییەکانیان لەگەڵیەکیدا لەیادبکەن. هەرچی سیاسەتە بۆی نەکراوە لەم ڕووەوە ئەم پرۆسانە جێبەجێبکات و ئەو وێناکردنانەی سیاسەت بەرهەمیهێناون لە گشتێتی خۆیاندا نەیانتوانیوە بگەنە ئاستی گشتێتی وێناکردنە ئایینیەکان و هەمان هێزی وێناکردنە ئایینیەکانیان هەبێت. بۆ نموونە هەرگیز مەسەلەی بوونی "یەک کوردستانی گەورە"، وەک ناوەندیترین ڕەمزی سیاسیی و نەتەوەیی ئێمە، نەیتوانیوە بچێتە شوێنی بوونی یەک خولوەند، یان هیچ نەبێت هەمان هێز و مۆتیڤی ویژدانی هەبێت. هەرگیز وێناکردنەکانی "بەهەشتی ئەو دونیا" شوێنی خۆی لە خەیاڵ و ویژدانی مرۆڤی ئێمەدا نەداوە بە "بەهەشتی وڵات"، هەرگیز حیزب نەچۆتە شوێنی فریشتەکان. لێرەدا سیاسەت لە

ئاستی ویژدانی و سایکۆلۆژی و ڕەمزی و فانتازیدا نەیتوانیوە هاویەشێکی کۆمەلایەتی، ویژدانی، سایکۆلۆژی بەرفراوان بەرهەمبهێنێت و هەمیشە بەدەست ئەو کەموکوڕییە کوشندەیەوە نالاندوویەتی. هەر ئەمەش قەیرانی ناسیۆنالیزمی کوردی لە ئاستە ویژدانی و ڕۆحییەکەیدا نیشاندەدات و هێما بۆ بۆشاییەکی ڕۆحی نەتەوەیی دەکات، کە تائەم ساتەی ئێستاشمان بەتاڵە و بەهیچ بارگەیەکی ویژدانی پڕنەکراوەتەوە.

-٨-

حیزب پێشنیاری نوخبەی نوێی کوردییە بۆ مێژووی هاوچەرخی کوردی و دەستپێشخەری ئەوە، بۆ وەلامدانەوەی ئەو کێشە سیاسییانەی کۆمەڵگای ئێمە لە نیوەی یەکەمی ئەم سەدەیەدا ڕووبەڕوویان بوویۆوە. حیزب دەزگای هەرەسەرەکی سیاسی کوردییە، کە دەربڕی ئیرادەی نوخبەی نوێیە بۆ گەڕان بە دوای چارەسەرێکی سیاسییانەی مەسەلەی کورددا. لە کۆمەڵگای ئێمەدا بەر لە ئامادەبوونی حیزب دوو دەزگای کۆمەلایەتی دیکە لە ئارادابوون و ڕۆڵی سەرەکیان بینیوە لە ڕێکخستنی هەوڵ و چالاکییەکانی مرۆڤی کورد و بەرنامەڕێژیی پرۆژەکانیدا. سیفەتی سەرەکی ئەو دوو دەزگایە ئەوەیە دوو دەزگای خۆڕسکن و زیاتر دەربڕ و هێمای کاری خۆڕسکانەی مرۆڤی ئێمەن لەسەر مێژوو. مەبەستم لەو دوو دەزگایەش مزگەوت و خێڵە. مزگەوت و خێڵ، دوو دەزگای کۆمەلایەتین، کە مرۆڤی ئێمە بەردەوام خۆی لەناویاندا دۆزیوەتەوە و بەپێی بەها و یاسا و داواکارییەکانیان ڕەوشت و هەڵوێستی نواندووە و لەوێدا ژیاوە و فێربووە و گەورەبووە، هاوکات هەر لەوێشدا مردووە. ئەم دوو دەزگایەش یەک ئەویدی

تەولوکردووە. مزگەوت لەئاستی ئایدیۆلۆژی و فانتازیادا، خێڵی بەرهەمهێناوەتەوە و خێڵـیش لەلایەن خـۆیەوە، بنەمـا مادییەکـانی بەردەوامبـوونی مزگەوتـی فەراهەمکردووە. هەردووکیشـیان بەسـەریەکەوە دوو سـنوری ئەسـتوور و پـۆلایین بـوون، کە کۆمەڵگـای کشـتوکاڵی کوردیـان پەرژینرێژکـردووە و نەیانهێشـتووە سنوورەکانی فراوانببێتەوە.

پرسیاری ئێمە لێرەدا ئەوەیە ئایا چ جۆرە پەیوەنـدییەک لەنێوان حیـزب و خێڵـدا هەیە؟ بەتایبەتی حیزب وەک دەزگایەک، کە ئیرادەی نوخبەی نوێی لەپشتەوەیە و خێڵیش وەک دەزگایەکی سروشتی، کە هێزە کۆمەڵایەتیەکانی ئێمەی ئۆرگانیزە و ڕێکخستوە؟ بەچ شێوەیەک ئەم دوو دەزگایە کاریان لەیەکدی کردووە؟ ئایا حیـزب توانیـویەتی خێـڵ ڕاکێشـێتە نـاو "کـایەی سیاسـی" ەوە و یاسـاکانی ئەو کـایەی بەسەردا بسەپێنێت، یاخود بەپێچەوانەوە خێڵ حیزبی ناچارکردووە لەناو پێکهاتەی سروشتی ئەودا و لەناو دونیای سنووردار و ئینتیما بچووکەکانی ئەودا، گیربخـوات؟ بەمانایەکی دیکە ئەگەر حیزب سـیمبۆلی وشـیاری سیاسـی تـازە بێـت و خێڵـیش سیمبۆلی واقیعێکی کـۆمەڵایەتی پێشـوەخت پێـدراو، ئایـا چ جـۆرە پەیوەنـدییەک لەنێوان ئەو دوولایەنەدا هەبووە؟ پێش وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە با سـەرەتا لەو ڕاسـتییەوە دەسـتپێبکەین، کە دونیـای کـۆمەڵایەتی ئـێمە لە ناوەڕاسـتی سـەدەی نۆزدەهەمەوە هەڵگری دوو نـوخبەی کـۆمەڵایەتییە، "نـوخبەی نـوێ" و "نـوخبەی تەقلیـدی". پرۆسـەی خـۆ تـازەکردنەوەی ئیمپراتـۆریەتی عوسـمانی لە ڕۆژگـاری "تەنزیماتەوە" هۆکاری لەدایکبوونێکی هێمن و لەسەرخۆ، بەڵام بەردەوامی نوخبەی نوێ بووە، لەهەمانکاتیشدا "تەنزیمـات" خۆشـی نـوخبەی تەقلیـدی لەکوردسـتاندا بەهێز و بەهێزتر کردووە لە ڕێگای دانانی یاسای خاوەندارێتی زەوی و دابەشکردنی بەشـێکی زۆری زەوی و زاری کوردسـتان بەسـەر شـێخ و پیـاوە ئـاییینیە دەسەڵاتدارەکاندا.

ئێمە گوتمان حیزب هەڵگری ئیرادەی نوخبەی نوێ و پڕۆژەکانی ئەم نوخبەیەیە، هەروەها ئەوەشمان وت، کە دونیای ئێمە دوو جۆر نوخبەی بەخۆیەوە دیوە، ئێستا دەکرێ وشیاریی سیاسی و کۆمەلایەتیش لە دونیای ئێمەدا بەپێی نوخبەکان بۆ دوو جۆر وشیاری دابەشکەین: "وشیاری تەقلیدی" و "وشیاری نوێ". مەبەستم لە وشیاری تەقلیدی کۆی ڕەوش و فانتازیاکانی ئایین و سیمبۆلە تەقلیدییەکانی ناو واقیعی کوردییە، ئەو سیمبۆلانەی، کە هالاوی ئایینیان لێهەڵدەستێ و هەر لەسەر زەمینی ئایینیشەوە هاتونەتە ناو مێژووی ئێمەوە. ئەم وشیاریە ئایینییە لەسەرێکەوە وابەستەی ئەو چوارچێوە کۆمەلایەتییەیە، کە بە خێلمان ناونووس کرد، بەلام لەهەمانکاتدا وابەستەی ئەو چوارچێوە سیاسیە گەورەیەشە، کە لە فۆرمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا لەئارادابووە. بەمانایەکی دیکە وشیاری تەقلیدی ئێمە لەسەرێکەوە وابەستەی خێڵ و کۆنفیدراسیۆنەکانی خێڵە، لەسەرێکی دیکەشەوە وابەستەی ئەو پەیوەندییەیە، کە خێڵ و کۆنفیدراسیۆنی خێڵە کوردییەکانی بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەوە، وەک ئیمپراتۆریەتێکی ئایینی، گرێداوە. نوخبەی تەقلیدی بەهۆی ئەو وشیارییە تەقلیدییەوە، کە ئایین هێڵە گشتیەکانی دەنەخشێنێت، ڕاستەوخۆ شانی داوەتە سەر ئەو سەرمایە ڕەمزییەی ئایین بۆی فەراهەمکردووە، ئەم سەرمایەیەش پەیوەندییەکی پتەوی هەیە بەو دونیا ڕۆحی و ڕەهەندە ئایینیەوە، کە بەشێکی گەورەی کەسایەتی مرۆڤی کوردی داگیرکردووە و ماناکانی بوون، ژیان، مێژوو، دونیا و مەبەستەکانی دیکەشی بۆ پێناسە و دەستنیشانکردووە.

ئەم سەرمایە ڕەمزییە ئەو هێز و دەسەلاتەی بەخشیوە بە نوخبەی تەقلیدی، کە بتوانن واقیعی سیاسی و کۆمەلایەتی ئێمە کۆنترۆڵبکەن و شوێنی خۆیان لە لوتکەی هەرەمی کۆمەلایەتیدا دەستنیشانبکەن. بێگومان ئەم شوێنە کۆمەلایەتییە تولانای ئەم نوخبەیەی هێجگار بەهێز کردووە و خاوەنەکانی هەم وەک "سەرکردەی

ڕۆحـی" و هەم وەک "سـەرکردەی دونیـایی" ناسـاندووە. لێـرەوە ئاسـانبووە ئەم سەرکردانە سەرمایە ڕەمزییەکەیان بگۆڕن بە سەرمایەیەکی ئابووری و کەڵەکەبوونی سـەرمایەی ڕەمـزی بگـۆڕنە سـەر کەڵەکەبـوونی سـەرمایەی ئـابووری. ئەمەش پرۆسەیەکە کاریگەریی گەورەی لەسەر ژیانی سیاسیی ئێمە جێهێشتوە، بەتایبەتی لەسەر دەستنیشانکردنی بڕی تواناکانی نوخبەی نوێ، کە لە هەلومەرجێکدا خـۆی دۆزیـوەتەوە دەبـوایە دژ بەهەردوو شـێوەکەی سـەرمایەی نـوخبەی تەقلیـدی لەململانێدابێت. نوخبەی تەقلیدی، لەپاڵ ئەو هاوکێشەیەی سەرەوەدا بۆتە خاوەنی شوێن و جێ و هەڵوێستێکی کۆمەڵایەتی هێجگار پتەو بەهێز. هەوڵی سەرەکی ئەم نـوخبەیەش لە ناوەڕاسـتی نیـوەی دووهەمـی سـەدەی نـۆزدەهەمەوە بریتیبـووە لەپاراسـتنی ئەو هاوکێشـەیە و پاراسـتنی وشـیاری تەقلیـدی وەک ژێرخـانی ئەو سەرمایەیەی هەڵگریەتی. وەک ئاشکرایە زۆربەی هەرە زۆری سـەرکردە سیاسـی و کۆمەڵایەتییەکانی ئێمە، سـەر بەم نـوخبەیە بـوون و هەم هەڵگـری سـەرمایەیەکی ڕەمزی بەهێز و هەم خاوەن سەرمایەیەکی ئابووری پتەویـوون. زۆربەی هەرە زۆری ئەندامانی ئەم نوخبەیە لەیەک کاتدا هەم شێخ بوون، واتە هەڵگری سـەرمایەیەکی ڕەمزی دینی گەورە و هەم سەرۆک خێـڵ، واتە هەڵگـری سـەرمایەیەکی ئـابووریی، گەورەش بـوون. لە شـێخ عوبەیـدوڵای نەهـریەوە بـۆ شـێخ مەحمـود و لە قـازی محەمەدەوە بۆ بـارزانی. سـەرکردە سیاسـییەکانی کـورد دەربڕێکـی ڕاسـتگۆی ئەو بۆچوونانەی سەرەوەن.

ئەوەی دەبێـت لێـرەدا جەخـدی لەسـەربکەین ئەوەیە، کە دروسـتبوونی حیـزب لە کۆمەڵگای ئێمەدا نەبۆتە هۆی لاوازبوونی نوخبەی تەقلیدی کوردی، بەپـێچەوانەوە ئەم نوخبەیە لە دوای دامەزرانـدنی حیـزبەوە لە یەک کاتـدا بـووەتە خـاوەنی سـێ شوێنی کۆمەڵایەتی گرنگ:

یەکەمیان: شوێن و جێی لەناو پێکهاتەی خێڵ دا، وەک سەرۆک خێـڵ و پیـاوانی

ڕیزی یەکەمی خێڵ.

دووهەمیان: شوێن و جێی وەک پیاوانی ڕۆحی و ئایدیۆلۆژیستی خێڵ.

سێیەمیان: شوێن و جێی لەناو دەزگاکانی حیزبدا وەک سەرکردە و بەرپرس.

هەموو ئەمانە وایانکردووە حیزب لە ئەزموونی ئێمەدا تا ڕادەیەکی گەورە ببێتە ماڵی خێڵ و خێڵیش بە ماڵی حیزب، حیزب ببێتە درێژکراوەی خێڵ لەناو جەستەی کۆمەڵایەتیدا و خێڵیش بە درێژکراوەی جەستەی حیزب لەناو هەناوی خۆیدا. لەم هاوکێشەیەدا نوخبەی تەقلیدی لەلایەکەوە سنوورەکانی دەسەڵاتی خێڵی لەڕێگای حیزبەوە فرلوانکردووە، لەلایەکی دیشەوە سنوورەکانی دەسەڵاتی حیزبی لەناو خێڵدا سنووریەند و بەرتەسککردۆتەوە.

یەکەمین دەرەنجامێک لەم دۆخەوە بەدەستیبهێنین گۆڕینی حیزبە لە دەزگایەکی ئیرادەگەرەوە، لەدەزگایەکەوە، کە وشیاری سیاسی نوێ دروستیکردووە بەدەزگایەکی نیمچە سروشتی، نیمچە خۆڕسک. دەزگایەک، کە بەشێکە لە دونیای تەقلیدی و لەدواجاردا بوونی بە هێزێک بۆ پاراستنی ئەو دونیا تەقلیدییە. ئەمەش لەزۆرجاردا بەتاڵکردنەوەی حیزب بووە لە هەر گوڕ و توانا و مەیلێکی نوێگەرانە. دەرەنجامی دووهەم بریتیە لەبەتاڵکردنەوەی کاریگەریی وشیاری لەسەر واقیع و دابڕینی واقیع لە هەموو بەرهەمهێنانەوەیەکی ڕەخنەگرانەی لە ئاستی فیکردا. ئەمەش مانای دابڕین و بێبەشکردنی واقیع لە هەر هەنگاوێکی ڕاستەقینە بە ئاراستەی گۆڕین و تێپەڕاندن و لەبەریەکهەڵوەشاندنەوەی بنەما تەقلیدییەکانی مانەوەی. لێرەدا دەکرێت قسە لە قرتاندنی ئەو پەیوەندییانە بکەین، کە دەشێت وشیاری لە ڕێگەیانەوە کاریگەرییەکانی خۆی لەسەر مێژوو و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی پیادەبکات و کەم تا زۆر ناچار بە گۆڕانیان بکات. دەرەنجامی سێهەم بریتیە لە کوشتنی دەزگا و عەقڵیەتی دەزگایی. تەسلیمکردنەوەی حیزب بە خێڵ مانای ڕەتکردنەوەی دەزگا سەربەخۆکانی ئەودیو پێکهاتەی تەقلیدی و بەخشینەوەی

هەموویان بە لۆژیکی خێڵ و قازانجەکانی خێڵ.
هەموو ئەمانەی سەرەوە وامان لێدەکات بڵێین، دەسەڵات لەم پێکهاتەیەی سەرەوەدا شوناسێ وەردەگرێت، کە بریتییە لە دەسەڵات لە غیابی وشیاری و دەزگا و مەعریفە و کۆنترۆڵ و لێپرسینەوەدا، دەسەڵاتێک لە دەرەوەی هەموو پەیمانێکی کۆمەڵایەتیدا، دەسەڵاتێک شانیداداوەتە سەر تەراتوبیەت و هیرارکیەتی ناو خێڵ و پەیوەندییەکانی خزمخواهی. بەکورتی دەسەڵاتێکی پاتریارکی، کە لە لوتکەی هەرەمەکەدا سەرکردە و لە بنکەکەشیدا هەموو حیزب، یان هەموو نەتەوە ئامادەیە، بەقسەی فۆکۆ لە لوتکەدا دەسەڵاتی "شوانێک "و لە بنکەدا "ڕەعیەتێک"، کە دەکرێتە گاڕانەوە. (٣) لێرەدا دەشێ بەسوودوەرگرتن لەو ئارکیۆلۆژیایەی فۆکۆ بۆ دەسەڵاتی سیاسی لە کۆمەڵگای کۆندا کردویەتی، ئەو ڕاستییە دووبارەبکەینەوە، کە دەسەڵاتی سیاسیی لای ئێمە، لە ژێر کاریگەریی ئەو بنەما ئایینی و شوێنگە سۆسیۆلۆژی و ڕەمزییەی لە سەرەوە هێمامان بۆ کرد، دەسەڵاتێکە لەپاڵ پەیوەندیی شوان و ڕەعیەتدا سەقامگیرە، مەبەست لەم دەسەڵاتەش ئەوەیە سەرکردەیەک مافی ئەوە بەخۆی دەدات وەک شوانێک هەڵسوکەوتبکات و میللەتێکیش وەک ڕانەمەڕێک بەڕێوەبەرێت. بێگومان لە دونیای ئێمەدا زۆرجار شوانی ناو حیزب و شوانی ناو خێڵ هەردوکیان یەک کەس بوون و سروشتی سەرکردایەتی کۆمەڵایەتی لە دونیای ئێمەدا بەم شێوەیە بووە.
ئەگەر ئەو ڕایەی "برنارد بادی"شمان بەڕاست زانی، کە دەڵێت لە دونیای ئیسلامدا تائێستاش "سەرزەمینی" و "ئاسمانی" لەیەکدی جیانەکراوەتەوە و بەتەواوی هەردوکیان ڕژاونەتە ناو یەکدیەوە (٤)، ئەوا بە ئاسانی دەشێ شوێنی کۆمەڵایەتی شوانەکان چ لەناو حیزب و چ لەناو خێڵدا، بە شوێن وجێی ئاسمانیانەی خوداوەند، لە وێناکردنەکانی مرۆڤی ئێمەدا بۆ سەرکردە بدۆزینەوە. هەر ئەمەشە پاڵ بەئەندامێکی پەرلەمانی کوردییەوە دەنێ ڕایگەیەنێت، کە مەسعود بارزانی وەک

سەرکردە لەوە پیرۆزترە بچێتە ناو پەرلەمانی کوردییەوە و پەرلەمان وەک باڵادەستترین دەزگای سیاسیی ئێمە لە مەقامی ئەو سەرکردەیە وەک 'پیاوێکی پیرۆز' کەمبکاتەوە. بەکورتی نوخبەی تەقلیدی لە چوارچێوەی ئەو پەیوەندییانەی سەرەوەدا ناتوانێ جەستەی خێڵ و جەستەی حیزب، دەسەڵات لەناو خێڵ و دەسەڵات لەناو حیزبدا، پەیوەندییەکانی ناو خێڵ و پەیوەندییەکانی ناو حیزب، شێوازی ئۆرگانیزەی حیزب و شێوازی ئۆرگانیزەی خێڵ لەیەکدی جیابکاتەوە. ئەم نوخبەیە حیزب دەکاتە بەشێک لە خێڵ و خێڵیش بەبەشێک لە حیزب.

ئێستا کاتی ئەوە هاتوە تەماشای نوخبەی نوێ و ئەو دونیا سیاسی و ئایدیۆلۆژی و فانتازیە بکەین ئەم نوخبەیە بە کۆمەڵگای ئێمەی بەخشیوە. بێگومان نوخبەی نوێ ڕۆڵێکی بەرچاوی بینیوە لە گۆڕینی وشیاری ئایینی ئینسانی ئێمەدا بە وشیاری سیاسی و ئەو هەنگاوەی بە کۆمەڵگای ئێمە هەڵهێناوە، کە تێیدا ئایین تا ڕادەیەک شوێنی خۆی بە سیاسەت بدات. ئەم نوخبەیە هەر لە سەرەتاوە لەناو سیاسەت و گۆڕانە سیاسییەکاندا لەدایکبوو. هەر لەسەرەتاوە لەگەڵ دروستکردنی کۆڕ و کۆمەڵەی ڕۆشنبیری و سیاسی و ڕۆژنامە و گۆڤار و ئەدەب و نوسیندا هاتەکایەوە. ئەم نوخبەیە ئامادەگی ڕۆژئاوا لە دونیای ئێمەدا لە فاکتەرە هەرە بەهێزەکانی لەدایکبوون و چالاکبوونیەتی. هەروەها پرۆسەی مۆدێرنیزەکردنی کۆمەڵگای ئێمە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە و چارەکی یەکەمی ئەم سەدەیەدا، بنەما ماددییەکانی لەدایکبوونی لەناو نەخشەی سۆسیۆلۆژیی کۆمەڵگای کوردییدا، فەراهەمکرد. ئەم نوخبەیە ڕەخنەگرانە لەدایکدەبێ، مۆدێرنانە دەیەوێت بژی، بەڵام ڕەخنە و مۆدێرنەیەک، کە هەڵگری یۆتۆپیایەکی کۆنکرێت و ڕادیکال نەبووە. مۆدێرنەی ئەم نوخبەیە زۆرجار مۆدێرنەیەکی کورتکراوە بووە بۆ کۆمەڵێ وەعز و ئامۆژگاری، بۆ بانگێشەکردن بۆ کۆمەڵێ گۆڕانی تایبەت لەناو پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ئێمەدا، کە زیاتر بەئاقاری پەروەردە و کێشەی چارەسەرکردنی

نەخوێندەواری و بنیاتنانی قوتابخانە و کۆمەڵە مافێکی سەرەتایی بۆ ئافرەتاندا تێپەڕیوە، نەک بەرنامەیەکی کۆمەڵایەتی سیاسی بەرفراوان لەڕێگایەوە بتوانێت بنەما تەقلیدییەکانی کۆمەڵگای ئێمە هەڵوەشێنێتەوە. بەرنامە کۆمەڵایەتییەکەی ئەم نوخبەیە سنووری بەرنامەیەکی بەرتەسک و ڕیفۆرمیستییانەی سەرەتایی تێنەپەڕاندووە و بۆی نەکراوە بەرزبێتەوە بۆ ئاستی پرۆژەیەکی ڕەخنەیی قووڵی هەمەلایەن و لە ڕەخنە لە بونیادی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانەوە دەستپێبکات و بەرزببێتەوە بۆ ڕەخنە لە عەقڵیەت و فانتازیای باڵادەست. ڕەخنەی ئەم نوخبە تازەیە ڕەخنەیەکی گیرخواردو بووە لە نێوان خوێندنەوەی نادروستی واقیعی کوردی لەلایەک و ناسین و تێگەیشتنی هەڵەی تیۆرەکانیش لەلایەکی دیکەوە. ڕەخنەی ئەم نوخبەیە ڕەخنەیەک بووە لە دەرکەوتە بەرچاوەکانی دیاردەکان، نەک لە ڕەگوڕیشە قووڵ و نادیارەکانیان. ئەم ئاستە ڕووکەشەی ڕەخنە، وادەکات دواجار نوخبەی تەقلیدی بەئاسانی و بەبێ گۆڕانێکی قووڵ و ڕادیکاڵ لە پێکهاتە و عەقڵیەت و بۆچوونەکانیدا، هێڵە گشتیەکانی ئەم ڕەخنەیە قبووڵکات و بیکاتە بەشێک لە پرۆژە و بەرنامەی کۆمەڵایەتی خۆی، بیکاتە پرۆگرامی بەرەنگاربوونەوەی تەحەدا کۆمەڵایەتییەکانی واقیعی کوردیی، بەڵام لە فۆرم و ناوەڕۆکێکی وادا، کە هەم بنکە کۆمەڵایەتییەکانی خۆی وەک نوخبەیەکی تەقلیدی بپارێزێ و هەم ببێتە فاکتەرێکیش بۆ خۆنوێکردنەوە و خۆگونجاندن لەگەڵ هەلومەرجە نوێکانی واقیعی ئێمەدا. وردتر قسەبکەین دەکرێ بڵێین بەرنامەی کۆمەڵایەتی نوخبەی نوێ ئەوەندە کەم خوێن و لاواز و بێ مەترسی بووە بۆ سەر واقیعی کۆمەڵایەتی ئێمە و شێوازی ڕێزبەستن و سیستماتیزەبوونی هێزەکانی ناوی، زیاتر لەوە دەچێ بەرنامەیەک بێ ئەم نوخبەیە بۆ ڕزگارکردنی نوخبەی تەقلیدی نووسیبێتی، نەک بەرنامەیەک دەربڕی شوناسی خۆی بێ وەک هێزێکی کۆمەڵایەتی نوێ، کە واقیع لەبەردەم پرسیاری گۆڕانی ڕادیکاڵ و بنەڕەتیدا ڕابگرێت و

ئەگەرەکان و ئاسۆی گۆڕانەکان، گەورەتر و هەمەلایەنتر بکات.
نوخبەی نوێ و نوخبەی تەقلیدی پێکەوە لەدەرگای سیاسەت دەدەن و پێکەوە دەچنە ژوورەوە بۆ ناو دونیای حیزب و ڕێکخراوە سیاسییەکان، بەڵام ئەم هاوکاتییە نەبۆتە هۆی ئەوەی نوخبەی نوێ ببێتە خاوەنی حیزب و سەرکردایەتیکردنی. بێگومان ئەم مەسەلەیە لەزۆر ڕووەوە وابەستەی توانا ڕەمزی و واقیعییەکانی ئەم نوخبەیەیە لە بەراوردکردنیدا بە توانا ڕەمزییەکانی نوخبەی تەقلیدی. ئەم ناهاوسەنگییەی هێز و نفوزی کۆمەڵایەتی سەرەتای دابەشبوونێک دروستدەکات، کە دواتر، دوای ساڵانێکی درێژی پێکەوە ژیانی ناچارانە، لە ناوەڕاستی شەستەکاندا، دەبێتە هۆی دابەشبوونی ئەو ماڵەی پێکەوە کۆیکردبوونەوە. لەو ڕۆژگارەدا و دوای مێژوویەکی درێژی پێکەوەژیان نوخبەی نوێ ماڵی خۆی جیادەکاتەوە. لە ناوەڕاستی شەستەکانەوە ئەم دوو نوخبەیە بەئاشکرا دەکەونە ململانێ لەگەڵ یەکیدا. سەرەتای ئەم ناکۆکیە نوخبەوییە، وەک وتم، لە سەرەتای دروستبوونی بزوتنەوە سیاسییەکان خۆیانەوە لە دونیای ئێمەدا دەستپێدەکات، کە دەشێت بیگەڕێنیەوە بۆ ڕۆژگارە سەرەتاییەکانی دروستبوونی ئۆرگانە سیاسییەکان و تەقینەوەی ناکۆکییەکانی نێوان کورد و دراوسێکانی. ئەم ناکۆکییە دەرەنجامی ئەو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی و مەعریفییانەیە، کە کۆمەڵگای ئێمە لەسەرەتاکانی ئەم سەدەیەوە دووچاری بووە. لەناو گروپی "تەعالی و تەرەقی"دا، ئەفسەرەکان و پاشاکان لەململانێیەکی سەختدا بوون، لەبزوتنەوەی شێخ مەحمود دا ناکۆکی نێوان خوێندەواران و ئۆردوگای شێخ ناکۆکییەکی بەرچاو و سەخت بووە، دامەزراندن و گەشەکردنی پارتی دیموکراتی کوردستان و مەسەلەی سەرکردایەتی لە ناویدا، دەربڕێکی زیندووی بوونی دوو مەیلی جیاواز و ئامادەبوونی دوو نوخبەی جیاوازە لەناو هەناوی ئەو حیزبەدا بووە.

بە بۆچوونی من کێشەی هەرە سەرەکی نوخبەی نوێ لە نەبوونی ئەو "سەرمایە ڕەمزی"ەدایە، کە نوخبەی تەقلیدی هەڵگریبووە. لە کۆمەڵگایەکی کشتوکاڵی وەک کۆمەڵگای ئێمەدا، کۆمەڵگایەکی خۆڕێکخەر و دامەزراو لەسەر بنەمای "پەیوەندییەکانی خزمخواهی"، کۆمەڵگایەک تیایدا مۆدێرنە تەنها چەند هەنگاوێکی شەرمنی ناوە و بەمەش مەوقیعی کۆمەڵایەتی زۆر هێزی تەقلیدی خستۆتە مەترسییەوە، دەڵێم لە کۆمەڵگایەکی ئاوادا سەرمایەی ڕەمزی ڕۆڵێکی گرنگ و چارەنوسساز دەبینێ لە دەستنیشانکردنی ئەو هێزە کۆمەڵایەتییەدا، کە دەشێ باڵادەستیی کۆمەڵایەتی خۆی بسەپێنێ و سەرکردایەتی کۆمەڵایەتی بگرێتە دەست. لەڕاستیدا ململانێی سەرەکی لە کۆمەڵگایەکی لەو بابەتەدا ململانێیە لەنێوان دوو جۆری جیاوازی سەرمایەی ڕەمزی و ململانێیە لەسەر پێشنیارکردن و سەقامگیرکردنی سیستمێکی ڕەمزی نوێ، کە ئینسان لەڕێیەوە ماناکان بەرهەمبهێنێت و شوناسی خۆشی لەسایەی ئەو سیستمەدا دروستبکات.

لاوازیی سەرمایەی ڕەمزی لەپێکهاتەی نوخبەی نوێدا لاوازییەکی بونیادییە و ڕاستەوخۆ وابەستەی ستراکتوری کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی و پێکهاتە کولتوری و ڕۆحی و ڕەمزییەکەیەتی. بێگومان چارەسەری ئەم کەموکوڕییە بونیادییە، بەبێ هەوڵدانێکی ڕادیکاڵانە بۆ گۆڕانی خودی ئەو پێکهاتە کۆمەڵایەتی و ڕەمزییە و گۆڕانی ئەو سەرمایە ڕەمزیەش، کە نوخبەی تەقلیدی ماناکانی بوونی خۆی و هێزە مەعنەویەکەشی لێوە هەڵدەهێنجێت، کارێکی بێهودە دەبێت. زەحمەتە هیچ گۆڕانێکی ڕاستەقینە لە کۆمەڵگای ئێمەدا ڕوویدات بەبێ جێگرتنەوەی سەرمایەی ڕەمزی تەقلیدی بە سەرمایەیەکی دیکەی ڕەمزی، کە هێز و ماناکانی خۆی لە پرۆسەی گۆڕان و مۆدێرنکردنەوەی کۆمەڵگای ئێمەوە وەربگرێت، نەک لە ئایین و نفوزی خێڵەکییەوە. بەبێ تێکشکاندنی ئەو کۆسپ و بونیادە ڕێگرانەی بەردەوام فوو بە ڕۆحی سەرمایەی ڕەمزی تەقلیدیدا دەکەن، هەر

لە پێکهاتەی خێزان و پەیوەندیی نێوان گروپە کۆمەڵایەتیەکان و تاکەکانەوە، تا بەو غەیبانیەتە ئاپینیە دەگات، کە ڕۆحی ئینسانی ئێمەی لەناوەوە ئیفلیجکردووە، دەڵێم بەبێ تێکشکانی بنەماکانی ئەو پەیوەندییانە کارێکی مەحاڵە بنەما کۆمەڵایەتییەکانی نوخبەی تەقلیدی لاواز و لێژیکرێت. بەمانایەکی دیکە بەبێ تێکشکاندنی پایە ڕۆحی و سایکۆلۆژییەکانی سەرمایەی ڕەمزی تەقلیدی، لە تێکشکاندنی پایە و دەسەلاتی ئاپینیەوە بۆ کۆی ئەو پاشخانە ئەخلاقی و ڕۆحییەی ئەو پایانەی لەسەر ڕاوەستاوە، ناکرێت بیر لە هیچ پرۆژەیەکی مۆدێرن و لاوازبوونی تەقلیدیەت بکەینەوە. گرفتی هەرە سەرەکی مێژووی ئێمەش لەوەدایە، کە نوخبەی نوێ هەڵگری پرۆژەیەکی لەم بابەتە نەبووە و نییشە. وەک نیشانیشمان دا بەرمانە کۆمەڵایەتییەکەی ئەم نوخبەیە هەڵگری قووڵاییەکی ڕەخنەیی ڕادیکاڵ نەبووە و لەئاستی تەحەداکردنی پایە تەقلیدییەکان و بەناڕەواکردنی بوون و مانەوەی ئەو پایانەدا نەبووە. بەمەش نوخبەی نوێ لە ناوەندێکدا کاریکردووە، کە نە ئێستاییبوونی ئەو ناوەندە و نەئاییندەییبوونیشی، ئێستاییبوون و ئاییندەییبوونی ئەو نەبووە و لە غیابی ستراتیژێکی ڕەخنەیی و شارستانی ڕادیکاڵدا، دواجار کەوتۆتە ژێر کاریگەریی پایە تەقلیدییەکانی کۆمەڵگای کوردیی و ژێر کاریگەری نۆرم و بەهاو ڕەمزەکانی ئەو دونیایەوە. ئەمەش بە پلەی یەکەم مانای ئەوە بووە، کە نوخبەی نوێ بەردەوام جەنگێکی کردووە، کە ستراتیژ و تاکتیکەکانی لەناو سەرزەمینی تەقلیدیەتدا بووە، نەک لە سەرزەمین و دونیایەکدا ئەم خۆی دەستنیشانی کردبێت و خۆی ئامادەیکردبێت بۆ بەرەنگاربوونەوە. بەمەش نوخبەی نوێ ئاڕادەیەکی زۆر هێزی بەرەنگاربوونەوە و هێزی نوێکردنەوەی خۆی لەدەستداوە و بەشێوەیەک لە شێوەکان پلانەکان و تواناکانی تەسلیم بە تەقلیدیەت بۆتەوە.

بەکورتی تێکشکانی پرۆژەی تەقلیدیەت و تێکشکانی دەسەلاتی نوخبەی تەقلیدی

تەنیا و تەنیا بە کارکردنێکی وشیارانە لەسەر پێکهاتەی تەقلیدی واقیعیی کوردی و مرۆڤی کورد و کولتوری کوردی و ئەو فەزا ڕەمزیە بالادەستە دەبێت،کە تێیدا هەم خودی واقیع و هەم خودی مرۆڤەکانی تێدا بەندکراوە. ئەم فەزا ڕەمزیەش فەزایەکە ئینسانی ئێمەی لەناو بازنە بچووک و بەرتەسکانەدا نیشتەجێکردووە، کە نوخبەی تەقلیدی پایەکانی خۆی لەسەر بنیادناوە. بەبێ تێکشکاندنی ئەو بازنە بچووکانە، لە تێکشکاندنی بونیادی خێڵەوە، بۆ بونیادی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیە بەرتەسکەکان، لە تێکشکاندنی ئینتمای بچووکەوە بۆ خێزان و خێڵ و ناوچە بۆ تێکشکانی ڕۆحانیەتی ئایینی چەپێنەر و مۆنۆپۆلکردنی دونیا ڕەمزییەکەی مرۆڤی ئێمە، زەحمەتە بکرێت پایەکانی دەسەلاتی تەقلیدی لەدونیای ئێمەدا لەبەریەکدی هەلوەشێندرێتەوە. بەبێ هەلوەشاندنەوەی ئەم پایانەش ناکرێت بیر لەهیچ پرۆژەیەکی گۆڕانی کۆمەلایەتی و سیاسی تەندروست بکەینەوە و ناکرێت خۆمان بۆ دروستکردنی دونیایەک ئامادەکەین جیا لەوەی لەئێستادا لەئارادایە. نوخبەی نوێ ئەبێت هەلگری پرۆژەیەکی کۆمەلایەتی و سیاسی و کولتوری وابێت، کە ئاسۆی نوێ بۆ ئینتیمای مرۆڤی ئێمە پێشنیاربکات، ئاسۆیەک لەدەرەوەی ئەو ئینتیما بەرتەسکانەی لەسەرەوە باسمانکردن، کە بەپلەی یەکەم وەک بەردی بناغەی سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی دەسەلاتی نوخبەی تەقلیدی کاردەکەن.

لەدونیای ئێمەدا زانیارییەکی دروست دەربارەی واقیعی سۆسیۆلۆژی کوردی و دونیای ڕەمزی مرۆڤی ئێمە لەئارادا نییە. دۆگما فیکرییەکان ناهێلن واقیع ببینرێت، دەسکەوتی سیاسی کورت و بچووک لێناگەرێت ئاسۆکانی گۆڕانی ستراتیژی ببینین. لەهەمانکاتدا نوخبەی نوێ لە کوردستاندا ترسێکی ڕۆشنبیری و سیاسی وای هەلگرتووە، وایلێکردووە نەوێرێت دەست بۆ تازەکردنەوەی بونیادە تەقلیدییەکانی کۆمەلگای ئێمە بەرێت. هەموو ئەمانەش نەک نوخبەی تەقلیدی لاوازنەکردووە و پرۆژەکانی تێکنەداوە، بەلکو بەهێز و بەهێزتری کردووە و ئاوی

حەیاتی بە پلانە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگیەکانیدا کردووە. لەم ناوەندەدا، دژلیەتی ئەو دوو نوخبەیە بۆ یەکدی، بەوەی لەسەر بونیادێکی عەقڵی و بونیادێکی فانتازیی ئایینی و هەموو ئەو دوالیزمانە دروستبووە، کە ئایین بۆ پۆلێن و ناساندن و هەڵسەنگاندنی دونیا بەرهەمیاندەهێنێ، جگە لە ڕەتکردنەوەی موتڵەقی یەکدی و گوناهبارکردنێکی سەرتاسەریی هیچی ئەوتۆی لێ دروستنەبووە. نوخبەی تەقلیدی هەمیشە نوخبەی نوێی بە جاش و بەکرێگیراو و ئەفەندی و کتێبی و هتد... دلوەتە قەڵەم و نوخبەی نوێش بەردەوام نوخبەی تەقلیدی بەکۆمپرادۆر و پیاوی ئیمپریالیزم و داردەستی کۆنەپەرستی و هتد... ناساندووە. لەهەناوی ئەم ململانێیەدا هەمیشە یەک بەهەشت هەبووە، ئەویش بەهەشتی "ئێمە"بووە بەرامبەر بەجەهەنمی "ئەوان"، یەک فریشتە هەبووە ئەویش "ئێمەین"، بەرامبەر بەشەیتانێک، کە "ئەوان"ن، یەک نیشتمانپەروەر هەبووە ئەویش "ئێمەین"، بەرامبەر بەخیانەتنامەی "ئەوان".

دەشێت پێداگرتنی هەمیشەیی نوخبەی نوێ لەسەر خەباتی چەکدار وەک هەوڵدانی ئەم نوخبەیە ببینین بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییانەی نەبوونی سەرمایەی ڕەمزی خولقاندوویەتی، بەڵام ئەم هەوڵدانە لە سایەی هاوکێشەی تەرازووی هێزەکاندا دیسانەوە تاڕادەیەکی زۆر ئەم نوخبەیەی بردۆتەوە باوەشی خێڵ. جگە لەمەش بەوەی، کە نوخبەی نوێ تائەم ساتەی ئێستاشمان هەڵگری پرۆسەی ڕەخنەگرتنێکی گشتی و سەرتاسەریی نییە لە کۆمەڵگای ئێمە و تێگەیشتنێکی دیکەی بۆ دەسەلات و بۆ شێوەی ڕێکخستنی کۆمەڵگا و پەیوەندییەکان پێشنیارنەکردووە، بۆیە نەیتوانیوە گۆڕەپانی ململانێیەکی کۆمەڵایەتی نوێ پێشنیارکات کەتێیدا هاوکێشەکان بەلای خۆیدا پارسەنگبکات. نوخبەی نوێ تائێستاش بەهەمان تێگەیشتنی تەقلیدی و بەهەمان وێناکردنی ئایینی شوان/ ڕەعیەت بۆ دەسەلات دەڕوانێت و بەتەواوی لە ژێر جەبری کوێرانەی بونیادە

کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگای ئێمەدا کاردەکات. لێرەوە ئەم نوخبەیە هەمان ئەو دوالیزمە بەرهەمدەهێنێتەوە، کە هەر لە سەرەتاوە مەعقولیەتی سیاسیی ئێمە گیرۆدەیەتی و بەدەستییەوە دەناڵێنێت.

لە درێژەدان بەململانێکردنێکی دەسەڵاتگەرانە لەگەڵ یەکتیدا نوخبەی نوێ هەموو ئەو پرۆژانە لەبیردەکات، کە دەشێت دەرەنجامی هەنووکەییان نەبێت، بەڵام لەئاستی ستراتیژیدا دەرەنجامی ئاییندەیی گرنگ بدەن بەدەستەوە و هەنگاوێکی راستەقینە و رادیکاڵیش بن بۆ تێکشکاندنی نەگۆڕەکانی ئەو بونیادە و سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی هەبیتۆسی کۆمەڵایەتی ئێمە. بۆ ڕونکردنەوەی ئەم بۆچوونە من مەسەلەی هەڵبژاردنەکەی ساڵی ١٩٩٢ و ڕووداوەکانی دوای ڕاپەڕین بە نموونە دەهێنمەوە تا نیشانیبدەم چۆن کۆی کارکردنی هەردوو نوخبەکە نەک نەبووە هۆی خۆشنەکردنی زەمینەیەک بۆ خولقاندنی ئیجماعی سیاسی و ڕزگاربوون لە جەبری پرۆکێنەری دوالیزمە ئایینی و سەرسەختەکانی ناو سیاسەتی کوردی، نەک نەبووە هۆکاری باڵکردنەوە و ڕەهاکردنی هێزە نادیار و شاراوەکانی ناو کۆمەڵگەی مەدەنی کوردی، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئاکاری ڕۆژانەی ئەو دوو نوخبەیە ڕۆژ دوای ڕۆژ وێناکردنە کۆنەکان و دوالیزمە دێرینەکانیان قووڵتر و بەهێزتر و هەمەلایەنەتر دەکردەوە. ئەم دوو نوخبەیە هەبیتۆسێکی دێرینەیان دەژیاندەوە، کە دابەشکردنەکانی ناو واقیعی ئێمەی قووڵتر و فراوانتر و خوێناویتر دەکرد، بەڕادەیەک خودی ئەو دوو نوخبەیە کەوتنە پەلاماردان و دابەشکردنی دوالیزمانەی ڕەمزە مێژووییە نەتەوەییەکانیش. دەستدەبرا بۆ دابەشکردنی فانتازیای کۆمەڵایەتی ئێمە و فانتازیای نەتەوەییمان لە ژێر زەبری دابەشکردنەکانی حیزبدا بەشبەش و پارچەپارچە دەکرا. بۆ نموونە، هەر لەو سەرەتاوە شەڕێکی ڕەمزی لەسەر مانا ڕەمزییەکانی کەسایەتیەکی وەک شێخ مەحمود دەکرا. دوو حیزبە گەورەکەی کوردستان بەجیا پەیکەر و پۆستەریان بەناوی خۆیانەوە بۆ شێخ مەحمود

دروستدەکرد، هەردوولا هەوڵیاندەدا ڕەهەندە گشتییەکانی ئەو ڕەمزە و ئاڕاستە نەتەوەییەکانی فانتازیای کۆمەڵایەتیمان بکەنە ڕەهەندی حیزبی و گشتێتیبوونی ئەو سەرمایە ڕەمزییە بکەنە موڵکی تایبەتی حیزب. ئەنجامی هەڵبژاردنەکەش دووبارە بەرهەمهێنانەوەیەکی تری هەمان دوالیزم بوو بەڕادەیەک کار گەیشتە دابەشکردنی بەشە ناشیرین و دزێوەکەی مێژووی ئێمە، مەبەستم پیاوخراپان و خیانەتکارە ڕاستەقینەکانی ناو مێژووی هاوچەرخی ئێمەیە. فەسڵێکی دیکەی قووڵکردنەوەی ئەو دوالیزمە خۆکوشتنی حیزبە بچووکەکان و دابەشکردنی خۆیان بوو بەسەر دوو حیزبە گەورەکەدا. پاشانیش دابەشکردنی هەموو شتەکان بەنیوەیی - پەنجا بەپەنجا- وەک دەرەنجامێکی حەتمی ئەو بونیادە دوالیزمیە. هەموو ئەمانە لەڕووی واقیعیەوە بوونە هۆکاری دابەشکردنێکی جوگرافی کۆمەڵایەتی لە نیشتمانی ئێمەدا و جەنگ و ئەخلاقیەتی ڕۆژانەی کۆمەڵگای سیاسیی کوردی تا ئەم ساتەش ئەو دابەشکردنە فراوانتر و بەهێزتردەکەن و خەریکە لە یادەوەریی و وشیاریی خەڵکی ئێمەدا دەبێتە ئەمرێکی واقیع و ئەم بەشەی کوردستان لەئەنجامی ڕاپەڕینێکی جەماوەریدا سەرلەنوێ دابەشدەکرێتەوە و دەبێتە دوویەش!!!

دواهەمین خاڵێک لێرەدا بمەوێت جەختی لەسەر بکەم ئەو ڕاستیە سۆسیۆلۆژیەیە، کە هیچ حیزبێکی کوردی بە تەنها نوێنەری هیچ یەکێک لەو دوو نوخبەیە نییە، لە ئێستادا ناکرێت هیچ یەکێک لە حیزبەکان بەماڵی یەکێک لە نوخبەکان دابنێین، بەپێچەوانە هەر یەکێک لەو دوو نوخبەیە بەشێوەیەک لە شێوەکان لەناو حیزبە کوردیەکاندا ئامادەن. ئەم ئامادەییەش وایکردووە بڕێکی ململانێی نێوان ئەم دوو هێزە لەناو خودی حیزبەکان خۆیاندا بێت، بێگومان بڕ و ڕادە و هێزی ئەم ململانێیە لە حیزبێکەوە بۆ ئەویدیکە دەگۆڕێت و لە یەکێکیاندا ئەم ململانێیە ئاسۆی گەشەکردنی زیاترە تا لەویدیکەیاندا. لەهەموو دۆخێکدا ئەم دوو نوخبەیە تائێستاش گرنگترین دوو هێزیی کۆمەڵایەتین لە کوردستاندا، کە دەشێت

ستراتیژیەتی ململانێ کۆمەڵایەتی و سیاسیەکانیان دەستنیشانکەن.

-٩-

ئەگەر جەنگ لە سادەترین پێناسدا سەپاندنی دونیابینییەک، وێناکردنێک، قازانج و دەسکەوتێکی تایبەت بێت بەسەر دونیابینییەک، وێناکردنێک، قازانج و دەسکەوتێکی دیکەی جیاوازدا، لەڕێی توندوتیژییەوە، ئەگەر جەنگ پێکدادانێکی توندوتیژانەی دوو دونیابینی جیاواز بێت، یان هەڵنەکردنی دوو جیاوازیی بێت بەیەکەوە، ئەوکات پرسیاری سەرەکی ئەوەیە ئایا کولتوری ئێمە بەگشتی و کولتوری سیاسیمان بەتایبەتی چ پێناسێکی بۆ تێرمی جیاوازی هەیە، جیاوازی چ مانایەک دەبەخشێ، سنوورەکانی تاکوێ کراوەن و لەکوێشدا داخراون؟ تا چەند ئەم چەمکە لەناو دونیای واقیعی ئێمەدا بەگشتی و دونیای فیکری و سیاسیماندا بەتایبەتی ئامادەیە؟ بەکورتی، تا چەند دەبێت لەیەک بچین و کەی و لەکوێدا و چۆن لەیەکدی جیاواز بین؟

جیاوازی هەمیشە بەشێکە لە بوونی سروشتییانەی مرۆڤ و کۆمەڵگا. خودی سروشت خۆی چەندەها جیاوازی بەسەر مرۆڤدا دەسەپێنێ (٥): جیاوازی سێکس، نێر/مێ. جیاوازی لەش، گەورە/بچووک. جیاوازی ڕەنگ، ڕەش/سپی/زەرد. لەهەموو کۆمەڵگایەکیشدا کولتور دێت و یاسا بۆ ئەو جیاوازییانە و دەیان جیاوازی دیکەش دادەنێت، کولتور دێت بۆئەوەی ڕێسایەک بۆ کۆبوونەوە و پۆلێنکردن و سیستماتیزەکردنی جیاوازییەکان دابنێت. جیاوازی چەمکێکە لەهەناوی هەموو کولتورێکدا ئامادەیە، ئەوەندەش گشتییە هەندێک باوەڕیان وایە ئەوەی شوناس، یان تایبەتمەندییەکانی کولتورێک دیاریدەکات ئەوەیە ئەو کولتورە چ مانایەک بە

تێرمی جیاوازی دەبەخشێ و چۆن مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، چۆن و بەچ شێوەیەک جیاوازی عەقڵانیدەکات، چۆن شتە جیاوازەکان کۆدەکاتەوە و هارمۆنییەتێکیان دەداتێ و بەڕێوەیاندەبات؟ چەمکی جیاوازی پەیوەندییەکی توند و بەهێزی بەتێرمی "شوناس" ەوە هەیە، ئایا تاکوێ من لەگەڵ ئەویدیدا وەک یەکم و پێکەوە شوناسێکی هاوبەشمان هەیە، لەکوێدا جیاوازییەکانمان ئەوەندە گەورە و کاریگەرە ناکرێ لەژێر چەتری یەک شوناسدا کۆببینەوە؟ ئەم پرسیارانە و دەیان پرسیاری دیکەی لەم بابەتە، سنووری ئەو زەمینە فیکرییە دیاریدەکەن، کە دەبێ بەناویدا تێپەڕین بۆ ئەوەی بکرێ لەو پەیوەندییە ئاڵۆزە تێبگەین، کە دوو بوونەوەری جیاواز بەیەکەوە گرێدەدات و دوو گروپ لە ناوەندی کولتورێکدا بەیەکەوە کۆدەکاتەوە و دوو دونیابینی جیاواز لە پەیوەندییەکی تەندروستدا بەرامبەر بەیەک ڕادەگرێت. من لێرەدا هەوڵدەدەم زۆر بە گشتی ئەو مانایانە دیاریکەم، کە تێرمی جیاوازی لە کولتوری ئێمەدا هەڵگرین.

ئەوەی دەشێت وەک سەرەتا هەموومان لەسەری تەبابین ئەوەیە، کە کۆ، یان گروپ لە کولتوری ئێمەدا شوێن و جێیەکی گرنگی هەیە و هەمیشە بەرز و بایەخدار نرخێندراوە. پەندی پێشینانی ئێمە، شیعری کوردی، لقە ئەدەبیەکانی دیکە، کولتوری زارەکیمان پڕن لەو وانە ئەخلاقییانەی باس لە گرنگیی گروپ و پیرۆزیی گروپ و مەسەلەی یەکگرتنی گروپەکان دەکەن. ئیسلام لەم ڕووەوە ڕۆڵێکی ئاشکرا و بەرچاوی گێڕاوە. ڕۆحی ئیسلام وەکو دین، لەڕاستیدا ڕۆحی هەموو ئایینەکان، ڕۆحێکی گروپخوازە، چەمکی 'ئوومە' بۆنموونە، چەمکێکی گرنگە، کە ئیمانداران وەک گروپێک بەیەکەوە گرێدەدات و دەیانکاتە برای ڕۆحی یەکتری. قورئان لەبانگێشەکردنی باوەڕدارانـدا هەمیشە بە ڕاناوی "ئێوە" و لە ناونانی بێئیماناندا بە ڕاناوی "ئەوان" قسەدەکات. لەبەرامبەر ئەمەدا تاکەکەس بەردەوام وەک بوونەوەرێکی تاک و تەنیا، لاواز، بێدالدە، کەمبایەخ و پڕگرفت

تەماشـاکراوە. هەر دەرکەوت و ڕووکـارێکی تاکـانە، هەر دەنگێکـی تـاک، هەر دەربڕینێکی تاکانە، زۆربەیجار وەک ڕووکـار و دەنـگ و دەربڕینێکـی نەفراتلێکـراو مامەڵەی لەگەڵـداکراوە. جـگە لەمەش هەمیشـە تـاک وەک هەڕەشـەیەک لە کۆ و پڕۆژەی تاکانە وەک هەڕەشە لە پڕۆژە کۆییەکان تەماشاکراوە. کولتوری ئێمە تەنیا لەو شـوێنانەدا سـەرنجی تاکەکەسـی داوە و ئـافەرینیکردووە، کە تـوانیبێتی نوێنەرێکی بەوەفا و دڵسۆزی کۆ و بەرنـامە کۆییەکـان بێـت، لەو شـوێنانەدا، کە توانیبێتی ئاوێنەیەک بێت تاک تیایدا نەرجسـیەتی خـۆی کوشـتبێ، تـا شـوێن بـۆ نەرجسـیەتی گـروپ بکـاتەوە، دەنـگ و ئـارەزوو و شوناسـی خـۆی خەفەکردبێـت بۆئەوەی ببێت بە هەڵگری دەنگی کۆ و شوناسی کۆ و ئارەزووەکانی کۆ.

تاکەکەس لەجەوهەردا دەربڕی جیاوازییە و هەرخۆشی بەرجەستەیەکی فەرنبیانەی جیاوازییە. بەڵام کۆ، یان گروپ زۆربەیجار سڕینەوە و لابردن و لە باشترین دۆخـدا لاوازکردنێکـی قـووڵی جیـاوازییە. کـۆ کاتێـک دروسـتدەبێت، کە تاکەکـان جیاوازییەکـانی خۆیـان وەلانـابێ، تـاکیش کـاتێ دروسـتدەبێ، کە بەرگـری لە جیاوازیەکانی خۆی بکات و لەبەردەمی کۆدا بیسەلمێنێ. بێگومان من لێرەدا باسی جـۆرێکی تـایبەت لە کـۆ دەکەم، کە لەسـەر بنەمـای نەفیکردنـی جیاوازیەکـان کاردەکات، دەشێت کۆ هەبێت، کە بەرهەمی بڕیاری ئازادانە و وشیارانەی تاکەکـان بێت. ئەگەر کولتوری ئێمە، وەک وتم، کولتورێک بێت بەشـێوەیەکی گشـتی کـۆ و ڕووکارە کۆییەکـان بەرز بنرخێنـێ، ئەوا کـارێکی لـۆژیکییە ئەنجامگیری بکەیـن و بڵێین چەمکی جیاوازی لە کولتوری ئێمەدا باش نانرخێندرێت. ئەگەر تاکەکەس لە کولتوری کوردیـدا ڕۆحلەبەرێکـی شـەڕانی و نەفرەتلێکراوبێـت و گـروپ تـا ئاسـتی پیرۆزی بەرزیکرێتەوە، ئەوکات ئەو ئەنجامگیرییەی سەرەوە بەهـیچ جـۆرێتە نـابێتە شوێنی گومان.

هاوکـات نابێـت ئەو ئەنجـامگیرییە بە ڕەهـایی وەرگـرین و وەک یاسـایەکی ڕەهـا

مامەڵەی لەگەڵدا بکەین. چونکە کولتوری ئێمە جیاوازی دەناسێت و دوو ئاستی دیاریکراوی جیاوازیش لەیەکدی جیادەکاتەوە، ئەو دووئاستەش ڕاستەوخۆ گرێدراوی ئەو پێکهاتەی سۆسیۆلۆژیەن، کە لەدونیای ئێمەدا ئامادەیە، ولەبەستەی دوو ئاستی دیاریکراوی پەیوەندی کۆمەڵایەتییە لەناو ئەو بونیادە سۆسیۆلۆژیەدا. ئەم خاڵە دواتر دێینەوە سەری. ئەگەر تاکە کەس هەڕەشەبێت لە پێکهاتەی کۆ، ئەوا جیاوازیش هەمان هەڕەشەی دووبارەیە لە کۆ. ئەگەر کۆ بەرهەمهێنەری شوناس بێت، بێگومان تاکەکەس تێکدەری شوناسە. ئەگەر کۆ هێزبێت ئەوا تاکەکەس لاوازی و نوشوستیە. بەم مانایانە جیاوازی لەدونیای ئێمەدا چەمکێکی هەڕەشەکەرە، تێرمێکە هارمۆنیەتی گروپ، دونیای ڕۆحی گروپ، پیرۆزیی گروپ دەشێوێنێت، بەڵام وەک ئاشکرایە، نە تاکە کەس بەبێ کۆ و نە کۆش بەبێ تاکەکەس بوونیان هەیە. بۆیە پرسیاری ئێمە لێرەدا ئەمەیە: ئایا تاکەکەس و کۆ لەدونیای ئێمەدا لە کوێدا بەیەکدی دەگەن و لە کوێدا لە یەکدی جیادەبنەوە؟ ئایا لەو ناوەندا جیاوازی چ مانا و دەلالەتێک وەردەگرێت؟

ئێمە وتمان کولتوری ئێمە خۆی وەک کولتورێکی کۆیی دەناسێنێت و تاکە کەس باش نانرخێنرێت. لێرەوە دەشێت ئەنجامگیریبکەین و بڵێین، کەواتە دەبێت فۆرمی ئەو پەیوەندییەی تاکەکەس لەم کولتورەدا بەکۆوە گرێدەدات فۆرمێک بێت بتوانێت سنوور و مەوداکانی بەرهەمهێنانی جیاوازی بەرتەسک و بچووک بکاتەوە، فۆرمێک بێت ڕێگر لەبەردەم بەرهەمهێنانی جیاوازیدا، ڕێگر لە جیابوونەوەی تاکەکەس و سەربەخۆیی و ئۆتۆنۆمبوونی لەبەرامبەر کۆدا. بەکورتی ئەم فۆرمە ئەبێت فۆرمێک بێت تاکەکەس لەکۆدا نوقمکات و بیکات بە بەشێکی دانەبڕاو لە پێکهاتەی ئەو کۆیانەی لەوکاتەدا ئامادەن. دیارە فۆرمێکی لەو بابەتە دەبێ فۆرمی "پەیوەندییەکی دەمجی" بێت، دەمج بەمانای سڕینەوەی هەموو جیاوازییەکان و تێکەڵکردنی هەموو تاکەکان بەیەکدی و فەرامۆشکردنی هەمەڕەنگییەکان. پەیوەندیی دەمجی

مەحکومکردنی تاکەکەسە بە سڕینەوەی هەموو ڕووکارە فەردییەکانی خۆی، هەموو ڕووکارە ئۆتۆنۆم و ڕووکارە تایبەتەکانی ژیانی خۆی وەک تاکەکەس. ئەم شێوە پەیوەندییە بە پلەی یەکەم مانای گۆڕینی تاکەکەسە بۆ بوونەوەرێکی بێ دەمووچاو، بێ کەسایەتی و بێ ڕۆح و بێ بڕیار و بێ دەسەڵات و دواجار بێ چارەنووس. لە دونیای ئێمەدا، تاکەکەسی کورد مەحکومە بەوەی هەموو جیاوازییەکانی خۆی بچەپێنێت و یەکە یەکەیان ڕەتبکاتەوە و نەیاندۆزێتەوە و بەرزیاننەکاتەوە بە ڕووی دونیای دەرەوەدا. لە خێزاندا، پەیوەندی دەمجی یاسای سەرەکی گرێدان و نووقمکردنی تاکەکەسە لەناو خێزاندا. قازانجی خێزان وەک گشتێک، ناوبانگی خێزان وەک کۆیەک و مانەوەی خێزان وەک ڕاستییەکی کولتوری پیرۆزکراو - بەهەمان بونیادی باوکسالارییەوە- لە قازانج و ناوبانگ و مانەوەی تاکەکەس گرنگترە. کولتوری ئێمە مەودای ئەوە بەتاکەکان نادات بوونی خۆیان، ناوبانگی خۆیان، مانەوەی خۆیان بەهەمان ئەندازەی گرنگیی و پیرۆزیی خێزان و لە دەرەوەی ڕەهەندی خێزاندا بەرهەمبهێنێت و هێڵێک، ماوەیەک، فاریزەیەک لەنێوان خۆیان و ڕووکارە کۆییەکانی خێزاندا بکێشن.

دەمجبوون لەم ڕەوتەدا مانای دووبارەکردنەوەی هەموو ئەو بونیاد و پەیوەندییانەی جیاوازی دەکوژن و وێکچوون بەرهەمدەهێنن، وێکچوون لەسەر بنەمای چەپاندنی هەموو ئەو چەمک و دید و بۆچوونانەی هێما بۆ کەسایەتیە جیاوازەکان و لێکدانەوە جیاوازەکان و پەیوەندییە جیاوازەکان دەکەن. "پەیوەندی دەمجی" لە خێزاندا مانای ئەوەیە نەوە نوێکان هەمان بەها و بابەت و وێنەی نەوەکانی بەر لە خۆیان دووبارەبکەنەوە، منداڵان دەبێ هەمان وێنەی باوکیان بەرهەمبهێننەوە، خێزان دەبێت ماناکانی باوک، بۆچوونەکانی باوک، بەهاکانی باوک، بە کورتی دونیای ڕەمزی و ڕۆحی باوک، کەلە واقیعی ئێمەدا دونیایەکی پاتریارکی تۆقێنەر و چەپێنەرە- نەک وەک بەڵگە نەویستێک قبووڵبکات، بەڵکو وەک پیرۆزێک مامەڵەی

لەگەڵدا بکات. ئەمەش مانای ئەوەی ئەم مانایانە دەبێت بارگاوی بکرێن بەبونیانێکی سایکۆلۆژی ئایینی، کە تێیدا گومانکردن لەڕووە پیرۆزەکانی ئەو پێکهاتەیە و قبوڵنەکردنی، ببێتە هۆی ئەوەی تاکەکەس بکرێتە دەرەوەی ئەو چوارچێوە ڕەمزیانەوە، کە بەهاکان و ماناکان و هێڵەگشتییەکانی ڕەوشتی کۆمەڵایەتی دەستنیشاندەکات. ئەو منداڵەی جورئەتی ئەوە دەکات جیاوازییەکانی خۆی بە ڕووی سیستەمی خێزاندا، بەڕووی بەها و نرخ و هیراركیەتی خێزاندا بەرزبکاتەوە و بەرگری لە فەردیەتی خۆی لە هەڵبژاردن و بڕیار و دروستکردنی دونیای تایبەتی خۆی بکات و یاسای دەمجبوون و وێکچوون نەسەلمێنێت، ئەو منداڵە وەک نەفرەتلێکراوێک دەنرخێنرێت. پەیوەندیی تاکی کوردی و نەفرەت پەیوەندییەکی بەرچاوە، حیکایەتێکە باس لە چارەنووسی پاڵەوانێکی تراژیدی دەکات، پاڵەوانێک، کە هاوسەنگی خۆی و دونیا و هاوسەنگی خۆی و فەزای ڕۆحی لەدەستداوە، پاڵەوانێک کۆمەڵگا تووڕیدەداتە ئەودیو سنوورەکانییەوە و لەلوتکەی پاڵەوانبوونیدا لە ڕووی ڕۆحی و سایکۆلۆژیەوە هەتیویخستوە بەکورتی چەمکی جیاوازی لە ئاستی خێزان و شوێنی کۆمەڵایەتی خێزاندا لەناو پێکهاتەی سۆسیۆلۆژی ئێمەدا هەڵگری هەموو ئەو مانا کۆمەڵایەتی و کولتورییە نێگەتیڤانەیە، کە کولتوری پاتریاركییەت بەرهەمیاندەهێنێت. جیاوازی لەم ناوەندە ڕەمزیەدا وەک شتێکی خراپ و پڕمەترسی و دژ بە یەکگرتن و دژ بە پاراستنی پەیوەندییەکان و ڕاگرتنی هاوسەنگییەکان دەنرخێنرێت. جیاوازی وەک مەترسیەک بۆسەر توانا و ئەگەری مانەوە تەماشادەکرێت و تابتوانرێت مەوداکانی ئامادەبوونی بەرتەسکدەکرێتەوە.

لە دوای خێزان دەشێت خێڵ ئەو گروپەی دیکەبێت، کە تاکەکەسی کوردیی خۆی لەهەناودا دەدۆزێتەوە. بێگومان لەدونیای ئێمەدا گروپی دیکەش لەئارادان، کە لەدەرەوەی خێزان و خێڵدا سەرزەمینی کۆکردنەوەی ئینسانی ئێمەن، بەڵام بەوەی

دواجـار بونیـادی گـروپ لەواقیعـی ئـێمەدا هەمـان بونیـادی خێـزان و خێـڵ دووبارەدەکـاتەوە و بەهەمـان فـۆرم و هەمـان شـێوازی پەیوەنـدی و پێکهـاتەی دەسەڵاتەوە کاردەکات، بۆیە لێرەدا زیاتر پێ لەسەر خێڵ وەک گروپی دوای خێزان دادەگرم. بەتایبەتی چونکە خێڵ لە بیست ساڵی ڕابردوودا بەئاشکرا ڕۆڵی لە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسـی ئـێمەدا گەورەتـر و کـاریگەرتر بـووە. ئەگەر خێـڵ لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە کۆبوونەوەی کۆمەڵێ خێزان و بەرەبابی جیاوازبێت لەناو دەزگایەکی گەورەتر لەدەزگای خێزاندا، ئەوا یاسای دروسـتبوون و کـارکردن و بەردەوامبـوونی خێڵـیش لەسـەر هەمـان سـڕینەوەی ئەو جیاوازییـانە دروسـتدەبێت، کە لەنێـوان خێزانەکانی ناو یەک خێڵدا هەیە و دروستیشدەبێت. خێڵ کۆیەکی گەورەیە لەسەر بنەمای سڕینەوەی جیاوازییەکانی ناو کۆ بچووکەکـانی نـاو هەنـاوی دروسـتدەبێت، بەرهەمهێنانەوەی هەمان بونیادی خێزانە، بەڵام لە ئاسـتێکی گەورەتـردا. لێـرەوەیە مارکس خێـڵ بە "خێزانێکـی گەورە" ناونووسـدەکات. دەمجبـوون لە خێڵـدا، وەک دەمجبوون لە خێزاندا، پرۆسەیەکی هەمەلایەنە و سەرلەبەری جەستەی کۆمەڵایەتی خێڵ دادەپۆشێت. لەڕاستیدا پرۆسەی وێکچوون لەخێڵدا توندتر و چاودێریکراوترە، چـونکە مەسـەلەی دەمجبـوون، یـان نەبـوون لە خێڵـدا کـۆمەڵێ دەرەنجـامی کۆمەڵایەتی و سیاسی لێدەکەوێتەوە، کە گرنگییەکی گەورەی هەیە بۆ پاراسـتن و مانەوەی خێڵەکە وەک یەکەیەکی کۆمەڵایەتی سەربەخۆ. لە دۆخێکی لەوبابەتەشدا پاراستنی خێزان وابەستەی پاراستنی خێڵە و تێکشکانی خێـڵ مانـای تێکشکانی خێزانیشە. لێرەوە ئامانجی سەرەکی خێزان لە پێکهاتەیەکی لەوبابەتەدا تاڕادەیەکی زۆر پاراستن و قایمڕاگرتنی پایە کۆمەڵایەتی و سیاسی و دەسەڵاتدارییەکانی خێڵە. بێگومان مەرجی سەرەکی دەمجبوون لە خێڵدا دەمجبوونی پێشینە لە خێزاندا. ئەو تاکەکەسـەی لەخێزانـدا دەمـج نەبووبێـت زەحـمەتە بتوانێـت لە خێڵـدا دەمجبێـت. ئەوەشی لە خێڵـدا دەمجدەبێت مانـای ئەوەی پێشـوەخت لە خێزانـدا دەمجبـووە.

لەنێوان دەمجبوون لە خێزان و دەمجبوون لەخێڵدا پەیوەندییەکی دیالێکتیکی هەیە. بەڵام دەرەنجامەکـانی دەمجبـوون لە خێڵـدا لە زۆر ڕووەوە لە دەرەنجامەکـانی دەمجبوون لە خێزاندا گرنگترە. پەیوەندی دەمجی لەگەڵ خێڵـدا تـاکە پەناگایەکی ئەمین و دڵنیاکەرە هەم بۆ خێزان خۆی و هەم بۆ تاکەکەسیش. بۆ ماوەیەکی درێژ ئاسایشـی مـرۆڤ لە دونیـای ئـێمەدا تـا ڕادەیەکـی زۆر وابەسـتەی بـڕی ئەو داکـۆکیلێکردن و پاراسـتنە بـووە، کە خێـڵ بـۆی مەیسـەرکردووە. پەناگـای سۆسیۆلۆژی و سایکۆلۆژی مرۆڤی ئێمە ئەو هێزە بووە، کە خێڵ هەم لە واقیعدا و هەم لە فانتازیای ئەودا دروستیکردووە. لێرەوە دەمجبـوون لە خێڵـدا و سـڕینەوەی هەموو ئەو جیاوازییانەی دەشێت درزێک بکاتە پەیوەندی نێوان تاکەکەس و خێڵ، یاسای سەرەکی مـانەوە و ئاسایشـی مرۆڤـی ئـێمە بـووە. هەر تـاکێکیش بـۆ هەر هۆیەک لە هۆکان جیاوازی خۆی و فەردیەتی خۆی بەڕووی یاسا دەمجییەکانی ناو خێڵدا بەرزکردبێتەوە، ئەوا تاقە چارەسەر هەڵاتـن و پەنـابردنە بەر خێڵێکـی دیکە بووە. هەڵاتن بووە لە کۆیەک بەرەو کۆیەکی دیکە، سەندنەوەی مـافی جیـاوازبوون بووە لە شـوێنێکدا بـۆ دۆڕانـدنی لە شـوێنێکی دیـکەدا. کەلەپـووری ئـێمە پـڕە لە نموونەی ئەو شێوە هەڵاتـن و ناڕەزاییـانە، بەڵام ئەوەی شـوێنی سـەرنجە هەرگیـز ئێمە لە لێکدانەوەماندا بـۆ ئەو ڕووداوە کەلەپوورییـانە قسـەمان لەسـەر فەردیەت و بەرگریکردن لە فەردیەت لای ئەو کەسانە نەکردووە، هەرگیز نەمـان گوتـوە ئەمـانە بەرگریکەرن لە بیرۆکەی جیاوازی، بەپێچەوانەوە بەردەوام قسەمان لە پاڵەوانێتی و قارەمـانی ئەو یـاخیگەرانە کـردووە. ئەوەی خێڵـی بەجێهێشـتوە و لە دژی ئەو هەڵوێستی وەرگرتووە لە کولتوری ئێمەدا وەک تاکەکەس نەناسراوە و کارەکەشـی وەک هەوڵدان بۆ پاراستنی تاکایەتی نەناسراوە. ئەوکەسانە لە باتی ئەوە شوناسی پاڵەوانیان پێدراوە. بە پاڵەوانکردنی تاکەکەسەکانیش بەخشینی کۆمەڵێک سیفەتی ئەفسانەیی بان ـ مێژوویی و بـان ـ ئینسـانییە، کە دەریانـدەکاتە دەرەوەی سیاقە

مێژوویی و کۆمەڵایەتیەکانەوە و گرنگیان وەک بوونەوەرێکی جیاواز کەمدەکاتەوە. بەم مانایەش کولتووری ئێمە لەڕێگای بە پاڵەوانکردنی کەسە جیاوازەکانەوە یاخیگەرە سۆسیۆلۆژییەکانی خۆی، نەک بەتەنیا لە فەردییەت و جیاوازبوونی خۆیان دابڕیوە، بەڵکو لە وەشی دابڕیون، کە مرۆڤ بن. بێگومان لە ڕەوتێکی لەم بابەتەدا دیسانەوە جیاوازی وەک هەڵبژاردنێکی تاکانە چەمکێکی نەفرەتلێکراوە، چەمکێکە نائارام و شێوێنەر، هەڕەشەیەکە و لە خێڵ کراوە. بۆیە تاقە چارەسەر بریتیبووە لە خۆبەدەستەوەدان و وازهێنان لە فەردییەت و گەڕانەوەبووە بۆ ئامێزی خێڵ، یان هەڵاتن بووە لە خێڵ بەرەو خێڵێکی دیکە.

بەڵام ئەمە دواهەمین ماناو دواهەمین فۆرمی ئامادەبوونی چەمکی جیاوازی نییە لە کولتور و دونیای سۆسیۆلۆژی ئێمەدا. ئەمە دواهەمین دەرکەوتێک نییە چەمکی جیاوازی لە دونیای ئێمەدا بیگرێتەخۆی. بەمانایەکی دیکە چەمکی جیاوازی لەدونیای ئێمەدا تەنها هەڵگری ئەو مانا نێگەتیڤانەی سەرەوە نییە، بەڵکو لە ئاستێکی دیکەدا و بۆ مەبەستێکی دیکە کۆمەڵێ مانای پۆزەتیڤیشی هەیە. ئەو ئاستەش ئاستی پەیوەندییەکانی خێڵە لەگەڵ دونیای دەرەوەی خێڵدا. ئەگەر تاکەکەس لە ئاستی خێزان و خێڵدا ناچاربێت دەمووچاوی خۆی ونبکات بۆ ئەوەی ڕووخساری خێزان و خێڵ بباتەوە، شوناسی خۆی وەک فەردێک بدۆڕێنێ بۆ ئەوەی شوناسی خێڵی دەسکەوێت، ئەوا لە ئاستی پەیوەندییەکانی دەرەوەی خێڵدا تاکەکەس دەبێت جیاوازی خۆی وەک ئەندامی خێڵێکی دیاریکراو بەڕووی خێڵەکانی دیکەدا بەرزبکاتەوە، شوناسی خۆی وەک کوڕی خێڵێکی دیاریکراو لە شوناسی خێڵەکانی دیکە جیاکاتەوە. لێرەدا تاکەکەس ئەو جیاوازییەی بەناچاری لە ئاستی ئەندامبوونی لە خێزانێک و لە خێڵێکدا دەیچەپێنێ و ڕەتیدەکاتەوە، دەبێت لە ئاستی دووهەمدا بەڕووی دونیای دەرەوەی خێڵدا بەرزبکاتەوە و بیپارێزێت. بە مانایەکی دیکە لەبەردەم خێزان و خێڵەکەی خۆیدا دەم و چاوی

خۆی و جیاوازییەکانی بنۆڕێنێت، بەڵام لە بەرامبەر خێڵەکانی دیکەدا ئەم دەم و چاوە تایبەتەی خۆی نیشانبداتەوە و پێی لەسەرداگرێت. ئەمەش بۆخۆی گەمەیەکی سایکۆلۆژی و سۆسیۆلۆژییە، کە یاساکانی سەرتاپا دژبەیەک و ناکۆک و پڕکێشەن لەگەڵ یەکدیدا.

وەک گوتمان دەمجبوونی تاکەکەس لە ناو خێزان و خێڵدا، بەو شێوەیەی لە سەرەوە هێڵە گشتیەکانیمان دیاریکرد، ئامادەکردنی تاکەکەس نییە بۆ دەمجبوون لە نێو پەیوەندییە دەرەکییەکانی ئەودیوی خێڵدا. خێڵ لە گەمەی دەمجکردنی تاکەکەس لە ئامێزیدا، ئەو ئامادەگییە گشتییە لە تاکەکەسدا دروستناکات، وای لێبکات لەگەڵ ئەو پێکهاتانەی دیکەدا، کە دەکەونە ئەودیو خێڵەوە و فۆرمێکی دیکەی دەمجبوون دەخوازن، پەیوەندییەکی تەندروستی هەبێت. بۆ نموونە دەمجبوون لەناو خێزان و خێڵدا دەمجبوون نییە لەناو نەتەوەدا، نەتەوە خوازیاری فۆرمی دیکەی دەمجبوونە، کە دەمجبوونی ناو خێڵ و خێزان ناتوانن دابینیبکەن. نەتەوە ئەو پەیوەندی و فانتازیایانەی گەرەکە، کە دەکەونە ئەودیوی پەیوەندییە بەرتەسک و ناوەکییەکانی ناو خێزان و خێڵەوە. لەڕاستیدا پەیوەندی نەتەوەیی کاتێک دروستدەبێت، کە فانتازییەکانی خێڵ شوێنیخۆی چۆڵکردبێت بۆ فانتازیاکانی نەتەوە. ئەو ڕووخسارەی تاکەکەس لەبەردەم خێڵدا ئەیدۆڕێنێت بۆ ئەوەی ڕوخساری خێڵ بباتەوە، ڕووخسارێکە نیشانەکانی خێڵ و یاساکانی خێڵ سنوورەکانی بۆنەخشاندووە و شیاو و نەشیاوەکانی بەوردی بۆ دەستنیشانکردووە. تێنەپەڕاندنی ئەم ڕووخسارە خێڵەکییە بەرەو ڕوخساری دیکە، بۆنموونە گەشەنەکردنی پەیوەندییەکانی خێڵ بۆ پەیوەندی چینایەتی، یان پەیوەندی نەتەوەیی، بەبێ وەستاندنی ئەو پرۆسەی دەمجبوونەی خێڵ ئینسانەکانی تێدا بەنددەکات و بە شوناسێکی بچووکتر و بەرتەسکتر لە چین و نەتەوە مەحکومیان دەکات، کارێکی مەحاڵە. ئەنترۆپۆلۆژەکان شێوەی پەیوەندییەکانی ناو خێڵ بە

"پەیوەندییەکانی خزمخواهی" ناودەبەن، ئەم پەیوەندییانە بە پلەی یەکەم لەسەر بنەمای "پەیوەندییەکانی خوێن" دروستدەبن، خێڵ لەم پەیوەندییانەدا دەبێتە ماڵ، یان نیشتیمانێکی بچووک، بێگومان تێکەڵبوونی خوێنی تاکەکەس بە خوێنی خێزان و بە خوێنی خێڵ، مانای تێکەڵبوونی ئەو خوێنە نییە بە خوێنی ئەو پێکهاتانەی دیکەی سنورەکانیان دەکەونە ئەودیوی سنوورەکانی خێڵەوە.

بەکورتی مرۆڤی ئێمە لەئاستی ناوەکیدا فەردیەتی خۆی دەدۆڕێنێ بۆ ئەوەی کۆیبوونی خێزان و خێڵ بباتەوە، بەڵام لە ئاستی دەرەکیدا کۆییبوونی چین و نەتەوە، کۆییبوونی ئەودیوی سنوورەکانی خێڵ، دەدۆڕێنێ بۆ ئەوەی "فەردیەتی خێڵ" بباتەوە. بەمجۆرە مرۆڤی ئێمە لە دواهەمین ئەنجامدا هەم فەردیەتی خۆی وەک تاکێکی سەربەخۆ دەدۆڕێنێ و هەم هەمان ئەو گشتە گەورانەش دەدۆڕێنێ، کە لەودیوی خێڵەوە دروستدەبن. لێرەوە لە دونیای ئێمەدا چەندە فەردیەت ونە، بەهەمان ئەندازەش ڕۆحی چینایەتی ونە، چەندە تاکەکەس ونە بەهەمان ڕادەش خودی نەتەوە خۆی ونە. ڕێکەوتیش نییە لە ئەزموونی کۆمەڵگاکانی ڕۆژئاوادا فەردیەت و ناسیۆنالیزم، تاکەکەس و نەتەوە بە یەکەوە لەدایکبوون و هەردووکیان یەک پرۆسە هێناونی، ئەو پرۆسەیەش پرۆسەی مۆدێرنەیە.

-١٠-

لاوازیی ئامادەگی چەمکی جیاوازی لە کولتووری ئێمەدا پێکهاتەیەکی سایکۆلۆژی تایبەت دەخولقێنێ، کە خاڵی سەرەکی تێیدا لاوازی و بچووکی "من" ە لە بەرامبەر دەسەڵات و جەبەروتی "بەرزەمن" دا. لە دونیای ئێمەدا ئەم پرۆسەیە ئەوەندە سەختە، کە پانتایی "من" بەڕادەیەکی ترسناک بچووک و پانتایی "بەرزەمن"

بەڕادەیەکــی ترســناک گەورەیە. ئەمەش دیــاردەیەکی ســایکۆلۆژی و ڕۆحــی بەرهەمدەهێنێت دەکرێ ناوی بنێین "بچووکگەرایی". ئەم بچووکگەراییەش فۆرمی جیاجیا دەگرێتەخۆی، بۆنموونە بچووکی مرۆڤی ئێمە لەبەردەم سەرکردەکاندا، بچووکی منـاڵان لەبەردەم باوکانـدا، بچووکی ئەنـدامانی خێـزان لەبەردەم خێزانـدا، بچـووکی هاووڵاتیـان لەبەردەم دەزگاکانـدا، بچـووکی نەوە نوێکـان لەبەردەم نەوە کۆنەکاندا. "مـن" لە کولتـوری ئێمەدا سـومبولی خۆپەرستییە، ئەو دەنـگەی، کە دەڵێـت "مـن" و ناڵێـت "ئـێمە" دەنگێکـی تاوانبـارە، تەنـانەت بەشـێکی گەورەی ئەدەبی ئێمە تا ساتی ئێستامان هەڵگری تۆنەکای دەنگـی "ئـێمەیە" نەک دەنگـی تـاکەکەس، "مـن" لەوێشـدا بـوونەوەرێکی نەفرەتلێکـراو و نـاچیزە. لە فەزایەکـی کولتوریی لەو بـابەتەدا مرۆڤـی ئـێمە ناتوانێـت بەشـێوەیەکی سـەربەخۆ و بەربـڵاو پەیوەندی خۆی بەدونیا و دەوروبەرەوە دەستنیشانبکات، ناتوانێت ئەزموونی خۆی، ڕاڤەی خۆی، مانای خۆی بۆ دیاردەکـان هەبێت. لەو دۆخەدا مرۆڤـی ئـێمە لەژێـر جەبری واقیعی و ڕەمزیی بەها و نرخ و سیمبۆڵەکانی ناو "بەرزەمنـی کـۆمەڵایەتی" دا بۆتە بوونەوەرێکی بێدەنگ و ترساو، بوونەوەرێکی گوێڕایەڵ و خۆبەدەستەوەدەر بەو یاسا پاتریارکییـانەی لە منـاڵییەوە هەمـوو ڕۆحێکـی تۆتۆنـۆم و جیـاوازخوازی تێــدادەکوژن. لەدۆخێکــی لەویــابەتەدا ئینســان هەر لە منــاڵییەوە فێردەکرێــت ڕاڤەکردنەکـانی کـۆ، وەڵامەکـانی کـۆ، هەڵوێسـتەکانی کـۆ، بکـاتە ڕاڤە و وەڵام و هەڵوێسـتی خـۆی. هەر لەمنـاڵییەوە "مـن" سـەرکوتدەکرێت و دەچەپێنرێـت، لە کۆتایشدا هەموو ئەو سەرچڵییە فیکریی و ڕۆحی و ژیارییـانەش دەچەپێنرێت، کە دەشـێت "مــن" لە ئەزمــوونی خــۆیەوە بــۆ دونیــا و لەڕاڤەکردنــی خــۆیەوە بــۆ ئەزموونەکانی تر، بەدەستیانبهێنێت. هەر ئەمەشە وادەکات مرۆڤی ئـێمە بەئاسـانی ببێـتە گەمەی دەسـتی "کـۆ" جیاوازەکـانی دونیـای ئـێمە، هەر ئەمەشـە وادەکـات حیـزب وەک "کـۆ" یەکـی تـایبەت بتوانێـت بە بڕیارێـک هەزاران کەس ڕوویەڕووی

جەنگێکی خوێناوی بکاتەوە، یاخود سەرۆکی "خێڵ" ێک بتوانێت لەباتی هەموو خێڵەکەی بڕیاریدات و"پیاوەکان" ی بەو ئاڕاستەیەدا ببات، کە خۆی دەیەوێت.
مۆڕاڵی باڵادەست لە کۆمەڵگای ئێمەدا لە تەماشاکردن و نرخاندنی تاکەکاندا عەودالی ناسینی ئینتما کۆییەکانی تاکە کەسە. سەر بە چ خێزان و خێڵ و حیزب و ناوچەیەکیت؟ ئەمە پرسیاری سەرەکی شوناسە لە کولتوری ئێمەدا و ئەمە فەزای نرخاندنە کۆمەڵایەتییەکانە لەدونیای ئێمەدا. بێگومان لە ڕۆژگاری ئێستاماندا گرووپی هەرە گرنگ لە کۆمەڵگای ئێمەدا حیزبە، حیزبە، کە دەتوانێ گرووپەکانی دیکە بنرخێنێ، حیزبە شوناسەکان دابەشدەکات، حیزبە ئەرێ و نەرێکان بەرهەمدەهێنێ، حیزبە لەناو "بەرزەمندا" جێگیرە، حیزبە پەیوەندیی نێوان "ئەستی کۆ" و "من" ی کۆمەڵایەتی دەستنیشان و کۆنترۆڵدەکات، حیزبە پرۆسەکانی تەماهیکردن بەڕێوەدەبات و چاودێریشیاندەکات. بەکورتی دەکرێ قسە لە "عوسابێکی کۆمەڵایەتی" گشتی بکەین، کە حیزب سەرچاوە و ئامرازی هەرە سەرەکی ئەو عوسابەیە، عوسابێک، کە بەجەنگ و پێکدادانی خوێناوی تەعبیر لەخۆی دەکات.

-١١-

بەڵام چی ئەو پێکهاتەی سەرەوەی ڕاگرتوە؟ چییە وادەکات مرۆڤی ئێمە هەڵگری ڕووخساری خۆی نەبێت؟ چییە نەرجسییەتی تاکی کورد دەکوژێت و لە گرووپێکی وەک خێزان، خێڵ، حیزبدا بەندیدەکات؟ چییە وادەکات ئەم مرۆڤە ببێتە ئامرازێک بۆ پیادەکردنی ئەو ئارەزوو و پلانانەی دەکەوێتە دەرەوەی خۆیەوە؟ چییە وادەکات مرۆڤی ئێمە ئازادی خۆی، فیکری خۆی، ژیانی خۆی، بداتە دەست باوکە

جیاجیاکان، له باوکی بایەلۆژییەوه بۆ باوکی کولتوری و سیاسیی؟ ئاشکرایه بۆ وەلامی ئەم پرسیارانه زیاد له هۆکارێک و زیاد له مۆتیڤێک لەئارادان، بەلام ئەوەی بەلای منەوه جێی سەرنجه و لەپەیوەندیدا به جەنگەوه دەمەوێت پەنجەی بخەمەسەر، هۆکارێکه بەباوەڕی من له هەموو فەزای کۆمەلایەتی و سیاسی و ئەخلاقی ئێمەدا ئامادەیه و ڕۆژانه کاری وێرانکارانەی خۆی لەسەر پێکهاتەی ڕۆحی و عەقلی مرۆڤی ئێمه و لەسەر بونیاده کۆمەلایەتی و هێزه جیاوازەکانی ناو واقیعی ئێمه پیادەدەکات، ئەو هۆکارەش توندوتیژییه.

توندوتیژی، هەم توندوتیژی فیزیکی و هەم توندوتیژی ڕەمزی، ئەو فاکتەرەیه له ناو هەناوی پەیوەندییه کۆمەلایەتیەکانەوه و لەناو هەناوی بەهاکانەوه دێت و بەتاکەکەسی کورد دەڵێ: تۆ بوونەوەرێکی لاواز و بێ دالده و پەنایت، تۆ بێنرخ و بێداهاتوو، بێهێز و ناکوتەنهایت. توندوتیژییه دێت و بەتاکەکەسی ئێمه دەڵێ تاقه پەناگای گەرم و ڕاستەقینه، تاقه ڕێگای دەربازبوون، تاقه بەهەشتێک، که هەبێت، باوەشی کۆ و دونیای کۆیه. توندوتیژی مرۆڤی ئێمه زەلیلدەکات و بونیادێکی سایکۆلۆژی وای پێدەبەخشێت، که زۆربەی ڕەگەزه ئۆتۆنۆمەکانی ناوهەناوی وێراندەکات. توندوتیژی فیزیکی و توندوتیژی ڕەمزی ئینسانی ئێمه دەکەنه بوونەوەرێکی پاشکۆ، ئینسانێک هەمیشه له دوای دوڵوه بڕوات، له دوای دوڵوه بخوات، له دوای دوڵوه تەماشابکات. توندوتیژی چاو لەئینسانی ئێمه دەسێنێتەوه و لەباتی ئەوه دوورببینێکی کۆیی پێدەدات، دوورببینێک تەنیا ئەو دونیا ساکار و سنووره دروستکراوانه دەبینێت، که کۆیەکی دیاریکراو، له دژایەتیکردن، یاخود هاریکاریکردنی کۆیەکانی دیکەدا دروستیکردووه، دونیایەکی مۆنۆپۆڵکراو و سنووردار.

توندوتیژی وزەیەکی چەپێنەر و بێدەنگکەره و له زۆر پانتایی سۆسیۆلۆژی کۆمەڵگای ئێمەوه دێتەدەرێ، له خێزاندا توندوتیژی له پەیوەندیی باوک/ منال،

گەورە/بچووک، نێر/ مێ دا لە چڵەپۆپەدایە، لە کۆمەڵگادا پەیوەندیی نێوان نەوە نوێکان و نەوەکانی پێشتر، سەرکردە و مرۆڤە سادەکان، دەزگاکان و هاووڵاتییان، گروپ و تاکەکەس، پەیوەندییەکە توندوتیژی چنیویەتی و توندوتیژی ڕایگرتووە. بونیادی خێزان، بونیادی خێڵ، بونیادی حیزب، بونیادی گروپەکانی دیکە، بەگشتی بونیادێکن لەپاڵ توندوتیژی و لەپاڵ کۆمەڵێک پەیوەندی ناهاوسەنگ و لەپاڵ فەزایەکی فیکریی و ئەخلاقیی توندوتیژدا مانەوە و بەردەوامی خۆیان پاراستوە. بێگومان توندوتیژی وەک هەقیقەتێک، وەک ئامرازێک بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگیيە کۆمەڵایەتییەکان، ناتوانێت هەمیشە توندوتیژییەکی بەرچاو و بینراو، توندوتیژییەکی مادی بەرجەستە و فیزیایی بێت. دەسەڵات گەمەی خۆی، توندوتیژییەکانی، هەقیقەتەکانی بەردەوام نابینا و نەدیتراو دەکات و بەچەندان ڕەمز و شێوازی جیاواز دایاندەپۆشێت. توندوتیژی بەرگی ڕەمز لەبەردەکات و دەبێتە سیمبۆل، بەرگی ئەخلاق لەبەردەکات و دەبێتە بەها، بەرگی سیاسەت لەبەردەکات و دەبێتە ئایدیۆلۆژیا، لەهەموو ئەم دۆخانەشدا بەشێوەیەکی نادیار و نەبینراو کاردەکات و دەبێتە "توندوتیژییەکی ڕەمزی". لەم دونیا ڕەمزیەدایە دەسەڵات گەمەکانی خۆی نابینادەکات و دونیای ڕاستەقینەی خۆی بە سیمبۆڵ دادەپۆشێ. بێگومان ئەم ئامادەگییە بەرفراوانەی توندوتیژی بەئاسانی وامانلێدەکات ئەنجامگیریبکەین و باس لەغیابی دەیان چەمکی سیاسی و فیکری و ئەخلاقی گرنگ بکەین، کە ناهێڵن پانتاییەکانی توندوتیژی ڕەمزی و توندوتیژی فیزیایی لە مێژوویەکی دیاریکراودا پەرەبسێنێت. من لێرەدا تەنیا لە چەمکی "لێبوردن" دەدوێم، بەو پێیەی ئەم چەمکە یەکێ لەکۆڵەکە گەورەکانی هاتنەکایەی کۆمەڵگای مۆدێرن و کایەی سیاسی مۆدێرنە. هەروەها ڕاستەوخۆ پەیوەندییەکی پتەویشی بە چەمکەکانی "جیاوازی" و "شوناس" و "ئەویتر" و "ئازادی" یەوە هەیە، کە هەموویان بەسەریەکەوە بنەماکانی ژیانی دیموکراسییانەی بێ توندتیژی، یان بە

توندوتیژییەکی کەمەوە، دەستنیشاندەکەن. لە ڕێنیسانسەوە چەمکی لێبووردن لە فیکری سیاسی هاوچەرخدا ئامادەیە و مێژوویەکی درێژی لەپشتەوەیە و تائێستاش بەچەند قۆناغێکی جیاوازی گۆڕان و گەشەکردن و فرلوانبوونی ماناکانیدا تێپەڕیوە، کەبەداخەوە من لێرەدا مەودای پیاچوونەوە و ناساندنی ئەو مێژوو و گۆڕانکارییانەم نییە. چەمکی لێبوردن قسە لەبڕی کرانەوەی سنوورە ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی کۆمەڵگایەکی دیاریکرلو دەکات بە ڕووی مانای جیاواز و بیرکردنەوەی جیاواز و شێوەی ژیانی جیاواز و کەسایەتی جیاوازدا. ئامادەنەبوونی چەمکی لێبوردن خۆی لەخۆیدا هێمایە بۆ ئامادەبوونی ناوەندێکی سیاسی و کولتوری و لەوێشەوە کەسایەتیەکی داخراوی دەسەڵاتگەر. بەبێ چەمکی لێبووردن ناکرێت قسە لە ئاشتییەکی کۆمەڵایەتی تەندروست و پتەو و باوەڕپێکراو بکەین.

لەڕاستیدا سەرهەڵدانی چەمکی لێبووردن لە کۆمەڵگاکانی خۆرئاواشدا بەتەواوی هاوتای هەوڵدانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتوری ئەو کۆمەڵگایانە بوو بۆ وەستاندن و کۆتاییهێنانی بە جەنگە ئایینیەکان، بەتایبەتی لەسەدەی شازدە و هەڤدەهەمدا. لێبوردن سەرەتا مانای "بێدەنگکردنی تفەنگەکان" بووە، دواتر و لە قۆناغێکی پێشکەوتووتردا لێبووردن لە بێدەنگکردنی تفەنگەکانەوە بووە بە "ئایدیالێکی ئەخلاقی"، یان مۆراڵی و بووە بە بەشێک لە پێکهاتەی ئەخلاقی ئەو کۆمەڵگایانە. سەرچاوەی چەمکی لێبووردن، وەک زۆربەی چەمکە سیاسی و کولتورییە هاوچەرخەکانی دیکە لە ڕۆژئاوادا، سەرچاوەیەکی ئەنوارییە، واتە لە ڕۆشنگەرییەوە هاتووە و ڕەگەکانی لەناو بیرکردنەوەی فەیلەسووفانی "پەیمانی کۆمەڵایەتی"دایە، لە لۆکەوە بۆ ڕۆسۆ و دوای ئەوانیش لەناو فەلسەفەی ئەخلاقی و سیاسی ئیمانوێل کانتدا.

جۆن لۆک بیرۆکەی لێبووردن بەتوندی دەبەستێتەوە بەبێتوانایی مرۆڤ لە گەیشتنیدا بەڕاستی و هەقیقەت، بەتایبەتی هەقیقەتی ئەبستراکت و نەبینرلو. لۆک

پێیوایە تواناکانی مرۆڤ بۆ ناسین و گەیشتن بە ڕاستی، توانایەکی سنووردار و دیاریکراون، کەس ناتوانێ هەڵگری هەموو ڕاستییەکان و هەموو پێناس و ناسینەکان بێت بەسەریەکەوە، ئینسان لە دیدی لۆکدا بوونەوەرەێکی نوقسانە و ئەوەی تاکەکەسێک دەیزانێت تەنها بەشێکی زانیارییەکان و بەشێکی ڕاستییەکانە. بۆیە بۆئەوەی ئینسانەکان بتوانن بەیەکەوەبژین دەبێت ئەوەیان قبووڵبێت، کە هەریەکێکیان بەشێک لە هەقیقەت و بەشێک لە ڕاستییەکان و لە زانیاریەکانی پێیە. بۆیە دەبێت هەریەکێکمان لەوە ببورین، کە ئەویدیکەمان هەڵگری ڕاستییەکە جیاوازە لە ڕاستییەکەی ئێمە. بەباوەڕی لۆک لێبوردن چارەسەرێکە بۆ داپۆشینی ئەو کەموکورییە ئینسانییە، ئەو بێتوانابییەی ئینسان لەگەیشتن بە هەموو ڕاستیەکان. بەباوەڕی لۆک ئەم کەموکورییە کەموکورییەکی وجودییە، هەمیشە و هەردەم لەگەڵ ئینساندایە، بۆیە پێویستە خەڵک بەرەو فیکرە و کردەی لێبوردن ببات.

ئەگەرچی فیکرەی لێبوردن لەجەوهەردا پەیوەندی بەجەنگە دینیەکانەوە هەیە، بەڵام هەم دواتر و هەم ئێستا ماناکانی ئەم چەمکە فراوانتر و گشتیتر دەبێت و بەتەنها لێبوردنی ئایینی ناگرێتەوە. ئێرە شوێنی نیشاندان و کەوتنەدوای مانا جیاوازەکانی چەمکی لێبوردن نییە و خوێنەر خۆی دەتوانێ بگەڕێتەوە سەر ئەو هەموو سەرچاوە زۆرانەی چ لە ئێستا و چ لە ڕابردوودا ئەم چەمکەیان لە گۆشەنیگای جیاوازەوە لێکداوەتەوە. بەڵام ئەوەی بەلای منەوە گرنگە پێی لە سەرداگرم و نیشانیبدەم ئەوەیە، کە نابێت فیکرەی لێبوردن وەک لێبوردنی خێڵێک، حیزبێک، یاخود گروپێک بۆ حیزب و خێڵ و گروپێکی دیکە تەماشابکەین. نابێت پێمانوابێت لێبوردن موفاوەزاتی نێوان دوو گروهە بۆ پاراستنی دەسەڵات و پەیوەندییەکانی هێز لەنێوانیاندا، دەبێت بیرۆکەی لێبوردن بەتەنها لە کایەی سیاسەت و کایەی دەسەڵاتدا بەندنەکەین، بەڵکو ڕاستەوخۆ دایبەزێنینە

ئاستی پەیوەندییە حەیاتیە ڕۆژانەییەکانەوە و ببێتە لێبوردنی تاکەکەسێک بۆ تاکەکەسێکی دیکە، لێبوردنی دوو ڕای جیاواز لە یەکتری، لێبوردنی دوو دیدی جیاواز، دوو ئەخلاقیەتی جیاواز، دوو ڕەگەزی جیاواز، دوو هەقیقەتی جیاواز لەیەکتری. لێبوردن دەبێت ڕزگاریکرێت لە مانای لێبوردنی گشتی گروپێ بۆ گروپێکی دیکە و دەرکرێ لە سنووردارکردنی بەمانا سیاسییەکان بەتەنها و نەکرێت بە سیمبۆڵی سازشی دوو هێز لەگەڵ یەکتریدا. ئەم چەمکە دەبێ ببێتە چەمکێکی شارستانی، ببێتە بەشێکی گرنگ لە کەشێکی ئەخلاقی و فیکریی، ببێتە سیستەمێک لە مامەڵەکردن بە مەرجێ هەموو ئەوانەی دەکەونە سنوورەکانی ئەو سیستەمەوە لەژێر کاریگەریەکانیدابن و لێبوردن بووبێتە بەشێک لە پێکهاتەی ئەخلاقی و سیاسی و کولتورییان. بەکورتی لێبوردن دەبێ ببێت بە بەشێک لە پراکتیکی ڕۆژانەی ژیان لەهەموو ئاست و کایە و ڕەهەندە جیاجیاکانیدا، لێبوردن دەبێ ببێ بە ئەخلاق، ولتە مۆراڵ.

-١٣-

ئەگەر کولتوری ئێمە و کارکردنی کۆمەڵێک لە چەمکەکانی ناوی و غیابی هەندێ چەمکی دیکە تیایدا، یەکێک لە فاکتەرە ناوەکییەکانی ئامادەگی زەمینەیەکی ناوخۆیی لەباربێت بۆ بەرپابوونی جەنگ، ئەوا ستراکتووری کۆمەڵایەتی کوردیش فاکتەرێکی دیکەی تەقینەوەی ناکۆکیەکانە بۆ ئاستی بەرپابوون و هەڵگیرسانی جەنگ. با هەوڵدەین ئەم بۆچوونە زیاتر شیبکەینەوە. سەردەمانێکی درێژ ئێمە نەخشەی سۆسیولۆژیی کۆمەڵگای کوردیمان بەپێوەر و نەخشە تەقلیدییەکەی مارکسیزمی ڕەسمی دەپێوا. قسەمان لە ناکۆکی چارەهەڵنەگری نێوان "پرۆلیتاریا"

و "بورژوازی کوردی" دەکرد و لەنێوان ئەو دوو "چینە" سەرەکیەشدا قسەمان لە "بورژوازییەکی بچووک" دەکرد، کە "دڵەڕاوکێ" و هەڵبەز و دابەزی چینایەتی گومڕا و نابینا و ترسنۆکی کردووە. خۆ ئەگەر زۆر لیبرال بووینایە، دەمانگوت تائێستاش "دەرەبەگایەتی" پاشماوەی لە کوردستاندا ماوە و فیودالیزم تا ئێستاش کاریگەریی لەسەر پێکهاتەی سۆسیۆلۆژی ئێمە و دیاردەکانی هەناوی ناو ئەو پێکهاتەیە هەر ماوە. هەروەها باسمان لەوەدەکرد، کە جوتیاران لەژێر سەرکردایەتی "پرۆلیتاریا" و "پارتە پێشڕەوەکەی" دا سۆسیالیزممان لە نێو شاخ و دەشتە بەیارەکانی کوردستاندا بۆ بنیاددەنێن. ئەم نەخشە سۆسیۆلۆژییە سادەیە ئەوەندە جێگای باوەڕ و متمانە بوو، ئەوەندە بەڵگەنەویستانە قبووڵکراو بوو، هەموو گۆشەنیگایەکی دیکەی بۆ تەماشاکردن و خوێندنەوەی پێکهاتەی سۆسیۆلۆژی ئێمەی بەلاوەنابوو.

ئەو ڕاستییەی، کە سەرمایەداری سیستەمێکی گەردوونیە و شێوە بەرهەمهێنانی باڵادەستە لە ساتەوەختی ئێستای مێژووی مرۆڤایەتیدا، مانای ئەوەنییە خۆبەخۆ هەموو دونیا و هەموو کۆمەڵگاکان یەک پێکهاتەی سۆسیۆلۆژی و یەک تەوقیتی کۆمەڵایەتی و یەکجۆر ناکۆکی و یەکجۆر ئایینده و یەکجۆر کێشەیان هەیە. لەدونیای ئێمەدا سەرمایەداری شێوازێکی تایبەتی بەرهەمهێنانە، کە نەیتوانیوە فۆرمەکانی پەیوەندی کۆمەڵایەتی و کولتوری پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکانی بەر لە سەرمایەداری ناو کۆمەڵگای ئێمە ڕادیکاڵانە بگۆڕێت و لەشوێنیاندا فۆرم و پەیوەندی نوێ پایەداربکات. مەبەستم لەو فۆرمانەش فۆرمی خێڵ و فۆرمی خێزانە، کە تائێستاش لە کۆمەڵگای ئێمەدا تاڕادەیەکی زۆر شوێن و مەوقیعی کۆمەڵایەتی و ڕۆڵە سیاسی و کولتورییە تەقلیدییەکانی خۆی پاراستوە. سەرەڕای ئەمەش سەرمایەداری لە دونیای ئێمەدا نەیتوانیوە "پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان" لە "پەیوەندییەکانی خزمخواهی" و لەوێوە چەمکە ئابوورییەکان لە چەمکە

ئایدیۆلۆژییەکان دابڕێت و ئابووری بکاتە ئەو هێزەی کەدەشێت لە پشتی زۆر لە گۆڕانکارییەکانەوە بێت. بێگومان ئەم بۆچوونە نایەوێت بڵێت ئابوری ڕۆڵی لە جێگۆڕکێ و ململانێی کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی دونیای ئێمەدا نییە، بەپێچەوانەوە شەڕی ناوخۆی ئەمجارە لە کوردستاندا تاڕادەیەکی زۆر وابەستەی جێگۆڕکێیەکی کۆمەڵایەتییە، کە تێیدا گۆڕینی "مەوقیعی سیاسی" بە "مەوقیعێکی ئابووری" ڕۆڵی سەرەکی تێدا دەبینێت و لانیکەم ئەوەمان بۆلێکدەداتەوە بۆ ئەم شەڕە ناوەستێت. ئەوەی من لێرەدا مەبەستمە بیڵێم ئەوەیە سەرمایەداری لە دونیای ئێمەدا فۆرمی پەیوەندی و فۆرمی ئۆرگانە کۆمەڵایەتییەکانی بەر لە سەرمایەداری بەتەواوی و ڕادیکاڵانە بۆ نەگۆڕاوە، بەڵکو لەناو هەناوی خۆیدا جێی بۆکردونەتەوە و پاراستوشنی. با ئەم بۆچوونە وردتر شیبکەینەوە.

لەسەدەی نۆزدەهەمدا، ئەوەی هاوسەنگیی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای ئێمە و هاوسەنگیی پەیوەندیی نێوان خێڵەکانی ڕادەگرت میرنشینە کوردییەکان بوون. ئەم میرنشینانە چەقی بەتاڵکردنەوەی بارگەکانی جەنگی نێوان ئەو خێڵانە بوون، کە دەکەوتنە ژێر چەتر و دەسەڵاتی میرنشینەکانەوە. جەنگی خێڵەکان لەبەردەم ئامادەگی میرنشینەکاندا تاڕادەیەکی زۆر دەوەستا و میرەکان دەیانتوانی ڕۆڵی ناوکۆییەک ببینن لەنێوان خێڵە جیاجیاکانی ژێر دەسەڵاتیاندا. بێگومان ئەم کۆبوونەوە ناوچەییە ڕێی لەوە نەگرتوە، کە میرنشینەکان خۆیان لە نێوان خۆیاندا پەلاماری خێڵەکییانە بۆسەر یەکتری ببەن. بەمانایەکی دیکە میرنشینەکان ڕۆڵی فیدراسیۆن، یان کۆبوونەوەی، کۆمەڵێک خێڵی تایبەتیان بینیوە لە بەرامبەر میرنشینێکی دیکەدا وەک فیدراسیۆنی کۆمەڵێ خێڵی دیکەدا، هاوکات میرنشینەکان لەنێوان خۆیاندا لە پەیوەندییەکی خێڵەکییەکاندابوون لەگەڵ یەکتریدا.

لەدوای ڕوخان و فەوتانی میرنشینەکان، ئیدی ئەو چوارچێوە سیاسی و

کـۆمەڵایەتییە کـۆکەرەوەیە بزربەبـێ، کە خێڵەکـان بەیەکـدیەوە کۆدەکـاتەوە و کۆمەڵگای ئێمە بەتەواوی دابەشدەبێتەوە بـۆ کـۆمەڵێ خێڵـی بچووک و ناتەبـا و ململانـێکەر، کە میرنشـینەکان نـامێنن ئیـدی ناوەنـدێک بـۆ دەسـەڵات نـامێنێتەوە بتوانێت ئەو هێزە لۆکاڵییە پارچەپارچانە کۆبکاتەوە، ئەگەرچی هەوڵی شـێخەکان، بەتایبەت شێخەکانی تەریقەت بۆ خـۆ بە سـێنتەرکردن و کـۆکردنەوەی خێڵەکـان، وەک مارتن ڤان براونێسـن دەڵێـت، لەم ڕووەوە هەوڵێکـی بەرچاوبووە. لەڕاسـتیدا ئەوەی ئەم بـارودۆخە تـایبەت و پـڕ تەقیـنەوەیەی لەجەنـگ و پەلامـاری نـاوخۆ ڕزگارکرد، دوو فاکتەر بوون:

یەکەمیـان ئەو هەلـومەرجە سیاسـییە نێـونەتەوەیی و نـاوچەییەی لەو ڕۆژگـارەدا هاتەکایەوە، کە سەرەتاکانی گوتارێکی نەتەوەیی هێنایەکایەوە و خەڵکی لە دەوری کۆمەڵێک چەمک و مانای سیاسی نـوێ کـۆدەکردەوە، کۆنسـێپتی نەتەوە و بیـری نەتەوەیـی بـۆ نمـوونە. لەپـاڵ ئەمەشـدا هەسـتکردنی کـورد بە هەوڵـدان بـۆ دروستکردنی دەوڵەتێکی ئەرمەنی مەسیحی لەو ناوچانەدا، کە کورد لەو ڕۆژگـارەدا بە مـوڵکی خـۆی زانیـوە، هۆکـارێکی گرنـگ بـووە دابەشـبوونە ناوەکییەکـانی هێمنکردۆتەوە. بەمانایەکی دیکە بوونی دوژمنێکی دەرەکی تا ڕادەیەکـی زۆر ڕۆڵـی هەبووە لە هێمنکردنەوەی کێشە ناوەکییەکاندا.

دووهەم: ئامـادەبوونی بـازاڕی سـەرمایەدارییە وەک ناوەنـدێک بـۆ کـۆکردنەوەی خێڵەکان و کاڵا بەرهەمهێنراوەکانیان.

بەبۆچـوونی مـن بـازاڕی سـەرمایەداری لە نیـوەی دووەمـی سـەدەی نۆزدەهەم و چارەکەسەدەی یەکەمـی ئەم سـەدەیەدا ئەو ڕۆڵەی بینـی، کە میرنشـینەکان وەک فیدراسـیۆنی خێڵەکـان دەیـانبینی، بـازاڕی سـەرمایەداری و ئـاڵوگۆڕی کـاڵا بەرهەمهاتووەکان بوونە ناوەندی ڕاگرتنـی هاوسـەنگییە نـاوەکییە کۆمەڵایەتیەکـانی دونیـای ئـێمە، بـوونە ناوەنـدێک بـۆ کـۆکردنەوە و نیشـتەجێکردنی خێڵەکـان و

ناوەندێک بۆ ئاڵوگۆڕ و بەرهەمهێنانی کۆمەڵێ پەیوەندیی نوێ. بەڵام ئەم هاوسەنگییە نوێیە، نەیتوانی خێڵ وەک فۆرمێکی سەرەکی و وەک شکڵبەندی کۆمەڵایەتی، هەروەها نەیتوانی پەیوەندییەکانی خزمخواهی، وەک پەیوەندی زاڵ و باڵادەست لەدونیای ئێمەدا، تێکبشکێنێت.

بەدرێژایی ئەم سەدەیە خێڵ و پەیوەندییە خێڵەکییەکان فاکتەرێکی گرنگی ڕووداوەکانی دونیای ئێمە بوون. بەرچاوترین و نزیکترینیان بە یادەوەری ئێمە ڕۆڵی خێڵە لە هەڵبژاردنەکەی پەرلەمانی کوردستانی دوای ڕاپەڕین لە ساڵی ١٩٩٢ دا. لەم هەڵبژاردنەدا خێڵ و پەیوەندییەکانی خزمخواهی بەئاشکرا ڕۆڵی گەورەیان بینی لە ئەنجامەکانی هەڵبژاردن و چۆنیەتی دروستبوون و هاتنەکایە و ئیشکردنی مۆدێرنترین دەزگای سیاسی و کۆمەڵایەتی لە دونیای ئێمەدا، مەبەستم پەرلەمانی کوردییە. ڕاستە نزیکەی سەدەیەکە بازاڕ بووتە شوێنی کۆبوونەوەی خێڵەکان و کاڵاکان بەیەکەوە، بەڵام ئەم کۆبوونەوەیە نەبۆتە هۆی تواندنەوەی سنوورەکانی خێڵ و تێکەڵبوونیان بەیەکتری. خێڵ وەک یەکەیەکی کۆمەڵایەتی داخراو لەناو خۆیدا ماوەتەوە و پەیوەندییەکانی خزمخواهیش لەم ڕووەوە ڕۆڵێکی بەرچاو و گەورەیان بینیوە و یارمەتیدەرێکی گرنگی مانەوە و سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی ئەم داخرانە سۆسیۆلۆژییە بوون. سەرمایەداری لە دونیای ئێمەدا خێڵە کۆچەرییەکانی نیشتەجێکرد، ئاشتییەکی ڕێژەیی لە نێوانیاندا هێنایەکایەوە، هەندێ توێژ و گروپی تازەی دروستکرد، کەمێک جەستەی خێڵی بچووککردەوە، بەڵام بونیادی خێڵی بۆ تێکنەشکا، یاسا ناوەکییەکانی ئەو بونیادەی بۆ هەڵنەوەشایەوە و فەزا ڕەمزی و ئەخلاقییەکەی خێڵی بۆ نەگۆڕدرا. دەکرێ تا ئەو شوێنە پێداگرم و بڵێم بازاڕی سەرمایەداری لە دونیای ئێمەدا زیاتر ڕۆڵی "تەوتەمێکی کۆیی" بینیوە تا ڕۆڵی کۆمەڵێک میکانیزمی ئابووریی بەهێز، کە کۆمەڵێک دەرەنجامی سۆسیۆلۆژیی بونیادی کاریگەر و گرنگی لێبکەوێتەوە. بە تەوتەمبوونی بازاڕی

سەرمایەداری لە سەرێکەوە پابەستی بونیادی کشتوکاڵییانەی ئابووریی کوردستان خۆیەتی و لەسەرێکی دیکەشەوە وابەستەی ستراتیژێکی سیاسی ناحەزانەی داگیرکەرانی کوردستان و لەڕاستیشدا بزوتنەوەی ناسیۆنالیزمی کوردیش خۆیەتی. مانەوەی خێڵ و پەیوەندییە خێڵەکیەکان، بۆ کۆمەڵێ مەبەستی سیاسیی دیاریکراو، هەم لەلایەن داگیرکەران و هەم لەلایەن بزوتنەوە سیاسیە کوردییەکانەوە پارێزراوە.

بۆ ئەوەی زیاتر ئەو بۆچوونەی سەرەوە ئاشکرابکەم، هەوڵدەدەم لێرەدا بەپشتبەستن بەچەند بۆچوونێکی "محمد عابد جابری" بۆ خوێندنەوەی عەقڵی سیاسیی عەرەبی ئەو مەسەلانە قووڵتر و وردتریکەمەوە. خێڵ وەک جابری بەپشتبەستن بە "ئیبن خلدون" دەڵێ، لەیەک کاتدا هەم دەرکەوت و پێدراوێکی سایکۆلۆژییە، واتە واقیعێکە پەیوندیی بە دونیای ڕۆحی و ویژدانیی مرۆڤەوە هەیە، هەم دەزگا، یاخود ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتی و سیاسیشە، کە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە دونیای پراکتیک و هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤەوە هەیە. (٦) بەمانایەکی دیکە خێڵ هەڵگری دوو ڕەهەندە، یەکەمیان ڕەهەندێکی ناوەکییە، ئەویدیکەشیان ڕەهەندێکی دەرەکییە. مەبەست لە ڕەهەندی ناوەکی خێڵ لایەنە سایکۆلۆژیی و ڕۆحییەکانی خێڵ نیشاندەدات، کە لە ناوەوەڕا بەها و پێوەرە ڕۆحییەکان و مەیلی ئینتما لە ئینساندا دەچێنن و ئەو دونیا ڕەمزیەشی بۆ بەرهەمدەهێنن، کە بەهۆیەوە پەیوەندییەکانی خۆی و مەوقیعی و ماناکانی لەبەرامبەر دونیادا دەستنیشاندەکات. بە بۆچوونی من لە دونیای ئێمەدا و تائەم ساتەوەختەی ئێستاشمان، ئەم ڕەهەندە ناوەکییەی خێڵ توانیویێتی تاڕادەیەکی زۆر بمێنێتەوە و سەرمایەداری نەیتوانیوە ئەم هەڵقە ویژدانییە ناوەکییە تێکبشکێنێ و ئینتیمای گەورەتر بۆ مرۆڤی ئێمە دروستبکات..

مەبەست لە ڕەهەندی دەرەکی خێڵیش ئەو لایەنە پراکتیکییەیە، کە پەیوەندیی

خێڵ بە دەرەوەی خێڵەوە دیاریدەکات و لەهەمانکاتیشدا ڕێکیدەخات. خێڵ لێرەدا خۆی وەک کۆیەک، وەک هێزێکی یەکگرتوو، وەک دەزگایەک لە بەرامبەر خێڵ و هێز و دەزگاکانی دیکەدا دەناسێنێت و هەوڵدەدات هاوسەنگییە سیاسییەکان و تەرازووی دەسەڵات وا ڕابگرێت، کە لە قازانجی مانەوە و گەشەکردنی سنوورەکانی دەسەڵات و توانای تایبەتی خۆیدابێت. بەبۆچوونی من سەرمایەداری لەم ئاستەدا توانیویەتی ئەو ناوەندە بخولقێنێ، کە تیایدا پەیوەندییە توندوتیژ و شەڕئامێزەکانی نێوان خێڵەکان کەم تازۆر کۆنترۆڵبکات، بەبێ ئەوەی هەوڵی تەواوی لەناوبردنیان بدات. ئەمەش سەرچاوەی ئەو ئاشتییە ڕێژەییەیە هێزە کۆمەڵایەتییەکانی ئێمە لەم سەدەیەدا بە بەراوردکردنی بەسەدەی ڕابوردوو لەگەڵ یەکدیدا هەیانبووە.

-١٣-

مەبەست لە "پەیوەندییەکانی خزمخواهی" لەو دیدە سۆسیۆلۆژیەی سەرەوەدا بە تەنها ئەوەنییە خەڵکان دەبێت خزم و کەسوکاری یەکدی بن و پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی خوێن بەیەکدیانەوە ببەستێتەوە. بەڵکو ئەم پەیوەندییە هەموو ئەو مانایانەش دەگرێتەخۆی، کە باس لە ئینتیما بۆ گەڕەکێک، شارێک، ناوچەیەکی دیاریکراو و حیزبێک، دەکات. پەیوەندییەکانی خزمخواهی باس لە ئینتمایەک دەکات، کە نە لەسەر بنەمای پەیوەندییە ئابوورییەکان دروستبوبێت، وەک مارکس پێشنیاریدەکرد، نە لەسەر بنەمای "ڕۆحی نەتەوە" شدا وەک هیگڵ ئامارەی پێدەدا. پەیوەندییەکانی خزمخواهی پەیوەندییەکە لەسەر بنەمای هاوخوێنی و خزمایەتی بەو مانایانەی لە سەرەوە باسمانکرد، دروستدەبێت. مارکس باس لەهێزی ئابووری دەکات لە دروستکردنی ئینتمایەکدا گەورەتر و فراوانتر لە ئینتما

بۆ خێڵ و ناوچە هتد... بەڵام هیگڵ باس لە "هێزی کولتور" دەکات بۆ خولقاندی ئەو پەیوەندییانە. ئابووری مارکس بەرەو بڕیاردان لەسەر ڕۆحی چینایەتی دەبات بۆ بەیەکەوەگرێدانی هەموو ئەوانەی یەک هەڵوێستیان لە پرۆسەی بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتیدا هەیە، بەڵام کولتور هیگڵ بەرەوپێشنیارکردنی ڕۆحی نەتەوە دەبات بۆ تێپەڕاندن و ڕزگاربوون لە پارچە پارچەبوون و هەنگاونان بەرەو دروستکردنی یەکە کۆمەڵایەتییە گەورەکان. جائەگەر سەرمایەداری نەیتوانیبێ خەونی مارکس لە واقیعی ئێمەدا بهێنێتە دی، ئەوا هێزی کولتوریش بەهەمان شێوە نەیتوانیوە خەونی هیگڵ لە دونیای ئێمەدا بهێنێتەدی. بەمانایەکی دیکە لەوکاتەدا، کە هێزی ئابووری لە کۆمەڵگای ئێمەدا زۆر لەوە لاوازترە بونیادی خێڵ و بونیادی پێکهاتە سروشتییەکان تێکبشکێنێت و چینە کۆمەڵایەتییەکان بەتەواوی دروستبکات، بەهەمان شێوە هێزی کولتوری نەتەوەیی لای ئێمە ئەوەندە لاوازە نەیتوانیوە ئەو ڕۆحە نەتەوەییەی هیگڵ باسیدەکات، بەرهەمبهێنێت. لێرەوە هێزە کۆمەڵایەتییەکانی دونیای ئێمە نە توانیویانە وەک چین و نە توانیویانە وەک نەتەوە هەڵسوکەوتبکەن. بەپێچەوانەشەوە سەرتاپا لەناو پەیوەندییەکانی خێڵ و پەیوەندییەکانی خزمخواهیدا نوقمن، ئەم پەیوەندییانەش هەردوکیان پەیوەندی بەر لە دروستبوونی چینی کۆمەڵایەتی و بەر لە دروستبوونی نەتەوەن.

بۆ زیاتر قوڵکردنەوەی ئەو بۆچوونەی سەرەوە پێویستە زیاتر جەخت لەسەر پێکهاتەی پەیوەندییەکانی خزمخواهی لە دونیای ئێمەدا بکەین و ماناکانی ڕوونبکەینەوە. بۆ جێبەجێکردنی ئەم کارەش هەوڵدەدەم سوود لەو مانایانە وەرگرم، کە ئەنترۆپۆلۆژیی فەرەنسی "موریس گودولیە" بەم چەمکەی دەدات.(٧) گودولیە ڕای وایە پەیوەندییەکانی خزمخواهی لە کۆمەڵگاکانی پێش سەرمایەداریدا، لەیەک کاتدا هەم ڕۆڵی "ژێرخان" و هەم ڕۆڵی "سەرخان" بەمانا مارکسییەکە دەبینن و ئەم پەیوەندییانە لەیەککاتدا هەم ژێرخانی کۆمەڵگان و هەم سەرخانی

کۆمەڵگاش. گۆدۆلیە ئەم بۆچوونەی قووڵتردەکاتەوە و پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت، کە پەیوەندییەکانی خزمخواهی لەیەککاتدا سێ شت بەیەکەوە کۆدەکاتەوە:

١ـ پەیوندییەکانی بەرهەمهێنان

٢ـ دەسەڵات

٣ـ ئایدۆلۆژیا.

وەک ئاشکرایە گۆدۆلیە دەیەوێت بڵێت پەیوەندییەکانی خزمخواهی لەیەککاتدا دەتوان هەم ڕۆڵی ئابووری و هەم ڕۆڵی سیاسی و هەم ڕۆڵی فیکری و ئایدۆلۆژیش ببینن. کۆکردنەوەی ئەم سێ ڕۆڵەش لەناو یەک پەیوەندی دیاریکراودا مەسەلەی تێکشکاندن و تێپەڕاندنی هێجگار زەحمەتدەکات. مەسەلەکە لێرەدا بەتەنها مەسەلەی تێکشکانی پەیوەندییە ئابوورییە تەقلیدییەکان نییە و بەتەنها تێکشکانی ئەم پەیوەندییە ئابوریانە بەس نیین بۆ ئەوەی خودی پەیوەندییەکانی خزمخواهی وەک گشتێک تێکبشکێنرێن. بەهەمان شێوە تێکشکاندنی شێوازی دەسەڵات، یان گۆڕین و دەستکاریکردنی ئایدۆلۆژیا بە تەنیا بەس نیین بۆ گۆڕینی پەیوەندییەکانی خزمخواهی بە پەیوەندی کراوەتر و بەرفراوانتر. ئەم جۆرە گۆڕانە یەکلایەنییانە چارەسەری مەسەلەی پەیوەندییەکانی خزامخواهی ناکات. بۆ تێکشکانی پەیوەندییەکانی خزمخواهی و جێگرتنەوەیان بە پەیوەندی نوێ و لەوێشەوە ئینتیمای نوێ بەتەنها تێکشکاندنی ڕەهەندێک لەو سێ ڕەهەندەی سەرەوە، بەبێ تێکشکاندنی دوو ڕەهەندەکەی دیکە، بە بەس نییە، ئەم جۆرە تێکشکانە یەکلایەنە جگە لە پرۆسەیەکی مێژووی سەقەت و نیوەوناچڵ کارێکی دیکە نییە. تێکشکانی پەیوەندییەکانی خزمخواهی خوازیاری پرۆژەیەکی سیاسی کۆمەڵایەتییە، کە بتوانێت لەیەککاتدا هەم دەسکاری پەیوەندییە ئابوورییەکان و هەم دەسکاری فۆرمەکانی دەسەڵات و هەم دەسکاری ئەو پێکهاتە ئایدیۆلۆژی و ڕۆحییەش بکات، کە پایەکانی پەیوەندییەکانی خزمخواهی لەسەر بنیادنراوە.

بەبۆچوونی من لەدونیای ئێمەدا سەرمایەداری زیاتر دەستکاری ڕەهەندی ئابووری پەیوەندییەکانی کردووە و کەم تازۆر ئاستێکی دیکە و فۆرمێکی دیکەی پێداون، بەڵام نەیتوانیوە دەستکارییەکی ڕادیکاڵانەی دوو ڕەهەندەکەی دیکە، ڕەهەندی دەسەڵات و ڕەهەندی ئایدۆلۆژیا بکات. ئەو دوو ڕەهەندە بەدرێژایی ئەم سەدەیە تاڕادەیەکی زۆر زۆریەی ڕەگەز و پایەکانی مانەوەی خۆیان پاراستوە، هەر لە فۆرمەکانی دەسەڵاتەوە بیگرە تا بەو زەمینە ویژدانی و ڕۆحی و ئایدۆلۆژییە دەگات، لەدونیای ئێمەدا خێڵ و پەیوەندیەکانی خزمخوازی بەرهەمدەهێنێتەوە.

-١٤-

ئەگەر ئەوەی تا ئێستا باسمانکرد ئەو هۆکارە بابەتییانەبن، کە زەمینەی جەنگ لە دونیای ئێمەدا، لەناوەوەڕا، خۆشدەکەن و "بوونی بە زەبری" جەنگ دەگرنە خۆیان، لێرە بەدواوە هەوڵ دەدەم ڕۆڵی سیاسەت بەگشتی و حیزب بەتایبەتی، بەتایبەتی لەدوای ڕاپەڕین و دروستکردنی پەرلەمان و حوکمەتی هەرێمەوە، لەخۆشکردنی ئاگری شەڕ و تیژکردنەوەی ناکۆکییەکانی نێو ئەو ستراکتورە کۆمەڵایەتی و کایە سیاسی و پێکهاتە کولتورییە نیشانبدەم. بەمانایەکی دیکە ئەگەر ئەوەی تائێستا لەم نووسینەدا باسمانکردووە، فاکتەرە بابەتییەکانی بەرپابوونی جەنگ بێت، مەبەستم ستراکتوری کۆمەڵایەتی و هەندێ لایەنی کولتوریی و خودی کایەی سیاسی وەک کایەیەکی پڕ کێشەی چارەسەرنەکراو، ئەوا ئەوەی ئەم زەمینە بابەتییە بارگاوییە دەتەقێنێتەوە، ئەوەی وزەی ناوەکی بونیادەکان بەرەو تەقاندنی تفەنگان دەبات، هۆکارە خۆییەکانن. ئەو هۆکارانەن، کە ڕاستەوخۆ وابەستەی بڕیاری حیزبەکان و سەرکردەی حیزبەکانن. بەم

پەڕینەوەیەش ئیدی سەرزەمینی بونیادەکان بەجێدەێڵین و دەچینە سەرزەمینی "بکەرە کۆمەڵەیەتییەکانەوە".

لەسەرەتاوە لەو ڕاستییە سادەیەوە دەستپێدەکەم، کە هۆکارە خۆییەکان لە دونیای ئێمەدا لەباتی ئەوەی هەوڵی چارەسەرکردنی ئەو کێشە کولتوری و سیاسی و ستراکتورییانەی لەسەرەوە لێیدواین بدەن، دەبینین زیاتر خەریکی قوڵترکردنەوەی کێشەکان و دوورخستنەوەی چارەسەرکانن. هۆکارە ناوەکییەکان لە باتی ڕێگرتن و دورخستنەوەی تەقینەوە پەنهانەکانی ناو ئەو بونیاد و پێکهاتانەی باسمانکردن، خۆیان دەبنە هۆکاری هەرچی زیاتر و زوتری تەقینەوەکان. هۆکارە خۆییەکان نایەن، بۆنموونە، لەڕێی دروستکردن و بەهێزکردنی کۆمەڵێ دەزگای تایبەت و پیادەکردنی سیاسەتێکی فەرهەنگی ڕادیکاڵانە و بەرهەمهێنانی پراکتیکێکی دیکەی دەسەڵاتەوە، لەپێش هەمووشیانەوە ئازادکردنی کۆمەڵگای مەدەنی کوردی و داگیرنەکردنی و نەبەستنەوەی هەڵقە ئابوورییە گرنگەکانی کوردستان بە دەغیلە تایبەتەکانی حیزبەوە، ڕێگە لە تەقینەوە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان بگرن. فاکتەرە خۆییانە نایەن بۆ ڕێگرتن لە گەشەی سەرەتانییانەی حیزب وەک تاقە دەزگا و چوونە شوێنی هەموو کۆمەڵگا، نایەن بۆ ڕزگارکردنی دەسەڵات لە جەستەی سەرکردەکان و نایەن بۆ دۆزینەوەی میکانیزمی دیکە بۆ بڕیاردانی سیاسی و دروستکردنی دەزگای بان حیزبی و ئەو دەزگایانەی دیکەش، کە دەشێت ببنە سەرچاوەی دروستبوونی ئیجماعێکی سیاسی و کولتوری. هۆکارە خۆییەکان نایەن لەپشتی دابەشبوونەکان و ئینتیما بچووک و بەرتەسکەکانەوە کاربکەن و سەرزەمینی دروستبوونی ئینتیمای گەورەتر و نەتەوەیی فەراهەم بکەن. دەڵێم هۆکارە خۆییەکان لەباتی چارەسەری ئەم کێشانە و ڕزگارکردنی دونیای سۆسیۆلۆژی ئێمە لە جەبری پڕوکێنەری بونیادەکان خۆیان دەبنە سەرچاوەی دروستبوونی دەیان کێشەی نوێ و سەرچاوەی قوولترکردنەوە و خوێناویکردنی

کێشە کۆنەکانیش.

لە چەندساڵی ڕابردوودا حیزبە کوردییەکان دابەشکردنە کۆنەکانی ناو کۆمەڵگای ئێمەیان نەک چارەسەر نەکرد، بەپێچەوانەوە ئەمان ئەم دابەشکردنانەیان قووڵتر و قووڵتر کردۆتەوە. لەدوای ڕاپەڕینەوە حیزبی کوردی خۆی چۆتە شوێنی کۆمەڵگا و خۆی چۆتە بری نەتەوە و خۆی بۆتە خاوەنی ئابووری و خۆی بۆتە تاقە دەزگایەک، کە ماف و شەرعیەت و هەموو دەسەڵاتێکی هەبێت. لەدوای ڕاپەڕینەوە دەسەڵات نەک بەدەزگایی نەکرا، نەک بنەمایەکی دەستوری و یاسایی بۆ دانەدرا، بەڵکو زیاتر "جەستێنرا" و ڕاستەوخۆ بوون و نەبوونی دەسەڵات بەجەستەی سەرکردەکانەوە گرێدرا، بەڕادەیەک لە غیابی جەستەیی تاڵەبانی و بارزانی دا، پەرلەمانی کوردی بووە دەزگایەکی بێ ڕۆح و بێ ناو و بێ ئیرادە. ئەو ژوور و ئاپارتمان و خانوەی بارزانی و تاڵەبانی تێدایە، دەسەڵات لەوێیە، نەک لەو دەزگا ڕەسمییانەدا، کە حکومەتی هەرێم دروستیکردبوون. بەجەستەییکردنی دەسەڵات لەعێراقدا ئەزموونێکی بەعسیانەی کوشندەیە و سەرکردە کوردەکان ڕاستەوخۆ کۆپیانکرد. کۆکردنەوەی هەموو دەسەڵاتەکان لە جەستەی سەدام حوسەیندا ئەزموونێکی تاکڕەوانەی بەعسە و دەربڕی خنکاندنی هەموو ئەو بازنانەی دیکەی دەسەڵاتە، کە دەشێ لەدەرەوەی جەستەی سەرۆکدا ئامادەبن، لەپێش هەمووشیانەوە دەسەڵاتی دەزگاکانی "کۆمەڵگای مەدەنی".

ئەزموونی دەسەڵاتی کوردی لەدوای ڕاپەڕینەوە دەبوایە گەشەی ئێمەی بەرەو بەنەتەوەبوونی تەواو، بەرەو بەرهەمهێنانی ئیجماعێکی سیاسی و نەتەوەیی ئاراستەبکردایە، ئەو هۆکارانەی تێکبشکاندایە، کە ڕێگرن لەبەردەم هەڵسوکەوت و پراکتیکی ئێمەدا وەک نەتەوەیەک. ئاخر پرۆسەی بەنەتەوەبوون، پرۆسەیەکە بەبێ بوونی دەوڵەت، یان بوونی دەسەڵاتێکی سیاسی، کە بیەوێت بەڕاستی نەتەوە دروستبکات، کارێکی مەحاڵە و نەتەوە و هەستی نەتەوایەتی دەبێت دروستبکرێن و

لەڕاستیشدا دابهێنرێن. بەپێچەوانەوە ئێمە لە باتی دروستکردنی دەوڵەت و بەهێزکردنی دەزگاکانی دەوڵەت، خەریکی بەدەوڵەتکردنی حیزب و بە کۆکردنەوەی دەسەلاتەکان لەناو دەزگاکانی حیزبدا بووین. ئەمەش زیانێکی مێژوویی هێجگار گەورەی هەم بە خودی ئەزموونی دەوڵەت خۆی و هەم بەواقیعی کۆمەلایەتی و سیاسی و ئەخلاقی و فیکری ئێمە گەیاند. لێرەوە لەباتی کۆتاییهێنان بە کۆی دابەشبوونە کۆن و توندوتیژەکانی ناو واقیعی سیاسی و کۆمەلایەتی ئێمە دەبینین لەیەککاتدا هەم دابەشبوونە کۆنەکان قوڵترکرانەوە و هەم کۆمەڵێک دابەشبوونی نوێش لەپاڵ دەسەلاتی حیزبدا دروستکران. بەکورتی حیزبە کوردییەکانی دونیای ئێمە سیاسەتیان کردە هونەری بردنەوەی جەنگ، نەک هونەری بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا.

-١٥-

یەکێک لەتایبەتمەندییەکانی کایەی سیاسیی کوردی بریتییە لە کورتکردنەوە و تەسککردنەوەی کۆمەڵگای سیاسی کوردی بۆ حیزب و ئۆرگانەکانی حیزب. حیزبیش نە بەو مانایەی نوێنەر، یان هەڵگری پرۆژە، یان ستراتیژێکی نەتەوەیی بێت، بەڵکو بەو مانایەی نوێنەری ناوچە، یان هاوپەیمانیەتێکی دیاریکراو، یان شارێک، یان هەر پێکهاتەیەکی دیکە بێت، کە لەسەر بنەماکانی ئینتیمای بەر لە دروستبوونی نەتەوە دروستبوبێت. لەڕاستیشدا هیچ یەکێک لە حیزبە کوردییەکانی دونیای ئێمە خولقێنەر، یان هەڵگری شوناسێکی نەتەوەیی نین، شوناسێک، وەک پێشتر لەپاڵ هیگڵدا هێمامان پێکرد، کولتور نەیتوانیوە دروستیبکات و لەپاڵ مارکسیشدا ئابووری نەیتوانیوە بەرهەمیبهێنێت. بەمجۆرە پرۆسەیەک، کە کولتور و

ئـابووری نەیـانتوانیوە بە کـامڵبوونی تەواوی بگەیەنـن، سیاسـەت هـاتوە لەبـاتی چارەسەرکردنی زیاتر قەیراناوی کردووە. لێرەوە پرۆژەکانی حیزب، وێناکردنەکانی، تەماشـا و هەڵسـەنگاندنەکانی، هەر هەموویـان لەو سـنوورانەدا سـوڕاونەتەوە، کە دەکەونە پێش سنووری مانا سیاسیەکانی نەتەوەوە، نەک نـاو سـنووری نەتەوە و قازانج و دەسکەوتە ستراتیژیەکانی نەتەوەوە.

"کۆمەڵگای سیاسی" دەشـێت هەمـوو دەسـتەو گـروپ و تـاکەکەس و چـالاکییەک بگرێتەوە، کە بەشێوەیەک لە شێوەکان قسە لە مەسەلەی گەیشتن بە دەسەڵات و حوکمڕانی دەکەن و دەسەڵاتیان لە چەقی بیرکردنەوەی خۆیانـدا دانـاوە و هەوڵـی بەدەستهێنانیشـی ئەدەن. کـورتکردنەوەی کۆمەڵگـای سیاسـی بـۆ حیـزب مانـای بەڕەهاکردنی دەزگایەکی دیـاریکراو بەرامـبەر چەنـدان دەزگـا و چـالاکی دیـکە، کە دەشێت سیاسەت مەسەلەی سەرەکی بێت لە پرۆسـەی کارکردنیانـدا. بەبۆچـوونی مـن ئەم پرۆسـەی خۆبەڕەهـاکردنەی حیـزب لە بەرامـبەر کـۆی دەزگـا سیاسـی و شارستانییەکانی دیکەدا، هەمان بونیادی خۆبەڕەهاکردنی خێڵە لەبەردەم نەتەوەدا. بەم مانـایەیە دەڵـێم میکـانیزمی کـارکردنی حیـزب و میکـانیزمی کـارکردنی خێـڵ هەردووکیان یەکن و لەسـەر بنەمـای یەک پرۆسـەی خۆبەڕەهـاکردن کـاردەکەن لە بەرامبەر بوونە دەرەکییەکانی دەرەوەی حیـزب و خێڵـدا. ترسـناکترین دەرەنجـامی ئەم پرۆسەیە بریتییە لە گۆڕینی هەموو بالادەستییەکی سیاسی بە بالادەسـتییەکی حیزبی، لێرەوە چەندە هەڵقە کۆمەڵایەتییە فراوانەکانی دەرەوەی خێڵ ونـن (وەک چین و نەتەوە) بەهەمان ئەندازەش هەڵقە فراوانەکانی ئەودیوی حیزب ونن، هەر لە ونبـونی بەرەیەکـی یەکگرتـووەوە بیگـرە تـا بە بـوونی هاوپەیمـانی فراوانـی چەنـد هێزێـک، بـوونی فیکـرەی دەوڵەتێـک، یـان بـوونی دەزگـا گشـتییەکان دەگـات. لەدۆخێکی وادا دەسەڵاتی سیاسی کارێک جێبەجێدەکات، کە بریتییە لە ڕاکێشـانی دونیـای دەرەوە بـۆ نـاو حیـزب، یـان فراوانکردنـی حیـزب تـاڕادەی داگیرکردنـی

کۆمەڵگـا. ئەمەش لە هەمـوو ڕوویەکەوە کـارێکە دژ بە داخـولزییە بـابەتی و مێژوویییەکانی واقیعی کوردی. بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵە و دواتریش بۆ زیاتر تێگەیشـتن لە ڕوداوەکـانی دوای ڕاپەڕیـن و بارگـاویبوونی فەزای سیاسـی و کۆمەڵایەتی ئێمە بە مۆتیڤەکانی جەنگ و پووچەڵکردنەوەی دەسـەڵاتی حکـومەتی هەرێم لە کوردستاندا، وای بەباش دەزانم ئەزموونی دەوڵەت و دەسەڵات لە عێراقدا بخەمەڕوو، چـونکە بەبـاوەڕی مـن ئەزمـوونی دەسـەڵاتی کـوردی لەگەڵ دەوڵەتـدا، دووبـارەکردنەوەی هەمـان ئەزمـوونی بەعسـە لە عێراقـدا، بەڵام نە لە شـێوە تراژیدییەکەیدا، بەڵکو لە فۆرمە کاریکاتۆریەکەیدا.

-١٦-

ئەزموونی بەعس لە عێراقدا لەسەر بنەمای پەیوەندییەکی تیرۆرئامێز و یەکلایەنە و ناهاوسەنگی نێوان ئەم سێ لایەنە کۆمەڵایەتی و سیاسییە دروستبووە:

١ـ کۆمەڵگای سیاسی

٢ـ دەوڵەت

٣ـ کۆمەڵگای مەدەنی.

لە عێراقدا لەمێژە "کۆمەڵگای سیاسـی" نەک تەنهـا کـورتکراوەتەوە بۆ ئەزمـوونی تاکەحیزبی بەعس خۆی، بەڵکـو خـودی بەعـس وەک حیزبێکـی شـێوە سـتالینی کورتبـۆتەوە بـۆ ئەو دەسـتە بچـوکەی حوکمیـان بەدەسـتە، واتە کورتبـۆتەوە بـۆ دیکتاتۆرێک و ئەو بازنە تەسکەی بەدەوری ئەو دیکتاتۆرەدان. لە دەرەوەی بەعس و دیکتاتۆر و هەڵقەی نزیک لە دیکتاتۆرەکە خـۆیەوە نـاتوانین لە عێراقـدا بـاس لە هـیچ دەرکەوتێـک لە دەرکەوتەکـانی کۆمەڵگـای سیاسـی بکەیـن، مەگەر ئەو

ئۆپۆزیسیۆنە ئاوارەیە نەبێت، کە لە دەرەوەی وڵات و لە دەرەوەی کۆمەڵگای عێراقیدا ئامادەیە.

سەبارەت بە "دەوڵەت" ی عێراقی دەکرێت بڵێین ئەم دەوڵەتە بەردەوام لە بارودۆخی خۆبەدەستەوەدان و تەسلیمبووندا بووە بە "کۆمەڵگای سیاسی" بەو مانایەی لەسەرەوە باسمانکرد، واتە بە بەعس و بە دیکتاتۆرێک و بەو نوخبە بچوکەی لەدەوری دیکتاتۆرەکە کۆبوونەتەوە. دەوڵەت لە عێراقدا دەزگا، یان پێکهاتەیەکی دەزگایی سەربەخۆ و ئۆتۆنۆم نییە، دەوڵەتی عێراقی دەربڕ و نوێنەری ئەو هێزە کۆمەڵایەتییانە نییە، کە نەخشەی سۆسیۆلۆژی و ئەتنی و ئایینی کۆمەڵگای عێراقی پێکدەهێنن. ئەم دەوڵەتە دامەزراوێک نییە، کە ناوەڕۆک و بوونی خۆی لە پەیوەندیی خۆیەوە بە یەکە کۆمەڵایەتی و ئایینی و ئەتنییە جیاجیاکانەوە دیاریبکات، یان لەو ئەرکانەوە وەریبگرێت، کە وەک دەوڵەت لە بەرانبەر کۆمەڵگادا و بۆ خودی کۆمەڵگای جێبەجێیاندەکات. دامەزراوەکانی دەوڵەتی عێراقی کۆمەڵێک دامەزراوی ئیفلیجن و لە ڕاستیدا کۆیلەی ژێردەستی بازنە تەسکەکانی حیزبن. دەزگاکانی دەوڵەتی عێراقی کۆمەڵێک دەزگان حیزب نەک تەنها ڕەنگڕێژیاندەکات بە بەرنامە و پرۆگرامەکانی خۆی، بەڵکو هەر لە سەرەتاوە حیزب سەرجەمی ئەو دەزگایانەی داگیریکردووە و دەستی خستۆتە ناو فۆرم و ناوەڕۆک و شێوازی کارکردنییانەوە. بەعس لە عێراقدا ئاراستەی کارکردنی دەزگاکانی دەوڵەتی گۆڕیوە لە ئاڕاستەی کارکردنیان بەڕووی کۆمەڵگادا، ڕوە و ئاراستەی کارکردنیان بە ڕووی حیزبدا، لێرەوە دەوڵەت نەک بۆ کۆمەڵگا، بەڵکو بۆ حیزب و لەناو حیزبیشدا بۆ دەستەی حاکم کاردەکات. بەکورتی دەوڵەت لە عێراقدا "بەرجەستەکردنی ناوەڕۆکی مێژوو" نییە وەک هیگڵ دەڵێ، یاخود دەربڕی "ئیرادەی گشتی" وەک ڕۆسۆ پێیوابوو، هەروەها "ئامرازی باڵادەستیی چینێک بەسەر چینێکی دیکەدا" نییە وەک مارکس و ئەنجلس بۆیدەچوون. دەوڵەت لە

عێراقدا کیانێکی لاواز و بێ ئیرادە و ئیفلیجی ژێر دەسەڵاتی بەعسە و دەربڕی ئارەزوو و ویست و قازانجەکانی ئەو بازنە تەسکەیە، کە لە سەرەوەڕا بەعسییان کۆنترۆڵ و دیسپلین کردووە.

چارەنووسی "کۆمەڵگای مەدەنی" لە عێراقدا لە چارەنووسی دەوڵەت باشتر نییە. کۆمەڵگای مەدەنی عێراقی بەتەواوی لە ژێر کۆنترۆڵی دەوڵەت و لەوێشەوە لە ژێر کۆنترۆڵی حیزبدایە، بەڵام پێشئەوەی بێمە سەر شیکردنەوەی میکانزمی پەیوەندییەکانی نێوان حیزب و دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی، با جارێ مەبەستمان لە ماناکانی کۆمەڵگای مەدەنی ڕوونکەینەوە. کۆمەڵگای مەدەنی بریتییە لە کۆی ئەو دەزگا و دامەزراو و پێکهاتانەی دەکەونە نێوان دەوڵەت و خێزانەوە. بەبۆچوونی گرامشی کۆمەڵگای مەدەنی مانای هەموو ئەو بەشانەی کۆمەڵگا، کە دەکەونە دەرەوەی دەوڵەتەوە. ئەمەش مانای کۆی ئەو هەموو تاک و گروپانەی لە دەرەوەی دەوڵەتدا بەشێوەیەک لە شێوەکان ئازادانە خۆیان ڕێکخستوە و داکۆکی لە سوود و قازانج و داولکارییە کۆمەڵایەتی و کولتورییەکانی خۆیان دەکەن. بەشێوەیەکی گشتی لەپشتی بیرۆکەی کۆمەڵگای مەدەنییەوە هەوڵدانی دابەشکردنی دەسەڵات و ڕێگرتن لە کۆبوونەوەی هەموو دەسەڵاتەکان لە ناوەند و بازنەیەکی تەسکدا هەیە. سەربەخۆبوونی کۆمەڵگای مەدەنی و بەهێزبوونی مانای بوونی تەوەری دیکەی دەسەڵات لە دەرەوەی دەسەڵاتی دەوڵەت و دەسەڵاتی کۆمەڵگای سیاسیدا. تیۆرەی کۆمەڵگای مەدەنی بەشێکە لە تیۆرەی دیموکراسییەت و لەڕاستیشدا بەشێکە لە تیۆرەی پەیمانی کۆمەڵایەتی و تیۆرەی دابەشکردنی دەسەڵاتەکان. لەنێوان ئامادەگی کۆمەڵگایەکی مەدەنی وشیار و گەشەکردو و لەنێوان دامەزراندن و بەرقەرارکردنی دیموکراسییەت و وەگەڕخستنی پرۆسەی بە دیموکراتیزەکردنی ژیانی کۆمەڵایەتیدا پەیوەندییەکی پتەو و بەرچاو هەیە. زەحمەتە قسە لە بوونی دیموکراسییەت بکەین بەبێ ئامادەگی چالاکی هێزە

جیاوازەکانی ناو کۆمەڵگای مەدەنی و بەبێ پرۆژەی دابەشکردنی دەسەڵات بەسەر ئەو هێزە جیاوازانەدا. (٨)

بەڵام ئەوەی لە عێراقدا دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی و کۆمەڵگای سیاسی بەیەکەوە گرێدەدا بوون و ئامادەگی پەیوەندییەکی توندوتیژ و یەک لایەنە و لاسەنگە. وەک وتمان لە عێراقدا کۆمەڵگای سیاسی کورتکراوەتەوە بۆ دەسەڵاتی تاقە حیزبێک و خودی حیزبیش کورتکراوەتەوە بۆ دەستەی حاکم، بەهەمانشێوە دەوڵەتیش کورتکراوەتەوە بۆ کۆمەڵێک دەزگای کۆنترۆڵکراوی ژێر دەسەڵاتی حیزب و لەڕاستیشدا کراوە بە موڵکی حیزب. کۆمەڵگای مەدەنیش ڕاستەوخۆ کورتکراوەتەوە بۆ کۆمەڵێک دەزگای ئیفلیجی بەتاڵ لە هەموو وزە و توانایەکی ڕەخنەیی و هێزی بڕیاردانی سەربەخۆ. هەقیقەتی ئەزموونی دەسەڵاتی بەعس لە عێراقدا بریتییە لە داگیرکردنی دەستەی حاکم بۆ حیزب و دواتریش داگیرکردنی حیزب بۆ دەوڵەت و لەوێشەوە داگیرکردنی دەوڵەت بۆ کۆمەڵگای مەدەنی. بەمجۆرە پرۆسەی داگیرکردن و دیسپلینکردن لە سەرەوە بۆ خوارەوە و لە ڕێگەی پووچەڵکردنەوەی هەموو دەزگا و دامەزراوە سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیەکانی دەرەوەی دەسەڵاتی حیزب و دەوڵەت و دەستەی حاکم بە توندی لەئارادایە. هەموو ئەمانەش بە یارمەتی فەزایەکی ئایدۆلۆژی بارگاوی بە سیمبۆڵی نەتەوەیی و ئایینی و سۆسیالیستی و بەیارمەتی سوپایەکی لەڕادەبەدەر گەورە و دەیەها دەزگای چاودێری و کۆنترۆڵی سیاسی و کۆمەڵایەتی دیکەی ئامادە بۆ گۆڕکردنی هەر نارەزاییەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی، ئەنجامدراوە. وەک ئاشکراشە دەرئەنجامی ئەم پرۆسانە بریتی بوو لە بەرهەمهێنانی یەکێ لە تۆقێنەرترین و هارترین و تۆتالیتارترین سیستمە دیکتاتۆرییەکانی مێژوو.

لە عێراقدا، لە سایەی ئەو هاوکێشانەی سەرەوەدا، کوژراوی یەکەم کۆمەڵگای مەدەنییە، کە لەژێر جەبری ئەو هەلومەرجەی سەرەوەدا هەموو هێز و توانا و وزە

ڕەخنەییەکانی لێسەندراوەتەوە. بە کوشتنی کۆمەڵگای مەدەنیش ئیدی دەوڵەت هیچ هێزێکی کۆمەڵایەتی شێلگیری لەبەردەمدا نەماوەتەوە بۆ ڕەخنەلێگرتن و چاودێریکردنی کاروبارەکانی. هەر ئەم مەسەلەیەش وادەکات لەئێستادا چاوەڕێی هیچ مەترسییەکی جیدی بۆ سەر دەوڵەتی عێراقی نەکەین لە دەرەوەی خودی دەوڵەت خۆیدا. کۆمەڵگای مەدەنی عێراقی بەشێوەیەک ئیفلیجکراوە ناتوانین چاوەڕێی ئەوەی لێبکەین دەوڵەتی عێراقی ناچاربکات دەسەڵات بەشێوەیەکی دیکە دابەشکات و سنوورەکانی خۆی واڵاکات بۆ بەشداربوونی هێزە جیاوازەکانی کۆمەڵگای عێراقی لە مەسەلەی دەسەڵاتداریدا. داگیرکردنی کۆمەڵگای سیاسییش بۆ دەوڵەت زیاتر تێکچوونی هاوسەنگی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی گەورەترکردووە. ئەم تێکچوونەش وایکردووە دەوڵەت بەئاراستە و قازانجی کۆمەڵگای سیاسی، واتە بە قازانجی حیزبی بەعس، کاربکات نەک بە قازانجی کۆمەڵگای مەدەنی عێراقی. هەر ئەمەشە وامان لێدەکات لەگەڵ ئەوەشدا، کە دەوڵەتی عێراقی دەوڵەتێکە ئامادە لە زۆربەی کایەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا و ڕاستەوخۆ دەستی جەهەنمییانەی خۆی خستبووە ناو ئەو کایانەوە، هێشتا دەوڵەتی عێراقی وەک دەوڵەت لاواز و ئیفلیج ببینین. دەوڵەت لەعێراقدا پایەکانی لەناو کۆمەڵگای عێراقی و پرۆسە مێژووییەکانی ئەو کۆمەڵگایەدا نییە، بەڵکو لەناو سەرزەمینی دەستەی حاکم دایە و خودی دەوڵەت خۆشی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ هەوای ژیانی لەو دەستەیەوە وەردەگێت، نەک لە کۆمەڵگای عێراقی و پرۆسە کۆمەڵایەتییەکانی ناویەوە. لێرەوە دەکرێ باس لە لاوازی بونیادنیانەی دەوڵەت لە عێراقدا بکەین و ئەزموونی دیکتاتۆریەت لەم وڵاتەدا، وەک ئەزموونی دەوڵەت نا، بەڵکو وەک ئەزموونی حیزب تەماشابکەین.

-١٧-

بەڵام داخۆ لە کوردستانی ئێمەدا چی ڕویداو پەیوەندی نێوان کۆمەڵگای سیاسی و دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی لێرەدا بە چ جۆرێکە، چ میکانیزمێ لەئارادایە و ئەو سێ لایەنە چۆن کاردەکەن و شێوازی پەیوەندیی نێوانیان چ فۆرمێکی گرتۆتەخۆی. ئەگەر بمەوێت بەپرستەیەک ئەزموونی ئێمە لەچەند ساڵی ڕابردوودا کورت بکەمەوە ئەتوانم بڵێم، ئەم ئەزموونە بریتیە لەهەوڵدانی بەردەوامی حیزب بۆئەوەی دەوڵەت لەدەزگایەکی "بان حیزب" یەوە بکاتە دەزگایەکی حیزبی و کۆمەڵگای مەدەنیش لەکۆمەڵگایەکی ئۆتۆنۆم و سەربەخۆوە، بکاتە پاشکۆیەک لەپاشکۆکانی حیزب. ئەگەر ئەزموونی سیاسی بەعس لە عێراقدا بریتیبێت لە داگیرکردنی حیزب بۆ دەوڵەت و لەوێشەوە داگیرکردنی دەوڵەت بۆ کۆمەڵگای مەدەنی، ئەوا ئەزموونی کوردی هەوڵدانی لاساییکردنەوە و دووبارەکردنەوەی هەمان ئەزموونی عێراقیە، بەڵام بەبێ بوونی وزە و هێز و ئیمکاناتی تەواو بۆ ئەم پرۆسەی لاساییکردنەوەیە. بۆیە ئەگەر ئەزموونی سیاسی بەعس ئەزموونێکی تراژیدی بێت، ئەوا ئەزموونی کوردی ئەزموونێکی کاریکاتۆرییە.

خاڵی هاوبەشی نێوان ئەزموونی کوردی و ئەزموونی بەعس بەرەهاکردنی حیزب و بەرزکردنەوەیەتی بۆ دەزگایەکی باڵادەست بەسەر دەوڵەت و دەزگاکانیدا لەلایەک و بەسەر هەموو پێکهاتەی کۆمەڵایەتیدا، لەلایەکی دیکەوە. بەڵام ئەو خاڵەی ئەزموونی کوردی لە ئەزموونی بەعس جیادەکاتەوە ئەوەیە حیزب لە ئەزموونی بەعسدا دوای داگیرکردنی دەوڵەت و لەڕێگای دەوڵەتەوە کۆمەڵگای مەدەنی داگیردەکات. بەڵام لەئەزموونی کوردییدا حیزبی کوردی کۆمەڵگای مەدەنی کوردی داگیردەکات بەبێ ئەوەی بەهەڵقەی دەوڵەتدا تێپەڕێت. ئەگەر لای بەعس دەوڵەت ئەو گەمەکەرە بێت، کە ئابووری بە تەواوی دەخاتە ژێردەستی خۆیەوە و

مۆنۆپۆلیزەی دەکات، ئەوا لای ئێمە حیزب، نەک دەوڵەت، دەست بەسەر ژیانی ئابووریی کوردییدا دەگرێت و مۆنۆپۆڵیدەکات و هەمان ئەزموونی بەعس دووبارەدەکاتەوە. هەرئەمەشە وادەکات دەوڵەت لە ئەزموونی بەعسدا تاراڵەی پیرۆزی پیرۆزبکرێت و لە ئەزموونی کوردییدا لە هەموو شتێ بێنرختر و پووچەڵتربێت. بەمانایەکەی دیکە حیزبی کوردی ڕاستەوخۆ کەوتە هەنجن هەنجنکردن و پارچەپارچەکردنی کۆمەڵگای مەدەنی کوردستانی لەڕێگای فراوانکردنی سنوورەکانی خۆیەوە، بەبێ ئەوەی پێویستی بە دەوڵەت بێت بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەی، لەکاتێکدا بەعس هەمان پرۆسەی بە ئانجامگەیاند، بەڵام لەناو دەوڵەت و بەهۆی دەوڵەتەوە.

لێرەوە حیزب لە ئەزموونی کوردییدا بەبێ ناوکۆیکردنی دەوڵەت و لەڕاستیدا تەنیا لە ڕێی ڕەتکردنەوەی دەوڵەتەوە دەیتوانی پرۆسەیەک ئەنجامبدات، کە لە ئەزموونی دیکتاتۆریانەی حکومەتەکانی دونیای سێهەمدا ئەنجامدانی بە دەوڵەت سپێردراوە. مەبەستم لەو پرۆسەیەش پرۆسەی خولقاندنی نوخبەیەکی ئابووری سیاسی نوێیە، کە بتوانێت پایەکانی دەسەڵاتی خۆی لەڕێگای بێدەنگکردنی زۆربەی هەرەزۆری کۆمەڵگاوە قایمبکات. ئەمەش ڕووی هەرە تراژیدییانەی ئەزموونی ئێمەیە لەگەڵ دەوڵەتدا، کە ساڵەهای ساڵە خەونی نەوە نوێکان و نەوە کۆنەکانە بەسەریەکەوە و چەندان قوربانی گەورەشی بۆدراوە.

## -١٨-

حیزبی کوردی بەڕەتکردنەوەی دەوڵەت وەک دەزگایەکی "بان حیزبی" و ئەگەرێکی مێژوویی گەورە بۆ تەواوکردن و بەکامڵ گەیاندنی پرۆسەی بەنەتەوەبوونی ئێمە

وەک نەتەوەیەکی سیاسی، ئەو ڕاستییەی سەلماند، کە لەزەین و وێناکردنەکانی هێزە سیاسییەکانی کورددا حیزب لە هەموو شتەکانی دیکە، لە خودی خەڵک، لە نیشتیمان و لە نەتەوەش گرنگترە. بەڕادەیەک لە نێوان پاراستنی حیزب و پاراستنی نەتەوەدا و لە نێوان پاراستنی نیشتمان و پایەدارکردنی حیزبدا، هەمیشە پاراستن و پایەدارکردنی حیزب بەپلەی یەکەم دێت. ئەم سیاسەتە تا ئەو ئەندازەیەش پێدادەگرێت، کە وێرانکردنی نیشتمان بۆ پاراستنی حیزب، هەنجن هەنجنکردنی نەتەوە بۆ پاراستنی سەرکردایەتی حیزب، برسیکردنی میللەت بۆ قەڵەوکردنی حیزب، بە کارێکی ڕەوا بزانێت.

من سەرەتا قسەم لەوە کرد، کە واقیعی ئێمە نە خەونی مارکس و نە خەونی هیگڵ، هیچیانی بۆ نەهاتۆتەدی، واتە هێزە سۆسیۆلۆژییەکانی ناو مێژووی ئێمە نەیانتوانیوە پرۆسەی کامڵبوونی خۆیان وەک چین و وەک نەتەوە، لە ڕێی ئابووری و کولتورەوە، پیادەبکەن و ئەو پرۆسەیە تائێستاش بەناکامڵی و لەناو توونە پێچاوپێچ و ئەهریمەنییەکانی مێژووی ئێمەدا گیریخواردووە و بەدەست ڕێگرە بونیادییەکانیەوە دەناڵێنێت. بەڵام من وای بۆ دەچم، کە ئەزموونی ڕاپەڕین هەلێکی مێژووی وای خولقاند، کە تێیدا سیاسەت، وەک جۆرێک لە پراکتیککردنی ئیرادەگەرێتی تایبەت و وەک مامەڵەیەکی عەقڵانی لەگەڵ واقیعی کۆمەڵایەتی و سیاسی ئێمەدا، دەیتوانی یارمەتیدەرێکی گەورە و گرنگبێت بۆ بەکامڵکەیاندن و بەرەوپێشەوەبردنی ئەو پرۆسەیەی سەرەوە. ڕاپەڕین دەیتوانی سەرەتای بونیادنان و دروستکردنی کۆمەڵگایەکی مەدەنی بەهێز و پتەو باوەڕبەخۆبوو بێت، بەتایبەتی دوای ئەوەی مێژووی ئێمە لە سەردەمانی ڕاپەڕیندا خوێنێکی نوێ بە شادەمارەکانیدا دەگەڕا و وزەیەکی نوێ لەهەناوی مرۆڤی ئێمەوە دەهاتەدەر. لە ڕاپەڕیندا ئیرادەگەرێتی مرۆڤی ئێمە لە لوتکەی ئامادەگی و تەقینەوە مێژووییەکانی خۆیدابوو. دەکرا سیاسەتێکی عەقڵانییانە و وریا و ئاگادار لە واقیعی کوردی و

هەلومەرجی ناوەکی دونیای دوای ڕاپەڕین ڕۆڵی ئەو هۆکارە گرنگە ببینێت، کە ئابووری و کولتور نەیانتوانیوە بیبینن، واتە سیاسەت دەیتوانی بێت و گوڕ و تین و تەوژمێکی تایبەت هەم بە ئابووری و هەم بەکولتوریش بدات و دەستی هێزە کۆمەڵایەتییەکانی ئێمە بگرێ و ئاسۆی گەشەکردنیان بۆ بکاتەوە، سیاسەت دەیتوانی چوارچێوەیەکی فراوانتر لە چوارچێوەی حیزب و ناوچە و خێڵ بۆ مرۆڤی ئێمە دروستبکات و مرۆڤی ئێمە دەربهێنێت لە چاڵی ئەو ئینتیما بچووک و بەرتەسکانە.

بێگومان تاکە دەزگایەکی سیاسی بیتوانیایە ئەم پرۆژەیە جێبەجێبکات تەنها دەزگایەکی بان حیزبییە، دەزگایەک بتوانێت لەودیو سنوورەکانی حیزب و عەقڵیەتی حیزبییەوە دیالۆگ لەگەڵ کۆمەڵگای کوردی و دونیای دەرەوەی کوردیشدا دەستپێبکات. دەوڵەت، پەرلەمان، بەرە، ئەمانە و دەزگای تری لەمجۆرە دەیانتوانی ئەو گیرخواردنە بونیادییانە تێپەڕێنن، کە باسمانکردن و هەموو ئەو هۆکارە کولتوری و ئابووری و فیکری و کۆمەڵایەتییانەی دابەشبوونی ئێمەی لەناو خودی خۆماندا بۆ هێز و دەستە و گروپ و تاقمی جیاواز بەپێی لۆژیکی خێڵ و پەیوەندییەکانی خزمخوازی دابەشکردووە، تێپەڕێنن و لە هەمانکاتیشدا ئاسۆی گەشەکردنی ئێمە وەک نەتەوە، ئاسۆی گەشەکردنی هێزە کۆمەڵایەتییەکان وەک چین بکەنەوە و هەنگاوێک دونیای ئێمە لەئایندەیەکی گەشتر لە ئێستامان نزیکتربکەنەوە.

بەڵام وەک هەموومان دەزانین ئەوەی ڕوویدا تەواو پێچەوانەی ئەم داخوازی و پلانە مێژووییانە بوو، حیزبی کوردی نەک دەرگای ئایندەی نەکردەوە، بەڵکو کلیلی هەموو دەرگاکانی ئێستاشی قووتدا و مرۆڤی ئێمەی لەناو کێشە بونیادییە کۆنەکانیدا نووقمکرد و هیچ ڕێگایەک، دەربازێک، ڕەهەندێکی بۆ نەهێشتەوە، جگە لە جەنگ و کارەسات و برسییەتی نەبێت. سیاسی کوردی لە جەنگی فیوداڵییانە

و خێڵەکییانەی خۆیدا لەسەر دەسەڵات، نەک هەلوومەرجی خولْقاندنی دەوڵەتی وەک دەگایەکی بان حیزبی پیادەنەکرد، بەڵکو ئەو تاقە دەزگا بان حیزبییەش، کە ڕۆژگاری تاڵی پڕهەرەس و نائومێدی، لەژێر قورسایی تێکشکانی دەزگاکانی حیزب و وجودی حیزب خۆیدا، دروستببوو، مەبەستم "بەرەی کوردستانی"یە ئەویش تێکشکێنرا و بەتاڵکرایەوە لە هەموو توانا و وزەیەکی جدی کارکردن و جێبەجێکردنی پێویستییە مێژووییەکانی ئێمە. ئەم بەئاسانی لەناوبردنەی "بەرەی کوردستانی" وامان لێدەکات دروستکردنی "بەرەی کوردستانی" وەک هێمای کارکردنی پێکەوەیی حیزب و سەرۆکە فیوداڵە سیاسییە کوردییەکان نەبینین و بەکارێکی ئیرادەگەرانەی گشتی تێنەگەین، دەنا چۆن وابەئاسانی لەناو دەچوو. بە بۆچوونی من "بەرەی کوردستانی" ئەو دەزگایە بوو، کە هێمای بۆ مەرگ و لاوازبوونی حیزب دەکرد وەک کیانێک، کە بتوانێت بەتەنها لۆژیکی گروپگەرای خۆی پیادەبکات. "بەرەی کوردستانی" ڕەمزی سەرەمەرگی حیزب بوو، ڕەمزی لاوازبوونی حیزب بوو تا ئاستی مردن و ماڵئاوایی لە مێژوو. "بەرەی کوردستانی" تێپەڕاندنی لۆژیکی خێڵ و لۆژیکی ناوچە و لۆژیکی پەیوەندییەکانی خزمخوازی نەبوو، بەڵکو ناوەندێک بوو بۆ کاری بە زۆر پێکەوەیی، لەڕۆژگارێکدا، کە مێژووی ئێمە لە خوێن و بای ژەهراویدا نووقمبوو، مەبەستم ڕۆژگاری سەردەمی پەلامارەکانی ئەنفال و دوای ئەنفال بوو. مەرگی مێژووی ئێمە، ئیفلیجکردنی هێزە کۆمەڵایەتییەکانمان، وێرانکردنی کوردستان، شێواندنی گەشەی دیمۆگرافی کۆمەڵگای کوردی، زەوتکردنی ئیرادەی مرۆڤی ئێمە، تووڕدانی بەشی هەرە زۆری واقیعی کۆمەڵایەتی ئێمە بۆ دەرەوەی مێژوو و پرۆسە مێژووییەکان لەڕێگای کۆکردنەوەی بەهەزاران هەزار گوندنشین لە ئۆردوگاکاندا. ئەمانەو چەندان فاکتەری دیکەی لەم بابەتە و لەپێش هەموشیانەوە مەترسی مەرگی حیزب خۆی دوای ئەو هەموو کارەساتانە زەمینەی دروستبوونی "بەرەی کوردستانی"یان هێنایە کایەوە،

نەک وشیارییەکی سیاسی بەرپرسیار و ئیرادەگەرییەتێکی سیاسیی هۆشمەند.
بە بۆچوونی من "بەرەی کوردستانی" زیاتر ڕۆڵی دەورەی نەقاهەی دەبینی بۆ ڕزگارکردن و زیندووکردنەوەی حیزب خۆی، زیندووکردنەوەی ئەو نەخۆشە، کە ڕووداوەکانی کوردستان لەسەر خوانی مەرگ دایناببوو، زیندووکردنەوەی ئەو نەخۆشەی، کە دواتر ئامادەیە خودی ئەو شوێنەی تێیدا چاکبۆتەوە وێران و خاپووربکات، مەبەستم "بەرەی کوردستانی" خۆیەتی. بەکورتی "بەرەی کوردستانی" زیاتر خەستەخانەیەک بوو بۆ حیزبە نەخۆشەکانی کورد، بەڵام دوای ئەوەی ڕاپەڕین ئەو دەرمانە سیحرییەی بەخشییە حیزبەکان بۆ زیندووبوونەوە و ڕزگاربوون و هاتنەوەکایە، کاری یەکەمیان لەناوبردنی ئەو خەستەخانەیە بوو، کە ڕۆژگارێک هەموویان وەک پەککەوتە لەناویدا کۆببوونەوە. لێرەوە چارەنووسی بەرەی کوردستانی قسە لە حیکایەتی کۆمەڵێ نەخۆش و پەککەوتە دەکات چاوەڕێی چاکبوونەوەن، بۆ ئەوەی دوای چاکبوونەوەیان سەرلەنوێ یەکتری پارچەپارچەبکەنەوە. حیکایەتی "بەرەی کوردستانی" حیکایەتی کۆمەڵێ خێڵ و جەنگاوەری سەرەتاییە، کە مەترسییەکی دەرەکیی تایبەت بۆ ماوەیەکی کورت ناچاریاندەکات، گەر بەیەکیشەوە کارنەکەن، ئەوا پەلاماری ڕاستەوخۆی یەکدی نەدەن، بەڵام هەردوای ڕەواندنەوە و بەسەرچوونی مەترسییە دەرەکییەکە، ئیدی جارێکی تر ڕم و شمشێرەکانیان بەسەر دڵی یەکدیدا بچەقێنن.

-١٩-

ئەگەر ئەزموونی ساڵانی دوای ڕاپەڕین بە پلەی یەکەم بریتیبێت لە ئەزموونی داگیرکردنی حیزب بۆ کۆمەڵگای مەدەنی لەڕێگای تێنەپەڕین بەهەڵقەی دەوڵەتدا،

ئەوا ڕەوایە بپرسین داخۆ شوێنگرتنەوەی حیزب بۆ دەوڵەت و هەوڵدانی گۆڕینی دەوڵەت لە دەوڵەتی ـ نەتەوەوە بەدەوڵەتی ـ حیزب چ ئەنجامێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئەخلاقی خستۆتەوە؟ ئایا کۆی ئەو دەرەنجامانە بەسەریەکەوە چ ڕۆڵێک لەبەرپاکردنی جەنگ و نەکوژاندنەوەیدا دەگێڕن؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە گرنگییەکی گەورەیان هەیە، چونکە گۆڕینی دەوڵەت بۆ دەوڵەتی حیزب بە پلەی یەکەم کارێکە ئیرادەگەر و لە پشتییەوە ویستێکی سیاسیی تایبەت و مەبەستێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو لەئارادایە، نەک کۆمەڵێک بونیادی جیاجیا.
لە کوردستانی ئێمەدا ئەم ویستە سیاسی و ئەم مەبەستە کۆمەڵایەتییە هەڵگری پرۆژەی مۆنۆپۆڵکردنی هەموو شێوەکانی دەسەڵات و مۆنۆپۆلیزەکردنی ڕەهەندە جیاجیاکانی واقیعی ئابوری و سیاسی و فەرهەنگی ئێمەن. ئەم ئیرادە سیاسیە ئیرادەی بەر لە دروستبوونی نەتەوە و ئیرادەی هەوڵنەدانی دروستکردن و داهێنانی نەتەوەیە. ئەم ئیرادەیە کێشەی کۆمەڵگای ئێمەی لە کێشەی "پرۆسەی بە نەتەوەبوونی تەواو"ەوە گۆڕیوە بۆ کێشەی "چۆنیەتی مۆنۆپۆڵیکرنی دەسەڵات" و "چۆنیەتی کۆکردنەوەی دەسەڵات لە جەستەی سەرکردەیەک و حیزبێکدا"، لە باتی فراوانکردنی سنوورەکانی ئینتیما خەریکی داخستنی ئەم سنوورانە بووە بەڕووی هەموو ئەو هێز و گروپانەدا، کە نایانەوێت شوناسی خۆیان لە شوناسی حیزب و لە شوناسی سەرکردەکانی حیزیدا بدۆزنەوە. لە کوردستانی ئێمەدا حیزب هەموو شوناسەکانی دیکەی چەپاندووە بۆ سەروەری کردنی شوناسی خۆی، ئەم چەپاندنەش ئەوەندە بەرفراوان و هەمەلایەنە مرۆڤی ئێمە ناچارکراوە شوناسی نەتەوەیی خۆی وازلێبێنێت بۆ شوناسی حیزبی و لە نێوان نەتەوە و حیزبدا بەناچاری حیزب هەڵبژێرێت. شتێکی ئاشکرایە لە دونیای ئێمەدا هیچ هێزێکی کۆمەڵایەتی بەتەنها توانای سەرکردایەتیکردنی هەموو کۆمەڵگای نییە و هیچ حیزبێکی سیاسیش هەڵگری هەیمەنەیەکی ئایدیۆلۆژی و فیکری و کولتوری وا نییە

بتوانێت بەهۆیەوە سەرکردایەتی هێزەکانی دیکە بکات. لەواقیعێکی وادا تاقە عەقڵانیەتێکی سیاسی تەندروست دارشتنی بەرنامەی دابەشکردنی دەسەڵاتە نەک مۆنۆپۆلیزەکردنی، دروستکردنی زیاد لە تەوەرەیەکە بۆ دەسەڵات، نەک کۆکردنەوەی هەموو دەسەڵاتەکان لە جەستەی سەرکردەیەکدا، دروستکردنی ئەو هەستەیە لای ئینسانی ئێمە، کە خۆی حوکمی خۆی دەکات و خۆی سەروەری ژیانی خۆیەتی، نەک ئیفلیجکردن و وابەستەکردنێکی سەرتاسەری بە حیزب و بریارەکانی حیزبەوە.

هەموومان دەزانین بارودۆخی سیاسی دوای جەنگی کەنداو و هاتنە سەر دەسەڵاتی حیزبە کوردییەکان لە کوردستانی عێراقدا بارودۆخێکە هیچ هێزێکی کوردی بەتەنها نەدەتوانێ بیپارێزێ و نەدەشتوانێ چالاکانە رۆڵ و کاریگەریی هەبێ لە هێشتنەوە و بەردەوامبوونیدا. ئەو دەسەڵاتەی لە هەولێر و سلێمانی و دهۆک و شوێنەکانی دیکەی کوردستاندا دامەزراوە دەسەڵاتێکە بە حیزبە کوردییەکان خۆیان ناپارێزرێت، بۆیە شەرکردن لەسەر ئەو دەسەڵاتە جگە لە عەبەس و بێهودەییەکی تاریک شتێکی دیکە نییە. لەراستیدا شەرکردن لەسەر شتێک، کە مۆڵکی خۆت نییە، یان لەباشترین حاڵەتدا بۆتنەپارێزرێت جگە لە دێوانەییەکی سیاسی و خونکوژیەکی کۆمەڵایەتی و نەتەوەیی شتێکی دیکە نییە.

دەڵێم وەڵامی ئەو پرسیارانەی سەرەوە گرنگن، چونکە راستەوخۆ دەمانباتە بەردەم ئەو هاوکێشە و بریار و بۆچوونە سیاسییانەوە، کە دەستکردی ئیرادەی سیاسی کوردی خۆیەتی، نەک دەستکردی بونیادەکان. وەڵامی ئەو پرسیارانە ئەوەمان نیشاندەدات، کە خۆمان چ رۆڵێکی گرنگ لەوێرانکردنی ماڵی خۆماندا دەبینین و چۆن بەدەر لەهەر هەستێکی نەتەوەیی شەرێکی خێڵەکی و فیوداڵییانە لەگەڵیەکدیدا دەکەین. پاڵەوانی ئەم بەشەی شەڕ ئەو بوونەوەرە نەخۆشەیە، کە ناوی "سیاسی کورده"، ئەو پیاوەی "نیشتمان وەک خاڵێکی گومرگ

تەماشادەکات" و پڕکردنی دەغیلە و قاسەکانی لە فرۆشتنی چەکەوە دەستپێدەکات و بە فرۆشتنی نیشتیمان و فیکر و ئەخلاقی سیاسیدا تێدەپەڕێت.، کە دەڵێین حیزب کۆمەڵگای مەدەنی کوردی بەتەواوی ڕەتکردۆتەوە، مانای ئەوەیە حیزب ڕێی لە هەموو دەستپێشکەرییەکی فەردی و کۆمەڵایەتی داهێنەرانە گرتووە گەر هاتوو ئەو دەستپێشکەرییە بە دەرگاکانی حیزبدا تێنەپەڕی و لەوێوە نەهاتە ناو دونیا و مێژوو و واقیعی ئێمەوە. ڕەتکردنەوەی کۆمەڵگای مەدەنی مانای پەکخستنی دینامیکیەتە ناوەکییەکانی کۆمەڵگا و وێرانکردنی ئەو وزە و توانا کۆمەڵایەتییانەی دەشێت فۆرم و ناوەڕۆکێکی دیکە بە پەیوەندییەکان و ئینتیماکان و سیستماتیزەبوونەکان بدەن. ڕەتکردنەوە و بێدەنگکردنی کۆمەڵگای مەدەنی بەتەنها ڕێگەگرتن لە چەند کەسێک، یان چەند هێزێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو نییە، بەڵکو لە ڕاستیدا خوڵقاندنی فەزایەکە: فەزایەکی سیاسی، کۆمەڵایەتی، سایکۆلۆژی، کە تیایدا مرۆڤ هەست بەبوونی ئازادانەی خۆی، هەست بەبوونی خۆی وەک بوونەوەرێکی عاقڵ، خاوەن ئیرادە و خاوەن هەڵبژاردنێکی ئازاد، نەکات. لە فەزایەکی وەهادا مرۆڤ هەست ناکات هاوڵاتییە و هەڵگری بەهایەکی تایبەت و هەڵگری هەزاران ئەگەری داهێنەرانەیە و دەتوانێت شوێنپەنجەی لەسەر دونیا و واقیع و مێژووی خۆی و مێژووی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگاکەی دابنێت.

کە کۆمەڵگای مەدەنی دەکوژرێت مانای ئەوەی ڕێ بەهەر کۆنترۆڵ و چاودێریکردنێکی کۆمەڵایەتییانەی دەسەڵات دەگیرێت و هەموو ئەو دەرگایانە دادەخرێن کۆمەڵگا لەڕێگایانەوە دەتوانێت دەسەڵاتداران بخاتە ژێر چاودێری و نەهێڵێت سایکۆلۆژیا و ویست و ئارەزووی دەسەڵاتداران بچنە شوێنی یاسا و ماف و عەقڵانیەتی دەزگاکان. لە دونیایەکدا، کە کۆمەڵگای مەدەنی نەیتوانی بەدەنگبێت و قسەبکات و بڕێک لەدەسەڵات پیادەبکات، ئیدی هیچ شتێک نامێنێتەوە بەر بە بڕیارە تایبەتەکان بگرێت، لە بڕیاری هێنانەوەی دەبابەکانەوە بۆ نیشتیمان، بۆ

بڕیاری کردنی هەموو ئابووری کوردستان بە دەغیلەی حیزب و دەغیلەی نوخبەی دەسەڵاتداری ناو حیزب. ڕەتکردنەوە و بێدەنگکردنی کۆمەڵگای مەدەنی لە دونیای ئێمەدا ئەو ستراتیژەی دەسەڵاتی لەپشتەوەیە، کە دەیەوێ مرۆڤی ئێمە لە هاوڵاتییەوە بکات بەدەستوپێوەند، لەبوونەوەرێکی ئازادی خاوەن ئیرادە و ویست و عەقڵانیەتەوە، بکات بە بوونەوەرێکی بچووک و ئیفلیج، لەهەمانکاتیشدا ئەم ستراتیژەی دەسەڵات ستراتیژێکە دەخوازێت سەرکردەکان لە پیاوانی خاوەن ئەرک و بەرپرسیارێتییەوە لەبەردەم دەزگا و یاسا و کۆمەڵگادا، بکات بە بوونەوەری پیرۆزی دەرەوەی هەر لێپرسینەوەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی. ئەم ستراتیژەی دەسەڵات چەندە ئینسانی ئێمە بێنرخ و بچووک و بێبایەخدەکات، بەهەمانئەندازە سەرکردەکان وەک پێغەمبەران و پیاوانی ئەفسانەیی و بان مێژووی پێشنیاردەکات. ڕەتکردنەوەی کۆمەڵگای مەدەنی واتا ڕەتکردنەوەی ئەو مەرجە "کانت" یانەی بنەمای کۆمەڵگایەکی لیبراڵ و ئازاد و تەندروست دروستدەکەن، مانای ڕەتکردنەوەی بیرۆکەی تاکەکەسی ئازاد، تاکەکەسی خاوەن هەڵبژاردن و تاکەکەسی عەقڵانی. بەدەستوپێوەندکردنی تاکەکەسی ئازاد، یان بە ڕەعیەتکردنیان، ئەو بونیادەی دەسەڵات نیشاندەدات، کە فۆکۆ دەیگەڕێنێتەوە بۆ زەمانی فیرعەون و بابلییەکان. گۆڕینی تاکەکەسی ئازاد لە هاوڵاتیەوە بە دەستوپێوەند تێگەیشتنێک و وێناکردنێکی تایبەتی دەسەڵاتی لەپشتەوەیە، کە سەر بەمەعقولیەتی سیاسیی سەردەمانی فیرعەون و کۆمەڵگا کۆنەکانە. بەم مانایەش مەعقولیەتی سیاسیی کوردی لەدواهەمین ساڵەکانی سەدەی بیستەمدا بستێک ئەمدیوتر نەهاتووە لە مەعقولیەتی سیاسیی سەردەمی بابلییەکان، عەقڵیەتی سەرکردە کوردەکان هەمان عەقڵیەتی فیرعەونی هەزاران ساڵ لەمەوبەرە. خۆ ئەگەر کاریزمای ئاشوریانیپاڵ و حیکمەتی حامورابیش لەبەرچاویگرین، لەچاو دلماوی و نەخوێندەواری و بێ کاریزمایی سەرکردە

کوردەکاندا، ئەوا ئەوکات لە قولآیی ئەو کارەساتە تێدەگەین، کە سیاسیی کورد واقیعی کوردی پێگیرۆدەکردووە و لەو قوفڵە مەعریفی و فیکری و سیاسییە ئەستورانەش تێدەگەین، کە ئەم بوونەوەرە نەخۆشە دونیای ئێمە و مێژووی ئێمە و ئیرادەی ئینسانیی ئێمەی پێقوفڵکردووە و ڕازیشنابێت بیانکاتەوە.

کە دەڵێین حیزب کۆمەڵگای مەدەنی ڕەتکردۆتەوە مەبەستمانە بڵێین حیزب هەموو پرۆسەیەکی بەشداربوون لە دەسەڵات و پراکتیککردن و سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەیدا دەکوژێت، کە ئەمەشیکرد ئیدی بەر بە هەموو بەشداربوونێک لە بڕیاردانی کۆمەڵایەتیدا دەگرێت و لەباتی ئەوەی کۆمەڵگا خۆی قسەبکات، چەند سەرکردەیەک بەناوی ئەوەوە قسەدەکەن. بیرۆکەی کۆمەڵگای مەدەنی وەک پێشتریش ئاماژەم پێکرد بیرۆکەیەکە لە جەوهەردا بۆ ڕێگەگرتن لە کۆبوونەوە و چەقبەستنی دەسەڵات لە تاقە خاڵێک، یان کەسێک، یان دەزگایەکدا لەدایکبووە. ئەم بیرۆکەیە ئامرازێکە بۆ دروستکردنی زیاد لە تەوەرێک بۆ دەسەڵات، دروستکردنی زیاد لەبەرپرسیاریەتییەک، دروستکردنی زیاد لەدەزگایەک بۆ بڕیاردان. ئەمە جەوهەری ئەو فەلسەفە سیاسیەیە، کە قسە لە کۆمەڵگای مەدەنی و ڕۆڵی کۆمەڵگای مەدەنی لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا و ڕێکخستنی پەیوەندیەکانی نێوان کۆمەڵگای سیاسی و هاوولاتیان، دەکات. فەلسەفەی کۆمەڵگای مەدەنی فەلسەفەی بەخشینی مافی قسەکردن و بڕیاردانە بە کۆمەڵگا بۆ دەربڕینی خودی خۆی و باسکردنی ئەو گرفت و کێشانەی بەدەستیانەوە دەناڵێنێت.، کە کۆمەڵگای مەدەنی نەبوا، ناتوانین بزانین کۆمەڵگا بەدەست چ کێشەیەکەوە گیرۆدەیە و چ کێشەیەک ئەولەویەتی گرنگیپێدان و چارەسەرکردنی هەیە، ئەو کۆمەڵگایەی کۆمەڵگای مەدەنی تێیدا نەتوانێت بروێت کۆمەڵگایەکە کێشە و گرفتەکانی خۆی ناناسێت و لەوێشەوە ئەو ئەگەرانەی بۆنانۆزرێتەوە، کە دەشێت کێشەکانی لەڕێگاوە چارەسەربکات.

به بێدەنگکردنی کۆمەڵگای مەدەنی تەنها کۆمەڵێ دەنگ دەمێننەوە بۆقسەکردن، که دەربڕی ویست و ئارەزووی ئەو نوخبەیەن، که هەموانیان بێدەنگکردووە، یان له ڕاستیدا هەلومەرجێکیان خولقاندووە، که دەنگ کردن و دەنگ نەکردن وەک یەک وابن. بێگومان بێدەنگکردنی کۆمەڵگای مەدەنی به پلەی یەکەم مانای دروستکردنی کۆمەڵگایەکی هەلپەرستە لەباتی کۆمەڵگایەکی ڕەخنەگر و عەقڵانی و ئازاد کەتێیدا ئینسان وەک بەهایەک مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت نەک وەک دوو دەست بۆ چەپڵە لێدان و گەرویەک به هەلپەرستەکێشان.، که دەڵێین حیزب کۆمەڵگای مەدەنی ڕەتکردۆتەوە، قسه له ڕەتکردنەوەی کۆمەڵێک دەزگای مەدەنی دەکەین، که دەکرا دروستبوون و گەشەکردنیان لایەنه پۆزەتیڤ و گەشەکانی کولتوری ئێمە و ڕەهەندە ڕووناک و بنیادنەر و شارستانییەکانی ژیانی ئێمەی گەشەپێبدایە و دونیایەکی نوێ و فراوانتری لەدونیای خێڵ و حیزب بۆدروستکردبینایە. بێگومان هەر هەنگاوێکی لەم بابەتە هەنگاوێکی گرنگ و سەرەکی دەبوو ڕووەو دروستکردنی ئینیمایەکی نوێ و گەورەتر له ئینتما بچووک و بەرتەسک و ناوچەییەکانی مرۆڤی ئێمە. ئینتمایەکی نوێ، که بەبێ دروستبوونی مەحاڵە بتوانین قسه لەبوونی خۆمان وەک میللەتێکی سیاسی، یاخود قسه لەسەر مانا سیاسییەکانی خۆمان وەک نەتەوە بکەین، که ئەمەشمان نەکرد نەدەتوانین نەوە نوێکانی کۆمەڵگای کوردی و نه دۆستەکانی کورد لەدەرەوەی کوردستاندا قەناعەت پێبهێنین، که ناسیۆنالیزمی کوردی بزاوتێکی سیاسی ڕەوایە و دلواکارییەکانی دەکەونه ئەودیوی قازانج و سودی حیزب و سەرکردەی حیزبەکان خۆیانەوە.

ڕووکارێکی دیکەی داگیرکردنی حیزب بۆ کۆمەلگای مەدەنی بریتییه له دروستبوونی توێژێکی کۆمەڵایەتی نوێ، گروپێک، که توانای بڕیاردان و دلوەریکردن و یاسادانانیان مۆنۆپۆڵکردووە و لەڕێگای دەزگاکانی حیزبەوە لایەنە جیاجیاکانی

ژیانی کۆمەڵایەتی ئێمەیان کۆنترۆڵکردووە: لە ئابوورییەوە بۆ فەرهەنگ، لە سووپاوە بۆ پەروەردە، لە یاسادانانەوە بۆ دادوەری. ئەندامانی ئەم گروپە، دەشێت لەباتی پێشمەرگە ناویانبنێین "بیرۆکراتەکانی حیزب". ئەمانە ئەو گروپە نوێیەن لەکوردستاندا دەسەڵاتدارن و ئابووریی وڵات و ئاسایش لەژێر دەسەڵات و ڕکێفی ئەماندایە و لە زۆر ڕووەوە شادەمارەکانی کۆمەڵگای ئێمەیان کۆنترۆڵکردووە. ئەم گروپە تۆڕێکی گەورەیان لە قازانج و سوودی تایبەت بەسەر هەموو ژیانی کۆمەڵایەتیدا بڵاوکردۆتەوە، تۆڕێک، کە ڕۆژ بەڕۆژ دونیای ئێمە هەژار و هەژارتر و دونیای ئەو تووێژە دیاریکراوە، دەوڵەمەند و دەوڵەمەندترەکات. ئەم تاقمە لە شوێنێکی دەسەڵاتی وا گرنگدان، کە دواجار هەموو چالاکییە ئابووری و فەرهەنگی و کۆمەڵایەتییەکان دەبێت بەژێر ڕەحمەتی بڕیارەکانی ئەواندا تێبپەڕێت. ئەمەش وای لێکردون لەکاتێکدا دوێنێ پارتیزانبوون لەشاخەکاندا و تەنها خاوەنی تفەنگەکانیان بن، ئەمڕۆ ببنە خاوەنی بەهێزترین پایەی ئابووری لە کۆمەڵگای ئێمەدا. ئەم جێگۆڕکێ خێرایە لە "پارتیزان"ەوە بۆ "بازرگان" دەسەڵاتێکی لە کوردستاندا هێناوەتە کایەوە، کە زیاتر شوناسێکی مافیایی هەیە تا هەر شوناسێکی دیکە، دەسەڵاتێک لە دەرەوەی هەر موحاسەبە و لێپرسینەوەیەکی یاسایی و سیاسی و ویژدانی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقیدا.

بێگومان درێژەپێدانی شەڕ و ڕێکنەکەوتن و چارەسەرنەکردنی کێشەکان و هێشتنەوەی بارودۆخی وڵات لە هەلومەرجی ئێستایدا ئەو مەرجە پێشینانەن، کە یارمەتی مانەوەی ئەو شێوە دەسەڵاتە مافیاییە ئەدەن، کە ئەم گروهە لە کوردستاندا پیادەیدەکەن. لێرەوە جەنگ لە قازانجی ئەوان و زەرەری هەموو خەڵکی کوردستاندایە، جەنگ مەرجی مانەوە و گەشەکردنی ئەوان و مەرجی فەوتان ولاوازی و بێ ئیرادەیی گشت خەڵکە، جەنگ سەرچاوەی کەڵەکەبوونی ئابووریی ئەوان و سەرچاوەی ڕووتاندنەوەی ئابووریی کوردستانە، جەنگ گەنجینەیە

بۆ ئەوان و کارەساتە بۆ کوردستان.

-٢٠-

لەکۆتاییدا خوێنەر وەک دەبینێت من لەم لێکۆڵینەوەیەدا قسەم لەو پەیوەندییە ژێرپەردەیی و نادیارانە نەکردووە، کە ئەم لایەنی سیاسی کوردی، یان ئەو لایەنی دی، لەگەڵ ئەم دەوڵەتی دراوسێ، یان ئەوی دیان دروستیدەکات. هۆی ئەمەش ئەوەیە حیزبە کوردییەکان خاوەنی تێڕوانینێکی ئاشکرا و ڕوون نەبوون بۆ ئەو هاوپەیمانییە ناوچەییانە، دەشێت لە شەو و ڕۆژێکدا تەوەری هاوپەیمانیەتییەکانیان بەتەواوی بگۆڕن. ئەگەر ئێستا دوو تەوەری ئاشکرا لەناوچەکەدا ئامادەبێت، یەکەمیان تەوەری ئەنقەرە ـ بەغداد بێت، ئەوا تەوەری دووەمیان تاران ـ دیمەشقە. ئەگەر لە ئێستادا پارتی سەر بە تەوەری ئەنقەرە ـ بەغداد بێت و لەپاڵ دەبابە و فڕۆکەکانی عێراق و تورکیادا دەسەڵاتی خۆی بپارێزێت، ئەوا یەکێتی لەپاڵ تەوەری تاران ـ دیمەشقدایە. بێگومان ماناکانی دانەپاڵی هەریەکێک لەم تەوەرانە جیاوازە و دەشێت لەڕووی مەعنەویەوە بۆ کوردێکی عێراقی ئاسانتربێت تەوەرەی دیمەشق ئێران قبووڵکات و تەوەرەی ئەنقەرە بەغداد ڕەتبکاتەوە، بەڵام لەڕاستیدا کێشەکە لەوەدایە کەهیچ شتێک زامنی گۆڕانی لەپڕی ئەو تەوەرانە ناکات، هیچشتێ زامنی ئەوە ناکات سبەینێ لایەنەکانی ئەو تەوەرانە نەگۆڕێن و دابەشکردنی نوێ دروستنەبێ و ئەمجارە بەشێوەیەکی دیکە حیزبە کوردییەکان بەسەریاندا دابەشنەبن. ئەوەی لێرەدا دەبێت جەختی لێبکرێت ئەوەیە، کە واقیعی سیاسی کوردی واقیعێکە لە غیابی لانیکەمی هەر ئیجماعێکی سیاسیدا دەژی و هێزەکانی ناوی لەگەڵ هێزە ئیقلیمیەکاندا ڕێکترن تا لەگەڵ یەکدیدا. ئەمەش کارەساتێکی

سیاسی گەورەیە و تراژیدیترین ساتەوەختی مێژووی ئێمە نیشاندەدات.
بێگومان ئەگەر ماڵی کورد خۆی لەناو خۆیدا ماڵێکی ڕێکخراو و پتەو و باوەڕپێکراو بوایە و فەزایەکی سیاسی تەندروست لەئارادابوایە، ئەوا هاوکێشە سیاسیە دەرەکییەکان نەیاندەتوانی بەئاسانی لەناویدا بژین و پیلانەکانی خۆیان لە ماڵی کورد دا بەئاسانی پیادەبکەن. کاری سەرەکیمان ڕێکخستنی ماڵی خۆمان و چاککردنەوە و پاککردنەوەی ئەم ماڵەیە، لەماڵێکی پاکدا زەحمەتە ڤایرۆسە دەرەکییەکان بژین.

هۆڵەندا ١٩٩٥

تێبینییەک

-ئەم باسە ڕۆژی ١-٩-١٩٩٥ لە (مەڵبەندی ڕۆشنبیریی کوردی) لە ئەمستردام پێشکەشکرا.

## سەرچاوەکان

١ـ بۆ پێناس و زانیاریی زیاتر دەربارەی چەمکی (هەبیتۆس) بڕوانە:

Kevin Olson: Habitus & body langaug, toward a critical theory of symbolic power. Philosophy & social criticism, vol.21, no.2, pp23-49.

٢ـ بۆ تێگەیشتنی زیاتر دەربارەی بیرۆکەی "کایەی سیاسی" بڕوانە:

Pierre Bourdieu, argumenten, SUA, Amsterdam 1992 بەتایبەتی لاپەڕە ٧٥ تا ٣٧.

٣ـ بۆ بۆچوونی فۆکۆ دەربارەی پەیوەندیی شوان/ڕەعیەت بڕوانە: د. محمد عابد الجابری، العقل السیاسی العربی، محدداته و تجلیاته، بیروت/ مرکز دراسات الوحده العربیه، ل ٩٣ـ٣٤.

٤ـ بۆ کۆی بۆچوونەکانی برنارد بادی دەربارەی ئەم خاڵە بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٥ـ بۆ فیکرەی (جیاوازی) بڕوانە: د. علی الحرب: نقد الحقیقه، المرکز الثقافی العربی، ط١، ٣٩٩١، ل ٩٢ـ٤٥.

٦ـ بۆ ناسینی تێرمی (خێڵ) لای (جابری) و (ابن خلدون) بڕوانە: محمد عابد الجابری. هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٨٤ـ٩٤. هەروەها کتێبی (فکر ابن خلدون، العصبیة و الدوله: معالم نظریة خلدونیة فی التاریخ الاسلامی. بیروت/ دار الطلیعة ٢٨٩١.

٧ـ بۆ فیکرەی (پەیوەندییەکانی خزمخواهی) لای (مۆریس غودولیە) بڕوانە: د. محمد دکروب: الانتروبولوجیا، الذاکره و المعاش. بیروت/ معهد الانماء العربی، ١٩٨٤، ل١٣٨،١٣٥،١٣٣.

٨ـ بۆ شارەزایی زیاتر دەربارەی تێرمی (کۆمەڵگای مەدەنی) بڕوانە: المجتمع المدنی و دوره فی تحقیق الدیمقراطیة. بحوث و مناقشات الندوه الفکریه التی نظمها مرکز دراسات الوحده العربیه. بیروت ١٩٩٢، بەتایبەتی ل ١٤ـ٥٦ لەگەڵ ل ١٩ـ٢٠١.

## بۆ شەڕی ناوخۆ بە 'شەڕی براکان' ناودەبرێت؟

-١-

هەموو کۆمەڵگایەک سیستمێکی دیاریکراوی ناونانی دیاردەکانی خۆی هەیە. لەڕێی ئەم سیستەمەوە ئەو کۆمەڵگایە هەوڵدەدات ناو لەو دیاردانە بنێت، کە لە ساتێک لەساتەکانی مێژوودا دەرکیانپێدەکات و وەک کێشەیەک ڕووبەڕوویان دەبێتەوە. توانای دەرککردنی ئەم سیستمی ناونانە بەو دیاردانەی لەو کۆمەڵگایەدا ئامادەن وابەستەی ئەو ستراتیژە مەعریفی و سیاسی و کۆمەڵایەتییانەیە لەو کۆمەڵگایەدا چاودێری دروستبوون و هاتنەکایەی دیاردەکان و بەرهەمهێنانی مەعریفە دەکەن. بێگومان مەرجنییە ئەم سیستمی ناونانە سیستمێک بێت دەرک بە هەموو ئەو دیاردانە بکات، کە کۆمەڵگا بەرهەمیاندەهێنێت و بەشێوەیەکی دیار، یاخود نادیار ڕووبەڕوویان دەبێتەوە. توانای دەرککردنی ئەم سیستمە بەدیاردەکان وابەستەی ئەو توانا مەعریفی و ئەو هێزی پرسیار و پشکنینەیە ئەو سیستمە هەڵگریەتی. لەغیابی سیستمێکی چالاکی ناوناندا زۆرجار وادەبێت کۆمەڵگا بەشێکی گرنگی ئەو دیاردانەی لەناو کایە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری و کولتورییەکانیدا دروستدەبن، نەبینێت و دەرکیان پێنەکات، بەم بۆنەشەوە نەتوانێت ڕاڤەیانبکات و

بەشێوەیەکی عەقڵانی پلانی پێشبینیکردن و چاودێریکردن و گەشەکردنیان بۆ دابنێت.

لەزۆر ڕووەوە دەشێت گۆڕان و وەرچەرخانە لەپڕ و ناوەختەکان، شڵەژانە کۆمەڵایەتی و سیاسییە چاوەڕوان نەکراوەکان و ئەو ڕووداوانەی بێهیچ خۆ بۆئامادەکردنێک لە دەرگاکانی مێژوو ئەدەن، بە بەرهەمی ئەو سیستمی ناونانانە تێبگەین، کە توانای دەرکپێکردن و دیتن و پێشبینیکردنی دیاردەکانیان نییە. ئەو سیستمانەی ناتوانن مێژوو و ئەگەرەکانی مێژوو بپشکنن و بناسن و لەوێوە جۆرێک لەئامادەگی بۆ بەرامبەربوونەوەیان لەناو خۆیاندا سازبدەن، ناتوانن ناو لەدیاردەکان و کێشەکانیش بنێن. بێگومان نابینایی کۆمەڵگایەک لە بینینی دیاردەکانی خۆی و ناونەنانیان مانای نائامادەیی ئەو دیاردانە نییە لەناو ڕواقە تاریکەکانی واقیع و مێژووی ئەو کۆمەڵگایەدا، بەپێچەوانەوە دەشێت دیاردەیەک ناونەنرابێت، بەڵام کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر بوونی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتووری ئەو کۆمەڵگایە هەبێت. شتێکی تازەش ناڵێین گەر بڵێین هەندێ دیاردە ناونانرێن لەبەر ئەوەی هێزێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو، ستراتیژێکی تایبەتی ناونان و پێکهاتێکی دیاریکراوی دەسەڵات نایەوێت ئەو دیاردانە ببینرێن و ناوبنرێن. جگە لەمەش دەشێت هەندێک دیاردە ببینرێن بەڵام بەهەڵە ناوبنرێن، لەم دۆخەشدا دیسان ئەو بەهەڵە ناونانە وابەستەی ستراتیژ و لۆژیکێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو و سەرزەمینێکی مەعریفی تایبەت و بەرنامەڕێژیەکی دیاریکراوی دەسەڵاتە، کە وادەکات ئەو دیاردەیە بەهەڵە ناوبنرێت. من دواتر دێمەوە سەر ئەم خاڵە و هەوڵدەدەم نیشانیبدەم بۆچی لە کۆمەڵگایەکی دیاریکراودا دیاردەیەک لەدیاردەکان بەهەڵە ناودەنرێت. ناونانی دیاردەکان هەنگاوێکی گرنگ و بنەڕەتییە لە تێگەیشتنی ئەو دیاردانەدا، لەهەمانکاتیشدا هەنگاوی یەکەمی بەرهەمهێنانی زانیارییەکی دروست و ڕاستەقینەیە دەربارەی ئەو دیاردانە. بەڵام با ئەوخاڵە تەولو ئاشکرابێت، کە

پرۆسەی ناونانی دیاردەکان پرۆسەیەکی ئاڵۆزە و وابەستەی چەندان میکانیزمی جیاوازە، کە بەسەریەکەوە سیاسەتێکی تایبەتی ناونان دەسەپێنن. ئەو پرسیارانەی ناسینی ئەم میکانیزمانە دەیانسەپێنێت ئەمانەن: کێ دیاردەکان ناودەنێت؟ چ هێزێک ناوەکان بەناو کۆمەڵگادا بڵاودەکاتەوە؟ کام پێکهاتی کولتوری و رۆشنبیریی سەرزەمینی ناونانەکان خۆشدەکەن؟ چ دید و مەبەست و ستراتیژێک لەپشتی ناونانەکانەوە ئامادەیە؟ ئەمانە و چەندان پرسیاری دیکەی لەم بابەتە ئەو ئاڵۆزییەمان بۆ دەردەخەن، کە لەپشتی ناونانی دیاردەیەک لەدیاردەکانەوە ئامادەیە.

من لەم نووسینەدا هەوڵدەدەم بەسوود وەرگرتن لە هەندێک لە بۆچوونەکانی فەیلەسوفی فەرەنسی میشێل فۆکۆ هێڵە گشتییەکانی چۆنیەتی ناونانی دیاردەیەک لە کۆمەڵگایەکی دیاریکراودا روونبکەمەوە و دوای ئەوەش هەوڵدەدەم وەڵامی ئەو پرسیارە بدەمەوە بۆ شەڕی ناوخۆی نێوان هێزە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکانی کوردستان بە شەڕی براکان ناودەبرێت. بێگومان ئەم هەوڵە هەوڵێکی سەرەتاییە و بۆ تێگەیشتنی زیاتری پرۆسەی ناونان لە دونیای ئێمەدا پێویستمان بە لێکۆڵینەوەی فراوانتر هەیە.

فۆکۆ پرۆسەی ناونانی دیاردەکان راستەوخۆ بە کۆمەڵێ یاساو پرنسیپ و رێوشوێنی تایبەتەوە دەبەستێتەوە، کە لە واقیعێکی سۆسیۆلۆژی و مەعریفی دیاریکرلودا، هەم کۆنترۆڵی بەرهەمهێنانی ماناو بەرهەمهێنانی مەعریفە دەکەن و هەم دەست بەسەر پرۆسەی ناونان و پێناسەکردنی دیاردەکانیشدا دەگرن. فۆکۆ ئەم یاسا و پرنسیپ و رێوشوێنە جیاوازانە بە "سیستەمی گوتار" ناودەبات. بەبۆچوونی فۆکۆ سیستەمی گوتار ئەو سیستەمەیە، کە چاودێری رەهەندە جیاجیاکانی زمان دەکات، لێناگەرێت دیاردەکان بەو شێوەیە ناوبنرێن، کە ئەو ستراتیژە باڵادەستەی دەسەڵات لەوساتەدا لەئارادایە بکەوێتە ژێر پرسیار و

ڕوویەڕووی مەترسی ببێتەوە. سیستمی گوتار هەوڵدەدات نەهێڵێت زمان ئەو ئەگەرە نەناسراو و چاوەڕواننەکراوانە بخاتەکارەوە، کە پێکهات و تواناکانی گوتار خۆی بخاتە ژێر پرسیارەوە. بە مانایەکی دیکە سیستمی گوتار بریتیە لەو چوارچێوە کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و مەعریفیەی زمان لەناویدا کاردەکات و بەهۆیانەوە دیاردەکان ناودەنێت. بێگومان زمان لەڕێگای ناونانەوە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەشدارە لەبەرهەمهێنان، یاخود لانیکەم لەسەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی دیاردەکاندا. پرۆسەی ناونانی دیاردەکان پرۆسەیەکی بێگوناه نییەو لەهەمانکاتیشدا پرۆسەیەک نییە تەنها ڕۆڵێکی سلبی - پەسیڤ - لەژیانی دیاردەکاندا ببینێت. ناونانی دیاردەیەک هەوڵدانی دەستنیشانکردنی مانا و ماهیەتی ئەو دیاردەیە و بەخشینی 'جەوهەرێکە' پێی، جەوهەرێک، کە لەژێر سایەی بەخشینی ناوێکدا بوونێکی بەرجەستەتر و ئامادەتر بگرێتەخۆی و بەشێوەیەکی دیاریکرلو خۆیبخاتە بەردەمی وشیاری کەسەکانەوە بۆ دیتن و ناسین و ڕاڤەکردنی دەرکەوت و ماناکانی.

کاتێک لەڕێی ناونانەوە جەوهەرێک دروستدەکرێت ئیدی ئەو 'جەوهەرە' تا ڕادەیەکی دیاریکراو میکانیزمێکی ناوەکی گەشە و مانەوە و بەرجەستەبوونی خۆی لەناو دونیای کۆمەڵایەتی و ئابوری و فەرهەنگی و سیاسیدا پیادەدەکات، زۆرجار پرۆسەی ناونانی دیاردەیەک دەبێتە بەشێک لە پرۆژەی دروستبوونی ئەو دیاردەیە خۆی. بەواتایەکی دیکە زۆرجار پرۆسەی ناونانی دیاردەیەک دەبێت بە یەکێ لەو فاکتەرانەی، لەپاڵ کۆمەڵێک فاکتەری دیکەدا، بوونی ئەو دیاردەیە دەستنیشاندەکات. واتە خودی ناونانەکە خۆی دەبێتە هێزێکی مادی و وەک کۆی فاکتەرەکانی دیکە بەشداردەبێت لە مانەوە و بەردەوامبوونی ئەو دیاردەیەدا. بەم مانایەیە مارکس باس لەوە دەکات، کە بیرو بۆچوونی ئایدیۆلۆژی کاتێک بەناو خەڵکدا بڵاودەبێتەوە، دەبێتە هێزێکی مادی. لەم ڕووەوە زانستە کۆمەڵایەتییەکان

نموونەی زۆری ئەو حاڵەتانەمان نیشاندەدەن، کە چۆن مەسەلەی ناونانی دیاردەیەک و مەسەلەی بەرجەستەبوونە واقیعییەکەی یەک پرۆسە بوون و خودی ناونانی دیاردەکە لەهەمانکاتدا خودی خولقاندن و دروستکردنیشی بووە. زمان لەرێگای ناونانەوە وێنەیەک بۆ دیاردەکان دروستدەکات، کە دەیکاتە ئەو دەروازەیەی بەهۆیەوە لەو دیاردانە بڕوانین. بەڵام زمان ئەم شتە لەفەزایەکی ئازاد و بێچاودێریدا ناکات، بەڵکو هەمیشە ناچاریەک، یان جەبرێک هەیە، کە زمان ناچاردەکات بەشێوەیەکی دیاریکراو کاربکات و ستراتیژێکی دیاریکراوی هەبێت لە ناونان و پێناسکردنی دیاردەکاندا. ئەم جەبرانەیە فۆکۆ ناویاندەنێت "سیستمی گوتار" و دابەشیشیاندەکات بۆ دوو جۆر جەبری تایبەت (١):

**یەکەم: جەبری دەرەکییەکان.**

مەبەست لە جەبرە دەرەکییەکان جەبری ئەو ناوەندە کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتورییەیە لەدەرەوەڕا، بۆ نموونە لەڕێی قەدەغەکردن، یان حەرامکردنەوە، سنورێک بۆ بەرهەمهێنانی مەعریفە و پرۆسەی ناونان و پێناسەکردن دادەنێت. بۆنموونە قەدەغەکردنی قسەکردن لەسەر سێکس و قەدەغەکردنی ڕەخنە لە ئایین لە دونیای سیاسی و کۆمەڵایەتی ئێمەدا و لەوێشەوە لە ئامادەنەبوونی ئەم بابەتانە لە ناو دونیای ڕۆشنبیری کوردیدا، بەشێکن لەو جەبرە دەرەکییانەی وادەکەن ئەم بابەتانە لە ڕۆشنبیری ئێمەدا ئامادەنەبن، یان زۆر بە لاوازی و پەراوێزی ئامادەبن.

**دووهەم: جەبرە ناوەکییەکان.**

ئەم شێوە تایبەتەی جەبر لەناو بونیادی ناوەکی و پێکهاتەی چەمکی و زاراوەیی ڕۆشنبیرییەکی دیاریکراوەوە هەڵدەقوڵێت، ئەمانەش کۆمەڵێک جەبرن لە ناوەوەڕا وا لە ڕۆشنبیرییەکی دیاریکراو دەکەن نەتوانێت لەسەر کۆمەڵێک دیاردەی دیاریکراو بدوێت، بۆنموونە لەبەر نەبوون و بەرهەمنەهێنانی ئەو دەزگا چەمکی و فیکری و مەعریفیەی بتوانێت ئەو دیاردانە بەشێوەیەکی گونجاو ببینێت و ناوینێت. بۆ نموونە

میکانیزمی گۆڕینی بیرکردنەوەی ئاڵۆز بۆ بیرکردنەوەی سادە لە ڕۆشنبیری ئێمەدا، واتە سادەکردنەوەی بەزۆری هەموو دیاردەیەک تا ئەو ئەندازەیەی چیدی نەکرێت لەسەر زۆر دەرکەوەت و ڕووکاری قووڵی ئەو دیاردەیە قسەبکرێت. ئەم سادەکارییە وادەکات نەتوانین ڕەهەندە قووڵ و نەدیتراوەکانی ئەو دیاردەیە بخوێنینەوە، ئەو ڕەهەندانەی، کە بۆ خوێندنەوەیان پێویستمان بەدەزگایەکی چەمکی ئاڵۆزدەبێت دەنا ناتوانین زۆر دەرکەوت و مانای ئەو دیاردەیە بناسین و لێیانتێبگەین و لەوێشەوە هەوڵبدەین بیانهێنینە ژێر ڕکێفی عەقڵەوە. ئەم پرۆسەی سادەکردنەوەیە وادەکات ڕۆشنبیرییەک نەتوانێت بونیادێکی ئاڵۆز لە چەمک و زاراوە و پرنسیپ بەرهەمبهێنێت، کە بتوانێت بەهۆیانەوە دیاردە ئاڵۆزەکانی ناو هەناوی خۆی ببینێت و ناوبنێت. باشترین نموونەش لێرەدا نموونەی ناونانی دیاردەیەکی ئاڵۆزو فرە ڕەهەندی وەک "شەڕی ناوخۆ" ی کوردستانە بە شەڕی "براکان"، یان شەڕی "براکوژی".

-٢-

هەموو لێکدانەوەیەک بۆ ناونانی شەڕی نێوان هێزە سیاسییەکانی کوردستان بە 'شەڕی براکوژی'، بەبێ تێگەیشتن و ناسینی ئەو جەبرە دەرەکی و ناوەکییانەی لەسەرەوە باسمانکردن، لێکدانەوەیەکی ناکامڵ دەبێت. سەرەتا با بزانین ئەو جەبرە دەرەکییانە کامانەن، کە وایانکردووە شەڕی ناوخۆی کوردستان بەشەڕی براکوژی ناونووسبکرێت و ئەم دیاردە ئاڵۆزە بۆ وا سادە بە شەڕی کۆمەڵێک برا لەگەڵیەکدا ناونراوە.

شەڕی ناوخۆ لە کۆمەڵگای کوردیدا شەڕێکە لەساتەوەختێکدا ڕوودەدات، کە کورد

خاوەنی بزاوتێکی نەتەوەییە و دەیەوێت خۆی لەڕێی ئەم بزاوتەوە وەک گروپێکی ئەتنی جیاواز و وەک نەتەوەیەکی تایبەت، بەدونیای دەرەوەی خۆی و بە خودی خۆشی بناسێنێت. شەڕی ناوخۆ لەکاتێکدا ڕوودەدات، کە کورد بەبەردەوامی پێ لەسەر ئەو سنوورە ڕەمزی و واقیعییانە داگرێت، کە لە نەتەوەکانی دیکەی جیادەکاتەوە. بەمانایەکی دیکە شەڕی ناوخۆ لە ساتێکدا ڕوودەدات، کە کورد دەیەوێت وێنەیەکی یەکگرتوو لەسەرخۆی بەدونیای دەرەوەی خۆی بدات و بیسەلمێنێت، کە گروپێکی ئەتنی هاوشێوە و وێکچووە و دەیان شتی هاویەش لە دونیای دەرەوە و لە نەتەوە و گروپەکانی دیکەی جیادەکاتەوە. ئەم شتە هاویەشانەش بریتین لەو هەموو هاویەشە ئایدیۆلۆژییانەی هەموو بزاوتێکی ناسیۆنالیستی پێویستی پێیەتی بۆئەوەی خۆی لە بزاوتەکانی دیکە جیابکاتەوە، ئەو هاویەشانەش فرەجۆرن، لە مێژووی هاویەشەوە بۆ ئابوری هاویەش، لە قازنج و سایکۆلۆژیا هاویەشەوە بۆ ئایندەی هاویەش. ئێریک هۆبزباوم، یەکێک لە تیۆریستە هەرە گرنگەکانی دیاردەی ناسیۆنالیزم، ڕای وایە ئەم هاویەشانە زیاتر کۆمەڵێک هاویەشی دروستکراو و داهێنراو و پێشنیارکراون، نەک هاویەشی واقیعێکی مێژووی و سۆسیۆلۆژی و ئەنترۆپۆلۆژی بابەتی و ڕاستەقینەبن.(٢) هۆبزباوم دەیەوێت بڵێت ئەم شتە 'هاویەشانە' سیستمێکی دیاریکراوی ناونان پێشنیار و دروستیاندەکات، کە نایەوێت ئەو جیاوازییە ناوەکییانە ببینێت، کە دەشێت گومانێک ڕوویەڕووی ئەو هەموو هاویەشە گریمانکراونە بکاتەوە. ناسیۆنالیزم هەڵگری سیستمێکی ناونانە جیاوازییەکان دەشارێتەوە و بەردەوام پێشنیار و گریمانی وێکچوونی کولتوری و سیاسی و ئابووری و سایکۆلۆژی دەکات. ئەم سیستەمی ناونانە ئەو ژێرخانە کۆمەڵایەتی و سیاسی و مەعریفی و فەرهەنگییە دەرەکییە دەخولقێنێت، کە بزوتنەوە ناسیۆنالیستییەکان کارپێدەکەن، بەبێ ئەم سیستمە زەحمەتە هیچ بزاوتێکی ناسیۆنالیستی بتوانێت تاکەکان و

گروپەکان لەدەوری کۆمەڵێک شتی هاوبەش کۆبکاتەوە و مۆبیلیزەیان بکات. ناسیۆنالیزم لەئاستە کولتوری و فەلسەفییەکەیدا بریتیە لە ماشێنێکی گەورەی بەرهەمهێنانی ئەفسانە و حیکایەتی گەورە، دەربارەی ئەسڵی هاوبەش و ئاییندەی هاوبەش و لێکچوونی هاوبەشی گریمانکراو. هەموو ئەمانەش پێکەوە دەتوانن فانتازیایەک بخولقێنن، کە هیچ بزاوتێکی ناسیۆنالیستی ناتوانێت دەستبەرداری بێت و تا ڕادەیەکی زۆریش گرەوی مانەوەی ئەو بزاوتە وابەستەی توانای ئەو فانتازیەیە لە بەردەوام سەپاندن و سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی ئەو هاویەشە گریمانکراوانەدا. بەکورتی ئەوەی لەدونیای ئێمەدا حوکمی پرۆسەی ناونانی دیاردەکان دەکات جەبری دەرەکی ئەو بزاوتە ناسیۆنالیستییەیە، کە بە شێوەیەک لە شێوەکان مێژووی ئێمەی لەم سەدەیەدا بەرهەمهێناوە. ناسیۆنالیزمێک، کە عەودالی خولقاندنی وێنە هاویەشەکانە، وێنەی نەتەوەیەکی هاو ڕابردوو، هاو چارەنووس و یەککگرتوو.

بێگومان یەکەمین شتێک شەڕی ناوخۆ بەکردەوە وێرانیدەکات ئەم وێنە هاویەشەی کوردە، ئەو فانتازیا کۆمەڵایەتی و سیاسییە هاوبەشەیە، کە وێنە هاویەشەکان و لێکچوونە زۆرەکان دروستدەکات. ئەو وێنانەی دەیانەوێت لەیەککاتدا هەم دونیای دەرەوەی کورد و هەم کورد خۆی لەوە ئاگاداربکەنەوە، کە مەسەلەی کورد یەک مەسەلەیە و کورد دەبێت وەک یەک گروپی ئەتنی جیاواز و وەک یەک نەتەوەی یەککگرتوو تەماشابکرێت. بەمانایەکی دیکە، شەڕی ناوخۆ دەبێتە هۆی وێرانکردنی ئەو وێنە هاویەشەی کورد دەیەوێت لە دونیای سیاسی و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی کورد خۆیدا و لە فانتازیای ئەوانیدیکەی دەرەوەی کوردیشدا، بیچێنێت. لە قووڵایی ناونانی شەڕی ناوخۆ بە شەڕی براکوژی، ترسێک هەیە هەست بە مەترسی وێرانکردنی ئەو وێنە هاویەش و یەککگرتووانە و دەرەنجامەکانیان دەکات، هەم بۆ کورد خۆی و هەم بۆ دونیای دەرەوەی کورد. هەستدەکات ئەو دونیا فانتازییەی

ناسیۆنالیزمی کوردی دەیەوێ دروستیبکات لەبەردەم مەترسی هەپروون بە هەپروون بوون و لێکهەڵوەشاندنەوەدایە. ئەم ترسە ترسێکە لەوەی نەکرێت کورد وەک یەک گروپی ئەتنی، وەک یەک نەتەوە، وەک یەک خێزان و مەسەلەکەشیان وەک یەک مەسەلە تەماشابکرێت. لێرەوە لە پشتی ناونانی شەڕی ناوخۆوە بە شەڕی براکان لۆژیکێک ئامادەیە، کە هەوڵدەدات ناکۆکییە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئایدیۆلۆژییە خوێناوییەکان بە ناکۆکی ناو یەک خێزان پێناسبکات، تا هیچ نەبێت بەم پێناسە خێزانییە ئەو هاوبەشە سەرەکییە بپارێزێت، کە هەموو بزوتنەوەیەکی ناسیۆنالیستی پێویستیپێیەتی.

بێگومان پاراستنی پایەکانی بزوتنەوەی ناسیۆنالیزمی کوردی، بەو مانایەی لەسەرەوە باسمانکرد، وابەستەی ئەوەیە تاچەند ئەو بزوتنەوەیە دەتوانێت ئەو وێنە یەکگرتوو و هاوبەشانە بپارێزێت، کە کورد هەم بە خۆی و هەم بەدونیای دەرەوەی خۆی دەدات. نەپاراستنی وێنەی هاوبەشی کورد و نیشاندانی کورد وەک کۆمەڵێک هێزی ناتەبا و دژیەک تا ئاستی بەرپاکردنی جەنگی خوێناوی لەگەڵیەکدا، هیچ بەهانەیەک بۆ مانەوەی بزوتنەوەیەک بەناوی نەتەوەی کوردەوە، بەناوی گشتێکی هاوبەش و هاوچارەنووسەوە ناهێڵێتەوە. لێرەوە ئەم بزوتنەوەیە ناچارە هەموو ئەو جەبرانە پیادەبکات، کە دەتوانێت بەهۆیەوە لانیکەمی ئەو وێنە هاوبەشانە بپارێزێت و بەم پاراستنەشی مانایەک بە مانەوەی خۆی وەک بزاوتێکی سیاسی بدات. جەبری بەرهەمهێنانی وێنەیەکی یەکگرتوو بۆ کورد، جەبرێکە دەیەوێت رێ لەهەموو هەوڵێک بۆ تێکشکاندنی ئەو وێنە هاوبەشە بگرێت، کە کورد وەک نەتەوە نیشاندەدات، ئەمەش وەک وتم جەبرێکە نایەوێت وێنەی یەکگرتووی کورد لە فانتازیای خۆی و لە فانتازیای ئەوانیشدا برینداربێت و لەناوبچێت. ئەم جەبرە جەبرێکە دەیەوێت هەموو مەترسییەکانی لەناوچوونی ئەو وێنەیە بنەبڕبکات. ئاخر ئەو مەترسییانەی بوونی ئەم وێنە یەکگرتووەی کورد دەخەنە بەردەم هەڕەشەی

گەورەوە مەترسی واقیعین و پەیوەندییان بە بونیادی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی کۆمەڵگای کوردی خۆی و بەو بارودۆخە ناوچەیی و نێونەتەوەییەوە هەیە، کە کورد خۆی لەناودا دۆزیوەتەوە. بەمانایەکی دیکە ترسی وێرانبوونی وێنەی هاوبەشی کورد وەک نەتەوەیەکی جیاواز، ترسێکی واقیعییە و بەردەوامیش بەشێک بووە لە مێژووی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئێمە، ترسێکە لەئێستادا لەهەموو کات ئامادەتر و بەرچاوتر و کوشندەتریشە.

لە مێژووی ئێمەدا بۆ پاراستنی ئەم وێنە یەکگرتووە دەستبراوە بۆ چەندان تەکتیکی جیاواز، لەهەموویان بەرچاوتر ئەو فێڵە مەعریفییەیە، کە شەڕی ناوخۆ بە شەڕی براکان ناودەنووسدەکات. ئەم ناونانە دەیەوێت بڵێت، ڕاستە کورد لەگەڵ یەکدیدا شەڕدەکەن، ڕاستە ناکۆکییەکان لەناو دەریایەک خوێندا دەتەقنەوە و ڕاستە کورد هەمان ئەو فیشەکانەی بە داگیرکەرانییەوە ئەنێت بەسەر دڵی یەکدیشیەوە ئەنێن، بەڵام هاوکات نابێت ئەوەمان لەبیرچێت ئەم شەڕانە شەڕی براکانە، شەڕی ئەو برایانەی بەحوکمی برابوونیان ناکرێت وا چاوەڕوانبکرێت شەڕەکەیان شەڕێکی ڕاستەقینە و بەردەوام و بێکوژانەوە بێت، شەڕێکبێت چوارچێوەی خێزان، چوارچێوەی هاوبەشی پێکەوە کۆکردنەوەی براکان، وێرانبکات. ئەم ستراتیژی ناونانە ئەیەوێت بڵێت ئەم شەڕە شەڕێکی کاتی و ناماقوڵ و لەهەمانکاتدا ناوازەشە. ناونانی شەڕی ناوخۆ بە شەڕی براکان ناونانێکە دەیەوێت لانیکەمی ئەو پەیوەندییە بپارێزێت، کە دواجار دوویرا لە چوارچێوەی یەک خێزاندا بەیەکەوە گرێدەدات، دەیەوێت بڵێت ڕاستە ئەم شەڕە شەڕی نێوان کورد و کوردە، بەڵام ئەم شەڕە شەڕی نێوان دوو برایە، شەڕی نێوان خێزانێکە، کە بێگومان کاتییەو، لەهەمانکاتیشدا هەڵەیە و دەشێت و دەبێت بەئاسانی چارەسەربکرێت. واتە ئەم ناونانە دەیەوێت بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بڵێت نابێت لەم شەڕەوە ئەو دەرەنجامە دەستگیربکەین و بڵێین ئەمانە یەک میللەت، یان یەک

نەتەوە، یان یەک خێزان نین و یەک چارەنووس چاوەڕوانیان ناکات. چونکە ئەم دەرەنجامە دەرەنجامێکە بوونی هەموو بزوتنەوەی سیاسی کوردی دەخاتە ژێر پرسیارەوە و ڕووبەڕووی کێشەی شەرعییەتی سیاسی دەکاتەوە. بەکورتی ئەم ناونانە هەوڵدانێکە بۆ پاراستنی ئەو وێنە هاوبەشە یەکگرتووەی کورد دەیەوێت بە دونیای خۆی و بە دونیای دەرەوەی خۆشی بدات.

-٣-

هۆکارێکی دیکەی ناونانی شەڕی ناوخۆ بە "شەڕی براکان" هەوڵدانی بەخشینی بارگەیەکی ویژدانییە دژیە شەڕ و ناونووسکردنیەتی وەک کارێکی ناعەقڵانی. ئاخر دۆخی عەقڵانی بوونی براکان بەیەکەوە دۆخی کارکردن و تەبایی و هاوئاهەنگی و پێکەوەبوونی ئاشتییانە و هاریکاری فرەلایەنە. لۆژیکی باڵادەست لای ئینسانی ئێمە و لەناو کولتوری ئێمەدا پێماندەڵێت دۆخی پێکەوەبوونی براکان، دۆخی خێزان، دۆخی هاریکاری و ئارامی و ئاسایشە، دۆخی خەمی یەکدی خواردن و بەدەم یەکەوەچوون و پشتی یەک گرتنە. ئەم دۆخە دۆخی ئەو شێوە هاریکاریە سروشتییەیە، کە دۆرکهایم ناویدەنێت "هاریکاری میکانیکی" خۆبەخۆ. هاریکارییەک، وەک دۆرکهایم دەڵێت، پشتئەستووره بەو پەیوەندییە سروشتی و خۆبەخۆیانەی لەشێوەی پەیوەندی خزمایەتی و پەیوەندی خوێندا کەسەکان و گروپەکان بەیەکیەوە گرێدەدات. بەم مانایە ئەم ناونانە لە قووڵاییە دەلالییەکانی خۆیدا هەوڵدانێکە بۆ ڕێگرتن لە بەرپابوون و داگیرسانی ئاگری شەڕ، هەوڵدانە بۆ پیشاندانی دونیای سیاسی کوردی وەک دونیای براکان، دونیای هارمۆنیەت و پێکەوەکارکردن.

ئەم ناونـانە ئەرکێکـی سـایکۆلۆژی و ڕەمـزی و دواجـار سیاسیشـی هەیە، کە لەپشتییەوە هەوڵدانێک بۆ ڕێگرتن لە شەڕو لە تەقینەوەی ناکۆکییەکان هەیە. هەر لەم ڕەوتەشـدا دەبـێ هەمـوو ئەو وێنـانەی دیـکەی برامـان لەبەرچاودابێـت، کە ڕۆشـنبیری گـوترلو و نووسـرلوی ئـێمە پێشـکەش بە ئینسـانی کـورد و دونیـا فانتـازییەکەی ئەو ئینسـانەی دەکەن، وێـنەی ئەو بـرا تەبایـانەی، کە یەککرتنیـان هێزێکی لەشکان نەهاتویان دەداتێ و ناکۆکبوونیشـیان دەیانکـاتە بـوونێکی لاوازی ئەوتۆ، کە شکاندنیان زۆر ئاسان بێت.

ئەگەر ئەوەی تائێسـتا باسـمانکرد بریتیبێـت لەدەرکەوتەکـانی ئەو جەبـرە دەرەکییانەی دیاردەی شەڕی ناوخۆیان بە شەڕی براکـان ناونووسـکردبێت، ئێسـتا کاتی ئەوە هاتووە باس لەو جەبرە ناوەکییانە بکەین، کە ئەم ناونانەی سەپاندووە. پرسیار ئەوەیە ئایا ئەو جەبرە ناوەکییانە کامەن؟

-٤-

وەک لە سەرەتای ئەم نووسینەدا هێمام بـۆکرد جەبـرە ناوەکییەکـان جەبـری ئەو بونیـادە ڕۆشـنبیرییەیە، کە پرۆسـەی بەرهەمهێنـانی مەعـریفە لە دونیـای ئـێمەدا بەڕێوەدەبات. ڕۆشـنبیری کـوردی بەشـێوەیەکی گشـتی ڕۆشـنبیرییەکە لە غیـابی چەمـک و زاراوە و میتـۆد و تیـۆرو تیـۆرەدا کاردەکـات، ڕۆشـنبیرییەکە هەڵگـری گوتارێکی مەعریفی و زانستی نییە سەبارەت بە کۆمەڵگا و دیاردە کۆمەڵایەتی و سیاسـی و سـایکۆلۆژی و فەرهەنگییەکـانی نـاو کۆمەڵگـای کـوردی. غیـابی سۆسیۆلۆجیا، ئەنسرۆپۆلۆجیا، سایکۆلۆجیا، فەلسەفە، زانستە سیاسیەکان هتد... وایکردووە ئەم ڕۆشنبیرییە نەتوانێت دیاردەکانی ناو واقیعی کوردی، کە بێگومـان

دیاردەی هێجگار ئاڵۆز و فرەڕەهەندن، تێبگات و بەشێوەیەکی دروست ناویانبنێت. کەئەمەشی بۆ نەکرا ناچار دەستدەبات بۆ سادەکردنەوەی ئەو دیاردانە و ناونانیان بەپێی ئەو توانا مەعریفییە کەمانەی ئەم ڕۆشنبیرییە هەیەتی. لێرەوە دیاردەی ئاڵۆزی شەڕی ناوخۆ کورتدەکرێتەوە بۆ شەڕی براکان و بەم ناونانەشی هەموو ئەو فاکتەرە ئابوری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئایدیۆلۆژی و کولتوری و فانتازیانە دەکوژرێن، کە لەناوەوەڕا فوو بەکوورە جەهەنەمییەکانی شەڕی ناوخۆدا دەکەن. بەکورتی ناونانی شەڕی ناوخۆ بە شەڕی براکوژی لەم ئاستەدا وابەستەی بێتوانایی ڕۆشنبیریی کوردییە لەناونان و ڕاڤەکردن و خوێندنەوەی ڕاستەقینەی ئەو دیاردانەی کۆمەڵگای کوردی ڕوویەڕوویان دەبێتەوە، لەوانەش شەڕی ناوخۆ.

-٥-

ئەگەر ناونانی شەڕی ناوخۆ بە شەڕی براکان ئەو جەبرە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییانەی سەرەوەی لەپشتەوەبێت و هەوڵدانێکبێت بۆ پاراستنی ئەو وێنە یەکگرتووەی کورد لەم قۆناغەی گەشەکردنی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا بەدونیای دەرەوەی دەدات، واتە ئەگەر ئەم ناونانە بەشێوەیەک لە شێوەکان هەڵگری مانایەکی ئیجابی بێت، پرسیاری سەرەکی ئەوەیە داخۆ ئەو کاریگەرە سلبییانە کامانەن ئەم ناونانە دەیانخاتەوە؟ یەکەمین خاڵێک لێرەدا هێمای پێبکەین سڕینەوە و داپۆشینی شوناسی ئەو گروپانەیە، کە بەشەڕدێن. ناونووسکردنی هێزە کۆمەڵایەتی و سیاسییە ناتەباکانی کوردستان بە برای یەکتری هەر لەسەرەتاوە ڕێگرە لەبەردەم ناسینێکی ڕاستەقینە و جدی هێزە شەڕکەرەکان و ناسینی ئەو مەسەلانەدا ئەم هێزە شەڕکەر و ناکۆکانە لەسەری بەشەڕدێن. ئەمەش مانای

نۆڕاندن و لەدەستدانی توانای ناسین و پێناسکردنی ڕاستەقینەی ئەو کێشانەی شەڕی ناوخۆ بەرهەمدێنن. بێگومان ئەم داپۆشینە بە پلەی یەکەم چەپاندنە، چەپاندنێک ناهێڵێت لەو ڕیشە کۆمەڵایەتی و ئابووری و سایکۆلۆژی و کولتوری و سیاسییانە تێبگەین، کە وادەکەن ئەم هێزانە بەشەڕبێن و جەنگ وەک نەگۆڕێک لە نەگۆڕەکانی دونیای ئێمە، بەرهەمبهێنن.

-٦-

لەڕووی سۆسیۆلۆجییەوە سەرنجێکی ورد لە زاراوەی "شەڕی براکوژی" دەمانخاتە بەردەم ئەو ڕاستییەی، کە ناونانی دیاردەی شەڕ لەکوردستاندا بەشەڕی براکان، ناونانێکە سەر بە سیستمێکی بەرهەمهێنانی مانایە، کە تیایدا کۆمەڵگا و دیاردە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان بە تێرمەکانی خێزان و پەیوەندییەکانی ناو خێزان پێناسەدەکرێن. ئەم ناونانە دەیەوێت بڵێت ئەوانەی شەڕدەکەن ئەو گروپە کۆمەڵایەتییە ناکۆکانە نین، کە لەپشتی شەڕەکانیانەوە جیاوازی لە دید و تێڕوانین و تەماحی کۆمەڵایەتییاندا هەیە، بەڵکو ئەم شەڕە شەڕی ئەو برایانەن، کە لەناو یەک خێزانەوە هاتون و هەڵگری یەک خوێنن. کردنی شەڕی ناوخۆ بە شەڕی براکان هەوڵدانێکی ڕاستەوخۆیە بۆ سڕینەوەی هەموو ڕەگە کۆمەڵایەتییەکانی ئەم شەڕە. بێگومان ئەم ناونانە ڕەمزییە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە ناونانێکی هەڵەیە، چونکە ئەوانەی شەڕدەکەن براکان نین، بەڵکو کۆمەڵێ هێزی جیاوازن، کە لە ململانێیەکی خوێناویدان لەسەر دەسەڵات. کۆمەڵێ هێز، کە لەڕۆژگاری جیاجیادا ئایدیۆلۆژیای جیاجیا و تێگەیشتنی جیاجیا و بنکەی کۆمەڵایەتی جیاوازیان هەبووە. بەڵام زۆربەی هەرەزۆریان سەر بەکولتورێکی سیاسی تایبەتن، کە دەکرێ

بەکولتوری خێڵ، یان کولتوری تۆڵە ناونوسیبکەین.
دانان و جێنشینکردنی ناکۆکییەکان لە دونیای خێزان و پێناسەکردنیان بە زاراوەی پەیوەندییەکانی خزمخواهی، بەشێکە لەو سیستمی چاودێرییەی دەیەوێت ئینکاری ئەو ڕاستییە کۆمەڵایەتییە بکات، کە شەڕ، هەموو شەڕێک، دەبێت ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ، ببەسترێتەوە بەو بونیادە کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتوری و ڕەمزییەوە ئەو هێزە جیاوازانە هەم بەیەکیەوە دەبەستێتەوە و هەم لەیەکتریشیان جیادەکاتەوە. ئەم داونانە دەخوازێت ئینکاری ئەوەبکات، کە شەڕ بەرهەمی ئەزمەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتییە گەورەتر و بەرفراوانتر لە سنووری خێزان و ئەو دونیایەی خێزان لەناویدا وەک یەکەیەکی کۆمەڵایەتی ئامادەیە. شاردنەوەی ئەم ڕەهەندە کۆمەڵایەتییەی شەڕ فێڵێکی سیاسیە و لەڕێگەیەوە ئەم هێزانە هەوڵئەدەن ڕووە تاریکەکانی ململانێی نێوانیان و هۆکارە ڕاستەقینەکانی بشارنەوە. داونەنانی ڕاستەقینەی ئەم دیاردەیە و چەندان دیاردەی دیکەی لەم بابەتە ئەو قەیران و پشێویە فیکری و چەمکی و عەقڵییەش بەرهەمدەهێنێت، کە دواجار خۆی دەبێتە سەرزەمینی بەرهەمهێنانەوەی دەسەڵاتی ئەو هێزانەی قازانجی کۆمەڵایەتییان لەوەدایە هیچ دیاردەیەک لە دیاردەکانی دونیای ئێمە، بە ڕاستی داونەنرێت. ئەمەش مانای ڕێگرتن لە ناسینی ئەو بارودۆخە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی و ئەخلاقییەی دواجار شەڕ دەبێتە یەکێک لەبەرهەمە هەرە گرنگەکانی.

-٧-

شەڕی ناوخۆی کوردستان لە نەوەدەکاندا شەڕی دووهێزە بڕیاری سەرەکییان ئەوەیە لەیەکدی بچن. ئەم شەڕە چیدی شەڕێک نییە لە پێناوی سەلماندنی

جیاوازییەکانـدا، بەڵکـو شـەڕێکە لە پێنـاوی سـڕینەوەیاندا، شـەڕ نییە لەسـەر هارمۆنیەتی ناو خێزان، بەڵکو شەڕە لەپێنـاوی داگیرکردنـی مەوقیعـی سیاسـی و کۆمەڵایەتیدا: بەکورتی شەڕی ناوخۆی نەوەدەکانی کوردستان شەڕە لەسەر بـوون بە تاقە گروپی باڵادەست لە کوردستاندا.

لەئاستی کۆمەڵایەتیـدا شـەڕی نـاوخۆی کوردسـتان لە نەوەدەکانـدا پەیوەنـدییەکی ڕاسـتەوخۆی بەو جێگـۆڕکێ کـۆمەڵایەتییەوە هەیە، کە لەدوای ڕاپەڕیـنەوە لە نەخشـەی کـۆمەڵایەتی کوردسـتاندا دروسـتبووە. مەبەسـتم لەو جێگـۆڕکێیەش هاتنەکایەی کۆمەڵایەتی ئەو 'سیاسییانەیە'، کە لەناو حیزبەوە و بەهۆی حیزبەوە و لە هەلوومەرجی ناوەکی شەڕی ناوخۆدا، مەوقیعێکی کۆمەڵایەتی پـتەو و گرنگیـان بـۆ خۆیان دروستکرد. ئەم گروهە سیاسـییە توانیـان لە سـاڵانی دوای ڕاپەڕینـدا مەوقیعـی سیاسـی خۆیـان بگـۆڕنە سـەر مەوقیعێکـی کـۆمەڵایەتی باڵادەسـت و دەسەڵاتی سیاسی خۆیان بگۆڕن بۆ دەسەڵاتێکی ئابووری و کۆمەڵایەتی گەورەش.

ئەم گـۆڕانە کـۆمەڵایەتییە بەبـێ بـوونی دونیـایەکی نائـارام و بەبـێ پشـێوییەکی کــۆمەڵایەتی گەورە مەیســـەرنەدەبوو. ئەم مەیســـەرنەبوونەش پەیوەنـــدی بەو ڕاسـتییەوە هەیە، کە 'سیاسـییەکان' گروهێـک بـوون لەدەرەوەی ژیـانی ئابووریـدا دروستبوون و تاقە هۆکارێک بۆ دابەزینیان وەک هێزێکی باڵادەست بۆ ناو دونیـای ئابووری و کۆمەڵایەتی، بەبێ مۆنۆپۆلیزەکردنی ژیانی ئـابووری کوردسـتان و بەبـێ خولقانـدنی پشـێوی کـۆمەڵایەتی دروسـتنەدەبوو. پشـێویی کـۆمەڵایەتی نەبـوایە پارتیزانەکانی دوێنێ نەدەبوونە سەرمایەدارەکانی ئەمڕۆ.

شــەڕی نــاوخۆ لەیەککاتــدا هەم مۆنۆپــۆلیزەی ئــابووری و هەم ئەو پشــێوییە کۆمەڵایەتییانەی خولقاند، کە ئەم جێگۆڕکێ کۆمەڵایەتییە پێویستی پێبوو. شەڕی نــاوخۆ سیاسـییەکانی کـوردی لە 'پـارتیزانی نـاو شـاخەکانەوە' کـردە پیـاوانی دەسەڵاتداری ناو شارەکان. ئەم جێگۆڕکێ کۆمەڵایەتییە هاوزەمـان بەنـاو هەڵـقەی

ئەو ململانێ سیاسی و ئایدیۆلۆژییەدا تێپەڕی، کە ڕۆژگارێکی درێژە هێزە سەرەکییەکیەکانی کوردستان بەیەکەوە دەبەستێتەوە. لێرەوە بەشێکی گەورەی داگیرکردنی مەوقیعە کۆمەلایەتی و سیاسییەکانی دونیای ئێمە بەناو ناکۆکییەکانی ئەم هێزە سیاسییانەدا تێپەڕی. بەمانایەکی دیکە پرۆسەی ئەم جێگۆڕکێ کۆمەلایەتییە و ململانێ لەسەر داگیرکردنی مەوقیعە ئابووری و کۆمەلایەتییەکان شێوەی ململانێیەکی سیاسی گرتە خۆی، کە لە شەڕی ناوخۆدا تەعبیری لەخۆیکرد. لێرەوە ناکرێت شەڕی ناوخۆی ئەمجارەی کوردستان لەو پرۆسەی جێگۆڕکێ کۆمەلایەتییە داببڕین، کە لە دوای ڕاپەڕینەوە لە نەخشەی کۆمەلایەتی کوردستاندا دروستبووە.

ئەوانەی لەکوردستاندا بەشەڕدێن و لەیەککاتدا ڕابوردوو و ئێستا و ئاییندەی ئێمە وێراندەکەن براکان نین، بەڵکو ئەندامانی نوخبەیەکی سیاسی دەسەلاتدارن، نەک ناتوانرێت لەسنووری خێزانێکدا کۆبکرێنەوە، بەڵکو زۆریەیان لەدەرەوەی کوردستاندا هاوولاتی دەوڵەتێکی دیکەن. ئەوانەی شەڕ بەرپادەکەن بەتەنها خەڵکی سلێمانی و هەولێر و دهۆک و زاخۆ نین، بەڵکو کوردی سویدی، دانیمارکی، ئەڵمانی، ئەمریکی، هۆڵەندی و بریتانین هتد... شەڕی ئەمجارەی کوردستان شەڕێکە ئەو پەنابەرە سیاسییانە بەڕێوەیدەبەن، کە سالانێکی درێژ لە ئەوروپا و ئەمریکا ژیاون، پەنابەرانێک هەموو مانگێک هاوڕێکانیان بەقاچاغ ئەو پارەی بێکارییەیان بۆ وەردەگرن، کە لە ئەوروپا بە پیر و پەککەوتە و سەقەتەکان ئەدرێت، پەنابەرانێک ئێستا بەسەفەر لە کوردستانن و لەوێ نیشتیمانی ئێمە بەسەر خەڵک و خەون و ئاییندەی ئێمەدا وێراندەکەن.

## سەرچاوەکان

1- Michel Foucault , De orde van vertoog, Amsterdam Boom1976
2- Hobsbawm and Ranger, The envention of Tradition, Cambridge University press, 1983 .

ئەم وتارە یەکەمجار لە گۆڤاری "بینین"، کە لە ئەمریکا دەردەچێت دا بڵاوکراوەتەوە.

# بەشی یەکەم

## تیۆرە

-١-

### سەرەتا

ئەم باسە دەخوازێت لە کێشەی دەسەڵات لە واقیعی کوردیدا بدوێت، لە بابەتێکی گشتی ـ کە دەسەڵاتە ـ لەناو واقیعێکی دیاریکراو و تایبەتدا ـکە واقیعی کوردییە. دەکرێت بڵێم ئەو دوو جەمسەرەی ئەم باسە ئەیەوێت بەیەکیانەوەگرێبدات دوو جەمسەری زۆر ئاڵۆزن. یەکێکیان ـ دەسەڵات ـ کێشەیەکی تیۆریی و فیکری هێجگار ئاڵۆزە، کە فیکری بەشەری لەسەرەتای سەرەتاکانییەوە عەودالی لێتێگەیشتن و ناساندن و تیۆریزەکردنیەتی. ئەوییدیکەشیان ـ واقیعی کوردی ـ بریتیە لە واقیعێکی سیاسی و کۆمەلایەتی و کولتوری ئاڵۆز، کە لەبەردەم گۆڕانی گەورە گەورە و لەپڕ و چاوەڕوان نەکراودایە. ئەم واقیعە تێکەڵێکی ئاڵۆزە لە بەناویەکداچوونی ئایین و سیاسەت، مۆدێرنە و تەقلیدیەت، خەون و تێکشکان، بزوتنەوەیەکی سیاسی، کە بەناوی نەتەوەوە ئەدوێت و لەبەرامبەر واقیعێکی

سیاسی پارچەپارچەی بەر لە دروستبوونی نەتەوەدا، تێکەڵبوونی سۆسیۆلۆژیای خێڵ و سۆسیۆلۆژیای کۆچ، بەناویەکداچوونی سەتەلایت و مزگەوت، کۆمۆنیزم و ئوسوڵییەت، هتد... ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئەم واقیعە واقیعێکی پەراوێزخراو و پشتگوێخراوی میللەتێکە، کە لەبەردەم دەرگاکانی ساڵی دوو هەزاردا "دەسەڵاتە ناوخۆیی" و خۆماڵییەکەی خۆی بەر لە "دەسەڵاتە دەرەکییەکان" جەستە سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتوری و ڕەمزییەکەی هەپرون بە هەپرون دەکات.

دەسەڵات وەک بابەتێکی فیکری بابەتێکی هێجگار بەرفراوانە و بەدەیان بۆچوون وتێز و تیۆرەی جیاواز و دژیەیەک سەبارەت بەچیەتی و چۆنیەتی و شێوازی کارکردن و ڕێکخستن و فۆرم و کاریگەریە دیار و نادیارەکانی لەسەر ڕووکار و دەرکەوتە جیاجیاکانی ژیانی گروپ و تاکەکان لەئارادایە. لە ئەفسانە سەرەتاییەکانەوە بۆ کتێبە پیرۆزەکان، لە فەلسەفەی کۆنی چین و هیند و بابلەوە بۆ فەلسەفەی یۆنانی، لە فیکری فەلسەفی مەسیحیەوە بۆ فیکری فەلسەفی ئیسلامی، لە قۆناغی ڕۆشنگەریەوە بۆ فیکری فەلسەفی سەدەی نۆزدە، لە مارکسەوە بۆ ئایەتوڵاخومەینی، لە کۆمۆنەی پاریسەوە بۆ جەنگی خوێناوی کورد لەگەڵ کورددا، دەسەڵات بابەتێکە ئینسان لە سێنتەری تێڕامان و گرنگیپێدانەکانیدا دایناوە. لێرەوە پەیڕەویکردنی تێزێکی تایبەت بە تەنها بۆ تێگەیشتن لە دەسەڵات، لەناو ئەو سەفەرە درێژەی فیکری بەشەری و تەماحی سیاسیدا دەمانخاتە بەردەم مەترسی کورتگەرایی و ڕوویەڕووی ئەو کێشەیەمان دەکاتەوە، کە نەتوانین دەسەڵات و میکانیزمەکانی کارکردنی بەباشی بناسین و نەتوانین لە دەرکەوت و فۆرمە جیاوازەکانی تێبگەین.

لەولاشەوە واقیعی کوردی وەک جەمسەری دوهەمی ئەم نووسینە واقیعێکی ئاڵۆزە و بۆ تێگەیشتنی پێویستمان بە دەزگایەکی تیۆری و چەمکی تایبەت هەیە. ئەم واقیعە، وەک گوتمان، واقیعێکی سیاسی پارچە پارچەیە، لەکتێکدا بزلوتێکی

سیاسی تێیدا، کە بەناوی نەتەوە و مافی نەتەوایەتییەوە دەدوێت، هاوکات ئەوەی لەڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتورییەوە ڕوودەدات کۆمەڵێک دیاردەن زۆربەیان سەر بەقۆناغ و لۆژیکی بەر لە دروستبوونی نەتەوەن. ئەم واقیعە لەزۆر ڕووەوە واقیعێکی پەراوێزکراوی پڕکێشەی هەمەجۆرە، لەهەمانکاتدا بێبەشیشە لە تەکانە نوێکانی مێژووی هاوچەرخی مرۆڤایەتی و ئەو دەسکەوتە گەورانەی دەکرێت لەڕێگەیانەوە ئەگەرەکانی ژیان و مێژوویەکی کراوەتر و پێشکەوتوتر گەورەتربکرێن. جگە لەمە واقیعی کوردی واقیعێکە تا ڕادەیەکی زۆر مەسەلەی کۆنترۆڵ و چاودێریکردنی گەشە ناوەکییەکانی لەلایەن هێزە دەرەکییەکانەوە و لەدەرەوەی خۆیدا پیادەدەکرێت، بە مانایەکی دیکە، کۆمەڵگای کوردی بەتەنها لەڕێگای میکانیزمە ناوەکییەکانی خۆیەوە ناجوڵێت، بەڵکو بەردەوام لەدەرەوەشڕا و لەلایەن داگیرکەرانەوە خودی ئەو میکانیزمانە بەشێوەیەک لە شێوەکان کۆنترۆڵ و ئاراستەدەکرێن. بۆ نموونە، کە هێزە مۆدێرنەکان لەم واقیعەدا زیاددەبن و هەوڵدەدەن قورسایی سۆسیۆلۆژی و کولتوری خۆیان لەناو واقیعی کوردییدا بسەپێنن، دەبینین بەعس بە بڕیارێک زۆربەیان لەڕێگای "سیستمی موستەشار"ەکانەوە دەخاتەوە بەردەست و ڕەحمەتی هێزە تەقلیدییەکانی ناو واقیعی کوردی و بەمەش سەرلەنوێ گیانێکی نوێ بەبەر هەموو ئەو پەیوەندییە تەقلیدییانەدا دەکاتەوە، کە کۆمەڵگای کوردی هەوڵدەدات لێیان ڕزگاربێت. بۆیە خوێندنەوەی واقیعێکی لەو بابەتە کۆمەڵێک کێشەی میتۆدی و فیکری و تیۆری دروستدەکات، کە چارەسەرکردنیان ئاسان نییە و نووسەر دەخنە بەردەم کۆمەڵێک موغامەرەتی فیکرییەوە، کە دەخوازن سنوورەکانی بیرکردنەوە و سنوورەکانی مەنهەج تائەوپەڕی کرانەوە بکەنەوە و دەربازبن لەتەڵەی تاکمیتۆدی و تاکڕوانین. لێرەوە ئەم نووسینە بێبەش نییە لە تەحەدای هەردوو جەمسەرەکەی ئەم بابەتە.

-٣-

لەم نووسینەدا بۆئەوەی دەزگایەکی چەمکی لەبار دروستبکەین هەوڵدەدەم سوود لەزیاد لە تیۆرەیەک لە تیۆرەکانی دەسەڵات ببینم. هەروەها هەوڵدەدەم واقیعی کوردی لەو ئاستانەدا بخوێنمەوە، کە دەشێت شێوازی کارکردنی دەسەڵات لەناوانیدا ئاشکراتر و بەرچاوتربێت، جگە لەمە جارنەجارێک لێکدانەوەکانم دەگوێزمەوە بۆ خوێندنەوەی ئەزموونی بەعس لە عێراقدا، چونکە پێموایە ئەزموونی دەسەڵات لە کوردستاندا لەزۆر ڕووەوە لە ئەزموونی بەعس ئەچێت لە عێراقدا، بێگومان لە هەندێک شوێنیدا ئەم ئەزموونە لە ئەزموونی بەعس جیاوازە بەڵام لە هەندێک شوێنی دیکەدا کۆپییەکی تەواوی ئەو ئەزموونەیە. ڕۆژگارێکی درێژی ئەوێت تا کۆمەڵگای ئێمە لەو کەلەپوورە بەدەی دەسەڵات ڕزگاربێت، کە بەعس لە عێراق و کوردستاندا بۆ دەسەڵاتدارانی سیاسی هاوزەمانی خۆی و دوای خۆشی بەجێهێشتوە. ئەم نووسینە هەوڵدانێکی سەرەتاییە بۆ ناسینی ئەو کەلەپوورە و هەوڵدانی ڕزگاربوون لە ڕووکارە ناشیرین و بەدەکانی.

لەبەر ئەو هۆیانەی سەرەوە هەوڵدەدەم لەم وتارەدا سوودێکی زۆر لە تیۆرەی دەسەڵات لای گرامشی و فۆکۆ و بۆردیۆ وەربگرم. لەهەریەکێک لەم فەیلەسوف و زانا کۆمەڵایەتییانە چەمکێک، یان چەند چەمکێک دەخوازم و دواتر ئەو چەمکانە بەسەر یەکەوە وەک سیستمێک بۆ خوێندنەوەی چەند ڕەهەندێکی جیاواز و چەند فۆرمێکی جیاوازی دەسەڵات لە واقیعی کوردیدا، بەکاردێنم. ئەڵبەتە هەر لەسەرەتاوە من ئەو ڕاستییەم لەبەرچاوە، کە ئەم سێ فەیلەسوفە خاوەنی سێ تیۆرەی جیاواز و سێ میتۆدی جیاواز و سێ کەلەپووری فیکری جیاوازن. هەریەکێکیان لەدەلاقەیەکی تایبەتەوە لەمەسەلەی دەسەڵات ئەڕوانێت و هەریەکێکیشیان دیدێکی تایبەتی بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ دەسەڵاتدا هەیە.

با لێرەدا بە چەند نموونەیەک ئەم خاڵە زیاتر ڕوونبکەینەوە. مەسەلەی سەرەکی لای گرامشی مەسەلەی چۆنیەتی بەرپابوونی شۆڕشی کۆمەڵایەتییە و گرامشی خۆشی بە "فەیلەسوفی شۆڕش لە ڕۆژئاوادا" ناونووسدەکرێت. (١) گرامشی سەرگەرمی دۆزینەوەی ستراتیژێک بوو بۆ ئاڵوگۆڕی کۆمەڵایەتییانەی دەسەڵات لە ئەورووپای ڕۆژئاوادا و تیۆرەی دەسەڵات لای ئەو لە جەوهەردا هەوڵدانە بۆ دۆزینەوەی ئەوستراتیژ و ئامرازانەی، کە دەشێت ئاڵوگۆڕی دەسەڵات لەڕێیانەوە فەراهەمبکرێت. ئەمە وادەکات تیۆرەی دەسەڵات لای گرامشی بە پلەی یەکەم "تیۆرەی حیزب" بێت. (٢) پرسیاری ستراتیژی سەبارەت بە دەسەڵات لای گرامشی بریتییە لەوەی چۆن و بە چ شێوەیەک حیزبی پرۆلیتاریا دەگاتە دەسەڵات؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە ستراتیژییە گرامشی هەوڵدەدات ئەم پرسیارە بۆ کۆمەڵێک پرسیاری بچووکتر و کۆنکریتتر دابەشکات، پرسیاری لەبابەتی:

- چۆن حیزبی پرۆلیتاریا هەیمەنە پەیدادەکات؟
- چۆن و بە چ شێوەیەک کاردەکاتە سەر هێزە جیاوازەکانی ناو "کۆمەڵگای مەدەنی"؟
- حیزب چ پەیوەندییەک لەگەڵ دەوڵەتدا دروستبکات؟
- حیزب لەگەڵ کام هێزی کۆمەڵایتیدا هاوکار و لەگەڵ کام هێزی دیەکەدا بەدکاربێت، بەمانایەکی دیکە حیزب چ جۆرە "بلۆکێکی مێژوویی" پێکبێنێت؟

دەستەواژەکانی "هەیمەنە"، "کۆمەڵگای مەدەنی"، "بلۆکی مێژوویی" و "دەوڵەت" دەستەواژە سەرەکییەکانی ناو فیکری گرامشین. وەک ئاشکرایە ئەو پرسیارانەی سەرەوە لە جەوهەردا کۆمەڵێک پرسیاری لینینین و بەزۆری لەدەوری حیزب و پەیوەندییەکانی حیزب و ڕۆڵی حیزب دەسوڕێنەوە، بۆیە کەمنین ئەوانەی گرامشییەت بە لینینزم ناودەبەن، بەڵام لینینیزمێک بۆ ڕوسیا نا، بەڵکو بۆ

ڕۆژئاوا.(٣). بەکورتی گرامشی ڕای وایە پارتە کۆمۆنیستەکانی ڕۆژئاوا بۆئەوەی بتوانن دەسەڵات بگرنەدەست دەبێت سەرەتا هەیمەنە پەیدابکەن، ئەمەش مانای ئەوەی بتوانن بیروبۆچوونەکانی خۆیان بەناو "کۆمەڵگای مەدەنی" دا بڵاویکەنەوە و ئەم کۆمەڵگایە والێبکەن بکەن بە هەڵگری بیروبۆچوونەکانی ئەوان، دواتر لەگەڵ هێزە شۆڕشگێڕەکانی دیکەدا "بلۆکێکی مێژوویی" دروستبکەن و لەڕێگای هەڵبژاردنەوە دەسەڵات بگرنەدەست.

فۆکۆ سەر بە کەلوپور و ڕەوتێکی فیکری دیکەیە جیاواز لەوەی گرامشی، ئەگەر گرامشی لەدۆخی گەڕانەوەیەکی بەردەوامدابێت بۆ مارکس و کەلەپووری مارکسیزم، ئەوا فۆکۆ لە پەیوەندییەکی بەردەوامدایە لەگەڵ کانت و نیتشەدا. زۆرن ئەوانەی پێیانوایە شێوازی کارکردنی فۆکۆ هەمان شێوازی کارکردنی کانتییانە و نیتشەویانەیە و ئەم دوو فەیلەسوفە گەورەیەی سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەم بە بەردەوامی لەکارەکانی فۆکۆدا ئامادەن.(٤) فۆکۆ هەڵگری تیۆرەی حیزب نییە و هەر لەسەرەتاشەوە باوەڕی بە دابەشکردن و لێکجیاکردنەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی نییە.(٥) فۆکۆ باوەڕی وایە لە هەموو کۆمەڵگایەکدا یەکجۆر "حوکمگەرایی" و یەک ستراتیژی دەسەڵات هەیە، کە هەم لەناو دەوڵەت و هەم لەناو کۆمەڵگادا ئامادەن و کاردەکەن. (حوکمگەرایی وەرگێڕانی ئەو چەمکە گرنگ و ئاڵۆزەی فۆکۆیە، کە پێدەگوترێت (governmentality). شۆڕش بەگشتی و شۆڕشی پرۆلیتاری بەتایبەتی لای فۆکۆ بابەتی تیۆریزە و بیرلێکردنەوە نین. ئەوەی فۆکۆ سەرقاڵی لێکۆڵینەوە و ناسینیەتی کێشەی دەسەڵاتە وەک تۆڕێک لە پەیوەندی هەمەلایەن و گشتگیر، کە هەموو خانە کۆمەڵایەتییەکان و سەرلەبەری جەستەی کۆمەڵایەتی دەتەنێتەوە. لەو شوێنانەشدا، کە فۆکۆ لەمانا سیاسییەکانی دەسەڵات نزیکدەبێتەوە، نەک تەنها باسی دەوڵەت و پەیوەندی نێوان حیزب و دەوڵەت ناکات، بەڵکو باسی ئەو بابەتانەش ناکات، کە فیکری سیاسی لەهەردوو

قوتابخـــانە گەورەکەیـــدا، قوتابخـــانەی "ڕیـــالیزمی سیاســـی" و قوتابخـــانەی "یۆتۆپیاگەرایی"، باسیاندەکات. (٦) بەلای فۆکۆ وە مانا سیاسیەکانی دەسەڵات لە مەیلـــی "حـــوکمگەرایی"، govemmentality دا دەردەکەوێـــت، چەمکـــی "حوکمگەرای"ی لای فۆکۆ بەمانای حوکمکردن نییە لەنـاو دەوڵەتـدا، یـان مەیلـی مۆنۆپـۆلیزەی دەســەڵات و شـتیتری لەم بابەتـانە، مەبەسـتی فۆکـۆ لە چەمکـی "حوکمگەرایی" بریتییە لە بیرۆکەی "ئیـدارەدانی ژیـان"، کردنـی ژیـان خـۆی وەک گشتێک، کە دەسەڵات کاری لەسەریکات. ئیدارەدانی ژیان مانای ئەوەی ژیان لەمانا بایۆلۆژییەکەیدا ببێتە بابەتی دەسەڵات و مەسەلەکانی سێکس و زاوزێ و مەسەلەی دانیشـتوان و مەسـەلەی تەندروسـتی و تەمەن و هەمـوو دیـاردە بایۆلۆژییەکـانی دیکەی ژیانی ئینسان، ببنە بابەتی ئیشـکردنی دەسـەڵات. بەکورتی فۆکـۆ باسـی حیزب و دەوڵەت ناکات، بەڵکو باس لە گشتێتی دەسەڵات دەکات لەناو سەرجەمی خانە کۆمەڵایتییەکاندا.

ڕوویەکی دیکەی تیۆرەی دەسەڵات لای فۆکۆ بریتییە لە پەیوەندی نێوان مەعریفە و دەسەڵات، لەم بارەیەشەوە دەنووسێت: "مـن (لە مەسـەلەی دەسـەڵاتدا) باسـی ئاغا ناکەم، مـن زیـاتر لەخەمـی بەرفراوانبـوونی میکانیزمەکـانی هەیـمەنەدام". (٧) بەباوەڕی فۆکۆ میکانیزمەکانی هەیمەنە بەتەنها چینێک لە چینەکان لێی بەرپرسیار نییە و بەتەنیا هێزێکی کۆمەڵایەتی هەڵگر و پیادەکەری نییە، هەیمەنە پێکهـاتێکی دیـاریکراوی دەســەڵاتە و لەهەمــوو جەســتەی کــۆمەڵایەتییەوە هەڵــدەقوڵێت و بڵاویشدەبێتەوە. لای فۆکۆ هەیمەنە سیفەتی سەرەکی ئەم حیزب، یان ئەو حیـزب و بـزوتنەوەی سیاسـی نیـیە، بەڵکـو سـیفەتی سـەرەکی دەسـەڵاتی مـۆدێرنە. لەمڕووەوە فۆکۆ دەڵێت دەسەڵات شتێک نییە یەکێـک لەسـەرەوەڕا بیسـەپێنێت و یەکێکیـدی لەژێـرەوەڕا، یـان قبووڵیبکـات، یـان لە دژی کاریکـات و بەرگرییبکـات. هەروەها دەسەڵات شتێک نییە بەتەنیا ئـابووری، یـان سیاسـەت، یـان دەزگاکـانی

حوکمڕانی پیادەییەکەن و مەعریفە، یان هەقیقەت لێی بێبەشبێت. فۆکۆ ئەڵێت "ئەگەر کەڵەبوونی سەرمایە بەشێکی گرنگی ئایندەی کۆمەڵگای ئێمەبێت، ئەوا کەڵەکەبوونی مەعریفە لەو کەمتر نییە". (٨) هەرلێرەشدا فۆکۆ جەخت لەوەدەکات، کە هەم بەرهەمهێنـان و هەم بەکارهێنـان و هەم کەڵەکەبـوونی ئەم مەعـریفەیە ناکرێت لە میکانیزمەکانی دەسەڵات جیاکرێتەوە". (٩). بەمانایەکی دیکە دەسـەڵات لەنـاو مەعـریفەدا و مەعـریفەش لەنـاو دەسـەڵاتدا ئامـادەیە، لەسـەردەمە مێـژووییە جیاوازەکاندا شێوازی جیاوازی پەیوەندی نێوان دەسەڵات و مەعریفە دەبینین. بۆیە لە خوێندنەوەماندا بۆ دیاردەی دەسەڵات دەبێت ئاگامان لەم پەیوەندییە نـاوەکی و گرنگەی نێوان دەسەڵات و مەعریفەبێت.

بۆردیـۆ هەم لە گرامشـی و هەم لە فۆکـۆ جیـاوازە. سـەرەتا ئەگەر ئەم دووانەی دواییان فەیلەسوفبن، ئەوا بۆردیۆ سۆسیۆلۆژ، واتە کۆمەڵناسە. ئەمەش وایکـردووە بۆردیـۆ هەم لە گرامشـی و هەم لە فۆکـۆ ئەزموونگەرتربێـت و پەیوەنـدی بە دیاردەکانی دەسەڵاتەوە پەیوەنـدییەکی تەجریبـی و ماتریالیانەتربێـت. بەبۆچـوونی هەندێک نووسـەر گرنگـی تیـۆرەی دەسـەڵات لای بۆردیـۆ لەوەدایە نوقسـانییەکانی تیـۆرەی دەســەڵات لای فۆکـۆ تەواودەکـات. ئەم تەواوکـردنەش لەپێـداگرتنی بەردەوامی بۆردیۆدایە لەسەر ڕەهەندە ڕەمزییەکـانی دەسـەڵات. (١٠) مەبەسـت لەم پێداگرتنەش ئاشـکراکردنی ئەو ئـامراز و میکانیزمـانەیە، کە دەسـەڵات بەهۆیـانەوە خۆی لەناو تۆڕێک لە کردە و پراکتیکی ڕەمزیدا ئەشارێتەوە، چونکە وەک بۆردیـۆ دەڵێـت "کـاری سـەرەکی دەسـەڵاتی ڕەمـزی شـاردنەوەی هەقیقەتـی دەسـەڵات خۆیەتی وەک ئامادەگییەکی فیزیایی". (١١) ڕەنگە جیاوازی هەرە سـەرەکی نێـوان بۆردیـۆ و فۆکـۆ لەوەدابێـت فۆکـۆ پێیـوایە دەسـەڵات لەسـەر جەسـتە کاردەکـات، لەکاتێکدا بۆردیۆ باوەڕی وایە دەسەڵات لەسـەر جەسـتە کارناکـات، بەڵکـو لەسـەر "هەبیتوس" کاردەکات. فۆکۆ دەڵێـت دەسـەڵات لە کۆمەڵگاکـانی بەر لەمـۆدێرنەدا

ڕاستەوخۆ لەسەر سزادان و تێکشکانی جەستە کاریکردووە و لە دوای مۆدێرنەشەوە لەسەر دیسپلین و کۆنترۆڵکردنی ئەو جەستەیە کاردەکات، بەڵام بۆردیۆ پێیوایە دەسەڵات جەستە بە شوێنی سەرەکی کارکردنی خۆی دانانێت، بەڵکو دەخوازێت دونیای ڕۆحی و دەروونی ناوەکی ئینسان بە ستراتیژەکانی خۆی ڕەنگڕێژکات. هەبیتۆس لای بۆردیۆ هێما بۆ ئەو دونیا ناوەکییە دەکات.

فۆکۆ لەوباوەڕەدایە دەسەڵات دێت بۆ ئەوەی بونیانێکی دیاریکراو بەجەستە بدات و بەو شێوەیە دروست و دیسپلینیبکات، کە زۆرترین سوودی لێوەربگیرێت، واتە دەسەڵات دەیەوێت جەستە بکاتە جەستەیەکی چالاک، بەڵام کۆنترۆڵکراو، لەکاتێکدا بۆردیۆ قسە لەوەدەکات، کە دەسەڵات بونیاد بە جەستە نادات، بەڵکو بە هەبیتۆسی دەدات. (١٣) (هەبیتۆس بریتییە لەو ئامادەگییە گشتییانەی لەناوەوەڕا وا لە ئینسان دەکەن توانای ئەوەی هەبێت بەشێوەیەکی دیاریکراو بڕیاربدات و بەشێوەیەکی دیاریکراو هەڵسوکەوتبکات). بە باوەڕی بۆردیۆ مادامەکی دەسەڵات لەسەر هەبیتۆس کاردەکات، واتە لەسەر دونیای ناوەکی ئینسان کاردەکات، بۆیە بەردەوام هەوڵدەدات ئامادەگی فیزیاییانەی خۆی بشارێتەوە و خۆی لە دەسەڵاتێکی دیترا و و بەرجەستەوە، بگۆڕێت بۆ دەسەڵاتێکی ڕەمزی. لێرەوە دەسەڵات لەباتی ئەوەی خۆی لە فۆرمی قامچی و خەنجەر و تفەنگدا نیشانبدات، ئەبێتە کۆمەڵێک ئەمر و نەهی دیاریکراو و دەبێتە کۆمەڵێک بەها و نۆرم و زمان و کۆمەڵێک نایەکسانی بونیادییانە، بەڵام زۆرجار نادیار و شاردراوە. بەکورتی مادامەکی دەسەڵات لەسەر هەبیتوس کاردەکات بۆیە بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدایە بوونی فیزیاییانەی خۆی بشارێتەوە و نەهێڵێت وەک هێزێکی دیار و بەرجەستە ببینرێت.

ئەم جیاوازیە بنەڕەتییانە لەنێوان فۆکۆ و بۆردیۆدا بۆ مەبەستی ئەم وتارە یارمەتیدەرێکی لەبارن بۆ بنیادنانی ئەو دەزگا چەمکییەی لەسەرەتاوە هێمامان

پێکرد، چونکە هەریەکێکیان یارمەتیدەری ئەوەن ڕەهەندێک لە ڕەهەندەکان و دەرکەوتێک لەدەرکەوتەکانی دەسەڵات تێبگەین. لەواقیعی ئێمەدا هەم ئامادەگی فیزیاییانەی دەسەڵات و هێرشە بەردەوامەکانی بۆسەر جەستەی ئینسان، لەوێنەی کوشتن و لێدان و ئازارداندا ئامادەیە، هەم ڕەهەندە ڕەمزییەکانی دەسەڵاتیش زۆر بە توندی ئامادەن بۆ شاردنەوەی هەندێک ئاستی بەکارهێنانی دەسەڵات و لانیکەم بۆ بەخشینی شەرعیەت بە هێرشە فیزیاییەکان. بەکورتی هیوادارم ئەم پرۆژە میتۆدە تەرکیبیە ئاڵۆزە یارمەتیدەری ئەوەبێت لەڕێگەیەوە کێشەکانی دەسەڵات لەواقیعی کوردیدا شیبکەینەوە و لە جومگە گرنگە دیار و نادیارەکانی تێبگەین. وەک سەرەتاش هەوڵدەدەم کەمەکێ ئاشکراتر لەسەر ئەو سێ تیۆرەیەی دەسەڵات بدوێم و هێڵە گشتییەکانیان، لە پەیوەندیاندا بەم نووسینەوە، ئاشکرابکەم، تا لە هەنگاوی دواتردا بتوانم دەرکەوتەکانی دەسەڵات لەواقیعی کوردیدا و چۆنیەتی ئیشکردنی هەندێک لە میکانیزمە گرنگەکانی نیشانبدەم.

-٣-

## گرامشی

ستراتیژیترین چەمک لە تیۆرەی دەسەڵاتدا لای گرامشی چەمکی "هەیمەنەیە"، Hegemony. ئەم چەمکە ئەو دەروازە گرنگەیە، کە گرامشی لەڕێگایەوە دەچێتە ناو دونیای ئەو پەیوەندییانەی، کە هەر سێ لایەنە گرنگەکەی تیۆرەی دەسەڵات لای ئەم فەیلەسوفە بەیەکەوە گرێدەدات، مەبەستم لەو سێ لایەنەش دەوڵەت و حیزب و کۆمەڵگای مەدەنییە. هەیمەنە لای گرامشی بە مانای باڵادەستییەکی ڕۆحی و ئایدیۆلۆژی دێت، ئەو هێزەی لە کۆمەڵگایەکدا خاوەن هەیمەنەیە ئەو هێزە

نییە بەزۆر و لەژێر زەبری ترس و تۆقاندندا ئەوانیتر ناچارەکات سەرکردایەتی ئەو قبووڵبکەن، پێناسەکانی ئەو بۆ دونیا و دیاردە و پەیوەندییکان قبووڵکەن، هێزی خاوەن هەیمەنە ئەو لایەنەیە هێزە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە خۆبەخۆ و بێ بەکارهێنان، یان هەڕەشەکردن بە بەکارهێنانی زەبروزەنگ و توندوتیژی، هێڵە گشتییەکانی دید و تێڕوانینەکانی ئەو قبووڵدەکەن.، کە دەڵێین فڵانە هێزی کۆمەڵایەتی خاوەن هەیمەنەیە ئەمە مانای ئەوەیە ئەو هێزە کۆمەڵایەتییە توانیویەتی قەناعەتەکانی خۆی و دید و بۆچوون و پێناس و ماناکانی خۆی لەڕێی باڵادەستییەکی رۆحی و ئایدیۆلۆژی و فەرهەنگییەوە بکاتە هی هێزە کۆمەڵایەتییکانی دیکەش، یان لانیکەم بەشێکی زۆری ئەو هێزانە. هێزێک کاتێک دەتوانێت هەیمەنەی هەبێت، کە هێزەکانی تر سەرکردایەتیکردنی ئەو بۆ کۆمەڵگا وەک شتێکی سروشتی ببینن و خۆبەخۆ قبووڵیبکەن. لای گرامشی هەیمەنەی حیزبێک ئەو ئەڵقە گرنگەیە نیشانیدەدات کام حیزب دەتوانێت دەسەڵات بگرێتە دەست و حوکم بکات، چونکە ئەو حیزبەی خاوەن هەیمەنە بوو مانای ئەوەی توانیویەتی دەنگی هێزە جیاجیاکانی ناو کۆمەڵگای مەدەنی بەلایخۆیدا ڕابکێشێت و لەڕێگای ئەم دەنگانەوە توانیویەتی دەسەڵاتی سیاسی لە دەوڵەتدا بگرێتە دەست و دەسەڵاتی فیکری و فەرهەنگیشی لە کۆمەڵگای مەدەنیدا چەسپاندبێت. بەمانایەکی دیکە هەیمەنە بریتیە لەو کلیلەی قوفڵەکانی دەسەڵات بۆ حیزب دەکاتەوە، هەم قوفڵەکانی دەوڵەت و هەم قوفڵەکانی کۆمەڵگای مەدەنی.

وەک ئاشکرایە چۆنیەتی دۆزینەوەی کلیلی هەیمەنە لەجەوهەردا وەڵامی ئەو پرسیارە سیاسییەیە، کە گرامشی لە بیستەکان و سیەکانی ئەم سەدەیەدا وەک مارکسییەکی رۆژئاوایی دەیکات، پرسیاری: چۆن بگەین بە دەسەڵات؟ بۆ گرامشی ئاشکرابوو، کە مارکسییەکانی ئەورووپای رۆژئاوا ناتوانن هەمان ئەزموونی بۆلشەویکە روسەکان دووبارەبکەنەوە، گرامشی ئەیزانی مارکسییەکانی ئەورووپای رۆژئاوا لە

دونیـایەکی جیـاواز لە دونیـای بۆلشـەویکەکاندا دەژیـن و لەگەڵ کۆمەڵگایەکـدا مـامەڵەدەکەن جیـاواز لە کۆمەڵگـای ڕوسـی. ئەگەر ئەزمـوونی بۆلشـەویکەکان بریتیبوو بێت لە پەلاماری ڕاستەوخۆی حیزب بۆسەر دەزگا سەرەکییەکانی دەوڵەت و داگیرکردنـی ئۆرگانەکـانی دەوڵەت، بەبـێ بـوونی هەیـمەنە لەنـاو کۆمەڵگـای مەدەنیدا، ئەوا ئەزموونی مارکسییە ڕۆژئاواییەکـان قسـە لە غیـابی هەلـومەرجێکی مێژوویـی لەو بـابەتە دەکـات. غیـاب و لاوازی کۆمەڵگـای مەدەنـی لە ڕوسـیادا مارکسییە ڕووسەکانی ناچارکرد ڕاسـتەوخۆ پەلامـاری دەزگاکـانی دەوڵەت بـدەن و وەک هەنگاوی یەکەم دەوڵەت و دەزگاکانی کۆنترۆڵبکەن، بەوهیوایەی دواتر لەڕێگای دەوڵەتەوە بگەڕێـنەوە نـاو کۆمەڵگـا و هەیـمەنەی خۆیـان لەسـەرەوەڕا بەسـەر کۆمەڵگادا بسەپێنن. بەڵام لە ئەوروپای ڕۆژئاوادا ئامادەگی کۆمەڵگـایەکی مەدەنـی بەهێـز و خۆڕێکخسـتوو ئەم هەلەی بە مارکسـییە ڕۆژئاواییەکـان نەئەدا. لێـرەوە گرامشی باوەڕی وابوو بۆهاتنە سەر دەسەڵات لە کۆمەڵگاکانی ئەوروپـای ڕۆژئـاوادا حیـزب نابێـت ڕاسـتەوخۆ پەلامـاری دەوڵەت و دەزگاکـانی دەوڵەت بـدات، بەڵکـو دەبێت سـەرەتا هەیـمەنەی خـۆی لەنـاو کۆمەڵگـای مەدەنیـدا پیادەبکـات و دواتـر لەڕێگـای ئەم هەیـمەنەیەوە دەسـەڵاتی سیاسـی بگرێتەدەسـت. بەمانـایەکی دیـکە ئەگەر مارکسـییە ڕوسـەکان لەبەر غیـاب و لاوزی کۆمەڵگـای مەدەنـی لە ڕوسـیادا ناچاربووین "لەسەرەوەڕا" و لەناو دەزگانی دەوڵەتەوە هەوڵی گەیشتن بە دەسەڵاتی سیاسـی و دروسـتکردنی هەیمەنەیـان دابێـت، ئەوا مارکسـییەکانی ڕۆژئـاوا بەهـۆی ئامادەگییەکی بەهێز و بەرفراوانی کۆمەڵگای مەدەنییەوە ئەبێت هەوڵی پەیداکردنی هەیمەنە "لە خوارەوەڕا"، واتە لەناو ئۆرگانە جیاجیاکانی کۆمەڵگای مەدەنیدا بدەن. خـاڵی هەرەسـەرەکی جیـاوازی نێـوان گرامشـییەت و لینینیـزم لەم بۆچـوونەدا ئاشکرادەبێت، گەرچـی هەردوکیـان دەیانەوێـت وەڵامـی ئەو پرسـیارە بـدەنەوە، کە دەپرسێت: چیبکەین، یان چۆن دەسەڵات بگرینەدەست؟

گرامشی ئەڵێت "هەیمەنە میتۆدێکە بۆ خەباتکردن"، ئەم میتۆدەش وەک "ڕێکەوتن لەگەڵ دۆستاندا و ناچارکردنی ناحەزان" وێنادەکات.(١٤) گەر بشپرسین سروشتی ئەو ڕێکەوتنە چییە، کە لەگەڵ دۆستاندا سازدەکرێت؟ گرامشی لەوەڵامدا دەڵێت "سروشتی ئەو ڕێکەوتنە سروشتێکی ئایدیۆلۆژی و کولتوورییە".(١٥). کەواتە هەیمەنە لە جەوهەردا کردەیەکی سیاسی و ئایدیۆلۆژی و کولتوورییە پێشنیاری دونیابینییەک دەکات، کە لەلایەن برێکی زۆری هێزە جیاجیاکانی نێو کۆمەڵگای مەدەنییەوە قبوڵبکرێت. هەیمەنە کۆمەڵێک لێکدانەوە و ڕاڤەکردن و پێناس و بۆچوونە، کە لە فۆرمی کولتور و کاری فیکری و سیاسیدا هێزێک پێشکەشی بە کۆمەڵگای دەکات. کەی کۆمەڵگا قەناعەتی بەو ڕاڤەکردن و بۆچوون و پێناس و لێکدانەوانە هێنا و قبووڵیکرد، ئەمە ئەو هێزە دەکاتە هێزێکی خاوەن هەیمەنە. هەیمەنە بەم مانایە نەخشاندن و ڕەنگڕێژکردنی ڕووبەری ڕۆحی تاک و گروپەکانی ناو کۆمەڵگای مەدەنییە بەو ڕاڤەکردنانەی حیزب، یان ڕۆشنبیرانی حیزب بۆ دونیا و دیاردە و ڕووداوەکانی دەکەن. لێرەوەیە حیزب لەدیدی گرامشیدا بەتەنها کۆمەڵێک دەزگا و ئۆرگانی ڕێکخراو و خاوەن دیسپلینێکی پۆڵایی نییە، وەک لای لینین، بەڵکو بەپلەی یەکەم ڕۆشنبیرە، ڕۆشنبیرێکی دەستەجەمعی. هێزێکە بۆچوون و لێکدانەوە و زمانێکی تایبەت بەرهەمدەهێنێت و دەیەوێت ئەو بۆچوون و لێکدانەوە و زمانە بکات بە زمانی زۆربەی هەرەزۆری کۆمەڵگا. کەی لەمەشدا سەرکەوت وئەم پرۆژەیەی بۆ چووە سەر، ئەودەم دەبێتە هێزێکی خاوەن هەیمەنە و دەتوانێت لەڕێگای هەڵبژاردنەوە دەسەڵات بگرێتەدەست.

بێگومان هەیمەنە وەک ڕێکەوتنێکی ئایدیۆلۆژی لە جەوهەردا ڕێکەوتنی نێوان چەندهێزێکە لەسەر ستراتیژێکی تایبەتی ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا و دەوڵەت و بەڕێوەبردنی پەیوەندیەکانی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگا، ستراتیژێک، کە قازانج و دەسکەوتەکانی ئەو هێزانە دەردەبڕێت و ڕوانینێکی هاوبەشیان بۆ ئایندە

لادروست دەکات. کەواتە هێزە موهەیمەنەکان کۆمەڵێک هێزن لەسەر مەسەلە هەرەگرنگەکانی کۆمەڵگا ڕێککەوتوون و دیدێکیان بەرهەمهێناوە، کە هەموویان قبووڵ کردووە، دیدێک تیایدا هەریەکێک لەو هێزانە بەشێکی گرنگی ویست و ئارەزوو و قازانج و ماناکانی خۆی تێدا دەدۆزێتەوە، گرامشی ئەم کۆمەڵە هێزە لەناوخۆدا ڕێکەوتووە ناودەنێت "بلۆکی مێژوویی". گرامشی بۆئەوەی زیاتر مەبەستەکانی لە چەمکی هەیمەنە ڕوونبکاتەوە جیاوازییەکی بنەڕەتی لەنێوان چەمکی "هەیمەنە" و چەمکی "کۆنترۆڵ" دا دەکات. وەک گوتمان هەیمەنە دەسەڵاتێکە لە ناو کۆمەڵگای مەدەنیدا دروستدەبێت، لەم ڕووەوە گرامشی دەڵێت: "هەیمەنە ئەو شێوەیەی دەسەڵاتە لەناو کۆمەڵگای مەدەنیدا پیادەدەکرێت" (١٦). بەڵام کۆنترۆڵ ئەو شێوەیەی دەسەڵاتە لە ناو دەوڵەتەدا پیادەدەکرێت. ئەم جیاکردنەوەیەی فۆرمەکانی دەسەڵات لەجەوهەردا لەو تێڕوانینە تایبەتەوە هاتوە، کە گرامشی بۆ "سەرخان" ی کۆمەڵگای هەیە. بەباوەڕی گرامشی سەرخانی کۆمەڵگا لەیەک ئاست، یان لە یەک قات دروستنەبووە، وەک زۆربەی مارکسییە تەقلیدییەکان پێیانوایە، بەپێچەوانەوە هەموو سەرخانێک لەدوو ئاست، یان دوو قاتی جیاواز پێکدێت. گرامشی قاتی یەکەمیان ناودەنێت "کۆمەڵگای مەدەنی" و قاتی دوەهەمیشیان "کۆمەڵگای سیاسی"، یان دەوڵەت. بەباوەڕی گرامشی لە نێوان ئەو دوو ئاستەدا، واتە لەنێوان کۆمەڵگای مەدەنی و کۆمەڵگای سیاسیدا، دونیایەک پەیوەندی ئاڵۆز و فرەچەشن هەیە و لەهەریەکێکیاندا، وەک وتمان، فۆرمێکی دیاریکراوی دەسەڵات لەکاردایە. لێرەوە کارکردن لەناو ئاستە جیاکانی سەرخانی کۆمەڵگادا پێویستی بە ستراتیژی جیاجیا هەیە. ئەو ستراتیژەی لە کۆمەڵگای مەدەنیدا وەگەڕدەخرێت، ستراتیژیەتی پەیداکردنی هەیمەنە، جیاوازە لەو ستراتیژەی لە بەرامبەر دەوڵەتدا پیادەدەکرێت، ستراتیژیەتی کۆنترۆڵ. لێرەوە ئەو حیزبەی بیەوێت هەیمەنە پەیدابکات پێویستی بە ستراتیژ و تاکتیکی جیاواز هەیە

لەو حیزبەی ڕاستەوخۆ پەلاماری دەوڵەتبدات و لەشێوەی ئینقیلابێکی لەپڕدا دەسەڵات بگرێتەدەست.

گرامشی لەقسەکردنیدا لەسەر ستراتیژیەتی کاری حیزبی لەکۆمەڵگایەکدا، کە کۆمەڵگای مەدەنی تیایدا بەهێز و پێگەیشتوویێت، جەخت لەوەدەکات، کە حیزب پێویستە لەناو ئاستی یەکەمی سەرخانی کۆمەڵگادا دەستبەکاربێت، واتە حیزب دەبێت لەناو دەزگا جیاجیا و هێزە جیاجیاکانی ناو کۆمەڵگای مەدەنیدا چالاکبێت و لەوێدا بناغەی هەیمەنەیەکی ئایدیۆلۆژی و فیکری و سیاسی دابڕێژێت. بەباوەڕی گرامشی حیزب تا لەوەدا سەرنەکەوێت هەیمەنە لەناو کۆمەڵگای مەدەنیدا پەیدابکات و بۆچوونە ئایدیۆلۆژییەکانی خۆی بکات بە دونیای ڕۆحی کۆمەڵگای مەدەنی، مەحاڵە بتوانێت دەسەڵات بگرێتەدەست و دەسەڵاتی سیاسی بگرێتەدەست. حیزب بۆئەوەی دەسەڵاتداربێت ئەبێت لە خوارەوە و لەناو کۆمەڵگای مەدەنییەوە بەرەو سەرەوە سەربکەوێت، واتە لە هەیمەنەوە بەرەو کۆنترۆڵ، نەک بە پێچەوانەوە وەک بەلشەویەکان لەڕوسیادا ئەنجامیاندا. لەڕاستیدا ئەم خاڵەیە گرامشیەت لە لینینیزم و ئەزموونی مارکسییەکانی ئەوروپای ڕۆژئاوا لە ئەزموونی بەلشەویکەکان جیادەکاتەوە. هەر ئەم خاڵەشە تایبەتمەندییەکانی تیۆرەی دەسەڵات لای گرامشی لە تیۆرە مارکسییە ڕوسەکان جیادەکاتەوە.

دواهەمین خاڵێک بمەوێت ئامـاژەیەکی خێرای بۆبکەم مەسەلەی شوێن و جێی ڕۆشنبیرانە لەناو تیۆرەی گرامشاییانەی دەسەڵاتدا، ڕۆشنبیران شوێنێکی دیار و گرنگیان لە تیۆرەی دەسەڵات لای گرامشی هەیە، ئەم شوێنە گرنگەش وابەستەی ئەو میکانیزمانەی دەسەڵاتە، کە گرامشی ناوی هەیمەنەی لێدەنێت. وەک ئامارەمان پێکرد هەیمەنە لە جەوهەردا کارێکی ڕۆشنبیری و ئایدیۆلۆژی و سیاسییە، هەیمەنە مانای دروستکردنی فەزایەکی فیکری و سیاسی و ڕۆشنبیری و ڕەمزی وا تیایدا بۆچوون و دید و تێزەکانی حیزبێک ببێتە بۆچوون و دیدی بەشی گەورەی

کۆمەڵگای مەدەنی. ئەمکارەش مەحاڵە بەبێ ڕۆڵی گەورە و بەرچاوی ڕۆشنبیران. لە دیدی گرامشیدا ئەوە ڕۆشنبیرانن بەها و ڕەمز و پێناس و زمان و فەزای فیکری و ڕۆشنبیریی دەخولقێنن، ئەوانن دەتوانن بنەما فیکرییەکانی ئەو ڕێکەوتنە کۆمەڵایەتییەی حیزب بۆ گرتنەدەستی دەسەڵات پێویستی پێیەتی، لەئاستی ڕەمزی و فیکری و ڕۆشنبیریدا و لەناو کۆمەڵگای مەدەنیدا بەرهەمبێنن. بەکورتی ئەگەر هەیمەنە "ڕێکەوتنێکی ئایدیۆلۆژی بێت"، ئەوا ئەوەی ئایدیۆلۆژیا بەرهەمدەهێنێت و بەناو خانە جیاجیاکانی کۆمەڵگادا، لە شێواز و فۆرمی جیاوازدا بڵاویاندەکاتەوە، ڕۆشنبیرانن. لێرەوە ئەگەر هەیمەنە ستراتیژی گەیشتنی حیزب بێت بەدەسەڵات، ئەوا ڕۆشنبیران ئەو هێڵی شەمەندەفەرەن، کە حیزب بەرەو پەیداکردنی ئەو هەیمەنەیە دەبەن. ئەگەر گرەوی کۆنترۆڵکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت لە گرەوی پەیداکردنی هەیمەنەدابێت، ئەوا گرەوی هەیمەنە گرەوێکە تەنها بە ڕۆشنبیران دەکرێت. لێرەوە ڕۆڵ و بەشداری ڕۆشنبیران دەبێتە بەشێکی ئۆرگانی تیۆرەی دەسەڵات لای گرامشی. گرامشی تەنانەت حیزب خۆشی وەک ڕۆشنبیرێکی دەستەجەمعی دەبینێت و مامەڵەدەکات. گرامشی ئەم حیزبە ناودەنێت "ئەمیر" بەڵام ئەو ئەمیرە کۆنە نا میکیافیلی باسیدەکرد، بەڵکو "ئەمیرێکی نوێ"، کە ئامرازی پەیداکردنی هەیمەنەیە. لەنێوان ئەمیری میکیافیلی و ئەمیری نوێی گرامشیدا جیاوازی زۆر و گەورە هەن، من لێرەدا تەنها جەخت لەو جیاوازییە بنەڕەتییە دەکەمەوە، کە ئەم دوو شێوە ئەمیرە لەیەکدی جیادەکاتەوە. ئەمیری نوێ لای گرامشی ئەو پیاوە فێڵباز و تاکتیکچی و درۆزنە نییە فێڵ و دووڕوویی و خەڵەتاندن بەشێکبێت لە ستراتیژی مانەوەی لەسەر کورسی دەسەڵات، بەپێچەوانەوە ئەمیری نوێ حیزبێکی سیاسی مۆدێرنە و بەدوای ڕێکەوتنێکی کۆمەڵایەتی بەرفرلواندا دەگەڕێت بتوانێت لەڕێگەیەوە "بلۆکێکی مێژوویی" دروستبکات. نەک هەرئەمە، بەڵکو ئەمیری نوێ بە تەنها ئەو نوخبە وشیارەی

کرێکاران نییە، کە لینینیزم وەک نوخبەی وشیار و بەئاگای کریکاران پێشنیاریدەکات، نوخبەیەک گوایە لەدەرەوەڕا وشیاری چینایەتی بەکرێکاران دەدات و کرێکاران لەدەرەوەڕا بۆ شۆڕشی چینایەتی ئامادەدەکات. ئەمیری نوێ حیزبێکە لەسەر بنەمای "لێکدابڕانی خەڵک لەلایەک و دەوڵەت لەلایەکی دیکە، نوخبە و جمهور دروستنەبووە"" (١٧) ئەمیری نوێ "هەڵگری هەیمەنەیەکی نوێیە، کە بەهێڵێکی ڕاستەوخۆ لە خەڵکەوە بۆ چین و لە چینەوە بۆ حیزب و لە حیزبەوە بۆ دەوڵەت دەڕوات". (١٨)

لە ڕاستیدا ئەو هەیمەنە نوێیەی گرامشی باسیدەکات و ڕۆشنبیران بە بنیادنەر و دروستکەری دەزانێت، ئەو خاڵەیە، کە فۆکۆ وەک ڕۆشنبیرێکی ڕەخنەیی لەدژی کاردەکات. چونکە ئەو شێوە هەیمەنە گشتگیرەی گرامشی باسیدەکات، لە ڕاستیدا هێما بۆ ئەو جۆرە لەدەسەڵات دەکات، کە ناهێڵێت "هەیمەنەی پێچەوانە" دروستببێت و گۆڕانی ڕادیکاڵانە دروستببێت. (١٩) ئەمەش بە پلەی یەکەم مانای کوشتنی ڕۆحیەتی کێبەرکێی کۆمەڵایەتی و سیاسی و سەپاندنی ڕێکەوتنێکی ئایدیۆلۆژی و فۆرمێکی دیاریکراوی ڕیزکردنی هێز و پەیوەندییەکانی دەسەڵات بەسەر شێوە و ڕیزبەستن و ئەگەرەکانی دیکەی دەسەڵاتدا. لێرەوە زۆرن ئەوانەی باوەڕیان وایە لەنێوان تێگەیشتنی گرامشییانەدا بۆ هەیمەنە و لەنێوان دیموکراسییەتدا دابڕانێکی ڕەها هەیە. (٢٠) پێیان وایە هەیمەنە مانای مەرگی دیموکراسییەت دەگەیەنێت، چونکە دیموکراسییەت لەسەر بنەمای بوونی هێزی جیاواز و بیرکردنەوەی جیاواز و تێگەیشتنی جیاوازی ناموهەیمن کاردەکات، یان لانیکەم لەسەر بنەمای بوونی زیاد لە هەیمەنەیەک کاردەکات.

-٤-

## فۆکۆ

بەپێچەوانەی گرامشییەوە پرسیاری فۆکۆ ئەوە نییە چۆن و کێ دەسەڵات بگرێتە دەست، بەڵکو ئەوەیە: دەسەڵات چۆن پیادەدەکرێت؟ لەکوێوە دێت؟ چۆن بەرەنگاری ببینەوە؟ (٢١) هەموو ئەمانەش بەبێ گرنگیدان بە شوناسی ئەو هێزەی دەسەڵات پراکتیک و پیادەدەکات. ئەگەر پرسیاری گرامشی لە دەسەڵات پرسیارێکی سیاسیبێت، ئەوا پرسیاری فۆکۆ تارادەیەکی زۆر پرسیارێکی مێژوویی فەلسەفییە، کێشەی دەسەڵات لای گرامشی کێشەی حوکمکردنی چین، یاخود حیزبێکی سیاسی تایبەتە، بەڵام کێشەی دەسەڵات لای فۆکۆ کێشەی خودی دەسەڵات خۆیەتی بەبێ پەیوەندی ئەو دەسەڵاتە بە هێزێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراوەوە. گرامشی بەهاتنە سەر حوکمی پرۆلیتاریا، یان حیزبی پرۆلیتاریا، کۆتایی بە پرسیاری دەسەڵات دەهێنێت و ئەمانخاتە ناو دونیای وەڵامەکانەوە، بەڵام پرسیاری دەسەڵات لای فۆکۆ پرسیارێکی بێکۆتاییە و هەمیشە ئەوەمان وەبیردەهێنێتەوە بە وەڵامەکانی دەسەڵات و تاکتیک و ستراتیژیەکانی ڕازینەبین.

لەسەرێکی دیکەوە پرسیاری سەرەکی فۆکۆ لەدەسەڵات پرسیاری چۆنیەتی بەرگریکردنە، واتە پرسیاری چۆنیەتی دەربازبوونی تاکەکانە لە تۆڕە فراوان و گشتگیریەکانی دەسەڵات. بەباوەڕی فۆکۆ ناکرێت دەسەڵات بە موڵکی هێزێک لە هێزە کۆمەڵایەتییەکان تێبگەین و وابزانین گروهێک خاوەنیەتی و ئەوانیدی نیانە. دەسەڵات لای فۆکۆ ئەو تۆڕەیە، کە لەناو پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی و مەعریفی تایبەتەوە دێت و خودی ئەو پێکهاتەیە وەک گشتێک دروستکەر و بەکارهێنەر و پارێزەریشین. لێرەوە فۆکۆ بەو وەڵامە سایکۆلۆژی و سیاسی و فیکرییانە ڕازی نییە، کە ئازادی تاکەکان بە خۆشنودییەکی سیاسی و

سایکۆلۆژی دەگۆڕنەوە و بەم بۆنەیەشەوە هەتانێت چاڵی دەستەمۆکردنی ئینسان قووڵتر و قووڵتر دەکەنەوە. بەبۆچوونی فۆکۆ ناکرێت قسە لە یەک شێوازی سەرەکی دەسەڵات لە کۆمەڵگایەکدا بکەین، هەموو کۆمەڵگایەک شێوازی جیاجیای دەسەڵاتی تێدایە. ئەو دەسەڵاتەی لای پزیشکێکی دەروونی لە کاردایە، جیاوازە لەو دەسەڵاتەی مامۆستایەکی زانکۆ هەیەتی، دەسەڵاتی ناو خەستەخانەکان جیاوازە لە دەسەڵاتی ناو دەزگاکانی داد و داوەریکردن، دەسەڵات لەناو لەشکردا ئەو دەسەڵاتە نییە لەناو ڕۆژنامەنووساندا هەیە، لێرەوە ناکرێت باس لە دەسەڵات وەک جەوهەرێک بکەین، جەوهەرێک لەهەموو شوێنێکدا بە هەمانشێوە دەرکەوێت و بەرجەستەبێت. سەرەڕای ئەمە مۆدێلی دەسەڵات لای فۆکۆ مۆدێلێکی هەرەمی نییە لە سەرەوە بەرەو خوار دابەزێت، بەڵکو مۆدێلێکی شەبەکەییە و سروشتێکی گشتگیری هەیە و لەهەمووشوێنێکدا ئامادەیە.

فۆکۆ باوەڕی وایە بەرگری بەرامبەر و ململانێ لەگەڵ دەسەڵاتدا بەهاتنە سەر حوکمی هیچ هێز و چینێکی کۆمەڵایەتی کۆتایی نایەت، ستراتیژەکانی دەسەڵات وابەستەی ستراتیژی چینەکان نیین، دەسەڵات خاوەنی نییە و ڕۆژانە لە هەموو ئاراستەکانەوە و لە شوێنە جیاجیاکانەوە ئینسان ڕوویەڕوویان دەبێتەوە. پێشنیاری فۆکۆ بۆ ئێمە ئەوەیە دەسەڵاتمان خۆشنەوێت و هەوڵدەین بەردەوام پانتاییەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئەخلاقی بۆخۆمان بنیادبنێین، کە تیایدا دەسەڵات نەتوانێت بە ئاسانی ستراتیژەکانی خۆی بەسەرماندا بسەپێنێت و پیادەبکات. لێرەوە بەرگری نەک تەنها کارێکی پێویستە، بەڵکو کارێکی ڕۆژانە و بەردەوامە و لە شوێنی جیاوازدا فۆرم و ناوەڕۆکی جیاواز دەگرێتەخۆی.

فۆکۆ کاریگەرییەکانی دەسەڵات تەنها لەڕەهەندە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی دەسەڵاتدا نابینێت، بەباوەڕی ئەو خاڵی هەرەسەرەکی ئیشکردن و کاریگەریی دەسەڵات لەوەدایە دەستنیشانی ئەوە دەکات "خود" ی ئینسان چ

فۆرمێـک وەربگرێـت و چـۆن دروسـتببێت. بەمانـایەکی دیـکە کـاریگەری گەورەی دەســـەڵات تەنهـــا لەوەدا نیـــیە، کە پـــلانە ئـــابووری و کۆمەڵایەتییەکـــان دەستنیشاندەکات، بەڵکو لەوەشدایە، کە فۆرمەکانی بەتاکەکەسبوون دادەڕێژێـت و تاڕادەیەکی زۆر ئینسان بەوە ناچاردەکات ئەو فۆرمانە قبوڵبکات. بەباوەڕی فۆکـۆ دەسـەڵات ئەوەنـدە کـاریگەرە دەتوانێـت تـا ڕادەیەکـی زۆر کەسـایەتی تاکەکـان دەستنیشـانبکات و چوارچێـوەیەک بـۆ دونیـای ڕۆحـی و سـایکۆلۆژی و تەنـانەت شێوەی جەستەشیان، دابنێت. بەڵام ئەم دەستنیشانکردنانەی دەسەڵات بۆ ڕۆح و جەسـتەی تـاکەکەس هەمیشـە پشتئەسـتوور نیـیە بە تەکنیکـی چەپانـدن و سەرکوتکردن، بەپێچەوانەوە دەسەڵات تـاڕادەیەکی زۆر بەرهەمهێنیشـە، دەسـەڵات تەنها ئارەزوو و ویستەکان ناچەپێنێت، بەڵکـو تـاڕادەیەکی زۆر دروسـتیاندەکات و بەرهەمیشـیان دەهێنێـت. لەم حـاڵەدا فۆکـۆ خـۆی لەهەمـوو کەلەپـوری فرۆیـد و قوتابخـــانەی شـــیکردنەوەی دەروونـــیش جیادەکـــاتەوە، تەنـــانەت لە چـــاپە مارکۆزیەکەیدا، کە ڕۆژگارێکی درێژ لەناو قوتابخانەی فرانکفۆرتدا وەک تاقە تیۆرەی ڕەخنەگـرانە لە کۆمەڵگـای مـۆدێرن مـامەڵەی لەگەڵـدا دەکـرا. لێـرەوە فۆکـۆ بـۆ بەرەنگاربوونەوەی دەسەڵات پێشنیاری ئەوە دەکات بەگژ ئەو شێواز و تەکنیکانەی بەرهەمهێنـــانی "خـــود" دا بچیـــنەوە، کە شـــێوازە نالەبـــار و دەســـتەمۆ و تەسلیمبووەکانی "خود" بەرهەمدەهێنێت. ئەو شـێوازانەی دەسـەڵات گەمـارۆدەمین، کە ژیان بە کارگێڕی و دونیـایەکی بیرۆکراسـی یەکسـاندەکات. بە کـورتی بەرگـری دەبێت بەرگریکردن بێت لەپێناوی بەرهەمهێنانی "خـود" ی ئـازاد، خودێـک خـۆی بتوانێت و بەشداربێت لە دروستکردنی خۆیدا.

مـن لە تیـۆرەی دەسـەڵاتدا لای فۆکـۆ هەوڵـدەدەم زیـاتر مـامەڵە لەگەڵ ئەو دابەشبوونانەدا بکەم، کە فۆکۆ بۆ شێوەکانی دەسەڵات و ستراتیژەکانی دەسەڵاتی دەیانکـات. مەبەسـتم لەو شـێوانەش ئەو دوو سـتراتیژەی دەسـەڵاتە، کە فۆکـۆ

ناوياندەنێت، ستراتیژی سزا و ستراتیژی کۆنترۆڵ، یان دیسپلینکردن.(٢٢) ئەم دوو فـۆرمەی دەسـەلات، واتە دەسـەلاتێک، کە سزابەخشـە و دەسـەلاتێک، کە دیسپلینکەرە، بە دوو فۆرمی جیاوازی کۆمەڵگاوە گرێدەدات: کۆمەڵگای تەقلیدی و کۆمەڵگای مۆدێرن. لە کۆمەڵگای تەقلیدیدا دەسەلات ڕاستەوخۆ لەسەر سزادانی جەستە کاردەکات و شانۆ بۆ سزاکان دروستدەکات، واتە سزادانەکان نیشانی کۆمەڵگا دەدات. بەلام لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا دەسەلات لەباتی سزا هەوڵدەدات دونیای ڕۆحی ئینسانەکان لەناوەوە ڕەنگرێژکات و لەناوەوەڕا دیسپلینیان بکات. لێرەوە مادامەکی وەک فۆکۆ دەڵێت: "دەسەلات کاریگەری هەیە بۆسەر شێوەی کەسایەتی تاکەکەسەکان" (٢٣) کەواتە ئەو دوو شێوازەی دەسەلات دوو شێوازی جیاوازی کەسایەتی و دوو جۆری جیای فەردانییەت دەخولقێنن. لەڕاستیدا ئەم دوو ستراتیژەی دەسەلات دەبنە دوو کارخانەی گەورەی بەرهەمهێنانی "خود"، بەلام خودی جیاواز لەیەکتری. دەسەلاتی سزادەر دەخوازێت ئەو فۆرمانەی "خود" بەرهەمبهێنێت، کە ترساو و بچووک و سنوردارن، لەکاتێکدا دەسەلاتی کۆنترۆڵکەر دەخوازێت ئەو شێوانەی تری خود بەرهەمدێنێت، کە پێویست ناکات لەدەرەوەڕا و لەڕێی ترس و سزا و تۆقاندنەوە دیسپلینبکرێن، بەڵکو خۆیان لەناوەوەی خۆیاندا میکانیزمێکی تایبەتی کۆنترۆڵ و دیسپلینکردنیان بەرهەمهێنابێت و زیاتر لەسەر بیرۆکەی بەرپرسیاربوون بەرامبەر بەو میکانیزمانە کاریکەن. (٢٤) فۆکۆ دەڵێت لە یەکەمیانـدا خوێنێـک بەرهەمـدێت، کە پـڕۆژە و بـابەتی مەرگە، لەکاتێکـدا لە دووهەمیاندا خوێنێک دروستدەکرێت، کە بەرهەمهێن و ژیاندۆستە. بە مانایەکی دیکە دەسەلاتی سزادەر لەسەر هەڕەشەی مەرگ کاردەکات و ئەم هەڕەشەیە ئامرازی سەرەکی پاراستنی سەروەری دەسەلاتە، لەکاتێکدا ئەوەی سەروەری دەسەلات لە دۆخی دەسەلاتی دیسپلینکەردا مەیسەردەکات ئەم هەڕەشەیە نییە، بەڵکو مژدە و میکانیزم و پراکتیکی گەورەکردنی هەرچی زیاتری ڕووبەرەکانی ژیانە، بەلام

ژیانێکی کۆنترۆڵ و دیسپلینکرلو. رەمزی سەرەکی دەسەڵاتی سزادەر کەسی پادشا، یان ئەمیر خۆیەتی، کە مافی کوشتنی ئینسانەکانی هەیە، لەکاتێکدا ڕەمزی سەرەکی دەسەڵاتی دیسپلینکەر و چاودێریکەر دەوڵەتی مۆدێرنە، کە لەڕێگای دەزگا زۆر و فرەجۆرەکانییەوە دەستدەخاتە ناو وردوبرشتی ژیانی ئینسان و دەخوازێت لەناوەوەڕا ئەو ئینسانە وا قورمیش بکات و وا بەرنامەڕێژیبکات، کە خۆی خۆی دیسپلینبکات و پێویستی بەهەڕەشەی مەرگ نەمێنێت. دەشێت لێرەدا لەگەڵ داریوشی ڕیجالیدا یەکبگرینەوە و ئەو بۆچوونانەی سەرەوەی فۆکۆ بەمجۆرە کورتبکەینەوە: "چەندە کۆمەڵگاکان پرۆسەی مۆدێرنیزە پیادەبکەن، ئەوەندە ستراتیژی سزادان ئەبێتە شتێکی ناجۆر و خراپ بۆ پراکتیکی دەسەڵات".(٢٥). بەکورتی و بەسادەیی فۆکۆ پێیوایە دەسەڵاتی تەقلیدی دەسەڵاتێکی سزابەخشە و لەسەر سزای جەستەیی ئینسانەکان کاردەکات، لەکاتێکدا دەسەڵاتی مۆدێرن نەک نایەوێت سزای جەستەکان بدات، بەڵکو دەیەوێت ئەو جەستانە بەهێز و چالاک و فرەتوانا بکات، بەڵام لەناو چوارچێوەیەکی کۆنترۆڵ و دیسپلینکراودا و لەڕێگای دەزگا زۆر و گەورەکانی دەوڵەتی مۆدێرنەوە.

ئەو دۆخی دیسپلینکردنە ناوەکییەی ئینسانە لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا وا لە فۆکۆ دەکات بڵێت نابێت گواستنەوە لە سزاوە بۆ کۆنترۆڵ و دیسپلین، وەک ڕیفۆرمێکی ئەخلاقی و ئینسانی ببینین، ڕیفۆرمی ئەخلاقی بەومانایەی گوایە ئەم گۆڕانە لە ستراتیژییەکانی دەسەڵاتدا وەک بەرهەمی پێشکەوتنێکی ئەخلاقیی و بەهێزبوونی ڕۆحی هیومانیستی، یان ئینساندۆستی، ببینین وەک فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری ڕایانوابوو. بەپێچەوانەوە ئەم گۆڕانە لە ستراتیژییەکانی دەسەڵاتدا گۆڕانێکە وابەستەی لەدایکبوونی کۆمەڵێک توانا و تەکنیکی نوێیە، کە هاتنی کۆمەڵگای مۆدێرن لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێت. کۆمەڵگای مۆدێرن هەلی ئەوەی بۆ دەسەڵات دەخولقێنێت، کە بتوانێت "شێوازێکی چالاکانەتر و کاریگەرتری حوکمکردن بێنێتە

کایەوە" (٢٦)، کە پێویستی بە سزادانی جەستە نەمێنێت، لەباتی سزا بتوانێت لەناوەڕا ئینسانەکان ئاراستە و کۆنترۆڵبکات. هیومانیستەکان ئەم گۆڕانە لە سزاوە بەرەو کۆنترۆڵ بە "پێشکەوتنی" ئەخلاقییەوە دەبەستنەوە، لەکاتێکدا فۆکۆ ئەم گواستنەوەیە بە دۆزینەوەی ئامراز و تەکنیکی چالاکتری دیسپلینکردنەوە دەبەستێتەوە، نەک هەر ئەمە بەڵکو فۆکۆ هەموو گواستنەوەکە بە چوارچێوەی لەدایکبوونی پرۆژەی دیسپلینکردنی ئینسان لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا گرێدەدات. (٢٧) بۆیە بەلای فۆکۆوە ئەم گۆڕانە لە ستراتیژییەتی دەسەڵاتدا کۆتاییهاتنی دەسەڵات و هاتنەکایەی سەردەمانی ئەخلاق نییە، بەڵکو لەڕاستیدا دەربڕی لەدایکبوونی ڕۆژگارێکی دیکە و ستراتیژێکی دیکەی دەسەڵاتە. (٢٨) گۆڕانەکە دەربڕی لەدایکبوونی ڕۆح و عەقڵیەتێکی ئینساندۆستی هیومانیستی نییە، بەڵکو دەربڕی لەدایکبوونی جۆرێکی نوێ و ستراتیژێکی نوێی دەسەڵاتە.

خاڵی سەرەکی ئەو بۆچوونەی فۆکۆ ئەوەیە دەسەڵات و ستراتیژەکانی دەسەڵات نەبەستینەوە بە ئەخلاق و گۆڕانکارییە ئەخلاقییەکانەوە. وەهمێکی گەورەیە وابزانین ڕووە خراپ و ڕووە باشەکانی دەسەڵات بەرهەمی بەرخوردی ئەخلاقی و پێشکەوتنی ئەخلاقن، یاخود پێمان وابێت بۆ گۆڕینی شێوازەکانی دەسەڵات ئەوە بەسە، کە سیاسیەکی 'بێئەخلاق' لابەین و لەشوێنی ئەودا سیاسیەکی 'بەئەخلاق' دابنێین. فۆکۆ دەیەوێت بڵێت دەسەڵات لە سەرزەمینی ئەخلاقەوە هەڵناقوڵێت و بۆ گۆڕینیشی پێویستمان بە گۆڕینی پەیوەندییەکانی دەسەڵات و گۆڕینی سیستمی بەرهەمهێنانی هەقیقەت و گۆڕینی پەیوەندییەکانی نێوان دەسەڵات و مەعریفەیە، نەک گۆڕانێکی ئەخلاقی بەتەنها.

بەباوەڕی فۆکۆ گواستنەوە لە سزاوە بۆ کۆنترۆڵ، لە ئازاردان و تێکشکانی جەستەوە بۆ دیسپلینکردنی سایکۆلۆژی و ڕۆحی، لەو ساتەوەختە مێژووییەدا هاتەکایەوە، کە کۆمەڵگا مۆدێرنەکان هەلی ئەوەیان بۆ ڕەخسا لەباتی مەقسەلە

بەدەیان دەزگای دیسپلین و کۆنترۆڵی نوێ بەرهەمبێنن، وەک بەندیخانە، لەشکر، دەزگاکانی پۆلیس، دروستکردنی کارخانە، قوتابخانە، سیستمی تەندروستی تازە و چەندان دەزگای دیکەی کۆنترۆڵ و دیسپلینکردنی ئینسان. لەپاڵ دروستبوونی ئەم دەزگایانەدا گۆڕانێکی گەورە لە مەعریفەشدا دێتەکایەوە، کە تیایدا دەروونناس و پزیشکە نەفسییەکان شوێنی جەلاد و قامچی وەشێنەکان دەگرنەوە، مامۆستا لە پۆلدا شوێنی مەلای دینی دەگرێتەوە، بەکورتی مەعریفە لە هەڕەشە و گوڕەشەکانی ئاینەوە دەگواسترێتەوە بۆ میتۆدی نوێی "زانستە کۆمەڵایەتی و ئینسانییەکان". لە دیدی فۆکۆدا ئەم زانستانە ئینسان دەکەن بابەتی تێبینیکردن و تۆژینەوە و ناسین و بەمەش هەلی ئەوە بە دەسەڵات دەبەخشن بتوانێت دەرەنجامی لێکۆڵینەوە زانستییەکان بەکاربهێنێت بۆ ئەوەی بتوانێت لە جۆری بیرکردنەوە و ڕەوش و هەڵسوکەوتی تاکەکەسەکان تێبگات و لەوێشەوە ستراتیژی تایبەتی دیسپلین و کۆنترۆڵکردنیان دابڕێژێت. ئەم ڕۆڵە دیسپلینکەر و کۆنترۆڵکەرەی زانستە ئینسانییەکانە وا لە فۆکۆ دەکات بەگژ مێژووی سایکۆلۆژیادا بچێتەوە و بەوە تاوانباریکبات، کە ڕۆڵێکی گەورەی لە دیسپلینکردن و دەستەمۆکردنی ئینساندا بینیوە.

بەباوەڕی فۆکۆ گرنگترین سیفەتی کۆمەڵگاکانی بەر لە مۆدێرنە بریتیە لە غیابی ئەو تەکنیکە تایبەتیانەی دیسپلین و کۆنترۆڵکردن، کە ئامازەمان پێکردن، ئەمەیە وادەکات لەو کۆمەڵگایانەدا دەسەڵات ڕاستەوخۆ پەلاماری جەستەکان بدات و ڕووی لەسزای جەستەیی ئینسانەکان بێت. بەڵام کاتێک فۆکۆ لەسەردەمی شۆڕشی ئێراندا و لەسەر دلواکاری ڕۆژنامەیەکی ئیتالی ئەچێت بۆ ئێران بەچاوی خۆی لەنزیکەوە ئەو ڕاستییە دەبینێت چۆن سزا لەناو ڕەوتی مۆدێرنەدا و لەپاڵ ئامادەگی سیستمی پۆلیس و لەشکر و بەندیخانە و لەپاڵ ئامادەگی پزیشکە سایکۆلۆژییەکان مامۆستاکانی سۆسیۆلۆژیای هاوچەرخدا ڕوودەدات. ئەگەر ئێران

وڵاتێکبێت ئەو ڕاستییەی سەلماندبێت، کە دەشێت سزا لە هەناوی ستراتیژیەتی دیسپلین و کۆنترۆڵدا پیادە بکرێت، ئەوا درلوسێکانی ئێران و زۆر شوێنی دیکەش ئەم ڕاستییە بۆ چەندەمینجار دەسەلەمێنن. لەم جۆرە کۆمەڵگایانەدا سزا دەبێتە ڕەهەندێک لە ڕەهەندەکانی کارکردنی کۆنترۆڵ خۆی، تەکنیکەکانی سزا دێن و هێزێکی ئەفسانەیی و تۆقێنەر دەبەخشنە تەکنیکەکانی دیسپلین و کۆنترۆڵکردن. لەڕێگای ناونوسکردنێکی بەردەوامەوە لەناو دەزگا جیاجیاکانی چاودێرییەوە، لە قوتابخانە و لەشکر و کارخانە و بنکە حیزبیەکان و لیستی ناوی دانیشتوان لای موختاری گەڕەکەکان و ئەفسەرەکانی ئاسایش و یەکێتییە ساختەکانی قوتابیان و مامۆستایان و کرێکارانەوە بیگرە، تا بە دەزگاکانی ئاسایش و دەزگا پۆلیسییەکانی دیکە دەگات، مرۆڤ لەم جۆرە کۆمەڵگایانەی لای ئێمەدا نووقمە لەناو پرۆسەی چاودێریکردنێکی سەرتاسەریدا. ئەوەی دەمەوێت بیڵێم ئەوەیە ئینسانی ئەم کۆمەڵگایانەی لای ئێمە لەپاڵ ئەم هەموو تەکنیکەی چاودێری و دیسپلینکردندا، کە پرۆسەی مۆدێرنبوونەوە مەیسەریاندەکات، ئینجا لە گۆڕەپانە گشتییەکانیشدا و بەدیارچاوی خەڵکەوە، لە دیمەنێکی شانۆسازدا، گولەباران دەکرێن و دوای مەرگیش سوکایەتی بە لاشەکانیان دەکرێت. دوای ئەو هەموو تولنا تۆقێنەرانەی دیسپلینکردن ئینجا لەناوەڕاستی فولکەکاندا بە سلنگا هەڵدەواسرێن و خەڵک کۆدەکرێتەوە بۆ تفلێکردنیان. ئەمە جگە لەوەی سزا لەم کۆمەڵگایانەدا زۆرجار بە دیمەنی شانۆیی و ئاشکرای بەریەریانەی دیکە کۆتایی بە شانۆی کوشتنەکان دەهێنێت، وەک ئەوەی کوژراوەکان بە پشتی موسەلەحەکاندا هەڵواسرێن و بەناو شەقامەکاندا بۆ ترساندنی خەڵک ڕابکێشرێن. ئەزموونی بەعس لە عێراقدا ئەرشیفێکی گەورەی ئەم گەمەی ترساندن و سوکایەتیکردنەیە بە ئینسان، لەهەمانکاتیشدا ئەزموونێکی نموونەیی تێکەڵکردنی هەمەجیبیانەی ستراتیژیەتی سزا و ستراتیژیەتی کۆنترۆڵ و دیسپلینە بەیەکتری. بەمانایەکی دیکە دەسەڵات لەو

ناوچەیەی ئێمەدا هەم بە تەکنیکە بەربرییەکانی دەسەڵاتی سزابەخش و هەم بەتەکنیکە ترسناکەکانی کۆنترۆڵ و دیسپلینکردنی ئینسان کاردەکات.
لە فەسڵی پێنجەمی کتێبی "مێژووی سێکسوالیەت" دا فۆکۆ لەژێر ناونیشانی "مافی مەرگ و دەسەڵات بەسەر ژیاندا" هەمان ئەو دوو ستراتیژەی دەسەڵات جارێکی دیکە باسدەکاتەوە، بەڵام ئەمجارەیان لە دۆخێکی کۆنکریت تردا. فۆکۆ ئەڵێت دەسەڵاتی کۆن زیاتر لەسەر "مافی کوشتن، یان مەرگ" بنیادنرابوو. بەڵام دەسەڵاتی مۆدێرن دەسەڵاتێکە تابتوانێت مەرگ دووردەخاتەوە و لەباتی هەڕەشەی مەرگ بکات "ژیان ڕێکدەخات" (٢٩)، کۆمەڵێک هێز و توانا لەناو ئینساندا دروستدەکات، کە "سوودبەخشن" و هێزەکانی ناو ئینسان "بەردەوام گەشەپێدەدەن نەک سەرنگونیان بکەن". (٣٠) لێرەوە مەرگ لەبەردەم دەسەڵاتی نوێدا تاقە هێزێکە، یان یەکێکە لەو هێزانەی، کە ناتوانێت کۆنترۆڵ، یان دیسپلینیبکات، مەرگ لەم دۆخەدا تەحەدایە بۆ دەسەڵاتی مۆدێرن، نەک ستراتیژی کارکردنیبێت، تەحەدایەک هێز و توانای دیسپلین و کۆنترۆڵکردنی ئەم دەسەڵاتە مۆدێرنە دەخاتە ژێر گومانەوە و سنوورداربوونی نیشاندەدات. مەرگ ئەو سنوورەیە کۆتایی بە تواناکانی دەسەڵاتی مۆدێرن دەهێنێت، توانا سنوور بۆکێشراوەکانی ئەم دەسەڵاتە لە پاراستن و ئۆرگانیزەکردنی ژیاندا دەردەخات. لێرەدا مەرگ دەسەڵات لەوە ئاگادار دەکاتەوە، کە هێشتا ئامادەیە و دەتوانێت ژیان لەو توانا سوودبەخشانە بدات، کە جەستە هەڵگریەتی و دەسەڵاتی مۆدێرن نەک نایەوێت تێکیانبشکێنێت، بەڵکو دەخوازێت گەورەیانبکات. وەک دەبینین مەرگ لەم دۆخەدا تەحەدایە بۆ هێز و تواناکانی دەسەڵات لە ئیدارەدانی ژیان و پاراستنیدا، نەک تەحەدابێت بۆ ڕەوایەتی ئەو دەسەڵاتە. ئەمەش تەواو پێچەوانەی هەڵوێست و ویستی دەسەڵاتی کۆنە لەبەردەم مەرگدا. بۆ دەسەڵاتی کۆن مەرگ ئامرازێکە بۆ سەپاندنی ڕەوایەتی، مافی کوشتن یەکێکە لە مافە سەرەکییەکانی پاشا بۆ

سەرکوتکردن و دامرکاندنەوەی یاخیگەران، بۆ گەڕاندنەوەی هەیبەت بۆ دەسەڵات.
لەکاتێکدا دەسەڵات لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا تابۆی دەکرێت مردن کەنارگیر و دوورەخاتەوە و لەباتی کوشتن هەوڵدەدات ئینسانی بەهێز و چالاک، بەڵام کۆنترۆڵ و دیسپلینکراو بەرهەمبهێنێت. لێرەوە خودکوژی لە کۆمەڵگای تەقلیدیدا وەک دەستدرێژیکرن بۆسەر مافی پادشا، یان ئەمیر وێنەدەکرێت، چونکە مافی کوشتن تەنها مافی پادشایە و کەسیتر مافی ئەوەی نییە خۆی بڕیاری مەرگی خۆی بدات. لەم کۆمەڵگایەدا مەرگ ڕاستەوخۆ بەستراوەتەوە بە مەسەلەی ڕەوایەتی دەسەڵاتەوە. بەڵام لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا خودکوژی نەک دەستدرێژیکرن نییە بۆسەر هیچ مافێک، بەتایبەتی مافی دەسەڵاتداران، بەڵکو لە جەوهەردا هێمای فەشەلی دەسەڵاتە لە پاراستنی ژیان خۆیدا، کاری دەسەڵاتی مۆدێرن پاراستنی ژیانە، خودکوژی مانای ئەوەی ئەو دەسەڵاتە نەیتوانیوە ژیان بپارێزێت.
بەڵام بۆ پاراستنی ژیان دەسەڵاتی مۆدێرن پێویستی بە ناسین و تێگەیشتنی مەرگ و خودکوژی هەیە، لێرەوە مەرگ لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا بۆتە بابەتێکی سۆسیۆلۆژی (٣١)، نەک بابەتێک شەرعیەتی سیاسی لەسەر بنیادبنرێت.
بەباوەڕی فۆکۆ گواستنەوە لەسزاوە بەرەو کۆنترۆڵ لە جەوهەردا گواستنەوەیە لە "ئابووری زەرەرەوە" بۆ "ئابووری قازانج"، گواستنەوەیە لە کۆمەڵگای بەرلەسەرمایەداریەوە بۆ کۆمەڵگای سەرمایەداری. ئەم خاڵە، وەک ئاشکرایە، فۆکۆ لە مارکس نزیکدەکاتەوە.

-٥-

## بۆردیۆ

بە باوەڕی هەندێک نووسەر تیۆرەی دەسەڵات لای بۆردیۆ تەولوکەری ئەو کەموکوڕییانەیە، کە تیۆرەی دەسەڵات لای فۆکۆ هەڵگریەتی، ئەم بۆچوونە پێیوایە فۆکۆ لە دوو ئاستدا دەسەڵات شیدەکاتەوە: ئاستی تاکەکەسی و ئاستی دەزگاکان. بەڵام کێشەی سەرەکی ئەم شیکردنەوەیە لەوەدایە نەیتوانیوە ئەو دوو ئاستە بەیەکەوە گرێدات.(٣١) ئەم دیدە ڕەخنەییە پێیوایە دەشێت ئەم کەموکوڕییەی تیۆرەی دەسەڵات لای فۆکۆ لە ڕێگای بۆچوونەکانی بۆردیۆوە دەربارەی "دەسەڵاتی ڕەمزی" پڕبکرێتەوە. بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی فۆکۆ لە نێوان تاکەکەس و دەزگاکان بەجێیدەهێڵێت، ئەم بۆچوونە پێیوایە، بۆردیۆ کاریگەرەییەکانی دەسەڵات لەسەر جەستەوە دەگوازێتەوە بۆسەر "هەبیتۆس"، بەبۆچوونی بۆردیۆ دەسەڵاتی مۆدێرن دەسەڵاتێکی ئەبستراکتە و وەک هێزێکی بەرجەستە و مادی دەرناکەوێت، بەڵکو ڕاستەوخۆ لەسەر هەبیتوس کاردەکات و لەڕێگای ئەم کارەشیەوە تاکەکان بە دەزگاکانەوە گرێدەدات.

تێگەیشتن لە تیۆرەی دەسەڵاتی ڕەمزی لای بۆردیۆ کارێکی مەحاڵە بەبێ تێگەیشتن لە بەشێکی زۆری سۆسیۆلۆژیای بۆردیۆ و کۆی ئەو زارەوە و چەمکە جۆریەجۆرانەی لە کارەکانی بۆردیۆدا بەکارهاتون. بۆنموونە زەحمەتە بتوانین بەبێ ناسینی چەمکەکانی "کایە"، "سەرمایە"، "میتا سەرمایە"، "هەبیتۆس"، "توندوتیژی ڕەمزی" و "سەرمایەی ڕەمزی" لە مەبەستەکانی بۆردیۆ لە دەسەڵاتی ڕەمزی بگەین. هەروەها زەحمەتە لە سۆسیۆلۆژیای بۆردیۆ وەک گشتێک تێبگەین بەبێ تێگەیشتن لەو شوێن و جێیەی ئەم سۆسیۆلۆژیایە لەنێوان "بونیادگەری" و "فەلسەفەی ئاگایی"دا داگیریدەکات. لێرەدا هەوڵدەدەم زۆر بە کورتی لە بەشێک

لەم مەسەلانە بدوێم.

بەبۆچوونی بۆردیۆ خەسڵەتی سەرەکی دەسەڵاتی مۆدێرن خەسڵەتی ڕەمزی بوونیەتی. (٣٢) ئەم خەسڵەتەش مانای ئەوەی دەسەڵاتی مۆدێرن هەوڵی ئەوە دەدات ئامادەگی فیزیاییانەی خۆی داپۆشێت و ڕووکارە بەرچاوەکانی بشارێتەوە. بەڕەمزیکردنی دەسەڵات مانای نابیناکردنی دەسەڵات و پیشاندانی وەک بەڵگەنەویست و پێدراوێکی لۆژیکی و کولتوری. بێگومان مەسەلەی خۆداپۆشینی دەسەڵات بە ڕەمز مانای نەمانی دەسەڵات نییە، بەڵکو لە جەوهەردا فێڵێکە لە فێڵەکانی دەسەڵات و تاکتیکێکە لە تاکتیکەکانی خۆپاراستنی خۆی. بۆردیۆ، کە ئەڵێت دەسەڵاتی مۆدێرن خەسڵەتێکی ڕەمزی هەیە، دەیەوێت بڵێت ئەم شێوە دەسەڵاتە نایەوێت خۆی وەک دەسەڵات نیشانبدات، بەڵکو دەیەوێت خۆی وەک ڕاستی، وەک یاسا، وەک بەڵگەنەویست و وەک بوونێک نیشانبدات نەکرێت پرسیارلێبکرێت. لێرەوە دەسەڵات هەوڵدەدات بە بەردەوامی بەرجەستەبوونە ماتریالییەکانی خۆی بشارێتەوە و کۆمەڵێک ڕەمز دروستبکات خۆی لەناویاندا بشارێتەوە. بۆردیۆ باوەڕی وایە دەسەڵات کاتێک ئەتوانێت وەک دەسەڵاتێکی دیسپلینکەر لەسەر جەستە کاربکات، کە پێشوەخت خۆیکردبێت بە دەسەڵاتێکی ڕەمزی.، کە دەسەڵات دەشبێت بە دەسەڵاتێکی ڕەمزی، ئەوکات سنووری جەستە بەجێدەهێڵێت و دەپەڕێتەوە بۆ سەرزەمینی "هەبیتوس". بە باوەڕی ڕەخنەگران ئەم ڕەهەندە ڕەمزییەی دەسەڵاتە فۆکۆ نایبینێت و گرنگیپێنادات. فۆکۆ بەردەوام خەریکی لێکۆڵینەوەیەکی ئارکیۆلۆژیانەی دەسەڵاتە لەناو دەزگاکاندا، هەرچی بۆردیۆیە ئەو "نایەکسانییە بونیادییانە ئەدۆزێتەوە، کە خۆیان لە ڕەهەندە ڕەمزییەکانی دەسەڵاتدا شاردۆتەوە". (٣٣) بێگومان بۆردیۆ و فۆکۆ لەوخاڵەدا یەکن، کە دەسەڵاتی مۆدێرن دەسەڵاتێکی بەربڵاوە و لە هەموو ئاراستە و ئاستا جیاوازەکانەوە دێت، هەردووکیان لەسەر ئەوە تەبان ئەم دەسەڵاتە دەسەڵاتێکی

لۆکاڵییە و بەبێسێنتەرێکی نیاریکراو کاردەکات و قورساییە فیزیاییەکانی خۆی گۆڕیوە بۆ کۆمەڵێک تەکنیکی چاودێریکردنی بیرۆکراسییانە. بەڵام بۆردیۆ لەوێدا لە فۆکۆ جیادەبێتەوە، کە پێیوایە بیرۆکراسیەتی نوێ چاودێری ڕەوشت دەکات نەک جەستە. (٣٤)

دەسەڵات لای بۆردیۆ هەمیشە لەناو کایەکاندا پیادەدەکرێت، بەبێ "کایە" دەسەڵات بوونینییە، لە دیدی بۆردیۆدا ململانێ و کێشەکانی ناو کایەکانە دەسەڵات بەرهەمدێنێت. بەڵام داخۆ "کایە" چییە و چ مانایەکی لە سۆسیۆلۆژیای ئەم کۆمەڵناسە گەورەیەدا هەیە؟ بۆردیۆ کایە بەمجۆرە پێناسدەکات: "تۆڕێک، یان پێکهاتەیەکە لە پەیوەندی بابەتی لەنێوان کۆمەڵێک مەوقیعی کۆمەڵایەتیدا". (٣٥) مەبەست لە "مەوقیعی کۆمەڵایەتی" ئەو شوێن و جێگە کۆمەڵایەتییە جیاوازانەیە، کە تاکەکەس و گروپەکان لە کۆمەڵگادا هەیانە و تارەدەیەکیش ناکۆک و ناتەبان لەگەڵ شوێن و جێی کۆمەڵایەتی تاک و گروهەکانی دیکەدا. بۆنموونە دەکرێت کۆمەڵگا بۆ چەندان کایەی جیاواز دابەشبکەین لەوانە کایەی ئابوری، کایەی سیاسەت، کایەی کولتور، کایەی میدیا، کایەی وەرزش، کایەی سەربازی هتد... لەناو هەریەکێک لەم کایانەدا هێزی ناتەبا و ململانێکەر و شێوازی جیاوازی کارپێکەوەبیش هەیە. کەواتە "کایە" بریتی نییە لە ڕووبەر، یان ناوەندێکی کۆمەڵایەتی هاوئاهەنگ و بێناکۆکی و تەبا، بەڵکو سەرزەمینی ململانێیەکی بەردەوامە لەنێوان گەمەکەرە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکانی ناو کایەکەدا. ئەوەی لەناو کایەکاندا ڕوودەدات ململانێ و کێبەرکێی تاک و گروهەکانە بۆ چاکترکردن و بەهێزکردنی هەڵوێستی کۆمەڵایەتی خۆیان، هەوڵدانە بۆ زیاترکردنی قازانج و دەسکەوتە کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و ڕەمزیەکانیان. ئەوەشی کایەیەکی تەندروست لە کایەیەکی نەخۆش جیادەکاتەوە ئەوەیە لەکایەی تەندروستدا ململانێکان لەچوارچێوەی کۆمەڵێک یاسادا ڕوودەدەن، کەپێشوەخت زۆربەی

گەمەکەرەکان لەسەری ڕێکەوتن و ڕێزی پرنسیپ و سنوور و داواکارییەکانی دەگرن. بەکورتی بۆردیۆ کایە وەک ڕووبەرێکی پڕ جوڵە و ململانێ و چالاکی دەبینێت، هەر ئەم جوڵە و ململانێ و کێبەرکێیەشە وادەکات بۆردیۆ کایە لەو "جیهازە ئایدیۆلۆژییانە" جیاکاتەوە، کە ئالتوسێر لە شیکردنەوەی کۆمەڵگادا پێشنیاریاندەکات. کایە بوونێکی زیندووی پڕ ناکۆکییە لەکاتێکدا "جیهاز" بوونێکی ئامێری و ئامرازییە.

بەڕای بۆردیۆ دەشێت "کایە" ببێت، یان بگۆڕێت بە "جیهاز"، بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە یەکێک لە یاریکەرە کۆمەڵایەتییەکانی ناو کایەکە ئەوەندە هێز و دەسەڵاتی گرتبێتەدەست توانیبێتی بەهۆیەوە هەموو یاریکەرە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە بێدەنگبکات. لە دۆخێکی لەو بابەتەدا دونیای ناوەکی و مەوقیعە جیاجیاکانی ناو کایەکە لەلایەن گروهێک لە گروهەکانەوە بەشێوەیەک مۆنۆپۆلیزەکراوە، کە ئاراستەوە بۆچوون و جوڵەی هەموو گروهەکانی دیکەی ناو کایەکەی چەپاندبێت.(٣٦) سیفەتی کایە لای بۆردیۆ لەوەدایە، کە "بەردەوام دەگۆڕێت" (٣٧)، بەڵام جیهاز بوونێکی نەگۆڕ و بێجوڵە و بێڕۆحی هەیە. کایە ئامانجێک بەدیدەهێنێت، کە لەناو کایەکە خۆیدا ئامادەیە، بەڵام جیهاز ئامرازێکە ئامانجێک بەدیدەهێنێت لەدەرەوەی ئامرازەکە خۆیدایە. قسەکردن لەسەر کایە لای بۆردیۆ ڕاستەوخۆ دەمانگوێزێتەوە بۆ قسەکردن لەسەر سەرمایە و شێوە جیاجیاکانی سەرمایە. بەبۆچوونی بۆردیۆ هیچ کایەیەک بوونی نییە بە بێ بوونی سەرمایەیەک لەناویدا. کایە نەک پانتاییەکی بەتاڵ نییە، بەڵکو مەملەکەتێکە پڕ لەهێز و گروپی کۆمەڵایەتی کێبەرکێکەر، ئەم هێزە و گروهە کۆمەڵایەتییانەش هەڵگری جۆرێک، یان چەندجۆرێکی دیاریکراوی سەرمایەن. هەر کایەیەک لە کایەکان نرخ و بەها و هیرارکیەتێکی تایبەتی هەیە بۆ جۆرە جیاوازەکانی سەرمایە، لەهەر کایەیەکدا جۆرێک سەرمایە سەروەرە و جۆرێک لەسەرمایە لە جۆرەکانی

نیکە گرنگترە. (٣٨)
بۆنموونە لەکەیەی ئەکادیمیدا "سەرمایەی کولتووری" لە "سەرمایەی ئابووری" گرنگترە، لەم کایەیەدا شوێن و جێی کۆمەڵایەتی ئەو پرۆفیسۆر و قوتابییە بەرزتر و گرنگترە، کە سەرمایە فیکری و کولتورییەکەیان گەورەترە لە هی پرۆفیسۆر و قوتابییەکانی تر، نەک ئەوەی کێ باشترین سەیارە و زۆرترین پارەی هەیە. کەچی لە کایەی بازرگانیدا بەپێچەوانەوە سەرمایەی ئابووری لە سەرمایەی کولتووری گرنگترە. بەباوەڕی بۆردیۆ دەشێت جۆرێک لەسەرمایە هەبێت لە هەموو کایەکاندا بەنرخ و بەکەڵک و سوودمەند بێت، واتە وەک جۆکەرێک بێت بۆ هەموو کایەیەک دەستبدات. بەپێچەوانەی ئەمەوە دەشێت سەرمایەی تایبەتیش هەبێت تەنها لە کایەیەک لە کایەکاندا بچێت و لەدەرەوەی ئەو کایەیەدا هیچ نرخێکی نەمێنێت. بەباوەڕی بۆردیۆ "بەهای رێژەیی سەرمایەکان بەپێی کایەکان دەگۆڕێت". (٣٩) لەهەمانکاتدا دەشێت ئەو بەهایە بەپێی کات و هەلومەرجی جیاجیا نرخی رێژەیی سەرمایەیەک لەناو هەمان کایەدا بگۆڕێت. (٤٠) لێرەوە بۆ لێکۆڵینەوە و ناسینی کایەیەک پێویستە بزانین جۆری ئەو سەرمایە جیاوازانە چین لەو کایەیەدا دەستبەکار و سەروەرن. (٤١) هەڵگری سەرمایەکان هەوڵدەدەن بەپێی جۆری سەرمایەکانیان ستراتیژیەکانی خۆیان دابرێژن، هێزی هەر یەکێک لە کەسانی ناو کایەکە و هێزی هەر یەکێک لە ستراتیژەکانیان وابەستەی ئەو هێزەیە سەرمایەکەی لەناو ئەو کایەیەدا هەڵگریەتی. هەر گروهێکی کۆمەڵایەتیش لەناو کایەکەی خۆیدا هەوڵدەدات ئەو شێوەیەی سەرمایە بەهێزکات، کە خۆی تێیدا بەهێزە و زۆرترین بڕی لێی هەیە. نرخی سەرمایەکانیش وابەستەی ئەوەن لەناو چ کایەیەکدا کاردەکەن. بەڵام ئەمە هەموو ڕاستییەکان نییە، چونکە ئەوە بەتەنها سەرمایە نییە، کە وابەستەی کایەکانە، بەڵکو کایەکانیش تاڕادەیەکی زۆر وابەستەی جۆرەکانی سەرمایەن و شوناسی خۆیان لەو سەرمایانەوە وەردەگرن. لێرەوە هەم

کەیەکان و هەم سەرمایەکان، هەردووکیان "وابەستەی یەکترن".(٤٢)
جگە لە جۆرەکانی سەرمایە بۆردیۆ قسە لە "بونیادی گشتی سەرمایەش" دەکات. بۆردیۆ ئەڵێت دەشێت هێزی "بونیادی گشتی" دوو سەرمایە یەکسانبن، بەڵام هاوکات ئەم دوو هێزە هەڵگری یەک جیهانبینی نەبن. بۆنموونە قۆنتەراتچییەک هێزی سەرمایە ئابوورییەکەی گەورەیە، بەڵام هێزی سەرمایە کولتورییەکەی لاوازە، بەپێچەوانەوە پرۆفیسۆرێکی زانکۆ هێزی سەرمایە ئابوورییەکەی لاوازە، بەڵام هێزی سەرمایە کولتورییەکەی گەورەیە. لێرەوە "بوونیادی گشتی" سەرمایە لای قۆنتەراتچییەکە و لای پرۆفیسۆرەکە وەک یەکە، بەڵام مەوقیع و جیهانبینییان جیاوازە.(٤٣)
بەباوەڕی بۆردیۆ ستراتیژیەتی خاوەن سەرمایەکان تەنها وابەستەی قەبارە و چەندایەتی و بونیادی ئەو سەرمایەیە نییە، کە لەو ساتەوەختەدا هەیانە، هەروەها بەتەنهاش وابەستەی ئەو هەلومەرجانە نییە، کە لەوساتەدا لە ئارادایە. ستراتیژیەتی خاوەن سەرمایەکان تاڕادەیەکی دیاریکرلو وابەستەی هەلومەرج و شانسە ئایندەییەکانی گەشەکردنی ئەو سەرمایەیە، کە هەیانە، وابەستەی ئەو هەبیتوسەیە، کە لەڕێگای کۆمەڵێک پەیوەندی بەردەوام و تووندەوە کۆمەڵێک شانسی گونجا و بابەتی بۆ ئەو سەرمایەیە دروستدەکات.(٤٤) لێرەوە ناوەڕۆکی ململانێی کۆمەڵایەتی و ناوەڕۆکی کێشەی دەسەڵات لای بۆردیۆ بریتیە لە هەوڵی بەردەوامی خاوەن سەرمایەکان بۆ پەکخستنی هێزی سەرمایەی بەرامبەرەکانیان و هێنانەخوارەوەی نرخ و بەها و تواناکانی ئەو سەرمایە دژانە. بەم مانایە ململانێکان تا ڕادەیەکی زۆر بریتیبن لە هەوڵدانێکی بەردەوام بۆ پەکخستنی ئەو شێوە سەرمایەی هێز بە گروهە ململانێکەرەکان دەدات، یان هیچ نەبێت نرخی ئاڵوگۆڕی کۆمەڵایەتی ئەو سەرمایە دژانە تێکبشکێنن و لەهەمانکاتیشدا نرخ و بەهای ئەو شێوە سەرمایەیە گەورەبکەن، کە خۆیان تێیدا بەهێزن.(٤٥)

لای بۆردیـۆ دەوڵەت لەنێـو کایەکانـدا گرنگییەکـی تـایبەتی هەیە، گرنگـی نە بەو مانایەی دەوڵەت ئامرزای باڵادەستی چینێکبێت بەسەر چینێکی دیکەدا، بەڵکو بەو مانـایەی دەوڵەت "کـۆکراوەی جـۆرە جیاوازەکـانی سـەرمایەیە". (٤٦) گرنگیـی دەوڵەت لای بۆردیۆ لەوەدا نییە، کە ئامرازە، بەڵکو لەوەدایە جۆرێکە لە سەرمایە هەموو سەرمایەکانی تر لە هەناوی خۆیدا کۆدەکاتەوە. دەوڵەت بریتیە لەو سەرمایە گەورەیەی هەموو سەرمایەکانی دیکەی لە ئامێزدایە. (٤٧) لەپاڵ ئەمەشدا دەوڵەت لە مەوقیعێکدایە دەتوانێت جۆرێک لەجۆرەکانی سەرمایە بەسەر جۆرەکانی دیکەدا زاڵبکـات. بەهـۆی ئەم گـرنگییە تـایبەتەوە بۆردیـۆ سـەرمایەی دەوڵەت ناودەنێـت "میتاـ سـەرمایە"، مەبەسـت لە میتاـسـەرمایەش ئەو شـێوەیەیە لە سـەرمایە، کە بەهـۆیەوە "دەتوانرێـت دەسـەڵات بەسـەر شـێوەکانی دیـکەی سـەرمایەدا بسەپێنرێت". (٤٨)

وەک دواهەمـین خـاڵ دەمەوێـت لێـرەدا ئامـاژە بـۆ ئەو ڕاسـتییە بـکەم، کە میتاـسەرمایە لای بۆردیـۆدا سـەرمایەیەکە هەمیشـە لەلایەن چینـێکەوە ئاراستەدەکرێت. بێگومان ئەو چینەی دەتوانێت میتاسەرمایە ئاراستەبکات لەڕووی کۆمەڵایتییەوە لە چینەکانی دیکە بەهێزترە، بەڵام ململانێـی کـۆمەڵایەتیش لەلایەن جۆرەکـانی دیـکەی سـەرمایەوە هەمیشـە لە هەوڵـی ئەوەدایە بتـوانن کـار لەو میتاسەرمایەیە بکەن و بائاراستەی قازانج و سوودی سەرمایە تایبەتەکانی خۆیـان بـیخەنەگەڕ. (٤٩) لەمخاڵەشـدایە بۆردیـۆ هەنگـاوێکی زۆر گەورە لە مـارکس نزیکدەبێتەوە و بۆردیۆ دەکاتە مارکسیستێکی هاوچەرخ و نوێکەرەوە.

# بەشی دووهەم

## -٦-

دوای ئەو سەرەتا تیۆرییە جیاوازانە ئێستا دەکرێت بپرسین: ئایا کێشەی دەسەڵات لە واقیعی ئێمەدا چۆن کەوتۆتەوە؟ ئەو تایبەتمەندییانە چین دەسەڵات لەدونیای ئێمەدا ڕەنگرێژدەکەن؟ ئایا دەسەڵات چ شوناسێکی هەیە و لەسەر کام پانتایی کاردەکات، پانتایی مەرگ، یان ژیان؟ ئایا دەسەڵات موهەیمنە، یان کۆنترۆڵکەرە؟ سروشتی ئەو کایانە چۆنن دەسەڵات لەناویاندا کاردەکات؟ کام سەرمایە هێزێکی سەپێنەری هەیە؟ ئایا دەشێت لە دونیای ئێمەدا قسە لە بوونی کایە بەمانا بۆردیۆییەکەی بکەین، یاخود کایەکان گۆڕاون بە جیهاز بەو مانایەی ئالتوسێر بە جیهازی دەدات؟

سەرەتا با لەمەسەلەی هەیمەنەوە دەستپێبکەم. ئێمە وتمان گرامشی هەیمەنە بە مەرجی گەیشتن بەدەسەڵات و کۆنترۆڵکردنی دەوڵەت دادەنێت. ئەوەمان وت بەبێ هەیمەنەی ئایدیۆلۆژی و کولتوری و ڕۆحیی حیزب لەناو کۆمەڵگای مەدەنیدا زەحمەتە حیزب بتوانێت دەسەڵات بگرێتەدەست. "بلۆکی مێژوویی"، کە بەری کاری پێکەوەیی چەند هێزێکی کۆمەڵایەتی جیاوازە یەکێکی دیکەیە لە

پێداویستییەکان، ئەمە جگە لەوەی دەبێت لەڕێگای ڕۆشنبیرانەوە هێزە جیاوازەکانی کۆمەڵگای مەدەنی لەدەوری بەرنامەیەکی کۆمەلایەتی سیاسی فەرهەنگی کۆبکرێنەوە، کە تەعبیر لەو ڕۆحی هەیمەنەیە بکات، کە هێزەکانی ناو ئە بلۆکە مێژووییە دروستدەکەن. وەک وتمان گرامشی لە لێکۆڵینەوەیدا بۆ ئەزموونی بەلشەویکەکانی ڕوسیا دەگاتە ئەو دەرەنجامەی ئەوان لەڕێگای "حیزبی پێشڕەوەوە" و لە ڕێگای نەفیکردن و بازدان بەسەر هێزە جیاوازەکانی ناو کۆمەڵگای مەدەنیدا، پەلاماری دەوڵەتیان دا و لەشێوەی کودێتایەکی سەربازیدا دەسەلاتیان گرتەدەست. حیزب لە ئەزموونی بەلشەویانەدا ڕاستەوخۆ هەڵدەکوتێتە سەر دەزگاکانی دەوڵەت و لەڕێی کۆنترۆڵکردنی ئەو دەزگایانەوە دونیای کۆمەلایەتی و سیاسی و فەرهەنگی دەرەوەی دەوڵەتیش کۆنترۆڵدەکات. حیزب لێرەدا لە باڵەخانەکانی دەوڵەتەوە دێتە خور بۆناو سەر شەقام و گۆڕەپانەکانی دونیای کۆمەلایەتی و سیاسی وفەرهەنگی کۆمەڵگا. لەڕاستیدا حیزب لەم ئەزموونەدا لەسەرەوەڕا و بەوشێوەیەی خۆی دەیەوێت دەخوازێت کۆمەڵگا دروستبکات، ئەو هێزانە بەهێزدەکات، کە خۆی مەبەستیەتی و ئەوهێزانەش لاوازدەکات، کە نایەوێت بەهێزبن، یان هەر بمێنن. بە چەمکەکانی بۆردیۆ لێرەدا میتاسەرمایەی دەوڵەت هەموو ئەو شێوانەی دیکەی سەرمایە وێراندەکات، کە نایەوێت بمێننەوە و گەشە بکەن و ئەو سەرمایانەی دیکەش پایەداردەکات، کە دەتوانێت لەپاڵیاندا دەسەلاتی خۆی هەم گەورەبکات و هەم بپارێزێت.

لەڕاستیدا لەم ئەزموونەدا زەحمەتە حیزب و دەوڵەت، حیزب و کۆمەڵگا، حیزب و کایەکان لەیەکدی جیابکەینەوە. حیزب لەم جۆرە ئەزموونانەدا دەچێتە هەموو شوێنێکەوە و دادەبەزێتە ناو پێکهاتەی هەموو ئەو سەرمایانەی لەو کۆمەڵگایەدا لەناو کایە جیاوازەکاندا لەئارادان. هەندێک تیۆریستی هاوچەرخ ئەم شێوە تایبەتەی دەوڵەت ناودەنێن "دەوڵەتی هۆبزی"، دەوڵەتێک لەسەرەوەڕا و لەناو ئۆرگانەکانی

دەوڵەتەوە هەندەسەیەکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو بەسەر کۆمەڵگادا دەسەپێنێت و مەودا بەهیچ هێزێک نادات لەدەرەوەی کۆنترۆڵی ڕاستەوخۆی دەوڵەتدا بوونی هەبێت. لە ئەزموونی دەوڵەتی هۆبزیدا حیزب ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینێت لە ڕێکخستنی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا، حیزب لەم ئەزموونەدا ڕاستەوخۆ هەموو دەزگاکانی دەوڵەت دەخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە و لەوێشەوە هەموو کایە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی و ئابوورییەکان کۆنترۆڵ و تەنانەت مۆنۆپۆلیش دەکات. حیزب لێرەدا دونیایەک دروستدەکات، کە بەردەوام بینراو و قابیلی چاودێری و کۆنترۆڵ و دیسپلینکردنبێت. گرامشی ئەم دۆخە ناودەنێت "تزاریزمی بێ تزار"، واتە "قەیسەریەت بەبێ قەیسەر"، لەم ئەزموونەدا حیزب ئەچێتە شوێنی قەیسەر و لەباتی قەیسەر دەسەڵات دەگرێتەدەست و وەک قەیسەریش هەڵسوکەوت ئەکات.

ڕەنگە ماندووبوونێکی زۆری نەوێت بۆئەوەی لەواقیعی کوردیدا بەهەمان ئەو دەرەنجامانەی سەرەوە بگەین و ئەوە بسەلمێنین هەمان میکانیزمی کارکردنی دەسەڵات لەئارادایە. جیاوازی هەرەسەرەکی لە نێوان ئەزموونی کوردی و ئەزموونی بەلشەویەکانی ڕوسیادا لەوەدایە حیزب لەئەزموونی کوردیدا توانای دروستکردنی دەوڵەتی نییە و لە غیابی دەوڵەتدا و لەناو حیزب خۆیەوە بڕیاردەدات چۆن کۆمەڵگا و هێزەکانی ناو کۆمەڵگا و کایەکان دابڕێژێت و ڕێکبخات. ڕەنگە هەر ئەم خاڵەش خاڵی هەرەسەرەکی جیاکردنەوەی ئەزموونی حیزبە کوردییەکان بێت لە ئەزموونی بەعس لە عێراقدا. بەعس لەناو دەوڵەت و دەزگاکانی دەوڵەتەوە دەیخواست بچێتە ناو کایەکانەوە و دەستکارییەکی ڕادیکاڵانەی سەرمایەی ناو کایەکان بکات، لەکاتێکدا حیزبە کوردییەکان لەناو دەزگاکانی حیزبەوە ئەم کارەیان کردووە و ئەم کارە دەکەن. بەم کارەشیان حیزبە کوردییەکان ئەوە دەسەلمێنن، کە حیزبێکن ناتوانن ببنە خاوەنی هەیمەنە، ناتوانن هێزە جیاجیاکانی ناو

کۆمەڵگای کوردی لەڕێی ڕێکەوتنێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی و ئایدیۆلۆژییەوە لەناو بلۆکێکی مێژوویدا کۆبکەنەوە و خودی ئەو بلۆکەش لەناو پێکهاتێکی سیاسی بانحیزبیدا بەرجەستە بکەن. بەڵام داخۆ ئەم حیزبانە بۆ ناتوانن خاوەنی هەیمەنەبن؟

دەشێت لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا هێما بەم چەند ڕاستییە بکەین:

١ـ حیزبە کوردیەکان لەناو کۆمەڵگایەکی ناشێلگیر و خۆڕێکنەخستوودا کاردەکەن. سنووری هێزە جیاجیاکانی ناو ئەم کۆمەڵگایە تا ڕادەیەکی زۆر لەیەکدی جیانەکراوەتەوە و لەڕووی سۆسیۆلۆژیەوە بەیەکداچوونێکی کۆمەڵایەتی دەبینین، کە وادەکات داواکارییە سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکان بەشێوەیەکی گەورە بەناویەکیدا چووبن و بەزەحمەت بکرێت لەیەکدی جیابکرێنەوە.

٢ـ بەرگرتن بەلەدایکبوونی هەر وشیارییەک هەوڵی ناساندن و بەرگریکردن لە جیاوازییەکان بدات، گەر ئەو وشیاریەش هەبێت، یان لەڕێگەدابێت بۆ دروستبوون، ئەوا ئەو هێزە جیاوازانە بە هۆی گوتاری "یەکگرتن"ەوە ناتوانن تەعبیر لەو جیاوازییانە بکەن. لێرەوە هەرکەسێک بخوازێت قسەبکات ناچارە بەناوی هەموو هێزەکان و هەموو نەوەکان و هەموو جنسەکانەوە بدوێت.

٣ـ هۆیەکی دیکەی دروستنەبوونی هەیمەنە ئەوەیە حیزبی کوردی، وەک فۆرمێکی دیکەی ڕێکخستن و کارکردن، جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە لە فۆرمە تەقلیدییەکانی کارکردن و ڕێکخستن لە کۆمەڵگای کوردیدا. بەمانایەکی دیکە حیزبی کوردی نایەت بۆ ئەوەی فۆرمە تەقلیدییەکانی ناو کۆمەڵگای کوردی تێکبدات و پێشنیاری فۆرمی دیکەی کارکردن و خۆڕێکخستن بکات، بەپێچەوانەوە حیزب دێت و بەپێی ئەو فۆرمە تەقلیدییانە و لەسەرهێشتنەوەی ئەو فۆرمانە کاردەکات. بەمەش زۆربەی زۆری ئەو هێزانەی، کە دەبێت لەو پێکهاتە تەقلیدییە جیاببنەوە و ببنە هەڵگری دیدێکی دیکە بۆ کاری سیاسی و کۆمەڵایەتی، بەشێوەیەک لە شێوەکان

ناچاردەکرێن بچنەوە بەردەمی هێزە تەقلیدییەکانی دونیای ئێمە. ئەمەش بەر بەفرەدەنگی و فرە بەرنامەیی دەگرێت و ئەو ڕێکەوتنە ئایدیۆلۆژییەی بنەمای هەیمەنەیە هەر لە بێشکەدا دەکوژرێت.

حیزبی کوردی، کە خاوەنی هەیمەنەیەکی کۆمەڵایەتی نییە و بەبێ ئەم هەیمەنەیە دەسەڵاتی لەدەستدایە، تاقە ڕێگایەک لەبەردەمیدا بۆ پاراستنی دەسەڵاتی خۆی مابێتەوە مۆنۆپۆلیزەکردنی ڕەهەندە جیاوازەکانی ژیانی کۆمەڵایەتییە، بەتایبەتی مۆنۆپۆلیزەکردنی ئابووری. بێگومان مۆنۆپۆلیزەی ئابووری لەواقعێکی تایبەتی وەک واقیعی ئێمەدا مانای داگیرکردنێکی سەرتاسەری هەموو کایە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگییەکان و ناچارکردنی کۆمەڵگایە وەک گشتێک بە تەسلیمبوون بە حیزب و ستراتیژەکانی حیزب. حیزب، کە لەوەدا سەرناکەوێت دونیا ئایدیۆلۆژی و ڕۆحییەکەی خۆی بکاتە دونیای ڕۆحی و ئایدیۆلۆژی هێزە چالاکەکانی ناو کۆمەڵگا، ئیدی ڕاستەوخۆ پەلاماری ئابووری کۆمەڵگا دەدات و شادەمارەکانی دەخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. بەم مانایە پەلاماردانی ئابووری ومۆنۆپۆلیزەکردنی بە پلەی یەکەم هێما بۆ فەشەلی ئایدیۆلۆژی حیزب و فەشەلی پەیداکردنی هەیمەنەی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەکات. حیزب، کە نەیتوانی کاریگەریی لەسەر عەقڵ و ڕۆح و سایکۆلۆژیای ئینسانی ئێمە هەبێت، ئەوەی لەبەردەمیدا دەمێنێتەوە بریتیە لە کۆنترۆڵکردنی گەدەی ئەو ئینسانە و مۆنۆپۆلیزەکردنی سەرچاوە ئابوورییەکانی ژیانی. بەگواستنەوە لە عەقڵەوە بۆ گەدە و لە ئایدیۆلۆژیاوە بۆ نان و لە هەیمەنەوە بۆ کۆنترۆڵ، حیزبی کوردی پشت دەکاتە ئەو دوو ڕەگەزە گرنگەی گرامشی بە بناغەی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیان دەزانێت، ئەو دوو ڕەگەزەش بریتین لە "بلۆکی مێژوویی" و "ڕۆشنبیران".

مۆنۆپۆلیزەی ئابووری و بوونی حیزب بە "خاوەنکار" مانای ئەوەی حیزب چارەنووسی هێزە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ خستۆتە ژێر

دەسەڵاتی خۆیەوە و ئیرادەی سەربەخۆبونی لەم هێزانە سەندۆتەوە. بەسەندنەوەی ئەم ئیرادەیەش ئیدی هیچ زەمینەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی بۆ دروستکردنی بلۆکێکی مێژوویی لە ئارادا نامێنێت و حیزب لە باتی هەموان بیردەکاتەوە و بڕیاردەدات. بەپێچەوانەی هەلومەرجی بونیادنانی بلۆکی مێژووییەوە، مۆنۆپۆلیزەی ئابووری مانای وابەستەکردنی هەموو هێزە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە بە حیزب و بە سیاسەتەکانی حیزبەوە. ئەم وابەستەبییە وەک ئاشکرایە وابەستەبییەکە نەک لە هاریکاری و هاوبیرییەکی سیاسییەوە نەهاتووە، نەک لەبوونی یەک لێکدانەوەوە و بوونی یەک ڕوانینەوە بۆ دونیا و دەوروبەر و دیاردەکانەوە سەرچاوەی نەگرتووە، نەک لەیەک تێگەیشتن و یەک شێوازی دۆزینەوەی چارەسەرەوە بۆ کێشەکانەوە هەڵنەقوڵاوە، بەڵکو لە ئەنجامی ناچاریەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و تێکشکانێکی ئیرادەگەرانەوە پەیدابووە. مۆنۆپۆلیزەکردن پرۆسەیەکە دیوی ئەودیوی ناچارییە، لەڕێگای مۆنۆپۆلیزەی ئابوورییەوە حیزب هەموو هێزە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە دەخاتە دۆخی ناچارییەکی قورسەوە، کە لە سنوورەکانی تەسلیمبوونی سەرتاسەری نزیکیاندەکاتەوە. لە هەر کۆمەڵگایەکدا حیزب، یان دەوڵەت ئابووری مۆنۆپۆلیزەکرد ئەوکات ئەوەی بە پلەی یەکەم تێکدەشکێنرێت، ئیرادەی سەربەخۆی هێزەکان و ئینسانەکانە لەو کۆمەڵگایەدا. بێگومان مۆنۆپۆلیزەکردنی ئابوری هەنگاوی هەرەسەرەکی مۆنۆپۆلیزەی هەموو شێوەکانی دیکەی سەرمایەشە، کە ئیرادە نەما ئیدی کایەکان ناتوانن گەمەی سەربەستی خۆیان بکەن و سەرمایەکان ناتوانن ئازادانە لە نێوخۆیاندا و لەگەڵ یەکدیدا لە کێبەرکێیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگیدا بن. بەمجۆرە حیزب ڕاستەوخۆی دەستدەخاتە ناو ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی کۆمەڵگاوە و کایەکان لەناوەوەڕا کۆنترۆڵ دەکات و دەستکاری سەرمایە و لۆژیکی ناوەکییان دەکات.

بەلام حیزب چۆن ئابووری مۆنۆپۆلیزە دەکات؟ بێگومان لەڕێی توونـدوتیژی و خولقانـدنی کـایەکی سیاسـی بەتـاڵ لە ململانـێ و کۆمەڵگـایەکی کـۆنترۆڵکراو و ترسێنراوەوە. بۆ ئەم مەبەستە حیزب پرۆسەیەکی دوورودرێـژی بە میلیتـاریزەکردنی کۆمەڵگا دەستپێدەکات. حیزب خۆشی لەم پرۆسەیەدا دەبێتە دەزگایەکی میلیتاری گەورە و لەگەڵ خۆشیدا کۆمەڵگا بەقبـووڵکردنی هەمـان رۆحییەتـی جەنگـاوەرانە ناچاردەکـات. بێگومـان ئەوەی پرۆسـەی بە میلیتـاریزەکردنی کۆمەڵگـای ئـێمەی ئاسـان کـرد دروسـتکردنی ئـابوورییەک بـوو، کە لە لایەکەوە لەسـەر هێشـتنەوەی بەتاڵی و لەلایەکی دیکەوە لەسەر بازرگانییەکی بەرتەسک کاریـدەکرد. لە هەردوو بارەکەشدا بۆ ئەوەی بتوانیت بژێوی رۆژانەی ژیان دابینبکەیـت دەبـوو بە حیـزب و بەو بڕیـــارانە تەســـلیمببیت، کە حیـــزب دەریـــدەکردن. ناچـــارکردنی هێـــزە کۆمەڵایەتییەکـانی دەرەوەی حیـزب بە تەسـلیمبوون، بەنـاو مەرگـی سیاسـی ئەو هێزانە و بەر لەهەمووشتێک بەناو مەرگی هەر شێوەیەک لە شێوەکانی دروستبوونی بلۆکی مێژووییدا تێدەپەڕی.

قوربانی دووهەمی ئەم دۆخە رۆشنبیرانن. کاری سەرەکی رۆشنبیران بەرهەمهێنانی ئایدیۆلۆژیا و ئەو دونیا رەمزی و رۆحییەیە حیزب دەیەوێت بۆ پەیداکردنی هەیمەنە بە کۆمەڵگای بدات. حیزب، کە ئابووری مۆنۆپۆلیزە دەکات مانای وایە پێشـوەخت بڕیاریداوە هەیمەنە بەمانا ئایدیۆلۆژی و فیکـرییەکەی کەنارگیربکـات. نەک هەرئەمە بڕیاری مۆنۆپۆلیزەی ئابووری خۆی لەخۆیدا بڕیاری مۆنۆپۆلیزەی هەموو کایەکـانی دیکەشە. بەمۆنۆپۆلیزەی کایەی ئابووری حیزب هەموو کایەکانی دیکە ناچاردەکات بۆ مانەوە و بەردەوامبوونیان پشت بە سەرچاوە ئابوورییەکانی حیزب ببەستن،، کە حیزب لەمەدا سەردەکەوێت ئەوکات پێویستی بە رۆشنبیران نامێنێت وا لە کۆمەڵگا بـکەن لەڕوی رۆحیـیەوە بە حیـزبەوە ببەسـتنەوە. لەڕاسـتیدا حیـزب کـایەی رۆشنبیریش وەک هەمـوو کایەکـانی دیکە مۆنۆپۆڵـدەکات و بەمەش هەوڵـی ئەوە

ئەدات هەموو سەربەخۆییەکی فیکری و ئەخلاقی لە ڕۆشنبیران بسێنێتەوە.
لە دۆخێکی لەم بابەتەدا و لەژێر سایەی مۆنۆپۆلیزەی ئابووریدا ڕۆشنبیران لەباتی ئەوەی ببن بە عەقڵی حیزب و هەوڵی بەدەستهێنانی هەیمەنەی بۆبدەن، ئەبن بە گرفتێک لەو گرفتانەی حیزب ڕووبەڕوویان دەبێتەوە. لەباتی ئەوەی ڕۆشنبیران ببنە دەروازەی حیزب بۆچوونە ناو دونیای ڕۆحی و ئایدیۆلۆژی و فیکری هێزە کۆمەڵایەتییە جیاجیاکانەوە، دەبنە کێشەیەکی گەورە و حیزب ئەبێت بەشێوەیەک لە شێوەکان بێدەنگیانکات، یاخود لەباشترین حاڵەتدا مەودای قسەکردنیان تەنها لەناو کەناڵە سانسۆرکراوەکانی خۆیدا بدات. حیزب بۆئەوەی بتوانێت مۆنۆپۆلیزەی خۆی بەسەر هەموو کایەکاندا درێژەپێبدات دەبێت بەپلەی یەکەم ڕۆڵی ڕۆشنبیران لە بەرهەمهێنانی فیکر و لەبەرهەمهێنانی دید و تێڕوانینی جیاوازدا، کەمبکاتەوە. بۆ ئەم مەبەستەش حیزب دەبێت کاریگەری ڕۆشنبیران لەسەر واقیع و لەسەر هێزە کۆمەڵایەتییەکان کەمبکاتەوە. لەپەرگیرترین دۆخدا ڕۆشنبیران لیستی تایبەتی ئەو بابەتانەیان بۆ دەستنیشان دەکرێت، کە دەبێت لەسەری بنووسن و ئەو بابەتانەش کەنابێت توخنی بکەون. ئەم دۆخە لەناو دەزگا ڕۆشنبیرییەکانی پارتیدا ئاشکراترە تا لەلای حیزبە سیاسییەکانی دیکە لە کوردستاندا، تا ئەو شوێنەی من ئاگاداریم لەناو دەزگا ئیعلامییەکانی پارتیدا قسەکردن لەسەر ئایین و سێکس و سیاسەت یاساغە و ئەم بابەتانە، کە بە بۆچوونی من گرنگترین بابەتی ڕۆشنبیری و فیکری کۆمەڵگای ئێمەن، کراونەتە دەرەوەی تێڕامانە فیکرییەوە لای ئەم هێزە. حیزب بۆ پیادەکردنی ئەم ستراتیژە تایبەتەی دەسەڵات، کە لەسەر مۆنۆپۆلیزەکردن بنیادنراوە، ستراتیژی مامەڵەکردنی لەگەڵ ڕۆشنبیراندا دەبێتە ستراتیژی کەنارگیرکردن و دابڕینیان لەهێزە کۆمەڵایەتییەکان. لێرەوە پێویستە کۆکردنەوەی ژمارەیەکی زۆری ڕۆشنبیران لەناو دەزگا ئیعلامییەکانی حیزبدا و ونکردن و شاردنەوەیان لە ناو ئەو دەزگایانەدا لەپاڵ ئەم ستراتیژ و فۆرمە تایبەتەی

دەسەڵاتەدا ببینین.

لەڕاستیدا لە هەلوومەرجی نەگەڕان بەدوای هەیمەنەدا ڕۆشنبیران دەبنە مایەی سەریەشە بۆ حیزب، نەک ئەو عەقڵە داهێنەر و ڕەخنەییەی دونیا و بیاردەکان بۆ حیزب شیبکەنەوە و گرفتەکانی واقیعی بۆ بکەن بە تیۆرە و چەمک و لێکدانەوەی مەعریفییانە. بەحوکمی ئەوەش، کە سەرچاوەی بژێو و ژیانی ڕۆشنبیران لەلایەن حیزبەوە دەستیبەسەرداگیرلوە و سەرلەبەری کایەی ڕۆشنبیری مۆنۆپۆلیزە کرلوە، بۆیە ڕۆشنبیران تا ڕادەیەکی زۆر ناچارن لەگەمە بەرتەسکەکانی حیزبەوە بئاڵێن و ئەو گوتارە ئایدیۆلۆژییە بەرهەمبێنن، کە نوخبەی دەسەڵاتداری ناو حیزب پێویستیپێیەتی. بەمکارەش ڕۆشنبیران دەبنە بەشێکە لەو شەڕانەی حیزبەکان بەیەکدی و بە کۆمەڵگای کوردی دەفرۆشن. بێگومان ئەم ئەزموونەی ڕۆشنبیران لەگەڵ حیزبدا ئاشکراتر لە ئەزموونی ڕۆشنبیران لە عێراقدا لەگەڵ بەعسدا دەبینرێت. تێکشکانی کایەی ڕۆشنبیری و بەتاڵکردنەوەی لەهەموو وزەیەکی ڕەخنەیی نەبێت، چی نەخوێندەوار و شەقاوەیەکی وەک عودەی کوڕی سەدام حوسەین دەکاتە نەقیبی ڕۆژنامەنووسان و نەخوێندەوار و نەفامێکی وەک لەتیف نسیف جاسم دەکاتە وەزیری ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن.

وەک وتمان هەیمەنە بریتیە لە ڕێکەوتنێکی کۆمەڵایەتی، لەم ڕێکەوتنەدا هێزی کۆمەڵایەتی جیاواز لەدەوری بەرنامەیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی وا کۆدەبنەوە، کە لانیکەمی سەربەخۆبوون و سوود و قازانجی ئەو هێزانە بپارێزێت، کە پێکەوەکۆبوونەتەوە، گەر ئەمەش جێبەجێنەبوو ئەو ڕێکەوتنە دەبێت لانیکەم ئەگەری دابینکردن و پاراستنی ئەو قازانجانە پێشنیاربکات. ئەوەی لەواقیعی ئێمەدا ڕوودەدات پێچەوانەی ئەم پرنسیپە سەرەتاییانەی کاری سیاسی تەندروستە، ئەوەی لە کوردستاندا ڕوویدا و ڕوودەدات کەنارگیرکردن و بێدەنگکردن و چەپاندنی زۆربەی هەرەزۆری هێزە کۆمەڵایەتییەکانی کوردستانە و لەڕێگای مۆنۆپۆڵکردنی

ئابوریشـەوە گۆڕینیـانە بە جمهـورێکی بەرفراوانـی چەکـدار و ئامادەکردنیـان بـۆ شەڕێک، کە بەر لەهەموو شتێک ئاییندەی خۆیان و ئاییندەی نەوەکانی داهـاتووی ئەم وڵاتە وێراندەکات. بێگومان کەنارگیرکردنی هێـزە کۆمەڵایەتییە جیاجیاکـان لە کوردسـتاندا دەرەنجـامی دروسـتبوونی گروهێکـی کـۆمەڵایەتی نـوێیە، کە لەدوای ڕاپەڕیـنەوە لە نەخشـەی سۆسـیۆلۆژی کومەڵگـای ئـێمەدا دروسـتبوون و توانـا سـەرەکییەکانی کومەڵگـای ئێمەیـان مۆنۆپـۆلکردووە، مەبەسـتم لەو گـروپەش ئەو تێکەڵەیە لە بازرگانی قاچاغکار و نوخبەی دەسەڵاتداری ناو حیزب.

ئەوەی لەدونیای ئێمەدا ڕوودەدات تا ڕادەیەکی زۆر دارشتنی پلانێکی ئـابووری و سیاسی و سایکۆلۆژی وایە ڕاستەوخۆ پایەکانی دەسەڵاتی گروپـی باڵادەسـتی نـاو حیزب لە کومەڵگای ئێمەدا بپارێزێـت و بەردەوام بەرهەمبهێنێـتەوە. تائەوشـوێنەی ئەم ستراتیژە بەبێ توندوتیژی و شەڕ پیادەبکرێت، حیزب هەوڵـدەدات دەسـەڵات لەڕێی نیشاندانی دەموچاوە ڕەمزییەکانی دەسەڵاتەوە کاربکات، بەڵام لەوکاتەدا، کە بەڕەمزیکردنی دەسەڵات دەرەقەتی ڕاگرتنی ناکۆکییەکان و ڕاگرتنی هاوسەنگییەکان نـایەت، ئیـدی شـەڕ و توونـدوتیژی دەبێـتە ئەو زمـانەی دەسـەڵات لەگەڵ هێـزە جیاوازەکـان و قـازانجە جیاوازەکـان و کومەڵگـای ئـێمەدا بەکاریـدەهێنێت. لەوکاتەشەوە، کە حیزب لە کەنارگیرکردنی هێزە کومەڵایەتییەکانی دونیـای ئـێمەدا سەردەکەوێت، ئیدی چیرۆکی درێژی غـائیبوونی هەیـمەنەیەک دەسـتپێدەکات، کە حیزب تەنها لەسەرەوەڕا و لەڕێگای هێزە چەکدار و توانا ئابوورییەکانیەوە دەتوانێت بۆشـایی ئەو غـائیببوونە پڕبکـاتەوە. لەدۆخێکـی لەو بـابەتەدا حیـزب ڕاسـتەوخۆ دەستدەخاتە ناو ژیانی کومەڵایەتی و سیاسـی و فەرهەنگـی کومەڵگـاوە بـۆئەوەی نەهێڵێـت ئاراسـتەی گـۆڕان و گەشـەکردنەکان بە ئاراسـتەیەکدابێت کلیلەکـانی لە دەستی حیـزب بچێـتەدەرەوە. ئەوەی یـارمەتی جێبەجێکردنـی ئەم هاوکێشـەیەش دەدات ئەو دابەشکردنە نادروستەی ئابووری کوردستانە، کە بەپێی قسەی یەکێـک

لە سیاسییەکانی کورد، ٧٠٪ بۆ حیزب بووە و تەنها ٣٠٪ بۆ حکومەتی هەرێم بووە.

لێرەوە ئەوە حیزب نییە لە کوردستاندا، کە چاوەڕوانی کۆمەڵگابێت بۆ بەخشینی هێز پێی و بۆ بەخشینی شەرعیەت بە بوون و مانەوەی، بەڵکو ئەوە کۆمەڵگایە، کە سواڵی ژیان لای حیزب دەکات. لێرەوە وەهمێکی گەورەیە کۆبوونەوەی خەڵکێکی زۆر لەڕیزەکانی حیزب و لەناو دەزگاکانی حیزبدا وەک هەیمەنەی ئەو حیزبە لەناو کەرتە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکاندا تێبگەین، بەپێچەوانەوە کۆبوونەوەی خەڵک لەناو دەزگاکانی حیزبدا گەڕانێکی نائومێدی ئەو کەسانەیە بەدوای بژێو و هۆکارەکانی تری مانەوەدا. لەڕاستیدا ئەم ستراتیژەی دەسەڵاتی حیزب بەشێکی زۆری کۆمەڵگای ئێمەی کردۆتە سواڵکەری بەر دەرگاکانی حیزب و ئەوەشی ئەم دۆخی سواڵکردنە دەیەوێت تێکیبشکێنێت ئیرادە و ڕێز و نەفەسبەرزی ئینسانی ئێمەیە.

هەموو ئەو گۆڕانانەی باسمانکردن چەندە دەرەنجامی خراپیان بۆ کۆمەڵگای ئێمە هەبووە، بەهەمانئەندازەش دەرەنجامی خراپیان بۆ ژیانی ناوەکی حیزب خۆشی هەبووە. حیزب، کە لەدەرەوەی خۆیدا هەموو بڕیار و هەموو پانتاییەکی سەربەخۆ و سەربەستی بێدەنگکردبێت و کۆمەڵگای کردبێتە ڕەعیەتی خۆی، بەهەمانشێوەش لەناوخۆیدا هەمان پرۆسەی پیادەکردووە و تواناکانی بڕیاردانی لەدەستی کەسێک، یان چەند کەسێکی زۆر کەمدا کۆکردۆتەوە. لێرەوە لەو کاتەدا کۆمەڵگا دەکرێتە ڕەعیەتی حیزب و دەنگە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان خەفەدەکرێن، بەهەمانشێوە لەناو خودی حیزبیشدا ئەندامان دەکرێنە ڕەعیەت و بەهەمانئەندازە بێدەنگدەکرێن. ئاوسانی جەستەی حیزبیش، لەڕێی کۆکردنەوەی بەزۆری هەرچی زیاتری خەڵکە لەناو ڕیزەکانیدا، وادەکات ڕەقابەی ناوەکی حیزب بەرفراوانتر و هەمەلایەنتربێت و تانێت دەسەڵاتەکان لەناو حیزبدا سێنترالیزە بکرێن. لەپاڵئەمەشدا حیزب بۆ

پیادەکردنی کۆنترۆڵ هەم لەناو خۆیدا و هەم لەدەرەوەی خۆیدا زیاتر پشت بەدەزگاکانی ئاسایش و زانیاری و دەزگای نهێنی تر ببەستێت، نەک بە هاوبەشێکی ڕۆحی و ئایدیۆلۆژی، کە ئەندامانی حیزب لەدەوری کۆببنەوە. تێگەیشتن لە مانا قووڵەکانی گەشەی هەردوو دەزگای زانیاری و ئاسایش لە دوای راپەرینەوە تەنها لەم دیدەوە بە تەواوی ئاشکرا دەبێت.

بەکورتی لەکاتێکدا حیزب دونیای دەرەوەی خۆی مۆنۆپۆلیزەدەکات و بڕیارەکان لەدەستی هێزە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان دەردەهێنێت، لەهەمانکاتدا لەناوخۆشیدا هەموو بڕیارەکان لەدەستی چەندکەسێکی کەمدا کۆدەکاتەوە، چەند ئەو پرۆسەی مۆنۆپۆلیزەیە لەدەرەوەی حیزبدا بەرفراوان و توندبێت، بەهەمان ئەندازەش هەمان پرۆسە لەناو حیزب خۆیدا بەرفراوان و توندەبێت. ئەم دۆخە لەدونیای ئێمەدا تا ئەو شوێنە قووڵدەبێتەوە هەموو دەسەڵاتەکان لە جەستەی سەرکردەی حیزبەکاندا کۆدەکاتەوە و تەنانەت خودی دەزگاکانی حیزب خۆشیان لە غیابی سەرۆکی حیزبدا توانای دەرکردنی بڕیاریان نامێنێت و سەرۆک لەباتی هەمووان بیردەکاتەوە و بڕیاردەدات. بێگومان ئەم دۆخە نەک بەتەنها ئیفلیجکردنی کۆمەڵگایە بەڵکو ئیفلیجکردنی حیزب خۆشیەتی. لە کوردستاندا لە دۆخی ئەم ئیفلیجییە کۆمەڵایەتی و سیاسییەدایە ئەو گروهە نوێیەی لەدوای راپەرینەوە دروستبووە گەشەی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی خۆی، بێهیچ چاودێرییەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی، مەیسەر و مسۆگەرکردووە، کوشتنی هەموو لێپرسینەوە و ڕەقابەیەکی کۆمەڵایەتی و حیزبی ئەو سەرزەمینەی خولقاند ڕووداوەکانی کوردستان بەو شێوە دراماتیکیە ڕوویدەن، کە لەچەند ساڵی ڕابردوودا دیمان.

"بەجەستەییکردن"ی دەسەڵات و کۆکردنەوەی هەموو دەسەڵاتەکان لەجەستەی سەرۆکدا بەرەو یەکێک لەڕەهەندە گرنگەکانی فیکری فۆکومان دەبات، بۆیە لێرەبەدوا هەوڵدەدەم ڕووەکانی ئەو بەجەستەییبوونەی دەسەڵات لە دونیای ئێمەدا

لەپاڵ هەندێک لە تێزەکانی فۆکۆدا بخوێنمەوە.

-٧-

فۆکۆ لەباسکردنیدا بۆ جەستەی ئەمیر، یان جەستەی سەرۆک ئەو ڕاستییە نیشاندەدات ئەم جەستەیە ئیستیعارەیەکی سیاسی، یان سیمبۆلێک نییە بۆ دەسەڵاتێک لەدەرەوەی خۆیدا، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەو جەستەیە خۆی واقیع و هەقیقەتی دەسەڵاتە. بەمانایەکی دیکە لەم شێوە دەسەڵاتەدا جەستەی سەرۆک تەعبیر لە دەسەڵاتی حیزب ناکات، یان تەعبیر لەدەسەڵاتی هێزێکی دیاریکراو، ئەوەندەی ئەو جەستەیە تەعبیر لەخودی دەسەڵات خۆی دەکات و لەناوخۆیدا ماناکانی یاسا و سەروەری و داوەریشی هەڵگرتووە. جەستەی سەرۆک لەم بۆچوونەدا جەستەیەک نییە ڕۆڵی ڕەمزێکی سیاسی ببینێت، بەڵکو جەستەیەکە خۆی خودی سیاسەت و خۆی خودی دەسەڵاتە. جەستەی سەرۆک لەم دۆخەدا دەبێتە تیشکۆیەک و دەسەڵات لەو تیشکۆیەوە دەردەچێت و بەسەر هەموو کایەکاندا بڵاودەبێتەوە.

گواستنەوە لە جەستەی سەرۆکەوە بۆ جەستەی کۆمەڵگا و دانانی بیرۆکەی کۆمەڵگا لەشوێنی ئەمیر، یان پادشا، جەوهەری پرۆسەی مۆدێرنیزەی سیاسییە، مۆدێرنیزەی سیاسی مانای کردنی کۆمەڵگایە بەسەرچاوەی دەسەڵات، نەک جەستەی سەرۆک، ئەو شتەش، کە دەبێت بپارێزرێت جەستەی سەرۆک نییە، بەڵکو جەستەی کۆمەڵگایە.(٥٠) هاوکات ئەو لایەنەش، کە تاکەکان لەبەردەمیدا دەبێت وەلائەتی قووڵی خۆیان نیشاندەن دیسانەوە سەرۆک نییە، بەڵکو کۆمەڵگایە، خودلوەند نییە بەڵکو "پەیمانی کۆمەلایەتییە". بەبێ ئەم گۆڕانە

ناتوانین قسە لە هیچ تازەگەرییەکی سیاسی بکەین و ناتوانین قسە لە هیچ پرۆژەیەکی دابەشکردن و لێکدی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان و بەشداربوونی کۆمەڵگا لەدەرکردنی بڕیارە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکاندا بکەین. ڕەنگە سەدام حوسەین باشترین نموونەیەک بێت سیفەتەکانی دەسەڵاتی جەستەییمان نیشانبدات. سەدام ڕەمزی دەسەڵاتێک نییە لەدەرەوەی خۆیدا و لەوبەر ئامادەگییە فیزیایی و نافیزیاییەکەی خۆیەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەو خۆی خودی دەسەڵاتە بەهەموو ئەو مانایانەی دەسەڵاتی جەستەیی لەخۆیدەگرێت. بەڕادەیەک قسە و نوکتە و تووڕەبوونەکانی سەدام چیدی قسە و نوکتە و تووڕەبوونی سادە نەبوون و نین، بەڵکو هەریەکێکیان حوکمی یاسایان هەبووە و هەیە. هێمای پەنجەکانی سەدام ئەو هێمایانەن دەسەڵات بۆ دەرەوەی خۆی دەیکات، ڕووگرژکردنی بەڕووی کەس و تاقم و گرووپێکدا مانای هەڕەشە و زۆرجار ئەمری دەسەڵاتە بە مەرگ بەڕووی ئەوانەدا. سەدام دەسەڵاتێکە لەساتەوەختی غیابی دەزگا و دەرکەوتی دەرەکیدا، دەسەڵاتە لە دۆخی گەڕۆکیدا، سەدام دەسەڵاتێکە دوو پێ و دوو دەست و دوو چاو و دوو گوێی هەیە. سایکۆلۆژیای سەدام چیدی سایکۆلۆژیای پیاوێک نییە، بەڵکو خودی سایکۆلۆژیای دەسەڵاتە و فانتازیاکانی سەدامیش شتێکی دیکە نین جگە لە فانتازیاکانی دەسەڵات لە عێراقدا. لێرەوە جیاکردنەوەی دەسەڵات لە عێراقدا لە جەستەی سەدام، یان کردنی بە سیمبۆلێک بۆ دەسەڵاتی گروهێک، یان چینێکی دیاریکرلو هەڵەیەکی تیۆری گەورەیە. ئەم بەجەستەییبوونەی دەسەڵات دەشێت لەساتێک لەساتەکاندا بە قازانجی هێزێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو بشکێتەوە، بەڵام هیچ زامنێک لەئارادا نییە هەمان ئەو هێزە لەلایەن هەمان ئەو دەسەڵاتەوە کەنارگیرنەکرێت و بەتەواویش بنەماکانی هێز و دەسەڵات و تەنانەت بوونیشی، لێنەسێندرێتەوە.

بێگومان دەسەڵات کاتێک دەتوانێت لەجەستەیەکدا کۆبێتەوە، کە لەدەرەوەیدا هیچ

پایەیەک لە پایەکانی دەسەڵات نەمابێت ئەو جەستەیە بە ئاسانی نەیتوانیبێت لەبەریەکدیان هەڵوەشێنێتەوە، لە پایە کۆمەڵایەتییەکانی دەسەڵاتەوە بیگرە بۆ پایە سیاسی و فەرهەنگی و فیکری و یاساییەکانی دەسەڵات. بەمانایەکی دیکە دەسەڵات کاتێک دەبێتە دەسەڵاتێکی جەستەیی، کە جەستە ڕۆڵی ئەو میتاسەرمایەیە ببینێت، کە دەتوانێت کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر هەموو فۆرمەکانی دیکەی سەرمایە هەبێت. بەم مانایە ئەزموونی بەعس لە عێراقدا بە پلەی یەکەم ئەزموونی بە جەستەییکردنی میتادەسەڵاتە، بەشەخسیکردنی دەوڵەت و بەشەخسیکردنی حیزبە.

لەدونیای ئێمەدا دەسەڵات هەمان شوناسی هەیە و بەهەمان ئەو شێوەیە کاردەکات، کە لە عێراقدا کارپێدەکرێت. پرۆسەی بەجەستەییکردنی دەسەڵات لە دونیای ئێمەدا هەمان ئەو چارەنووسە بەو دەزگا و لایەنانە دەبەخشێت، کە سەدام لە عێراقدا بەدەرەوەی خۆی دەبەخشی. بۆنموونە دەزگایەکی گرنگی وەک "پەرلەمانی کوردستان" بووە دەزگایەکی ئیفیلجی بێهێز و بێپەنا کاتێک جەستەی تاڵەبانی و بارزانی لەدەرەوەی پەرلەماندا مانەوە. بێگومان خۆمان بە سەهویەکی گەورەدا دەبەین گەر پێمان وابێت بەگواستنەوەی ئەو دوو جەستەیە بۆناو پەرلەمانی کوردستان، ئیدی دەسەڵات لە جەستەی سەرکردەکانەوە دەگواسترایەوە بۆ دەزگاکان، لە ژووری نووستن و دانیشتن و مەکتەبەکەی تاڵەبانی و بارزانییەوە دەگواسترێتەوە بۆناو دەزگا جیاجیاکانی حوکمەت و پەرلەمان. گۆڕینی دەسەڵاتی جەستەیی بۆ دەسەڵاتێکی دەزگایی پێویستی بەتێکشکانی ئەو بونیادەی دەسەڵاتە، کە دەسەڵاتەکان دەخاتەوە ناو جەستەکان. تێکشکانی ئەو بونیادە پێویستی بە پرۆژەیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی هەیە، کە دەشێت بە "پرۆژەی بەهێزکردن و ئازادکردنی هێزە جیاوازەکانی ناو کۆمەڵگای مەدەنی" ناویبەرین. ئەم پرۆژەیە بەپلەی یەکەم وابەستەی ئەوەیە حیزب واز لە هەموو ئەو مۆنۆپۆلیزە

ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگیان بهێنێت، کە کۆمەڵگای پێکیـرۆدە کـردووە و لەنـاوەوەڕا وزەی هەر گـۆڕان و هەسـتانەوەیەکی ڕەخنەگـرانەی تیـا کوشـتووە. پرۆژەیەکـی لەم بابەتە لە جەوهەردا ئیشـکردنێکی عەقڵانـی سیاسـیە تیایدا گەشەی کۆمەڵگا و هێزە جیاجیاکانی ناو کۆمەڵگا و دابەشکردنی دەسـەڵات بەسـەر ئەو هێـزانە و کۆنەکردنەوەی لە سـێنتەرێکی بچـووک و بەرتەسـکدا هـێڵە گشتییەکانی دەنەخشێنێت. لێرەوە پرسیاری سەرەکی دەسەڵات چیدی پرسیارێک نییە وابەستە بە کەسی ژمارە یەکەوە، بەڵکو وەک فۆکۆ دەڵێت، دەبێتە پرسیاری ئەوەی :"چـۆن منـاڵان بەڕێـوەئەبرێن، چۆن هەژاران بەڕێـوەئەبرێن، چـۆن خێـزان بەڕێوەئەبرێـت، چـۆن مـاڵ بەڕێوەئەبرێـت، چـۆن سـوپا بەڕێوەئەبرێـت، چـۆن گروپەکان، شارەکان، دەوڵەتەکان بەڕێـوەئەبرێن، چۆن خەڵـک جەسـتە و ڕۆحـی خۆیـان بەڕێـوەدەبەن".(٥١) ئەڵـێم ئەگەر ئەمە پرسـیاری سیاسـەت بێـت لە دونیایەکی عەقڵانیدا، ئەوا پرسیاری سیاسی لای ئێمە تائێستاش بـریتییە لەوەی چۆن منـاڵان ڕاکێشـینە نـاو ڕیزەکـانی حیـزبەوە، چۆن هەژاران ناچـاریکەین ببـنە سووتەمەنی میلیشیاکانی حیزب، چۆن حیزب دابەزێتە ناو خێزان و پەیوەندییەکانی خزمخـواهیەوە، چـۆن سـوپا بکـرێتە سـووپای حیـزب، چـۆن جەسـتە و ڕۆح ئیفیلجکرێن و هەردووکیان بە ڕەوڕەوەکانی حیزبەوە ببەسترێنەوە، بەکورتی چۆن هەموو کۆمەڵگا تەسلیم بە حیزب بکرێت و چـۆن ئینسـان بکـرێتە سـواڵکەری بەر دەرگاکانی حیزب؟

یەکێـک لە دەرەنجـامە هەرە گرنگەکـانی لێکـۆڵینەوەی دەسـەڵاتی جەسـتەیی لای فۆکۆ دۆزینـەوەی ئەو ڕاسـتییەیە، کە ئەم دەسـەڵاتە بـۆئەوەی بـژی و بمێنێـتەوە دەبێت بەردەوام لەسەر مەرگ کاربکات. فۆکۆ لەم ڕووەوە دەنوسێت :"پاشا چۆن دەسەڵات بەسەر ژیاندا پیادەکات ئەگەر مافی کوشتنی نەبێت".(٥٢). بەمانـایەکی دیکە دەسەڵاتی جەستەیی بۆئەوەی بتوانێت لە ژیاندا بمێنێـتەوە و بتوانێـت لەنـاو

ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیدا دەستبەکاربێت، ئەبێت هەمیشە لە گەڕاندنەوەیەکی بەردەوامدابێت بۆ ئەو مافی کوشتنەی پاشا بە موڵکی خۆی دەزانێت. بۆیە ئەو تەکنیکەی دەسەڵات بۆسەروەری پادشا بەکاریدەهێنێت دەبێتە تەکنیکی سزا و ترساندن و هەڕەشە بە مەرگ. لە کۆمەڵگـایەکی داگیرکـراودا بە دەسـەڵاتی جەستەیی هەڕەشە و ترساندن بە مەرگ هێڵە گشتییەکانی ئیشکردنی دەسەڵاتن، بۆیە ئاسۆکانی ئینسان، بە تایبەتی ئاسۆکانی سەربەخۆبوون و ئازادبوونی، لە کۆمەڵگایانەدا زیاتر لە گۆڕستان دەچن تا ئاسۆیەک بۆ ئازادی. لەدونیـای ئێمەدا سزا پرۆسەیەکی هەمەلایەنە و ئەوانەی سزادەدرێن دەشێت هەم تاکەکەس هەم گروپ بن. ئەزموونی بەعس لە پەیوەندیدا بە ئێمەوە وەک کورد چییە جگە لە ئەزموونی سزادانی جەماعی جەستەی نەتەوەیەک تا سنووری وێرانکردن و مەحفکردنەوەی یەکجارەکی. ئەنفال چییە جگە لە پەلاماری بێئامانی دەسەڵات بۆ لەبەریەک هەڵوەشاندنەوەی جەستەی میلەتێک. شەڕی پارتی و یەکێتی چیبوو جگە لە تەمای لەناوبردنی سەرتاسەری و هەمەلایەنی دوو هێزی سیاسی بۆ یەکتری. لێرەوە سزا لە دونیای ئێمەدا بەتەنها دەستدرێژیکردنە سەر مافێک لە مافەکان، یاخود سنووردانان بۆ ئازادییەک لە ئازادییەکان نییە، بەپێچەوانەوە سزا تێکشکانی ئەو جەستانەیە، کە دەشێت ڕۆژێک لە ڕۆژان ئازادی و مافیان بووێت، وێرانکردنی ئەو ڕۆحانەیە، کە دەشێت بۆ ساتێک لەساتەکان بۆ ستراتیژێکی دیکەی دەسەڵات و ڕیزبەستنێکی دیکەی هێزەکان بگەڕێن. لەسەرێکی دیکەشەوە سزا بەتەنها دانانی قەیدێک نییە لەسەر ئازادی، بەڵکو سڕینەوەیەکی یەکجارەکی بیرۆکەی ئازادییە. لە کۆمەڵگایەکی وەکو کۆمەڵگای ئێمەدلو لەپاڵ ستراتیژیەتی دەسەڵاتی جەستەیدا جەلاد بکەری یەکەم، یان لانیکەم یەکێک لەبکەرە هەرە گرنگەکانە، لەکاتێکدا لە کۆمەڵگاکانی ڕۆژئاوادا بۆ نموونە، وەک فۆکۆ دەڵێت، "سووپایەک لە چاودێریکەر و پزیشک و قەشە و سایکۆلۆژیست شوێنی جەلادیان

گرتۆتەوە". گواستنەوە لە جەلادەوە بۆ سایکۆلۆژیست گواستنەوەیە لە دەسەڵاتێک لەسەر مەرگ کاردەکات بۆ دەسەڵاتێک لەسەر ژیان کاردەکات.

-۸-

تەکنیکی سەرەکی ئەودەسەڵاتەی لەسەر مەرگ کاردەکات بە "شانۆییکردنی مەرگە". بەشانۆییکردنی مەرگ مانای گێڕانی ئاهەنگ لە سەر لاشەی کوژراوەکان، کردنی مەرگ بە دیمەنێکی دیتراو لەنێوان دەسەڵاتی سیاسی و خەڵکدا. ئەمەش لەجەوهەردا مانای بنیادنانی دونیایەک لەترس، کە بەردەوام مەرگ بەبیری ئینسانەکان بهێنێتەوە. لە عێراقدا ئەم دونیا تۆقێنەرە یادەوەری هەر یەکێکمانی پڕکردبوو لە وێنەی ئەو کوژراوانەی لاشەیان بووبوو بە قەرەبروت. بەبێخولقاندنی یادەوەرییەک پڕکراو لە ترس و لە دیمەنی ترسنامێز،بەعس نەیدەتوانی درێژە بە دەسەڵاتی خۆییدات. نیشاندانی جەستە کوژراوەکان لەسەر شاشەی تەلەفیزۆنەکان، کۆکردنەوەی خەڵک لەدەوری گوولەبارانەکان، هەلهەلەکێشان بەسەر جەستەی کوژراوەکاندا، بە کورتی نەشاردنەوەی سزاکان ئەو تەکنیکە سەرەکییەیە دەسەڵاتی سزابەخش کاریپێدەکات. ئەمەش مانای تێکەڵکردنی ترس و مەرگ، هەڕەشە و کوشتن، یادەوەری و دەسەڵاتی سیاسی، کونجی زیندانەکان و بەردەرگای ماڵان، گۆڕەپانی فوتبۆڵێن و فولکە گشتییەکان و بەردەمی خەستەخانەکان بە ئاهەنگی گوولەبارانەکان. هەموو ئەمانە بەسەریەکەوە ئەو تەکنیکە سەرەکییەیە مەرگ و سزا لە دیمەنێکی شانۆیدا بەیەکەوە کۆدەکاتەوە.

دەشێت تەکنیکی دووهەمی ئەم شێوە دەسەڵاتە بە تەکنیکی "جیانەکردنەوەی موڵکیەت و ماف لە جەستە" ناوببەین. ئەگەر لە گەشەی کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکاندا

و لەساتێک لەساتەکاندا سزادان لە سزای جەستەوە گوسترابێتەوە بۆ سزای "لەدەستدانی موڵکیەت و نۆڕاندنی ماف"، ئەوا لەدونیای ئێمەدا تاڕادەیەکی زۆر ئەو دوو مەسەلەیە یەکشتن و بەشێوەیەکی بەرفراوان بەناویەکداچوون. زۆرجار سەندنەوەی موڵکیەت لە کەسێک شانبەشانی سەندنەوەی ژیان بووە لێی و سەندنەوەی ژیانیش لێی مانای نۆڕاندنی هەموو مافێکی موڵکداری بووە. بێگومان نۆڕاندنی موڵکیەت بە پێویست مانای نۆڕاندنی ژیان نییە، بەڵام تێکەڵکردنی ئەم دوولایەنە بە یەکتری یەکێکە لەو تەکنیکانەی دەسەڵاتی سزابەخش کاریپێدەکات. لەعێراقدا هەرکەسێک بەعس گومانی لێبکردایە بەتەنها دەست بەسەر و سەروەت و سامانیدا نەئەگیرا، بەڵکو دەکوژرا، یان لەکونجی زیندانەکاندا سەرنگوون دەکرا.

تەکنیکی سێهەم بریتیە لە "گەمەی بەردەوامی داهێنانی تاوانی نوێ". لەعێراقدا ئەم تەکنیکەی دەسەڵات کاریگەرییەکی زۆر کوشندەی هەبوو، چونکە لەڕاستیدا تەکنیکێک بوو لەسەر سڕینەوەی سنووری نێوان تاوان و بێتاوانی کاریدەکرد. ئەم تەکنیکە تێکەڵکردنێکی بەئەنقسەتی ڕەوشتی ئاسایی ئینسان بوو بە ڕەوشتی تاوانبار. لە عێراقدا بۆنموونە هێشتنەوەی ڕیش، لەبەرکردنی جلی ڕەش، بەشدارنەبوون لەبۆنە گشتییەکاندا، نەکڕینی کتێبەکانی سەرۆک، نوکتەیەکی 'مەترسیدار'، هەبوونی کۆمەڵێک کتێبی تایبەت، کڕینی تابیعەیەک، گۆڕینی قەناتی تەلەفیزۆن لەکاتی دەنگ و باس و هەندێک بەرنامەی دیکەدا، ئاوڕدانەوە لەدواوە لەهەندێک شەقام و شوێنی تایبەتدا، ئەمانە و چەندەها 'تاوانی' دیکەیەی لەم بابەتە بەسبوون بۆئەوەی مرۆڤ ژیانی خۆی لەدەستبدات. ئەم تاوانانە ئەوەندە گشتی و ئاسایین، دەکرێت لەهەرساتێکدا هەر کەسێکی پێ تاوانبار بکرێت. لە دۆخێکی لەم بابەتەدا خودی ژیانی ڕۆژانە خۆی دەبێتە سەرچاوەی تاوانباربوونێکی بەردەوام. لەعێراقدا زۆرجار ژیان خۆی تاوانێک بوو لەپاڵ تاوانەکانی دیکەدا.

چوارەمین تەکنیکی ئەم شێوە دەسەڵاتە دەکرێت بە "تۆتالیتاریزمی شوێن"

ناویبەین. ئەم تەکنیکەی دەسەڵاتە تەکنیکێکە لەڕێگایەوە دەسەڵات ئینسان لە فەزایەکدا جێگیردەکات نەتوانێت لەناویدا جیاوازی لەنێوان شوێنی ئاسایی و زیندان و بەندیخانە شاراوەکاندا بکات. ئەوەی لە عێراقدا شوێنی سەرنجە سڕینەوەی سنووره لەنێوان شوێنە جیاوازەکاندا و تێکەڵکردنیانە بەیەکتری. بۆنموونە ئەگەر زانکۆکانی عێراق تەماشابکەین دەبینین هەریەکێکیان لەیەککاتدا تێکەڵکردنێکی بەئەنقەستی زیاد لە شوێنێکی دژ بەیەکن. ژووری یەکێتی قوتابیان لەیەککاتدا هەم ژووری کاروباری تایبەتی قوتابیان و هەم ژووری لێپرسینەوەی سیاسی و هەم ژووری سزادانی ئەو قوتابیانەش بوو، کە بە قوتابی 'نامەرغوب' ناودەبران. ژووری ئەفسەرەکانی ئاسایش بەهەمانشێوە لەیەککاتدا ژووری بەرجەستەکردنی دەسەڵاتی سیاسی و ژووری ترساندن و ژووری سزادانی قوتابیان و مامۆستایان و فەرمانبەران بوو. ئەمە جگە لە ژووری پۆلیس و ژوری ئەمنی بەردەرگا و ئەو دەیان ژوورە چکۆلە و تاریکانەی تریش، کە زانکۆکانیان لە یەککاتدا لە شوێنی فێربوون و خوێندنەوە، دەکردە شوێنی چاودێری و سزا. ئەم تەکنیکەی دەسەڵات بەرهەمهێنانەوەی دەزگاکانی سزادان و چاودێریکردنی ئەمنی بوو لەناو ڕاڕەو و پۆلەکانی خوێندندا. ئەمەش تێکەڵکردنێکی بەئەنقەستی دوو تۆپۆگرافیای جیاوازە بەنیازی بەرهەمهێنانی فانتازیایەکی تایبەت بەرامبەر بە شوێن، کە بەردەوام سنوری نێوان شوێنە جیاجیاکان لە خەیاڵی تاکەکەسدا تێکەڵبکات و لەوێشەوە لە هەموو "شوێن"ێکدا ستراتیژیەتی سزا ببینێت. ئەمەش لەجەوهەردا بەگشتیکردنی شوێنەکانی سزا و بە دیتراوکردنێکی بەردەوامی سزادانبوو. بەعس بەهۆی ئەم تەکنیکەی دەسەڵاتەوە ژوورەکانی ئازار و ئەشکەنجەی، لانیکەم لە فانتازیای ئینسانی عێراقیدا، بەسەر هەموو شوێنەکانی دیکەدا بڵاو دەکردەوە. هەموو ژێرزەمینێک، هەموو خانوویەکی چۆڵ لە زەینی ئینسانی عێراقیدا زیندانێک، یان پرۆژەی زیندانێک بوو. لەڕۆژی یەکەمی ڕاپەڕیندا خەڵکێکی زۆر لە سلێمانی گوێیان

ئەنا بە کوونی زێرابی سەرجادەکانەوە و دەیانگوت گوێمان لە هاواری زینـدانییانە.
بەعـس لەزەینـی زۆربەمانـدا هەمـوو خـانویەکی چـۆڵ، یـان ژێرزەمینێکـی تـاریکی
کردبووە ئەگەری زیندانێک. بەمجۆرە زینـدان تەنهـا شـوێنێکی دیـاریکراو و ناسـراو
نەبوو، بەڵکو فەزایەکی کراوە بوو ڕۆژانە بەناویدا دەهاتین و دەچووین.
بێگومـان مەسـەلەی بە زینـدانکردنی هەمـوو شـوێنەکان لە فانتازیـای ئـێمەدا
تاڕادەیەکی زۆر وابەستەی ئەوەش بوو بەعس لەهەموو گەڕەک و شەقامێکدا بنکەی
تـایبەتی گـاردی میلـی و حیـزب و چەنـدان دەزگـای دیـکەی دروسـتکردبوو. ئەم
دەزگایانە سەرەڕای ئەوەی ئەرکی چاودێریکردنی دانیشتوانی ئەو شوێنەیان هەبوو،
لەهەمانکاتدا وێنەی ئەو زیندانەشی نیشانئەدان، کە بە هەر یەکێک لەوان نزیکبوو،
زۆر نزیکبوو.

-٩-

بۆئەوەی باشتر لەدەسەڵاتی جەستەیی بگەین ڕەنگە لێرەدا گەڕانەوە بـۆ چەمکـی
دەسەڵاتی کـاریزمی لای مـاکس ڤێبەر سوودبەخشـبێت. دەسـەڵاتی کـاریزمی لای
ڤێبەر دەسەڵاتێکی جەستەییە و ڕاستەوخۆی هەڵقوڵاوی نـاو ئەو توانـا و سـیفەتە
تایبەتـانەیە، کە کەسـێکی دیـاریکراو هەڵگریەتـی. بە بـڕوای مـن جیـاوازی
هەرەسەرەکی نێوان بۆچوونی فۆکۆ دەربارەی بە جەستەییکردنی دەسـەڵات لەگەڵ
بۆچوونی ماکس ڤێبەردا دەربارەی دەسـەڵاتی کـاریزمی لەوەدایە فۆکـۆ دەسـەڵاتی
جەستەیی بە دەسەڵاتێکی بەر لە مۆدێرن دادەنێت و ڕاسـتەوخۆ ئەیبەسـتێتەوە بە
سزا و کۆمەڵگـای سـزاوە بەر لە پـڕۆژەی مـۆدێرنە، لەکاتێکدا ڤێبەر دەسـەڵاتی
کـاریزمی بە وابەسـتەی قۆنـاغێکی دیـاریکراو دانانێـت. لە بۆچـوونی ڤێـبەردا

دەسەڵاتی کاریزمی ئەو شێوەیەیە لە دەسەڵات وەکچۆن دەشێت پێغەمبەرێک، یان سیحریازێک هەڵگرییێت، ئاواش دەشێت سەرۆکی حیزبێکی مۆدێرن، یان سەرۆکی دەوڵەتێک هەڵگرییێت. (٥٤)

یەکێک لە تەکنیکە هەرەسەرەکییەکانی دەسەڵاتی کاریزمی ئەوەیە دەیەوێت وابنیشاندات هەڵگری پرۆژەیەکی فەرهەنگی و سیاسی و کۆمەڵایەتییە و بەرجەستەکردنی ئەو پرۆژەیەش وابەستەی بوون و ئامادەبوونی ئەو سەرۆکە کاریزمییەیە، کە گوایە خودی پرۆژەکە لەبوونی خۆی بەگرنگتر دادەنێت. باشترین نموونە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم مەسەلەیە مەسەلەی 'یەکێتی عەرەب' و نیشاندانی سەدام حوسەینە وەک ئەسپسواری جێبەجێکردنی ئەم یەکیەتییە پێشنیارکراوە. هاوکات دەسەڵاتی کاریزمی هەمیشە هەڵگری چیرۆکێکی ڕزگارییە و هەمیشە دوژمنێکیش دروستدەکات ئەو چیرۆکی ڕزگارییە بخاتە مەترسییەوە، بۆیە دەسەڵاتی کاریزمی هەم داوا لە سەرۆک و هەم داوا لەخەڵک دەکات بەردەوام چاویان کراوەبێت بۆ دیتن و لەناوبردنی ئەو دوژمنانە. دەسەڵاتی کاریزمی بەردەوام خەونی ئەوە دەبینێت هەموو نەتەوە بکات بە ئەندامی ئەو دەزگا چاودێرییانەی دروستدەکرێت بۆ پاراستنی سەرۆک و بۆ بەگژاچوونەوەی دوژمنانی نەتەوە. دەسەڵاتی کاریزمی دەسەڵاتێکە بێدروستکردنی ئەو دوژمنە دەرەکییە، کە هەڕەشە لە نەتەوە و نیشتیمان و ئازادی و پێشکەوتن دەکات، نازێ. ئەم دەسەڵاتە بەردەوام پێویستی بە ناحەزانی ڕاستەقینە و ڕەمزی هەیە، بۆیە گەر ناحەز نەبوو ئەوا بە شێوەیەک لە شێوەکان دایاندەهێنێت و دروستیاندەکات.

دروستکردنی دوژمنی وەهمی و ڕاستەقینە میکانیزمێکە بێدەنگکردن و کوشتنی ئەو پرسیارانەی لەپشتەوەیە، کە دەشێت بەشێوەیەکی ڕەخنەیی ڕوویەڕووی کاریزما بکرێتەوە. مادامەکی دوژمنان ئامادەن دەبێت هەموان بێدەنگبین لە کاریزما و هەڵەکانی کاریزما، بێدەنگبین لەو دونیا پڕ ترس و تۆقاندنەی کاریزما

دروستیدەکات، بێدەگنبین لەبەدوژمنکردن و لەناوبردنی هەموو ئەو هێزانەی دەشێت لەبەرامبەر پرۆژەی کاریزمادا هەڵگری پرۆژەی دیکەی دەسەڵاتبن. کاریزما هەموو پرسیارێک دەربارەی چۆنیەتی ئیشکردنی دەسەڵات، مافەکانی دەسەڵات، ئەرکەکانی، چۆنیەتی پیادەکردن و پاراستنی بێدەنگدەکات. کاریزما دونیایەکی کپکراو و بێدەنگی دەوێت تەنها سەرۆکی کاریزمی بتوانێت لەناویدا بدوێت، دوژمنی هەرە سەرەکی کاریزما زمانێکە بتوانێت زیاد لەمانایەکی هەبێت و زیاد لە ڕەهەندێکی دەلالی، کاریزما زمانێکی دەوێت نەتوانێت لەدەرەوەی ڕێزمان و فەرهەنگی کاریزمادا بدوێت.

دەسەڵاتی کاریزمی هەمیشە خۆشی بە سەرپۆشێک لە پیرۆزی دادەپۆشێت، سەرۆکی کاریزمی هەیشە ئەو پیاوەیە، کە پیرۆزە و پیرۆزیەکەشی وابەستەی بوونی ئەوە وەک پیاوێکی خاوەن کاریزما، بەشێکی دیکەشی وابەستەی پیرۆزی ئەو مەسەلەیە ئەو خۆی بە نوێنەر، یان هەڵگر، یان خولقێنەری دەزانێت. ئەم پیرۆزگەراییە وادەکات کاریزما لە ئاستی ئایدیۆلۆژیادا بە زمانێک بدوێت هەڵگری گراماتیک و فەرهەنگ و وێنەکانی ئایین و موقەدەسە جیاوازەکانبێت. گەورەترین مەترسیی دەسەڵاتی کاریزمی بەرهەمهێنانی وابەستەییەکی سەرتاسەری کوشندەیە، وابەستەییەک هەموو تواناکان دەبەستێتەوە بە توانا پێشنیار و گریمانکراوەکانی سەرۆکەوە. کاریزما جۆرێک لە پاشکۆیەتی ئەخولقێنێت، کە هێزی داهێنەرانەی مرۆڤ دەکوژێت. پاشکۆیەتی خەڵک بۆ کاریزما مانای کوشتنی هێز و توانای دەستپێشخەری و ڕۆحیەتی ئۆتۆنۆمانەیە لەناو خەڵکدا. کاریزما لەوکاتەدا، کە دەسەڵاتێکە و شانیدادوەتە سەر ئیرادە و ویستی سەرۆکێک، لەهەمانکاتدا سەرچاوەی کوشتن و ئیفلیجکردنی ئیرادەی کۆیی خەڵک و هێزە کۆمەڵایەتییەکانی دەرەوەی بازنەکانی سەرۆکە. بە کورتی کاریزما پرۆژەی کردنی سەرۆکە بە خودلوەند و کردنی خەڵکە بە ڕەعیەت. دەسەڵاتی کاریزمی، چونکە خۆی وەک

دەسەڵاتێکی پیرۆز نیشاندەدات، بۆیە بەردەوام وایپیشاندەدات پێویستی بە قوربانی هەیە. چەندە قوربانییەکانیش بەژمارە گەورە و زۆرین و لەڕووی چۆنایەتییەوە بەنرخ و بەهادار بن، ئەوەندە دەسەڵاتی کاریزمی پیرۆزی خۆی گەورەتر و هەمەلایەنتر دەکات. لێرەوە "گوتاری قوربانی" هەمیشە بەشێکی دانەبڕاوی دەسەڵاتی کاریزمییە. لەم گوتارەدا سنوورەکانی قوربانیدان ئەوەندە گەورەدەکرێت هەموو ڕووەکانی ژیان دەگرێتەخۆی، لە قوربانیدانەوە بۆ نیشتیمان بۆ قوربانیدان بۆ پێشکەوتنی ئابووری، لە قوربانیدانەوە بۆ نەتەوە و سەرۆک خۆیەوە، بۆ قوربانیدان بۆ مێژوو و حیزب و ئایدیۆلۆژیا و بیرو بۆچوونەکانی سەرۆک. لەدنیایەکی ئاوادا ئەوەی بەر لە هەمووشتێک سووکایەتی پێدەکرێت خودی ژیان خۆیەتی و ئەوەی پاڵەوانی ئەم سوکایەتیەشە کاریزمایە.

لێرەوە دوژمنی هەرەسەرەکی کاریزما ئەو گوتارە مەعریفیەیە، کە بایەخ بۆ ژیان دەگێڕێتەوە و داوای بچووککردنەوە و عەقڵانیکردنی پانتاییەکانی قوربانیدان دەکات. گرنگیدان بە ژیان مانای بەگژاچونەوەی ئەو دەسەڵاتەی لەسەر مەرگ و لەسەر سزادان کاردەکات، مانای ئەوەی ئەو مافانە لەدەسەڵات بسەندرێتەوە، کە ڕاستەوخۆ لەسەر سەندنەوەی ژیان لە کەسێک، یان لە گروپێک بنیادنراوە. گێڕانەویە بایەخەکان بۆژیان، مانای کردنی سەرۆکیش بە کەسێک وەک کەسەکانی دیکە و دابەزاندنی لەسەرزەمینی پیرۆزییەوە بۆناو مێژوو و ڕوداوەکان و بەرپرسیارکردنی بەرامبەر بە دەرەنجامی بڕیارەکانی. گرنگترین پرسیارێک لێرەدا پێویستی بەوەڵامدانەوە هەبێت بریتیە لە چارەنوسی کایەکان، داخۆ کایەکان لە بەردەم دەسەڵاتی کاریزمیدا چییان لێدێت؟ چۆن مەوقیعەکانی ناو کایەکان ڕیزدەبن و چ جۆرە پەیوەندییەکیان لەنێواندا دروستدەبێت؟

یەکەمین شتێک دەسەڵاتی کاریزما بەرامبەر بەکایەکان بیکات کۆنتڕۆڵ و مۆنۆپۆلکردنی ژیانی ناوەکی کایەکانە، چاودێریکردنێکی وردی کۆی جوڵە و

ململانێ و ئاڵوگۆڕەی ناو کایەکانە. ئەم چاودێرییە ئەوەندە بەرفراوان و فرەڕەهەندە کایەکان لەوەدەکەون بە کایە ناوببرێن، لەراستیدا لەم دۆخەدا کایەکان دەبن بە جیهاز. گۆڕانی کایەکان بە جیهاز بەپلەی یەکەم کوشتنی لۆژیکی ناوەکی کایەکان و ئەو وزە و هێز و کێبەرکێ کۆمەڵایەتی و سیاسیانەیە، کە دەشێت کایەکان لە ناوەوەڕا هەڵگریبن. گۆڕینی کایەکان بە جیهاز، وەک پێشتریش باسمانکرد، مانای گۆڕینی کایەکان لە سەرزەمینی ململانێوە بۆ دونیایەکی کپکراو و لە کۆمەڵێک وزەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتورییەوە بۆ جەستەیەکی بەنجکراو و لە دونیایەکی کراوەوە بۆ سەرزەمینێکی قوفڵدراو و مۆنۆپۆلیزەکراو. لە دونیای ئێمەدا زۆربەی هەرەزۆری کایەکان مۆنۆپۆلیزەکراون، بەتایبەتی کایەی دەسەڵات. لەم کایانەدا گروهێکی دیاریکراو ژیانی کایەکەی بەتەواوی داگیرکردووە و زۆربەی هەرە زۆری گروهەکانی دیکەی چەپاندووە. ئەم چەپاندنەش بەجۆرێک پڕمەترسییە هەر هێزێک بیەوێت لێی دەربازبێت، دەبێت بەر لەهەر شتێک بوونی کۆمەڵایەتی و سیاسی خۆی بخاتە مەترسییەوە. گەر لێشی دەربازنەبێت ئەوا ئەو سەرمایە ڕەمزیەی هەڵگریەتی بەتەواوی بێبەها و بێنرخ دەبێت و ئەمەش وادەکات نەتوانێت لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە چالاکبێت. کایەی دەسەڵات لەدونیای ئێمەدا بەجۆرێک لە ناکۆکی ناوەکی بەتاڵکراوەتەوە تێیدا مەوقیعی گروهی باڵادەست لە ناو خودی کایەکەدا لە بەردەم هیچ مەترسیەکی دیاریکراودا نییە.

پەکخستنی سەرمایەی ڕەمزی گروهە نوێیەکان یەکێکە لەو ستراتیژەی لەڕێیەوە کایەکان لە هەر وزەیەکی ناوەکی بەتاڵدەکرێنەوە. با کایەی سەربازی لە عێراقدا وەک نموونە بهێنینەوە. هەموومان دەزانین کایەی سەربازی لە عێراقدا باڵادەسترین کایەیە و سەرمایەی سەربازی گرنگترین و بەهێزترین شێوەی سەرمایەی ڕەمزی بوو، بەڕادەیەک دەشێت بڵێین سەرمایەی سەربازی لەو شێوە سەرمایەیە دەچێت، کە بۆردیۆ دەڵێت لەناو هەموو کایەکانی دیکەشدا دەخوات. خەونی بەعس لە

جەوهەردا خەونی بە سەربازگەکردنی عێراق بوو، بەعس کۆمەڵگایەکی عەقڵانی نەدەویست، بەڵکو سەربازگەیەکی دەویست بتوانێت لەناوەوە خۆی دیسپلین و حوکمی کات. پرۆژەی بەسەربازگەکردنی کۆمەڵگای عێراقی ئەو زەمینە کۆمەڵایەتی و سیاسییە تێیدا سەرمایەی سەربازی دەبێتە گرنگترین شێوەکانی سەرمایە. بەڵام داخۆ بەعس چۆن مامەڵەی ئەم کایە گرنگەی لە عێراقدا دەکرد؟

دەشێت لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا بڵێین یەکەمین شتێک بەعس لە عێراقدا کردبێتی تێکشکاندنی لۆژیکی ناوەکی کایەی سەربازی بوو. هەر کردنی سەدام بە سەرۆکی گشتی هەموو هێزە چەکدارەکان و بەخشینی گەورەترین مەرتەبەی سەربازی پێی خۆی یەکەمین شەپازلەی بەعسە لە ڕوخساری ئەم کایەیە. لەدوای ئەمەوە بەعس لەناوەوەڕا و بەبەردەوامی لۆژیکی ناوەکی کایەی سەربازی وێراندەکرد، ژێرپێخستنی هەموو ترادیسیۆن و یاسا و بەها سەربازییەکان ئەو ستراتیژە بوو بەعس بۆ تێکشکانی لۆژیکی ئەم کایەیە گرتیەبەر. کردنی نائیب عەریفێک لە بیست و چوار سەعاتدا بە سەرۆکی هێزی ئاسمانی عێراق نموونەیەکە لەو هەزارەها نموونانەی بەعس بەهۆیەوە لەناوەوەڕا هەرچی یاسا و ڕێسایەکی سەربازییە پێشێلیدەکرد. بەخشینی چەند ئەستێرەیەک لە چەند سەعاتێکدا بە کەسێک، کە لەڕووی سەربازییەوە بێنرخ و بێتوانبێت، یان کردنی دەرچوویەکی سێی ناوەندی بە ئەفسەری سیاسی و لەوێشەوە کردنی ئەو کەسە بە چاودێریکەر بەسەر جەنراڵە پیرەکانی سوپاوە، نموونەی دیکەی تێکدانی لۆژیکی ناوەکی کایەی سەربازین لە عێراقدا. خۆ ئەگەر تەماشای کایەی ڕۆشنبیری بکەین ئەوکات مەسەلەی تێکدانی لۆژیکی ناوەکی کایەکانمان ئاشکراتر بۆ دەردەکەوێت. کایەی ڕۆشنبیری لە عێراقدا بەشێوەیەک کۆنترۆڵ و مۆنۆپۆلیزە کرابوو، وایلێهاتبوو کورتکرابووەوە بۆ کایەی تەبریرهێناوە و ئافەرینی بەعس خۆی. جگەلەوەی پرۆفیسۆرێکی زانکۆ زۆر جار سەرمایە ئابوورییەکەی کەمتر بوو لە سەرمایەی عەریفێکی ناو لەشکری عێراقی،

لەهەمانکاتدا دەبوایە لە ناو خەونی بەسەربازگەکردنی عێراقدا ئەمانیش هەمان ڕۆڵی سـەربازەکانی نـاو لەشـکری عێراقیـان ببینیـایە. کەمنەبـوون ژمـارەی ئەو پرۆفیسۆرانەی جل و بەرگی سەربازییان دەکرایەبەر و تەسلیم بە نائیب عەریفەکانی ناو سەربازگەکان دەکران. بەم کارە بەعس ئەو سەرمایە کولتوورییەی بێنرخدەکرد، کە پرۆفیسۆرێکی زانکۆ دەشێت هەڵگریبێت، ئەمە جگە لەوەی ئەم کارە خـۆی لە خۆیدا نووچپێدانی سەرمایەی کولتوری بوو لەبەردەم سەرمایەی سەربازیدا. کردنـی نەخوێنـدەوارەکانی حیـزبیش بە وەزیـری ڕۆشـنبیریی و بە سـەرۆکی زانکـۆ و بە بەرپرسـی دەزگـا گرنگەکـانی دیـکەی بـواری ڕۆشـنبیری و ڕاگەیانـدن هەمـان ئەو تاکتیکە بوو بەعس بۆ تێکدانی لۆژیکی کایەی ڕۆشنبیری دەیخستە گەڕ. بەمجـۆرە بەعس لە پرۆسـەی سـەرلەنوێ بەرهەمهێنـانەوەی دەسـەڵاتی نـوخبە حاکمەکەیـدا بەردەوام لۆژیکی هەموو کایەکانی تێکدەشـکان و بەتاڵیـدەکردنەوە لەهەر هێزێکـی ڕەخنەیی. بەعس بەردەوام کایەکانی دەگۆڕی بە جیهاز و جیهازەکانیشی سـەرتاپا مۆنۆپۆلیزە دەکرد. لە کوردستانی خۆشماندا هەمـان پرۆسـە لە ئـارادایە و هەمـان لۆژیکی تێکشکانی کایەکـان ئامـادەیە. ئەڵـبەتە لێـرەدا پێویسـت بە نـاو هێنـانەوە ناکـات، خـوێنەری کـورد دەتوانێـت بەئاسـانی چەنـدان نمـوونە لە خەیـاڵی خۆیـدا بهێنێتەوە، کە لە نموونەکانی بەعس باشتر نین، گەر خراپتریش نەبن.

هۆڵەندا ١٩٩٦

## سەرچاوەکان

3- Marxistiesche statstheorie 2 , TE ELFDER URE, NR.2 JANUARI 1981. P293
4- Ibid, P.477
5- Ibid, P. 293
6- Foucault, Waarheid als Macht, TE ELFDER URE, NR.2/3 september 1986.
7- Andrew Barry, _ocault and Political Reasion, London, 1996
8- Foucault, Remarks on Marx, New York 1981, P 173-174
9- Ibid, P.165
10- Ibid, P.165
11- Ibid, P.165
12- Kevin Olson, Habitus & Body langauge: Toward a Critical Theory of Symbolic Power, Philosophi & Social criticisim, Vol 21 nr 2 P. 24
13- Ibid, P.21
14- Ibid, P.24
15- Marxistiesche statstheorie 2 , P. 319 .
16- Ibid, P.319
17- Ibid, 319
18- Ibid, P.378

19- Ibid, P.24
20- Ibid, P.13
21- Ibid, P.138
22- Ibid, P.138
23- Foucault Herdenken, Over Werk en Werking van Michel Foucault, Dam, 1995. P, 96-97

٢٤- مەریوان وریا، لە کومەڵگای سزاوە بۆ کومەڵگای کونترۆڵ، دەروازە، ژمارە دوو، دانیمارک ٥٩٩١.

25- Foucault, Remarks on Marx, P. 167
26- Darius M. Rejali, Torture and Modernty, Self, Society and Stote in Modem Iran. Westview, USA 1994. P. 15
27- Ibid, P.15
28- Ibid, P.15
29- Foucault, Dicipliene snd Punish, The birth of the Prison. Penguin London, 1997
30- Darius M. Rejali, P. 16

٣١- میشل فۆکو، تاریخ الجنسانیه -١- یراده یلمعرفه. مرکز النماء القومی ١٩٩٠، ل ٤١.

٣٢- ه س پ ل ٩٢١

٣٣- ه س پ ل ١٤١

34- Kevin Olson. P 21
35- Ibid, P.21
36- Ibid, P.24
37- Pierre Bourdieu, Argumenten, Verijsua Amsterdam, 1992. P. 58
38- Ibid, P.63
39- Ibid, P.63

40- Ibid, P.60
41- Ibid, P.59
42- Ibid, P.59
43- Ibid, P.59
44- Ibid, P.59
45- Ibid, P.59
46- Ibid, P.60
47- Ibid, P.60
48- Ibid, P.60
49- Ibid, P.71
50- Ibid, P.71
51- Ibid, P.72
52- Ibid, P.72
53- Foucault, Recht over de Dood en Macht over het Leven. Te Elfder Ure, nr.1 1981.

# بەشی یەکەم

-١-

لە مێژووی ڕۆشنبیری و سیاسی ئێمەدا کەم چەمک هەیە ئەوەندەی چەمکی یەککگرتن گرنگی پێدرابێت و بانگێشەی بۆ کرابێت. تەمەنی ئەم گرنگیپێدان و بانگێشەبۆکردنەش لە چەند سەدەیەک تێپەڕەکات. لەسەرەتادا بیرۆکەی یەککگرتن لە مێژووی ئێمەدا وەک چەمکێک لە پاڵ چەمکەکانی دیکەدا ئامادەبووە، بەڵام دواتر گەشەیکردووە و بووە بە گوتاری باڵادەستی ناو دونیای ڕۆشنبیری و سیاسیمان. بێگومان جیاوازییەکی گەورە هەیە لەنێوان ئامادەبوونی بیرۆکەی یەککگرتن وەک چەمکێک لە پاڵ چەمکەکانی دیکەی ناو ڕۆشنبیرییەکی دیاریکراودا و لەگەڵ بوونیدا بە گوتاری باڵادەست لە ناو ئەو ڕۆشنبیرییەدا. من لەم وتارەدا هەوڵدەدەم لە گوتاری یەککگرتن بدوێم نەک لە چەمکی یەککگرتن، زیاتر گرنگی بەو فەزایە دەدەم، کە یەککگرتن لە چەمکێکەوە لەپاڵ چەمکەکانی دیکەدا، دەکاتە گوتاری باڵادەست و ڕۆڵێکی چارەنووسسازیشی پێدەبەخشێت لە دەستنیشانکردنی شوناسی ڕۆشنبیری و سیاسی ئێمەدا. بەمانایەکی دیکە ئەم نووسینە دەخوازێ لەو فەزا کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتوورییە بدوێت، کە تیایدا گوتاری یەککگرتن

لەدایکدەبێ و گەشەدەکات و دەبێتە هێزێکی ڕێکخەر لەناو کایە ڕۆشنبیرییەکانی نیـکەدا. ئەوەی مـن لەم گوتـارەدا نامەوێـت لێیبـدوێم ئەو مانـا کـۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژییە گشتیانەی بیرۆکەی یەکگرتنە، کە بەرلەدایکبـوونی گوتـاری یەکگـرتن ئامادەن، بۆ نمـوونە لە نـاو پەنـدی پێشـینان و قسـەی نەسـتەق و ڕا و تەکبیـری پیاوماقوڵان و ڕیشسپیاندا، واتە من نامەوێت لەسەر ئەو ڕەهەندە ئەنترۆپۆلۆجییەی چەمکـی یەکگـرتن بـدوێم، کە لە پێناسـەی ئینسـانەوە سـەرچاوەدەگرێت وەک بـوونەوەرێکی کـۆمەڵایەتی، بوونەوەرێـک بەردەوام پێویسـتی بە هاریکـاری ئینسـانەکانی دەوروبەری هەیە و بەردەوام بەدوای یەکگرتنـدا دەگەڕێـت بـۆ ئەوەی بتوانێت بەسەر گرفتەکانی ژیانی ڕۆژانەدا سەربکەوێت و ئەو ژیانە مسۆگەربکات.

-٣-

چەمکـی گوتـار لەم نووسـینەدا بەومانـایە بەکارهـاتووە، کە فەلەسـوفی فەرەنسـی میشێل فۆکۆ بەم چەمکەی دەدات، وەک هەنگاوی یەکەمیش هەوڵدەدەم بەکـورتی لەو مانایانە بدوێم، کە چەمکـی گوتـار لای ئەم فەیلەسـوفە لەخۆیـدەگرێت. (١) بە باوەڕی فۆکۆ لەهەموو کۆمەڵگایەکدا بەرهەمهێنـانی هەمـوو دەقێکـی گوتراو، یـان نووسـراو دەکەوێـتە ژێـر پرۆسـەی چاودێریکردن و دیسـپلینکردنێکی بەردەوامەوە. لەهەر کۆمەڵگایەکـدا نە هەمـوو کەس بـۆی هەیە لەسـەر هەر بابەتێـک لەئـارادایە بدوێت و نە هەموو بابەتێکیش دەکرێت قسەی لەسـەربکرێت. لەهەر کۆمەڵگایەکـدا کۆمەڵێک کەسانی دیاریکراو دەبنە لێزان و مافی ئەوەیان دەدرێتێ لەسەر کۆمەڵێک دیـاردەی تـایبەت بـدوێن، دوانەکانیشـیان نـرخ و بەهـایەکی تـایبەت وەردەگرێـت. لەهەمانکاتیشدا لە هەموو کۆمەڵگایەکدا کۆمەڵێک بابەت یاساغدەکرێن و ناهێڵرێـت

ببنە بابەتی مەعریفە و قسەیان لەسەربکرێت، لانیکەم قسەی ئاشکرایان لەسەربکرێت. ئەوەشی ئەم پرۆسەی چاودێریکردنە بەڕێوەدەبات ئەو یاساو پرنسیپانەن، کە فۆکۆ ناویان دەنێ "سیستمی گوتار". کەوابوو سیستمی گوتار بریتییە لە کۆمەڵێ تەکنیکی ئاراستەکردن و کۆنترۆڵ و سانسۆر و چاودێریکردن، کە چاودێری و کۆنترۆڵ و سانسۆری بەرهەمهێنان و بەکارهێنانی مەعریفەی جۆربەجۆر دەکات لەکۆمەڵگایەکی دیاریکراودا.

تەکنیکەکانی دیسپلینکردن و چاودێریکردن لەناو گوتاردا هەمەجۆرن، بەڵام دواجار هەموویان بەسەریەکەوە ئەو رووبەرە پێکدەهێنن، کە دەستنیشانی ئەوە دەکات چ مانایەک لە ساتێک لە ساتەکانی مێژوودا باڵادەست بێت، چ بابەتێک ببێتە بابەتی لێدوان لە کۆمەڵگایەکدا، چ شتێک ببێت بە حەقیقەت و چی یاساغ و چی بێدەنگ و چی پەرلوێز و چی گرنگ بکرێت. بە بۆچوونی فۆکۆ لەناو هەموو گوتارێکدا دوو سیستمی سانسۆر، یاخود چاودێری کاردەکات، یەکەمیان سیستمی چاودێرییەکی دەرەکییە کەرەگەکانی لەناو ئەو سیاقە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابورییەدایە، کە لەدەرەوەڕا گوتارەکان ناچاردەکات سەر بۆ جەبری ئەو سیاقە دیاریکراوە دانەوێنن و لەسنووری داخوازیەکانیدا بجوڵێنەوە. دووەمیشیان سیستمی چاودێری ناوەکییە، کە لەناوەوە سنوورە ناوەکییەکانی گوتار دەستنیشاندەکات. با سەرەتا باس لە سیستمی یەکەمیان بکەین.

لە باسکردنی ئەم سیستمەدا فۆکۆ باس لە سێ تەکنیکی چاودێریکردن دەکات، کە لەدەرەوەڕا کۆنترۆڵی گوتارەکان دەکەن، ئەم سێ تەکنیکەش بریتین لە:

١ـ تەکنیکی قەدەغەکردن. بەپێی ئەم تەکنیکە هەر کۆمەڵگایەک کۆمەڵێک بابەت قەدەغەدەکات و ناهێڵێت ببنە بابەتی فیکر و توێژینەوە و قسەلەسەرکردن. بۆنموونە قەدەغەکردنی قسەکردن لەسەر سێکس، یان ململانێی چینایەتی، یان ئایین، یان هەر بابەتێکی دیکە، کە هێزە کۆمەڵایەتی و سیاسی و مەعریفییەکانی

ئەو کۆمەڵگـایە نەیانەوێـت قسـەیان لەسـەریکرێت و، یـان لانـیکەم قسـەیەکیان لەسـەریکرێت، کە لەگەڵ داخوازییەکـانی ئەو سـیاقانەدا یەکنەگـرێتەوە، کە لەو کۆمەڵگایەدا باڵادەستن.

٢ـ تەکنیکی سنوورکێشان لە نێوان شتەکاندا، بۆنموونە کێشانی سـنورێک لەنێـوان شێتی و عەقڵ، مـاقوڵ و نامـاقوڵ، بـاش و خـراپ، ئەشـێ و ناشـێدا. لەڕێـی ئەم تەکنیکەوە گوتاری باڵادەست کۆمەڵێک سنوور دروستدەکات، هەندێک شت بەشیاو و هەندێکشـت بەنەشـیاو ناودەبـات، هەنـدێک جـۆری قسـەکردن وەک قسـەکردنی عەقڵانـی و هەنـدێک جـۆری تـری قسـەکردن بە نـاعەقڵانی ناودەبـات. لەنێـو ئەم سنوورکێشی و جیاکـارییەدا پەیوەنـدییەکانی هێـز دەسنیشـانی ئەوە دەکەن، چـی ماقوڵە و چی ناماقوڵ، چی باشە و چی خراپ، چـی مانـادارە و چـی بێمانـا. ئەم تەکنیکی سنورکێشانە لەڕاستیدا تەکنیکی دەستنیشـانکردنی پانتـایی مەعقولیەتە لەکۆمەڵگایەکـــدا، کە تیایـــدا هەمـــوو ئەو شـــتانەی دژ بەو مەعقـــولیەتە و پێداویســـتییەکانی مـــانەوەی ئەو مەعقـــولیەتەن، وەک نامـــاقوڵ دەناســـرێن و مامەڵەدەکرێن.

٣ـ تەکنیکی جیاکردنەوەی ڕاست لە ناڕاست، ولتە هەقیقەت لە ناهەقیقەت. بەپێـی ئەم تەکنیکەش هەموو کۆمەڵگایەک کۆمەڵی ڕاستیی تایبەت بەرهەمـدەهێنێت، کە دەیانکـاتە پێـوەری هەمـوو حـوکمێکی کـۆمەڵایەتی و سیاســی و ئەخلاقــی و سایکۆلۆجی هتد.. هەر کۆمەڵگایەک خاوەنی سیستمێکی دیـاریکراوی هەقـیقەتە و دواتر پێوانی بڕی ڕاستی و دروستی شتەکانی دیکە لەڕێگـای پێـوانی بـڕی دوور و نزیکی ئەو شتانە لەو سیستمی هەقیقەتەوە، دەستنیشاندەکرێت. بەمانەیەکی دیکە ئەگەر دیدێک، یان بۆچوونێک ناکۆکبێت بەو سیستمی هەقـیقەتەی باڵادەسـتکراوە ئەوکـات ڕاسـتەوخۆ ئەو دیـدە تـووڕدەدرێتە دەرەوەی ئەو سیسـتمەوە و وەک نـاهەقیقەت و لەوێشـەوە وەک هەڕەشـە و مەترسـی مـامەڵەی لەگەڵـدا دەکرێـت.

بێگومان ئەم هەقیقەتە گریمانکرلو و سەروەرکرلوە هەمیشە بەدەیان هەقیقەتی دیکە، یان ئەگەری بەرهەمهێنانی هەقیقەتی دیکە دەکوژێت، کە لەگەڵ دلواکارییەکانی ئەو سیاقە دەرەکییەدا یەکناگرنەوە، کە ئەو هەقیقەتە تایبەتەیان بەرهەمهێناوە و سەروەرکردووە.

بەباوەڕی فۆکۆ ئەم سێ تەکنیکەی باسمانکردن هەوڵئەدەن لەدەرەوەڕا، واتە لەناو بونیادە ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانەوە، پێکهاتەی گوتار لە کۆمەڵگادا کۆنترۆڵبکەن و لەڕێی ئەم کۆنترۆڵکردنەشەوە ئەو "پانتاییە گوتارییە" ئامادەبکەن، کە دەتوانێت شەرعیەت بدات بەو دونیایەی لەوساتەدا لەئارادایە، شەرعیەتێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی. وەک گوتمان سیستمی گوتار هەڵگری جۆرێکی دیکەی سیستمی چاودێرییە، کە فۆکۆ ناوی ئەنێت "چاودێری ناوەکی". چاودێری ناوەکی بریتییە لەو میکانیزمە ناوەکییانەی لەناو گوتار خۆیەوە ئاراستە و جڵەوی پرۆسەی بەرهەمهێنانی شێوازە جیاجیاکانی مەعریفە لەرۆشنبیرییەکی دیاریکراودا دەکەن. ئەم میکانیزمانەش بریتین لە کۆی ئەو بنەما و یاسا و پرنسیپ و پۆلێن و ئەرشیفکردنانەی مەعریفەن، کە پرۆسەی بەرهەمهێنانی مەعریفە لە ڕۆشنبیرییەکی دیاریکراودا بەڕێوەدەبەن.

ئەوەی لەم باسەی مندا شوێنی گرنگپێدانە سیستمی چاودێرییە دەرەکییەکانە، واتە جەبری ئەو سیاقە کۆمەڵایەتی و سیاسییە دەرەکییەیە، کە لەدەرەوەڕا گوتاری یەککگرتن دەسەپێنێت، نەک چاودێرییە ناوەکییەکانی گوتار. بەمانایەکی دی من دەخوازم لەو فەزا دەرکییە بدوێم، کە لەدایکبوونی گوتاری یەککگرتنی لەڕووی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتورییەوە مەیسەرکردووە و گوڕپویشیەتی بۆ گوتاری باڵادەست و بۆ سیستمی چاودێریکردنی گوتار لە کۆمەڵگای ئێمەدا. لێرەوە پرسیاری یەکەم، کە دەبێت وەڵامبدرێتەوە ئەوەیە داخۆ ئەو پرۆژە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییە دەرەکییە چییە، کە گوتاری یەککگرتنی لە دونیای ئێمەدا

وەک پێداویستییەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و مەعریفی سەپاندووە؟

-٣-

بێچەند و چوونی زۆر دەکرێت هەموومان لەسەر ئەوە کۆکبین ئەو پرۆژەیەی لەدەرەوەڕا گوتاری یەکگرتن ئاراستەدەکات و دەسەپێنێت، پرۆژەی ناسیۆنالیزمە. ناسیۆنالیزمە گوتاری یەکگرتن دەکاتە ژێرخانی هەموو چالاکییە ڕۆشنبیری و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان. ناسیۆنالیزمە یەکگرتن لە چەمکێکەوە لەناو چەمکەکانی دیکەدا، دەکاتە گوتاری باڵادەست. ناسیۆنالیزمە گوتاری یەکگرتن لە بوونێکی سەرخانییەوە، بە زاراوەی مارکسییەکان، دەکاتە بوونێکی ژێرخانی، لە باتی ئەوەی خۆی ڕەنگدانەوەی دیاردەیەکی دیکەبێت، خۆی دەبێتە بەرهەمهێنی دیاردەی دیکە. بەکورتی ناسیۆنالیزمە بەزمانی یەکگرتن لەکایە جیاجیاکانی کۆمەڵگای ئێمەدا دەدوێت و ڕۆشنبیری و فیکری سیاسی ئێمە بە ڕێزمانی یەکگرتن بەرنامەڕێژی دەکات.

بەم مانایە گوتاری یەکگرتن بریتییە لەو ئامراز، یان میتۆدی چاودێرییەی ناسیۆنالیزم لەدەرەوەڕا بەسەر کایەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی کوردیدا دەیسەپێنێت و چاودێری پرۆسەی بەرهەمهێنانی تێز و تیۆرەی سیاسی و بەرهەمی کولتووری و کۆمەڵایەتی پێدەکات. ناسیۆنالیزم لەڕێگای گوتاری یەکگرتنەوە قسەکردن لەسەر دەیان بابەت لە ڕۆشنبیری ئێمەدا قەدەغەدەکات، بۆ نموونە قەدەغەکردنی قسەکردن لەسەر ئەو جیاوازییانەی بۆتە هۆی ئەوەی ئێمە وەک میللەتێک تا ئێستاش لەوەدا سەرنەکەوین هەستێکی هاوبەشمان لا دروستبێت، لانیکەم بەرامبەر بە کارەساتە هاوبەشەکانمان. قەدەغەکردنی قسەکردن لەسەر

فەرد و فەردانیەت وەک دوو بابەت، کە گوایە بوونی کۆیی و دەستەجەمعی ئێمە دەخەنەمەترسییەوە. ناسیۆنالیزمە وایکردووە نەهێڵێت ڕەخنەی کۆمەڵایەتی و سیاسی لە بونیادی باوکسالارییانەی کۆمەڵگای ئێمە و لە ڕۆحی پاتریارکییانەی سیاسەت لەدونیای ئێمەدا ڕاڕەوی سروشتی خۆی وەربگرێت و ئەم دووشێوازە ڕەخنەیە وەک کارێکی خراپ بنرخێنێت. ناسیۆنالیزمە ڕۆشنبیران ناچاردەکات ڕەخنە هەڵبگرن بۆ ڕۆژگاریی "دوای سەرکەوتن". ناسیۆنالیزمە کۆمەڵی هەقیقەت بەرهەمدەهێنێت، کە هەموومان بێهیچ گومان و بێهیچ پرسیارێک ناچارین قبوڵیبکەین.

بێگومان ناسیۆنالیزم ئەم سیستمی چاودێرییە بەمەبەستی هەرچی زیاتر کۆکردنەوەی ڕیزە جیاوازەکانی خەڵک و مۆبیلیزەکردنیان لە دەوری ئەو پرۆگرامە سیاسی و پرۆژە کۆمەڵایەتییەی دەیەوێت پیادەبیکات، دەخاتەگەڕ. ئەم میتۆدی چاودێریکردنە چەندە لەم ڕووەوە ڕۆڵێکی گرنگیش بینیبێت، واتە ئەو زەمینە ڕۆحی و ڕەمزییەی دروستکردبێت، کە یەککگرتن تیایدا ببێتە گوتاری باڵادەست، بەهەمان ئەندازەش کۆمەڵێک کێشەی سیاسی و ڕۆشنبیریی هێناوەتەکایەوە، کە تا ئەمڕۆ کۆمەڵگای ئێمە لێی دەربازنەبووە و بەدەستییەوە گیرۆدەیە، لەپێش هەمووشیانەوە کێشەی چەپاندن و بێدەنگکردنی "گوتاری جیاوازی"، کە بەبۆچوونی من بەبێ ئازادکردنی ئەم گوتارە، گوتاری یەککگرتن خۆشی ناتوانێت بەشێوەیەکی چالاک پیادەبکرێت و دەرەنجامی تەندروستی لێوەهەڵهێنجرێت، ئەم خاڵە دواتر دەگەڕێمەوە سەری.

کە گوتاری یەککگرتن دەبێتە سیستمی چاودێریکردنی بەرهەمهێنانی گوتارەکانی دیکە لە دونیای ئێمەدا، ئەوکات هەمان ئەو سێ تەکنیکەی چاودێریکردنی دەرەکی، کە لەسەرەوە باسمانکردن بە شێوەیەکی بەرفراوان لە دونیای ئێمەدا پیادەدەکرێن. تەکنیکی قەدەغەکردن لە دەرەوەڕا مەملەکەتێک لە بابەتی

قەدەغەکراومان بۆدەخولقێنێت، کە هەریەکێکیان وەک ڕێگرێک لەبەردەم یەککرتندا تەماشادەکرێت. تەکنیکی سنوورکێشان دەیان بابەتی "خراپ"مان لە بابەتی 'باش' بۆجیادەکاتەوە و ناچارماندەکات لەسەر ئەو بابەتە "ناماقوڵانە" نەدوێین، کە گوتاری یەککرتن ناماقوڵیکردوون. تەکنیکی جیاکردنەوەی ڕاست لە ناڕاست ڕووبەڕووی "هەقیقەت"ێکمان دەکاتەوە، کە وەکو پێشینەیەک و بەڵگەنەویستێک پێماندراوە و هەمووماڹ ناچاردەکات قبوڵیبکەین، هەقیقەتێک لەدەرەوەی ئاگری سوتێنەری پرسیار و گومانی مەعریفی و سیاسی و کۆمەڵایەتیدا.

-٤-

بێگومان بیرۆکەی یەککرتن لە ئاستی بەکارهێنانی زارەکی، واتە شەفەهیدا، بیرۆکەیەکی کۆنە و وەک لەسەرەتاشەوە هێمامان بۆکرد وابەستەی ڕەهەندی کۆمەڵایەتیبوونی ئینسان خۆیەتی وەک بوونەوەرێک، کە ناتوانێت بەتەنها و بە دابڕاوی لەوانیدیکە بژی. ڕۆشنبیریی زارەکی کوردی، وەک زۆربەی ڕۆشنبیرییە زارەکییەکانی دیکەی دونیا، پڕە لەو دەستەواژە و بۆچوونانەی بەهاکانی یەککرتن بەرز و بەنرخ رادەگرێت. بەڵام وەک پێشتریش هێمامان بۆ کرد چەمکی یەککرتن لە ڕۆشنبیری ئێمەدا لە مێژە قۆناغی زارەکی بەجێهێشتوە و بۆتە بەشێک لە گوتارێکی نووسراو. دەکرێت سەرەتای لەدایکبوونی چەمکی یەککرتن، لەئاستی نوسرلودا، ببەینەوە بۆ سەردەمی ئەحمەدی خانی، بەڵام گۆڕان و گەشەکردنی بیرۆکەی یەککرتن تا ڕادەی بوونی بە گوتاری باڵادەست لە ڕۆشنبیری کوردیدا دوادەکەوێت بۆ کۆتاییەکانی سەدەی رابوردو و سەرەتاکانی ئەم سەدەیە، واتە بۆ ڕۆژگاری لەدایکبوونی ناسیۆنالیزمی کوردی وەک تیۆرەیەکی سیاسی نوێ و وەک

هێنا بۆ جۆرێکی تازەی شوناس و وەک ویستی دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوە وەک ئەلتەرناتیڤی هەم ئیمپراتۆریەت، ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، هەم ئەلتەرناتیڤی ئەو دەسەلاتە لۆکاڵییە بچووکانەی لەکوردستاندا لەئارادابوون، دەسەلاتی ئاغا و بەگ و ئەمیرە ناوچەییەکان. بێگومان بۆ هاتنەکایەی ئەم "جێگۆڕکێیە گوتاریە" چەندان هۆکاری کۆمەلایەتی و فەرهەنگی و سیاسی جیاواز لەئارادان، بەلام من لەم نووسینەدا تەنها گرنگی بەیەکێک لەو هۆکارانە دەدەم، کە ئەویش بریتییە لە لەدایکبوونی "کایەی سیاسەت" لە کوردستاندا وەک کایەکی سەربەخۆ و جیا لە کایەکانی دیکە، جیا لە کایەی ئەدەب و دین و ئابوری هتد...

بەلام مەبەستمان لەکایەی سیاسی چیە؟ ئایا سیاسەت بەر لە دروستبوونی کایەیەکی سیاسی سەربەخۆ بوونی نەبووە؟ سەرەتا دەخوازم وەلامی پرسیاری دووهەم بدەمەوە، چونکە وەلامی ئەم پرسیارە وەلامدانەوەی پرسیاری یەکەمیش ئاسانتردەکات. وەک سەرەتاش هەوڵدەدەم لە ئامانەگی مۆدێرنەوە وەک پرۆژەیەکی تایبەت دەستپێبکەم، چونکە کایەی سیاسی سەربەخۆ بەرهەمی قۆناغی مۆدێرنەیە، کە لە دونیای ئێمەدا بە دروستبوونی هەست و ویست و خەون و عەقلیەتی ناسیۆنالیزم تەعبیر لەخۆی دەکات.

-٥-

مۆدێرنە پرۆژەیەکی سیاسی، کۆمەلایەتی، ئابووری و رۆشنبیری بەرفراوانە، کە سەرلەبەری کایەکانی کۆمەڵگایەکی دیاریکراو ناچار بە گۆڕان دەکات، ئەو هێزە سەرەکییەش مۆدێرنە پشتی پێدەبەستێ بۆ پیادەکردنی ئەو گۆڕانانە ئەو ماشێنە سیاسیە مۆدێرنە بەهێز و گەورەیەیە، کە دروستیدەکات، مەبەستم دەوڵەت، یاخود

دەوڵەتی نەتەوەیە. دروستبوونی دەوڵەتی مۆدێرن ساتەوەختێکی گرنگە لە مێژووی مۆدێرنەدا، چونکە بەدروستبوونی دەوڵەت ئیدی سێنتەرێکی شەرعی دروستدەبێت بۆ چاودێریکردنی کۆمەڵگا و بەخشینی ئاراستە بە کۆی گۆڕانە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و فەرهەنگییەکان. دەوڵەت لەسەرەوەڕا کۆمەڵگا مۆبیلیزەدەکات و وزەی پێویست بەو گۆڕانکارییانە دەبەخشێت، کە کۆمەڵگایەک بۆ ڕزگاربوون لە کۆسپە کۆمەڵایەتییەکانی بەر لەمۆدێرنە پێویستی پێیەتی. یەکێک لەکارە هەرە گرنگەکانی دەوڵەت، کە دواجار وەک یەکێک لە ڕەهەندە هەرە گرنگەکانی مۆدێرنە دەناسرێتەوە، مەسەلەی جیاکردنەوە، یاخود ڕزگارکردنێکی ڕێژەیی سیاسەتە لە دیاردەکانی دیکە و کردنیەتی بە کایەیەکی سەربەخۆ، واتە نیشتەجێکردنی سیاسەتە لە "کایەیەکی سیاسی" سەربەخۆدا. لەم کایەدا سیاسەت بۆ یەکەمینجار خۆی لە ئایین و لە "پەیوەندییەکانی خزمخواهی" و زۆربەی ئەو پرنسیپانەی دیکەش ڕزگاردەکات، کە سیاسەت ڕاستەوخۆ بە کەسی ئەمیر، یان پادشاوە دەبەستنەوە، مۆدێرنە سیاسەت دەکاتە پیشەیەکی سەربەخۆ و کایەیەکیشی بۆدروستدەکات، کە تیایدا سەربەخۆیی خۆی بپارێزێت. مۆدێرنە بەدروستکردنی کایەکی سیاسی سەربەخۆ سەرزەمینی ئەو پەیمانە کۆمەڵایەتییە خۆشدەکات، کە شێوە جیاوازەکانی دەسەڵات لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا لەیەکدی جیادەکاتەوە و دەسەڵات لەجەستەی ئەمیرەوە بۆناو دەزگاکانی دەوڵەت و دەزگاکانی کۆمەڵگای مەدەنی دەگوازێتەوە. لەڕاستیدا خودی "پەیمانی کۆمەڵایەتی" خودی هەمان گوتاری یەکگرتنە، بەڵام لە ساتەوەختی تەرجەمەکردنیدا بۆ بابەتێکی فەلسەفی، کە لەپشتییەوە هەموو کۆمەڵگا لەدەوری بیرۆکەی پەیمانێک کۆدەکاتەوە. پەیمانی کۆمەڵایەتی بنەمای دروستبوون و کارکردنی دەوڵەتی نەتەوەیی مۆدێرنە لەساتەوەختی بوونیدا بە بەسێنتەری شەرعی کۆمەڵگا، لەپێش هەمووشیانەوە شەرعیەتی مافی مۆنۆپۆلیزەکردنی

بەکارهێنانی توندوتیژی و مافی دەرکردنی یاسا.

ئەوەی من دەمەوێت جەختی لەسەربکەم ئەو ڕاستییەیە، کە پرۆسەی دروستبوونی کایەی سیاسی سەربەخۆ پرۆسەیەکی نوێیە و ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە لەدایکبوونی ئەو دیاردە ئاڵۆزەوە هەیە کەناوی ناسیۆنالیزمە. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت، کە بڵێین لەقۆناغی بەر لە ناسیۆنالیزمدا شتێک نەبووە ناوی سیاسەت بوویێت. ئەنترۆپۆلۆجیای سیاسی هاوچەرخ ئەو ڕاستییەی سەلماندووە هیچ کۆمەڵگایەک لە مێژوودا نادۆزینەوە سیاسەت بەشێکنەبوویێت لە پێکهاتە ناوەکییەکەی. بوونی سیاسەت لەهەر کۆمەڵگایەکدا وابەستەی بوون، یان نەبوونی دەزگای سیاسی سەربەخۆ نییە لەو کۆمەڵگایەدا. جۆرج بالاندیێ لە کتێبی "ئەنترۆپۆلۆجیای سیاسیدا" ئەوەی نیشاندلوین چۆن سیاسەت لە کۆمەڵگاکانی بەر لە مۆدێرنەدا وەک تۆڕێکی بەرفراوان بەناو خانە جیاجیاکانی کۆمەڵگادا بڵاوبۆتەوە و لەیەککاتدا وەک بەشێک لە ئایین، وەک بەشێک لە پەیوەندییەکانی خزمخواهی، وەک بەشێک لە پەیوەندی نێوان نەوەکان، وەک بەشێک لەو دابەشبوونە کۆمەڵایەتییە جیاوازانەی لە ناوەوە و دەرەوەی گروپەکاندا هەیە، ئامادەبووە.(٢) بەکورتی ئەنترۆپۆلۆجیای سیاسی ئەو ڕاستییەی سەلماندووە، کە سیاسەت لە کۆمەڵگاکانی بەر لە مۆدێرنەدا ئامادەیە، بەڵام نە لەناو دەزگای سیاسی سەربەخۆدا، نە لەناو پانتاییەکی سەربەخۆدا بۆ سیاسەت، بەڵکو وەک بەشێک لەو سیستەمەی ژیانی کۆمەڵگاکە وەک گشتێک بەسەریەکەوە بەڕێوەدەبات. کەواتە لە وەڵامی پرسیاری دووەمدا دەکرێت بڵێین سیاسەت نەگۆڕێکی کۆمەڵایەتی بووە و بەردەوام لەناو فۆرمە جیاوازەکانی کۆمەڵگادا ئامادەبووە. بەڵام گەشەکردن وَ بوونی بە کایەکی سەربەخۆ دوادەکەوێت بۆ قۆناغی مۆدێرنە، قۆناغێک تیایدا دەوڵەت وەک بوونەوەرێکی نوێ لەدایکدەبێت و بەناوی نەتەوەیەکی دیاریکراوەوە حوکمدەکات، ئەمەش لەڕوی مێژووییەوە هاوکاتی قۆناغی لەدایکبوونی ناسیۆنالیزمە.

بێگومان بوونی پەیوەندی پتەو لەنێوان کایەی سیاسەت و دەوڵەتی مۆدێرندا مانای ئەوە نییە بوونی کایەی سیاسی سەربەخۆ ڕاستەوخۆ بە بوون، یان نەبوونی دەوڵەتەوە گرێدراوە. ڕاستە بنیادنانی نەتەوە و بنیادنانی دەوڵەت یەک پرۆسەن و هەردووکیان لەناو یەک کایەی سیاسیەوە سەرهەڵدەدەن، بەڵام دەشێت کایەی سیاسی سەربەخۆ دروستببێت، بەڵام دەوڵەت هێشتا لەدایکنەبووبێ، واتە دەشێت کۆمەڵگایەک بەرەو مۆدێرنیزمی سیاسی هەنگاوبنێت، بەبێئەوەی دەوڵەت تیایدا وەک چاودێریکەرێک ئامادەبێت. ئەوەی دەمەوێت جەختی لەسەربکەم بیرۆکەی نەبەستنەوەی کایەی سیاسی سەربەخۆیە بە بوونی دەوڵەتەوە وەک مەرجێکی حەتمی پێشین. لەم حاڵەتەدا دەشێت بیر لەبوونی کۆمەڵێک هێزی دیکە بکەینەوە، کە ڕۆڵی دەوڵەت ببینن، بۆ نموونە ئەو دەزگا مۆدێرنانەی پرۆسەی مۆدێرنیزمی سیاسی لەگەڵ خۆیدا دەیانهێنێت، لە دەزگاکانی حیزب و ڕێکخراو و ئۆرگانە سیاسییەکانەوە بیگرە، تا بە میدیای مۆدێرن و هۆیەکانی ڕاگەیاندن دەگات. لەم ڕووەوە ئەزموونی ناسیۆنالیزمی کوردی نموونەیەکی گرنگی ناسیۆنالیزمێکە لەغیابی دەوڵەتدا کاردەکات، بەڵام لەپاڵ ژمارەیەک لەو دەزگایانەدا، کە مۆدێرنیزمی سیاسی و کۆمەڵایەتی بەرهەمیاندەهێنێت. واتە ئەوەی کایەی سیاسی سەربەخۆ و تازە لە ئەزموونی ئەم ناسیۆنالیزمەدا دروستدەکات دەوڵەت نییە، بەڵکو حیزب و میدیا و دەزگا و گروپ و کۆڕە سیاسییەکانی ترە. با ئەم بۆچوونە زیاتر وردکەینەوە.

لەناو ناسیۆنالیزمی کوردیدا ئەو بوونەوەرە نوێیەی ناوی "سیاسی کوردە" لەدایکدەبێت، بەڵام ئەو بونیادە ئیداری و شەرعی و سیاسییە دروستنابێت، کە ناوی دەوڵەتی کوردییە. بیرۆکەی کوردستان وەک وڵاتی نەتەوەیی کورد، بیرۆکەی بوونی کورد وەک نەتەوەیەکی سەربەخۆ، بیرۆکەی کولتوری کوردی وەک کولتورێکی جیاواز، بیرۆکەی دامەزراندی دەوڵەتێکی کوردی وەک چەترێک بەسەر

کۆمەڵگا و کولتوری کوردییەوە، دەزگاکانی حیزب و ڕێکخراو و کۆڕ و کۆمەڵی کوردی هەمەجۆر لەدایکدەبن، بەڵام ئەو فۆرمە سیاسییە لەدایک نابێت، کە هەموو ئەم لەدایکبوونە نوێیانە بگرێتەخۆی و لەیەکەیەکی سەربەخۆدا بەرجەستەیان بکات، مەبەستم دەوڵەتی کوردییە. بێگومان نابێت ئەو ڕاستییەمان لەیادبچێت، کە کایەی سیاسی کوردی لە پەیوەندیدا بە هەوڵدان بۆ دروستکردن و بنیادنانی دەوڵەتی کوردییەوە هاتۆتەکایەوە، دەوڵەتێک بتوانێت مانا سیاسییەکانی بوونی کورد وەک نەتەوەیەک نوێنەرایەتی بکات. لەواقیعی سیاسی ئێمەدا ئەم مەسەلەیە مانای بەگژاچوونەوەی ئەو دەوڵەتە دروستکراوانەبووە، کە لەدوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە لەو بەشەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا دروستکران، کە کورد تیایاندا وەک "کەمینەیەک" ژیاوە. بەمانایەکی دیکە دروستبوونی کایەی سیاسی سەربەخۆ لە کوردستاندا ناکرێت لە کۆی پرۆژەی دروستبوونی دەوڵەت لەناوچەکەدا داببڕێت، گەرچی خودی ئەم پرۆسەیە لەکوردستان خۆیدا بەئاکامی دامەزراندنی دەوڵەت نەگەیشتوە.

بەڵام "کایەی سیاسی سەربەخۆ" چییە؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەکرێ بڵێین کایەی سیاسی سەربەخۆ مانای لەدایکبوونی ئەو پێکهاتە ئالۆزەیە لە چەمک و زاراوە و بیرۆکە و شێوازی ڕێکخستن و تەکتیکی سیاسی و پێناسی تایبەتی، کە بەسەریەکەوە کاریان ڕێکخستن و کۆکردنەوە و هاندانی خەڵکە بۆ وەدەستهێنانی کۆمەڵێ داواکاری سیاسی تایبەت. "کایەی سیاسی سەربەخۆ" مانای درووستبوونی پانتاییەکی تایبەتە بۆ سیاسەت، کە جیایدەکاتەوە لە پانتاییە کۆمەلایەتییەکانی دیکە، بۆ نموونە لە ئایین و ئەو پەیوەندییانەی ئایین پێشنیاریدەکات بۆ ئۆرگانیزە و ڕێکخستنی ناوەکی کۆمەڵگایەکی دیاریکراو. بێگومان جیاکردنەوەی سیاسەت وەک کایە مانای دابڕانی سیاسەت نییە لە دونیای دەورویەری، بەڵکو مانای ڕێکخستنی سیاسەت خۆیەتی وەک چالاکییەکی کۆمەلایەتی سەربەخۆ، مانای

دروستبوونی هێزی کۆمەڵایەتی تایبەت، کە دیدی خۆیان لە چوارچێوەی هەندێک پرنسیپ و کردە و هەڵسوکەوتی سیاسیدا بەرجەستەکەن.

-٦-

وەک گوتم سەرەتای لەدایکبوونی کایەی سیاسی سەربەخۆ لە کوردستاندا دەگەڕێتەوە بۆ کۆتاییەکانی سەدەی ڕابردوو، بەڵام تەنها لە نیوەی یەکەمی ئەم سەدەیەدا ئەم کایەیە گەشەدەکات و دەبێتە کایەکی سەربەخۆ. هەر لەسەرەتاشەوە کایەی سیاسەت لەکوردستاندا وەک "کایەیەکی ناسیۆنالیستانە" لەدایکدەبێت و لەوێشەوە پێدادەگرێت لەسەر ئەو سنووره ڕەمزی و واقیعییانەی کورد وەک نەتەوەیەکی جیاواز، وەک گروپێکی فانتیازیاکراوی نوێ، لە نەتەوەکانی دیکە جیادەکاتەوە. دەڵێم کورد وەک گروپێکی فانتازیاکراو، چونکە نەتەوە وەک بێنێدیک ئەندرسۆن دەڵێت بریتیە لە گروپێکی سیاسی فانتازیاکراو، کە تاکەکانی هەموویان یەکترناناسن، ڕەنگە تا دەشمرن شوێنی ژیانی یەکتریش نەبینن، بەڵام لەڕووی فانتازییەوە، واتە لەڕێگای خەیاڵەوە، ئاگایان لەبوونی یەکتری هەیە و هەست بەبوونی پەیوەندیەیکی سیاسی و کولتوری و مێژووی هاوبەشیش لەگەڵ یەکدا دەکەن.(٣)، کە دەڵێین نەتەوە گروپێکی فەنتازیاکراوە دەمانەوێت بڵێین نابێت تەماشای نەتەوە بکەین وەک بوونێکی بەرجەستە و فیزیایی، وەک شتێکی مادی هەستپێکراو. بەپێچەوانەوە نەتەوە بیرۆکەیەکە لەناو وشیاریدا، وێناکردنێکی دیاریکراوی کۆمەڵگا و ئینسان و گروهەکانی ناو کۆمەڵگایە، نەتەوە بەرهەمی فانتازیا، واتە خەیاڵێکی سیاسی تایبەتە. بێگومان لەدایکبوونی ئەو خەیاڵە تاییەتەش، کە کەسانی ناو سەرزەمینێکی دیاریکراو وەک نەتەوە وێنادەکات،

وابەستەی دروسستبوونی کۆمەڵێک گۆڕانکاری ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگیی گەورەیە، کە من لێرەدا مەودای باسکردنیانم نییە. ئەوەی گرنگە جەختی لێبکەم ئەوەیە لەڕووی ئەنترۆپۆلۆژییەوە دروستبوونی نەتەوە وەک گروپێکی فانتازیەکراو مانای لەدایکبوونی جۆرێک لە وشیارییە، کە تیایدا ئەو گروهە خۆی دەخوازێت خۆی پێناسە بکات، نەک لە دەرەوەڕا و لەڕێی ئەوانیترەوە پێناسبکرێت. واتە لەدایکبوونی گروپێک، کە خۆی دەستنیشانی ئەوەدەکات چ شوناسێکی هەیە نەک هێزێکی دەرەکی دەستنیشانی شوناسی ئەوبکات.

لە دۆخی کورددا ئەم مەسەلەیە مانای لەدایکبوونی ئەو وشیارییە تایبەتە، کە کوردی کردۆتە گروپێکی "خود پێناس" نەک بەتەنها گروپێکی "ئەویتر پێناس"، گروپێک خۆی بڵێت کێیە و چییە و چی دەوێت، نەک لەدەرەوەڕا ئایین، یان هاوسێکان، یان هەر هێزێکی دیکە، دەستنیشانی ئەوەبکات ئەو کێیە. ئەم گۆڕانە ستراتیژییە لە پێناسەکردنی خود خۆیدا، کە لە جەوهەردا کردەیەکی سیاسیی نوێیە و کایەی سیاسەت لە کوردستاندا دەهێنێتەکایەوە، ئەو زەمینە فانتازی و ڕەمزییە دەخولقێنێت، کە بواری ئەوە دەڕەخسێنێت بیرۆکەی یەکگرتن لە چەمکەوە ببێت بە گوتار. بەمانایەکی دیکە ئەم گۆڕانە لە وێناکردنی "خود"دا، لەدیکبوونی ئەم ویست و وشیارییەی "خودپێناسی"یەیە وادەکات گوتاری یەکگرتن لە فەزای سیاسی و ڕۆشنبیری ئێمەدا ببێتە گوتاری باڵادەست. ئەو گروپەی بیەوێت خۆی خۆی پێناسکات پێویستی بە داهێنانی دەیان ڕەمز و هێما و مەسەلەی هاوبەش هەیە، کە بتوانێت لەڕێی ئەوانەوە خۆی وەک بوونێکی دەستجەمعی یەکگرتوو و جیاواز پێناسبکات، ناسیۆنالیزم پێویستی بە کارخانەیەکی گەورەی بەرهەمهێنانی وەهمی لێکچوون و سڕینەوەی جیاوازییەکان هەیە. ئەم کارخانەیە ئەوەندە کۆنترۆڵ و چاودێریکراوە یەکێکی وەک ئارنست ڕێنان دەڵێت ناکرێت بیر لە بوونی ناسیۆنالیزم بکەینەوە بەبێ بیرکردنەوە لە درۆکردن و

پێشنیارکردنی ڕستێک لە وەهم.
گوتاری یەکگرتن دێت بۆ ئەوەی کەرەستە ڕەمزی و خەیاڵییەکانی دروستبوونی ئەم گروپە یەکگرتوو و جیاوازە فەراهەمبکات، مەبەستم لەو کەرەستانەش بەرهەمهێنانی دەیان ئەفسانەیە بتوانێت ئەو بوونە سەربەخۆ و یەکگرتووە بسەلمێنێت، وەک ئەفسانەی بوونی ئەسڵێکی هاوبەش، مێژوویەکی هاوبەش، سایکۆلۆژیایەکی هاوبەش، ئابوورییەکی هاوبەش، زمانی هاوبەش و هەموو ئەو هاوبەشانەی دیکەش کەدەشێت بەهۆیانەوە فۆرمێکی دیاریکراو و یەکگرتوو بەو گروپە بدرێت، هۆبزباوم ئەم زنجیرە داهێنانانە ناو دەنێت "داهێنانی کەلەپور"، یاخود "داهێنانی ڕابردوو".(٤) مەبەستی هۆبزباوم لە داهێنان ئەوەیە ئەوشتە هاوبەشانە، ئەو ڕابوردووە گریمانکراوەی گوایە ڕابردووی هەمووانە، ئەو ئەسڵە هاوبەشەی باسیدەکەین، هەموویان کۆمەڵێک شتی دروستکراون و داهێنراون، بەڵام وەک ڕاستی بابەتی و گومانهەڵنەگر وێنادەکرێن. ئەم هەموو شتە هاوبەشانە لەلایەن ئەو نوخبە خوێندەوارەوە دادەهێنرێن و تیۆریزەدەکرێن، کە بەناوی نەتەوەوە دەدوێت و نەتەوە وەک بوونەوەرێکی سیاسی دادەهێنێت.
لەکوردستاندا ئەم لە دایکبوونە فانتازییانەی نەتەوە، لەڕووی مێژووییەوە، لەپاڵ چەندان هۆکاری دیکەدا، کە ئێرە شوێنی باسکردنیان نییە، پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بەو ترسە گەورەوە هەیە، کە کورد لە سەدەی ڕابوردودا ڕووبەڕوویبۆتەوە، مەبەستم ترسی دامەزراندنی دەوڵەت بۆ ئەرمەنییەکان. ترس لە ئەرمەنییەکان ترسبووە لە گروپێک ویستویەتی جیاوازییە ئایینییەکەی خۆی بگۆرێت بۆ جیاوازی سیاسی و بەم جیاوازییە سیاسییەش فۆرمی دەسەڵاتێکی سیاسی ببەخشێت. بەمانایەکی دیکە ترس لە ئەرمەنییەکان لای کورد ترس بووە لەوەی ئایینی مەسیحی لەلایەن ئەرمەنییەکانەوە شێوەی دەسەڵاتێکی سیاسی لە فۆرمی دەوڵەتدا وەربگرێت و لەم ڕووەشەوە کورد وەک گەلێکی موسڵمان تووشی

کێشەی گەورەبێت. ئەم ترسە ڕۆڵێکی گەورەی بینیوە لە گۆڕانی "فانتازیای ئایینی" ئینسانی کوردا بە "فانتازیایەکی سیاسی"، فانتازیایەک لەپاڵ بەرگریکردنیدا لە ئیسلام وەک ئایینی زۆرینەی خەڵکی کوردستان بارگاویبووە بە بەرگریکردن لەو خاکەی، کە کورد لەو ڕۆژگارەدا بە خاکی خۆی ناسیوە. ئەم بەستنەوەیەی چەمکی خاک، یان نیشتیمان بە ئایینەوە، یاخود بەرگریکردن لە ئایین لە فۆرمی بەرگریکردن لە نیشتیماندا، ئەو هەنگاوە بووە هەم ئایین و هەم نیشتیمانی بە مانای سیاسی نوێ بارگاویکردووە و هەردووکیانی لەیەک پرۆژەی پاراستنی دەستەجەمعیدا کۆکردۆتەوە: پرۆژەی ناسیۆنالیزم. ئەم بارگاویبوونەی ئایین بە مانا سیاسی و نەتەوەییەکانی نیشتیمان لە گەشەی ئاسایی خۆیدا پرۆژەی یەکگرتنی کوردی لە پرۆژەیەکی ئایینییەوە گواستۆتەوە بۆ پرۆژەیەکی سیاسی نەتەوەیی، کوردی لە گروپێکی دینییەوە کردۆتە گروپێکی سیاسی و لەهێزێکەوە لەدەرەوەڕا پێناسبکرێت بۆتە هێزێکی خودپێناس.

-٧-

هەموو ئەو گۆڕانانەی باسمکرد ئەو زەمینە سیاسی و دینی و دەروونییە نوێیە دروستدەکەن، کە تیایدا یەکگرتن دەبێتە گوتاری باڵادەست.، کە ئەم گوتارەش دەبێتە گوتاری باڵادەست ئیدی هەموو ئەو پێکهاتە ڕۆشنبیرییەی لەناویدا ئامادەیە ناچاردەکات بە زارلوەکانی یەکگرتن، هاوخوێنی، هاوچارەنوسی، هاودەردی، هاونیشتیمانی و هاونەتەوەیی هتد.. بدوێت. کایەی سیاسی ناسیۆنالیستی نەک گوتاری یەکگرتن باڵادەستدەکات، بەڵکو بارگاویشیدەکات بە هەموو ئە ڕەهەندە ئایینییە ئەنترۆپۆلۆجییانەی موقەدەس دروست دەکەن. لێرەوە لەکاتێکدا

ناسیۆنالیزمی کوردی هەوڵدەدات سنوری دابەشبوونە ئایینییەکان تێپەڕێنێت و شوناسێکی نوێ دروستبکات، بۆنموونە سنوری جیاوازیی ئایینی نێوان تەریقەتەکان و تایەفە دینیەکان تێپەڕێنێت و لەودیوی ئینتیما ئایینییەکانەوە ئینسانی ئێمە بە ئینتیمایەکی فراوانترەوە، واتە ئینتیمای نەتەوەییەوە گرێبدات. ئەڵێم لەو کاتەدا، کە ناسیۆنالیزم ناچارە لە پشتی ئینتیماکانی ئایینەوە کاربکات بۆ بونیادنانی نەتەوە، ناچارە خودی نەتەوە خۆی و خودی ئەو گوتارەی دەخوازێت ئینتیما بۆ نەتەوە بکات بە بەشێک لە وشیاری و فانتازیای تاکەکان، وەک "ئایینێکی دیکە" پێشنیاربکات. بەکورتی لەکاتێکدا ناسیۆنالیزم لەودیوی جیاوازیی ئایینیەکانەوە کاردەکات و ئینتیمایەکی نوێ بۆ ئینسانەکان پێشنیاردەکات، هاوکات خۆی ناچارە خودی گوتاری یەکگرتن بکاتە "ئایینی مەدەنیانەی" خەڵک. لەمحاڵەدا تەکنیکی چاودێریکردنی گوتاری یەکگرتن بۆ گوتارەکانی دیکە ئەو شێوەیە وەردەگرێت، کە دەقە ئایینیەکان خودی ژیانی پێچاودێری دەکەن. وەک گوتارە دینییەکان گوتاری یەکگرتن دەیان حەڵاڵ و حەرامی نەتەوەیی دەهێنێتەکایەوە، کە تەماحی ئەوەیان هەیە بەهەمان قورساییە ڕۆحییەکانی حەڵاڵ و حەرامی ئایینی، کاربکان. ئەوەی گوتاری یەکگرتن لە گوتاری ئایین جیادەکاتەوە ئەو سنوورانەیە، کە هەریەکێک لەم دوو گوتارە دەیانەوێت بیگەنێ، ئایین دەیەوێت هەموو مرۆڤایەتی لەناو سنوورەکانی خۆیدا کۆبکاتەوە، لەکاتێکدا گوتاری یەکگرتن ڕووی دەمی تەنها لە نەتەوەیەکی دیاریکراوە. ئەمەش وادەکات گوتاری یەکگرتن لەکاتێکدا سەرگەرمی خولقاندنی ئینتیمایەکی ڕەمزی و فانتازییە بۆ کۆکردنەوەی گروپەکان لەدەوری یەک چەمک، یان یەک مانا، بەهەمان ئەندازەش سەرگەرمی کێشانی هێڵێکی ئاشکراشە لەنێوان ئەو گروپانە و دونیای دەرەوەی ئەو گروپانەدا. گوتاری یەکگرتن چەندە پێ لەسەر ئەو شتە هاوبەشانە دادەگرێت، کە ئەندامانی نەتەوەیەک بەیەکەوەکۆدەکاتەوە و

هاوچارەنوسیان دەکات و مژدەی ئایندەیەکی گەشیان پێدەدات، بەهەمان ئەندازەش پێ لەسەر ئەو خاڵانە دادەگرێت، کە ئەو نەتەوەیە لەدونیای دەرەوەی نەتەوە و لە نەتەوەکانی دیکە جیایدەکەنەوە.

لە کوردستاندا ئەم پرۆسەی خۆجیاکردنەوەیە لەسەرەتادا پرۆسەیەکی کولتوری بووە و تیایدا زمان ڕۆڵی ئەو سنورە ڕەمزییەی بینیوە، کە کوردی لەوانیتر جیاکردۆتەوە. دەکرێت کۆی ئەم خۆجیاکردنەوە کولتورییە لەسەر بنەمای زمان بە "ناسیۆنالیزمێکی کەلتووری" ناونووسبکەین و دلواکارییەکانی ئەم ناسیۆنالیزمە لە سنووری بەرگریکردن لە کۆمەڵێک تایبەتمەندێتی کولتوریدا ببینین. بەڵام ئەم پێداگرتنە کولتورییە لەسەر جیاوازیوون، دواتر لە ڕەوتی ڕوداوەکانی کوردستان و گۆڕانەکانی ناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا سنوری کولتور تێدەپەڕێنێت و وردە وردە گەشەدەکات بۆ پێداگرتن لەسەر مانا سیاسییەکانی جیاوازیوون. لەڕوی مێژووییەوە زۆرجار ناسیۆنالیزمی کولتوریی قۆناغی یەکەمی پرۆژەی ناسیۆنالیزمە، منداڵی ناسیۆنالیزمە، کە دواتر لە ڕەوتی گەشەکردنیدا ماناکانی کولتور فراوانتردەکات تا دەیگۆڕێت بۆ پرۆژەیەکی سیاسی. ئەمەش وەک ئارنیست گێلنەر ئەڵێت، لەجەوهەردا گەڕانی گروپێکی کولتورییە بەدوای فۆرمێکی سیاسیدا، کە بتوانێت ببێت بە پەناگا، یان کەپری ئەو کولتورەی ئەو گروپە پێشتر وەک کولتورێکی جیاواز پێناسیکردووە. (٥) بەمانایەکی دیکە لەدایکبوونی ناسیۆنالیزمی سیاسی مانای گۆڕینی سنوورە کولتورییەکانە بۆ سنووری سیاسی و گواستنەوەی مانا کولتورییەکانی بوونی گروپێکی فانتازیکراوە بۆ مانا سیاسییەکانی. بە لەدایکبوونی کایەی سیاسەت لە کوردستاندا ئیدی ناسیۆنالیزمی کولتوریی هەنگاوی یەکەمی بەرەو بوونی بە ناسیۆنالیزمێکی سیاسی هەڵناوە. ئەوەی ڕاستەوخۆ دەبێتە ژێرخانی گوتاری یەککگرتن ئەم گۆڕانەیە لە کارەکتەری ناسیۆنالیزمی کوردیدا، گۆڕان و گوستنەوە لە ناسیۆنالیزمێکی کولتورییەوە بۆ ناسیۆنالیزمێکی سیاسی.

ئەم گۆڕانەش لە یەکەمین دەرکەوتیدا گۆڕانە لە دید و بۆچوون و فانتازیای نوخبەی نوێی کوردیدا، ئەو نوخبەیەی سەرگەرمی بونیادنانی ئەو ژێرخانە سیاسی و کۆمەڵایەتییەیە، کە کایەی سیاسەتی لەکوردستاندا لەسەر دروستدەبێت و وردە وردە سەرزەمینی بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی سیاسی خۆشدەکات و دادەڕێژێت. دەشێت یەکەمین دەرکەوتی سیاسی و پراکتیکی و مێژوویانەی گوتاری یەکگرتن لە دروستکردنی ئەو فیدراسیۆنی خێڵانەدا بدۆزینەوە، کە (شێخ عوبەیدوڵای نەهری) لە ساڵی ١٨٧٨ دا دروستی کرد.(٦) ئەم فیدراسیۆنە یەکەمین هەوڵی سیاسی ئاشکرایە بۆ پیادەکردنی گوتاری یەکگرتن بەو مانایەی لەپشتی کۆکردنەوەی خێڵە جیاوازەکانی کوردەوە لەدەوری یاخیبوونێکی سیاسی سەرەتای فانتازیایەکی نەتەوەیی لەکاردابووە، کە هەوڵی مەیسەرکردنی ئەو یەکگرتنەی داوە. لە دوای ئەم ئەزموونەوە و بە تایبەتی لە سەرەتای ئەم سەدەیەوە ئیدی زۆربەی هەرە زۆری ڕێکخراوە سیاسی و کولتورییە کوردییەکان بەئاشکرا دەبنە هەڵگری گوتاری یەکگرتن و ئەم گوتارە دەبێتە بناغەی ئایدیۆلۆژی هەموو ئەو پرۆگرامە سیاسی و پرۆژە رۆشنبیرییانەی لەم سەدەیەدا کورد بەرهەمیاندەهێنێت.

-٨-

وەک گوتمان پرۆسەی گواستنەوە لە گروپێکی "ئەویتر پێناسەوە" بۆ گروپێکی "خودپێناس" پرۆسەیەکە لە هەناوی پرۆژەی ناسیۆنالیزمدا جێگیرە. واتە ئەوە ناسیۆنالیزمە وا لە گروپێکی ئەتنی دیاریکراو دەکات سنوورە رەمزییەکانی خۆجیاکردنەوەی خۆی لە سنورێکەوە، کە دەشێت لەلایەن ئەوانیترەوە بکێشرێن، دەگۆڕێت بۆ سنوورێک، کە خودی ئەو گروپە خۆی دەیکێشێت و بەرووی دونیای

دەرەوەیدا بەرزیدەکاتەوە. بێگومان پێداگرتن لەسەر ئەم سنوورە ڕەمزییە پێویستی بە پێناسێکی نوێ هەیە بۆ خودی ئەو گروپە، پێناسێک مەرجی هەرەسەرەکی تیایدا تێکشکاندن، یاخود لانیکەم لاوازکردنی ئەو ڕەهەندانەیە، کە ئەو گروپە بە گروپەکانی دیکە دەچوێنێت. لێرەدا وەک ئەندرسۆن ئەڵێت بۆ بنیادنانی شوناسی نەتەوەیی دوو ڕەهەندی دەرەکی پێویستییان بەتێکشکاندن هەیە:

یەکەمیان تێکشکانی گوتاری کۆسمۆپۆلیتییانەی ئایینە تەوحیدییەکانە، کە بەناوی هەموو مرۆڤایەتییەوە دەدوێن.

دووهەمیان: تێکشکانی ئیمپراتۆریەتە سیاسییەکانە، کە خۆیان وەک چوارچێوەی سیاسی گرووپە کولتوری و ئەتنییە جیاجیاکان پێناسدەکەن.

لێرەوە لەدایکبوونی نەتەوە وەک بوونەوەرێکی سیاسی وابەستەی تێکشکاندنی ئەو شوناسە کۆسمۆپۆلیتییانەیە، کە لە بوونی نەتەوە و لە شوناسی نەتەوە گەورەترن، مەبەست لەمەش تێکشکانی شوناسی کۆسمۆپۆلیتییانەی ئایینی و شوناسی ئیمپراتۆریەتە فرەنەتەوەکانە. لەکوردستاندا ئەم پرۆسەیە بە قەیرانە سەختەکانی ئیمپراتۆتیەتی عوسمانی لەکۆتایی سەدەی رابردوودا دەستپێدەکات، قەیرانی لاوازبوونی ناوەندی ئیمپراتۆریەتەکە و پارچەپارچەبوون و جیابوونەوەی کەنارەکانی ئیمپراتۆریەتەکە لە ناوەندەکەی. بێگومان ئەمە لەهەمانکاتیشدا قەیرانی هێزی کۆسمۆپۆلیتییانەی ئیسلام و تواناکانی ئیسلام بووە لە کۆکردنەوە و پێکەوەبەستنی نەتەوە جیاجیاکان بەیەکەوە وەک ئومەیەکی ئیسلامی یەکگرتوو و وەک برای ئایینی یەکتری.

بەڵام تەنها لەناوچوونی پەیوەندییە ئایینیە کۆسمۆپۆلیتییەکان و لەناوچوونی ئیمپراتۆریەتە فرە ئەتنییەکان بەسنین بۆئەوەی پرۆسەی گۆڕانی پێناسی گروپێک بەمانا ناسیۆنالییەکەی لەدایکببێت. واتە گوتاری یەکگرتن تەنها پێ لەسەر سنورە ڕەمزییەکانی جیابوونەوەی گروپێک لە گروپێکی دیکە داناگرێت، بەڵکو

لەهەمانکاتدا پێش لەسەر هەموو ئەو شتە هاویەشانەش دادەگرێت، کە توێژە جیاوازەکانی ناو یەک گرووپ تووند بەیەکەوە گرێدەدات. بە مانایەکی دیکە نەتەوە تەنها ئەو پێکهاتە کۆمەڵایەتییە نییە، کە لە پێکهاتەکانی دەرەوەی خۆی جیاوازە، بەڵکو ئەو پێکهاتەشە، کە لەناوخۆیدا وێکچو و هاوشێوە و بێجیاوازییە. گوتاری یەکگرتن ئەم شتە هاویەشانە ناوئەنێت "سیفەت"، یان "کاراکتەر"ی نەتەوەیی، یاخود وەک فەیلەسوف و باوکی ناسیۆنالیزمی ئەڵمانی هێردەر دەڵێت، "ڕۆحی نەتەوە". لێرەوە بۆ ئەوەی گرووپێک خۆی وەک نەتەوە پێناس بکات پێویستە بێدەنگبێت لەو سنوورە واقیعی و ڕەمزییە ناوەکییانەی توێژە جیاوازەکانی ئەو نەتەوەیە لەیەکدیادەبڕێت، یان لانیکەم ئینکاری بوونی ئەو جیاوازییانە بکات و لەباشترین دۆخدا بیانکاتە سنورێکی لاوەکی و بێبایەخ، کە ناتوانن یەکێتی نەتەوە تێکبدەن. بەبێ بێدەنگبوون و ئینکارکردنی جیاوازییە ناوەکییەکان ناکرێت قسە لەبوونی نەتەوە بکەین. گوتاری یەکگرتن دەبێت هەوڵی ئەوەبدات لە بوونی سنورە واقیعی و بەهێزەکانی بوونی پەیوەندییەکانی خزمخوامی و بوونی خێڵ و ناوچەی جیاواز بێدەنگبێت و لەهەمانکاتیشدا جیاوازییەکانی زمان، چین، جیهانبینی، جیاوازی بەهاو نۆرمی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی، جیاوازی خەون و چاوەڕوانی جیاواز هتد..ئینکاربکات و لەباتی ئەمانە باس لەو هاوبەشە گریمانکراوانە بکات، کە هێمامانپێکرد. بەمانایەکی دیکە گوتاری یەکگرتن دەبێت هەوڵی لەناوبردنی ئەو شوناسە لاوەکییانە بدات، کە لە نەتەوە بچووکترن. بەکورتی ئەرکی سەرەکی گوتاری یەکگرتن جێبەجێکردنی ئەم دوو مەسەلەیەیە:

یەکەم: لەناوبردن، یان بێدەنگبوون لە هەموو ئەو جیاوازییە کۆمەڵایەتی و کولتوری و سایکۆلۆژی و سیاسییانەی دەشێت ڕێگرین لەبەردەم پرۆژەی یەکگرتندا و لێرەشەوە ڕێخۆشکردن بۆ بەرهەمهێنانی فانتازیایەک ئەو جیاوازییانە وەک خاڵێک بۆ یەکگرتن وێنابکات.

دووهەم: کێشانی هێڵێکی ئاشکرا لەنێوان 'خود' دا وەک نەتەوە و 'ئەوانیتردا' وەک بێگانە.

هیچ پرۆژەیەکی ناسیۆنالیستی بەبێ وزەی ئەم گوتارە iekgrtne ناتوانێت بژی و ناتوانێت هێزی کۆکردنەوە و مۆبیلیزەکردنی تاک و گروپە جیاجیاکانی هەبێت. نەتەوە وەک ئارنست رێنان دەڵێت پێکهاتەیەکی یەکگرتووی گریمانکراوە و مەحکومە بەوەی بەردەوام جیاوازییەکانی ناو هەناوی خۆی لەبیربکات، نەتەوە بوونەوەرێکە بەبێ بوونی ئەفسانە، ئەفسانەی لێکچوون و بەبێ درۆ، درۆی نەبوونی جیاوازی، دروستنابێت. هەر بەم ئاراستەیە ئارنست گێڵنەر پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت، کە لەژێر کاریگەری بزوتنەوەی ناسیۆنالیزمدایە نەتەوە دروستدەبێت، نەک نەتەوە پێشوەخت هەبێت و دواتر بزوتنەوەی ناسیۆنالیزم دروستبکات. بەمانایەکی دیکە گێڵنەر ئەڵێت ئەوە نەتەوە نییە، کە ناسیۆنالیزم، یان بزوتنەوەی ناسیۆنالیستی دروستدەکات، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەوە بزوتنەوەی ناسیۆنالیزمە ئەو ئامرازە سیاسی و کولتورییانە فەراهەمدەکات بەهۆیانەوە گرووپێک شوناسی خۆی وەک نەتەوە پێناسدەکات. (٧) لەم دیدەوە دەکرێ بڵێین کاری سەرەکی گوتاری یەکگرتن خولقاندنی ئەو گروپە خەیاڵییەیە، کە ئەندرسۆن ناوی ئەنێت نەتەوە. (٨) ئەو پرسیارەی لێرەدا دەبێ وەلامبدرێتەوە ئەوەیە داخۆ کێ ئەم گۆڕانانە لە وێناکردنی خوددا بەرپادەکات، کێ بیرۆکەی نەتەوە، یان لانیکەم ناسیۆنالیزم لەئاستی سیاسی و فەرهەنگیدا بەرهەمدەهێنێت و بەڕێوەیدەبات، کام هێزی کۆمەڵایەتی دەیەوێت نەتەوە دروستبکات و بەناوی ئەوەوە بدوێت؟ وەلامدانەوەی ئەم پرسیارانە لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکی دیکە و لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر و لە مێژوویەکەوە بۆ مێژوویەکی دیکە دەگۆڕێت. بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ئەوهێزانەی تیۆرەی ناسیۆنالیزم بە داینەمۆی ئەو گۆڕانانەی دەزانێت، کە لەسەرەوە باسمکردن بریتین لە نوخبە نوێکان، ئەو نوخبە نوێیانەی لە هەناوی

پرۆسەی مۆدێرنیزمی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیدا لەدایکدەبن، نوخبەیەک لەسەرەوەڕا و لەڕێگای دەزگاکانی دەوڵەتەوە، دەزگاکانی خوێندن، سەربازی، سیستەمی پارە و ئاڵوگۆڕ، باج، میدیا و ڕۆژنامەگەری، ئەدەبیات و هونەر هتد... دەخوازێت زمانی خۆی، هەستی خۆی، ئەخلاقیاتی خۆی، زەوق و سەلیقەی ئیستاتیکی خۆی، بەهاو نۆرمەکانی خۆی، دید و تێروانینەکانی خۆی بەسەر هەمووان‌دا بسەپێنێت و بەم سەپاندنەش ئەو بوونەوەرە ئاڵۆزە دروستبکات، کە ناوی نەتەوەیە. ئەم گۆڕانە وەک وتمان پێویستی بە کارخانەیەکی گەورەی بەرهەمهێنانی بنەما سیاسی و کولتورییەکانی نەتەوە هەیە و ماشێنی هەرەسەرەکیش تیایدا کایەیەکی سیاسی ناسیۆنالیستییە، کە تیایدا گوتاری یەکگرتن بەشێکی زۆری ئەفسانەکانی لێکچوون و یەکبوون و یەکئەسڵی و هەموو ئەو کارخانە کولتورییە بەرهەمدەهێنێت، کە ناسیۆنالیزم پێویستیپێیەتی.

-٩-

وەک پێشتر هێمانپێکرد بەدروستبوونی کایەی سیاسەت لە کوردستاندا ئیدی گوتاری یەکگرتن چیدی بەتەنها وەک گوتارێکی ڕۆشنبیری نامێنێتەوە و گەشەدەکات و دەبێتە گوتارێکی سیاسیش.، کە ئەمەش ڕوودەدات گوتاری یەکگرتن ئیدی لە کاری کۆمەڵێک ڕۆشنبیرەوە گەشەدەکات بۆ کاری سیاسیەکانیش. ڕۆشنبیران تا ئەوکاتەی گوتاری یەکگرتن لەکوردستاندا گوتارێکی ڕۆشنبیرییە و نەبۆتە گوتارێکی سیاسی هەیمەنەی خۆیان وەک گرووپێکی ستراتیژی لەناو دونیای مۆدێرنی کوردیدا پیادەدەکەن، دەڵێم لەناو دونیای مۆدێرندا، چونکە لەدەرەوەی ڕۆشنبیران و لەدەرەوەی پرۆسەی تازەکردنەوەی

کۆمەڵگای کوردیدا هێزە تەقلیدییەکانی دونیای ئێمە لەناو کەرتە تەقلیدییەکانی کۆمەڵگای کوردیدا لەوپەڕی هێزی کۆمەڵایەتی خۆیاندا بوون. بەڵام بەلەدایکبوونی مانا سیاسییەکانی جیاوازبوون و گۆڕانی گوتاری یەکگرتن لە گوتاری ڕۆشنبیرانەوە بۆ گوتاری سیاسییەکانیش، واتە بەلەدایکبوونی کایەی سیاسەت، ئیدی ئەو هاوکێشەیەی سەرەوە بەتەواوی دەگۆڕێت، کە سیاسەت دێت ئیدی گوتاری یەکگرتن ڕووبەڕووی پرسیارە پراکتیکییەکانی مەسەلەی یەکگرتن دەبێتەوە. چۆن یەکبگرین؟ چی دەتوانێ یەکمانبخات؟ کێن ئەو کەسانەی دەتوانن زۆربەی خەڵکی کوردستان کۆبکەنەوە؟ ئەم پرسیارانە، کە کایەی سیاسەت بە سەختی دەیانهێنێتە پێشەوە لە پێشهەموانەوە نوخبەی نوێ لەوە ئاگادار دەکاتەوە، کە ئەوان ئەو گروپە نین ئەم کارەیان بۆ جێبەجێبکرێت. ئەوە نووسەران، ڕۆژنامەنووسان، پارێزەران، ئەفسەران، مامۆستایان نین دەتوانن خەڵکی کوردستان لەدەوری خۆیان کۆبکەنەوە و سەرکردایەتیان بکەن، بەڵکو ئەوە گروپە کۆمەڵایەتییە تەقلیدیەکانن، کە خاوەنی نفوزێکی کۆمەڵایەتی گەورە و هەڵگری سەرمایەیەکی ڕەمزی ئەوتۆن ئەم کارەیان بۆ مەیسەربکات. سەرمایەی ڕەمزی ئەم گروپە تەقلیدییە بەپلەی یەکەم سەرمایەیەکی ئایینی بووە، بەڵام دواتر لەپاڵ گوتاری یەکگرتندا ڕەهەندێکی سیاسی نەتەوەییش دەگرێتەخۆی. هەڵگرانی ئەم سەرمایەیە بریتیبوون لە شێخەکانی تەریقەت، پیاوانی ئایین، سەرۆک عەشیرەتەکان و هەندێک لە خێزانە ئەرستۆکراتەکان.

کێشەکەش لێرەدا دەستپێدەکات، پرۆسەی مۆدێرنیزمی سیاسی پرۆژەیەکە ڕۆشنبیران، یاخود نوخبەی نوێ خولقێنەرین، بەڵام ئەو گرووپەی دەتوانێت لەناو واقیعی کۆمەڵایەتی کوردیدا پیادەیبکات ئەوان نین، بەڵکو هێزە تەقلیدییەکانی دونیای ئێمەن. بەمانایەکی دیکە ئەوانەی کورد وەک نەتەوە پێناسدەکەن، نەک وەک خێڵ، یان ئەندامانی تەریقەتێک، یان بەشێک لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی،

نوخبەی نوێن، بەڵام ئەوانەی لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە توانای جێبەجێکردنی ئەم پرۆژەیەیان هەیە و دەتوانن خەڵکی کورد لەدەوری خۆیان کۆبکەنەوە ئەم نوخبەیە نین، بەڵکو کۆی هێزە تەقلیدییەکانی ناو واقیعی کوردین، لەپێش هەمووشیانەوە سەرۆک خێڵەکان و شێخەکانی تەریقەت. ئەمەش مانای ئەوەی ڕۆشنبیران بۆ پتەوکردن و فراوانکردنی کایەی سیاسەت و کردنی فانتازیای خۆیان بە فانتازیای نەتەوە دەبێت مەوقیعی کۆمەڵایەتی خۆیان چۆڵبکەن بۆ ئەو گرووپەی لانیکەمی ئیمکاناتی کۆمەڵایەتی پیادەکردنەی پرۆژەی ناسیۆنالیزمی هەیە. واتە ڕۆشنبیران بۆئەوەی بتوانن مانا سیاسییەکانی دروستبوونی نەتەوە بپارێزن، دەبێت مەوقیعی کۆمەڵایەتی خۆیان بخەنە مەترسییەوە و تەسلیم بە سەرکردایەتیکردنی هێزە تەقلیدییەکانی دونیای ئێمە ببن. بەڵام نوخبەی نوێی کوردی، وەک هەموو نوخبەیەک لە هەر قوژبنێکی دیکەی دونیادا، بەم دابەزینە کۆمەڵایەتییە رازینەبووە. ئەم نوخبەیە نەیویستوە ئەو مەوقیعە کۆمەڵایەتییە بدۆڕێنێت، کە مۆدێرنیزمی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی پێیبەخشیبوو، بۆ نموونە ئەفسەرێکی کورد، کە پرۆسەی مۆدێرنیزەکردنی لەشکر لەناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا دروستیکردبوو، نەیویستووە مەوقیعی خۆی تەسلیمی تفەنگبەدەستی عەشیرەتێک لە عەشیرەتە بەهێزەکانی کوردستان بکات، یان پارێزەرێک خۆییخاتە ژێر دەسەڵاتی مەلایەکی ئایینییەوە و ڕۆژنامەنوسێک ئەمرو نەهی لە ئاغایەکی نەخوێندەوارەوە وەربگرێت. لێرەوە نوخبەی نوێی کوردی بەدوای ئەلتەرناتیڤی دیکەدا گەڕاوە، بەڵام داخۆ ئەو ئەلتەرناتیڤە چیبووە؟

لەوکاتەوە، کە پرۆژەی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی لەناوبراوە و مەسەلەی کورد بۆتە مەسەلەی گۆڕانی هاوکێشە سیاسییەکان لەڕێگای هێزەوە و بۆتە پرۆژەی کۆکردنەوەی خەڵک بۆ بەرگری و هەوڵدانی دروستکردنی کیانێکی کوردی لەڕێگای خەباتی چەکدارەوە، ئیدی مەسەلەکە بۆتە مەسەلەی گولستنەوەی سەرکردایەتی

بزوتنەوەکە بۆ ئەو هێزە تەقلیدییانەی توانای کۆکردنەوەی خەڵک و دروستکردنی هێزیان هەبووە. نوخبەی نوێی کوردی بۆنەوەی توشی ئەم چارەنووسە کۆمەڵایەتییە سەختە نەبێت هەوڵیداوە لەناو ئەو دەزگا دەوڵەتییە مۆدێرنانەدا جێیخۆی بکاتەوە، کە لەو ڕۆژگارەدا خەریکبوون دروستدەکران، بۆنموونە دەوڵەتی تازە دامەزراوی عێراقی، یاخود کەرتە مۆدێرنەکانی ناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و لەپێش هەموشیانەوە لەشکر و دەزگا ئیدارییە نوێیەکان. نوخبەی نوێی کوردی، کە لەوە نائومێددەبێت بزوتنەوەی ناسیۆنالیزمی کوردی تەرجەمەبکات بۆ دەوڵەتێکی نەتەوەیی و خۆی لە لوتکەی هەرەمی دەسەلاتەوە کۆمەڵگا ناچار بەگۆڕان بکات، وەک ئەوەی ئەتاتورک لەتورکیادا جیبەجێیکرد، ئەڵێم نوخبەی نوێی کوردی، کە ئەمەی بۆنەکراوە ئیدی نەیویستوە قورسایی خۆی بە تەواوەتی بخاتە ناو بزوتنەوەی ناسیۆنالیزمی کوردییەوە، بەتایبەتی کاتێک سەرکردایەتی ئەم بزوتنەوەیە لەژێر دەستی هێزە تەقلیدییەکانی دونیای ئێمەدابووە. وەک ئەلتەرناتیڤ ئەم نوخبەیە چووەتە ناو پرۆسەی دروستکردنی ئەو دەوڵەتانەوە، کە لەناوچەکەدا خەریکبوون دروستدەکران، دەوڵەتانێک، کە زیاتر بەناوی مۆدێرنیزمی سیاسییەوە دروستدەکران نەک بەناوی پرۆژەیەکی ناسیۆنالیستییەوە، لەپێش هەمووشیانەوە دەوڵەتی تازە دامەزراوی عێراقی، کە لەپشت دروستکردنیەوە هیچ پرۆژەیەکی ناسیۆنالیستی لەئارادا نەبووە. لێرەوەیە نوخبەی نوێی کوردی تا ساڵەکانی چلی ئەم سەدەیەش لە پەیوەندییەکی پتەوتردابێت لەگەڵ دەوڵەتی تازە دروستکراوی عێراق و دەزگاکانی ئەو دەوڵەتەدا تا لەگەڵ شۆڕشەکانی کورد خۆیدا، کە سەرکردایەتیکردنیان لەژێردەستی شێخەکانی تەریقەتدا بووە، شێخانێک، کە لەهەمانکاتدا دەرەبەگە گەورەکانی کوردستانیش بوون.

نوخبەی نوێی کوردی، کە منالی مۆدێرنیزەی سیاسیە لەناوچەکەدا ئامادە نەبووە لەپاڵ ناسیۆنالیزمێکدا بژی، کە مەوقیعە کۆمەڵایەتییەکەی بخاتە مەترسییەوە،

یاخود دەرگاکانی گەشەکردنی لەڕوودا دابخات. ئەم ناکۆکییە کوشندەیە وادەکات ئەفسەرە کوردەکان خەریکی دامەزراندنی لەشکری عێراقی بن، نەک بچنە ناو لەشکرەکەی شێخ مەحمودەوە. دەوڵەتی تازە دامەزراوی عێراقی زیاتر مژدەی گەشەکردن و بەرەوپێشەوەچوونی کۆمەڵایەتی بۆ ئەم نوخبە نوێیە پێبووە تا بزوتنەوەی ناسیۆنالیزمی کوردی. بە بۆچوونی من لەهەر لێکدانەوەیەکی سۆسیۆلۆجی شێلگیردا بۆ کۆمەڵگای کوردی و بەتایبەتی بۆ سۆسیۆلۆجیای سیاسیی ئەم کۆمەڵگایە، دەبێت جەوهەری ئەو دابەشبوونە سیاسیی و کۆمەڵایەتییە قووڵەمان لەبەرچاوبێت، کە نوخبەی نوێ و نوخبەی تەقلیدی کوردی لە سەرەتای ئەم سەدەیەوە لەیەکدیجیاکردۆتە. بەبێ تێگەیشتن لەم جیاوازییە زەحمەتە لە بەشێکی زۆری مێژووی سیاسیی خۆمان لە کۆتاییەکانی سەدەی ڕابوورد و لە ساڵە سەختەکانی ئەم سەدەیەشدا تێبگەین.

-١٠-

ناکۆکی نێوان ئەم دوو نوخبەیە درێژەدەخایەنێت تا ئەوکاتەی نوخبەی نوێی کوردی لەوە تێدەگات، کە ناتوانێت لەناو دەوڵەتە دروستکراوە تازەکاندا ئازادانە دەستبەکاربێت و ئاسۆکانی گەشەکردنی خۆی فراوانبکات. لەڕاستیشدا لەچلەکانی ئەم سەدەیە بەدوا ئیدی دەوڵەتێکی وەکو دەوڵەتی عێراقی چیدی بەتەنها کیانێکی سیاسیی مۆدێرنی بێ پرۆژەیەکی نەتەوەیی نەبووە، بەڵکو ئەم دەوڵەتە بۆتە سەرزەمینی دروستبوون و گەشەکردنی ناسیۆنالیزمی نەتەوەی باڵادەست لە چاپە پان عەرەبیزمەکەیدا. پێموایە ئەمە خاڵی وەرچەرخان بووە لە هەڵوێستی سیاسیی و کۆمەڵایەتی نوخبەی نوێی کورددیدا. تاچەند ئەم نوخبەیە بەهۆی کوردبوونیەوە

لە دەوڵەتــی عێراقــی دوورخــرابێتەوە و ئەگەری گەشــەکردنی بەرتەســکرابێتەوە، ئەوەنــدە زیــاتر بەلای ناســیۆنالیزمی کوردیــدا داشــکاوە، تاچەنــدیش لەنــاو ئەو دەوڵەتەدا جێیکرابێتەوە و ئاسۆی گەشەکردنی کراوەبووبێت ئەوەندە دلواکارییەکانی داواکاری تەنمەویی بوون. لێرەوەیە نوخبەی نوێی کوردی نوخبەیەکی ئۆتۆنۆمیستە و هەرئەمەشــە ســەرچاوەی ســەرەکی دروشــمی ئۆتۆنــۆمی لە بــزوتنەوەی ناسیۆنالیســتی کوردیــدا. بەڵام نــوخبەی تەقلیــدی بەحــوکمی بەشــدارنەبوونی ڕاستەوخۆی لەناو دەزگاکانی دەوڵەتدا و تەنــانەت مەترســی لەدەستدانی مەوقــیعە کۆمەڵایەتییەکەشی نوخبەیەکی توندڕەوتر و بەڕواڵەت ناسیۆنالیستتر بووە. ئەمەیە وادەکات شێخ مەحمود خۆی وەک مەلیکی کوردستان پێشنیاربکات، بەڵام دواجار، کە پــارتی دیمــوکراتی کوردســتان دروســتدەبێت و نــوخبەی نــوێ چالاکــانە کــاری تێدادەکات ئۆتۆنۆمی دەبێتە دروشمی بزوتنەوەکە.

لە چلەکــان بەدوا نــوخبەی نــوێی کــوردی لەعێراقــدا لەوە ئاگــاداردەبێتەوە، کە دەوڵەتی دروستکراوی عێراقــی ســەرزەمینی گەشــەی ئەو نییە و لەهەمانکاتیشــدا سەرەتاکانی گۆڕانی دەوڵەتی عێراقی بۆ پرۆژەی ناسیۆنالیستی نەتەوەی باڵادەست لەژیانی ڕۆژانەی خۆیدا هەســتپێدەکات. ئەمەش ئەو خــاڵەیە، کە نــوخبەی نــوێ و نوخبەی تەقلیدی کوردی زیــاتر لەیەکدی نزیکــدەکاتەوە و هەر ئەمەشــە وادەکــات نوخبەی نوێی کوردی لە چلەکان بەدواوە زیاتر ئامادەبێــت لە بــزوتنەوەی سیاســی کوردســــتاندا و ڕۆڵێکــــی ڕاســــتەوخۆتری تێــــداببینێت. ئەم لێکــدینزیکبوونەوە و هاریکــارییەش لە دامەزرانــدنی پــارتی دیمــوکراتی کوردســتان و هەڵبژاردنــی مەلا مستەفا بــارزانی وەک نــوێنەری نــوخبەی تەقلیــدی بە ســەرۆک بەباشــترین شــێوە دەردەکەوێت.

وەک ئاشــکرایە ڕەهەنــدێکی گرنگــی گوتــاری یەکگــرتن تــا ناوەڕاســتی چلەکــان ڕەهەندێکی تەنویرییە و لەجەوهەردا هەڵگری خەونێکی مۆدێرنیستییانەیە، خەونــی

ڕاکێشانی هێڵی شەمەندەفەر بۆ هەورامان لای (ئەحمەد موختار جاف) و خەونی بە ئەوروپاکردنی کوردستان لای (قانع) دوو دەرکەوتی گرنگی ئەم پرۆژە تەنویرییەن. تا چلەکان تۆنی سیاسەت لە گوتاری یەکگرتندا بەبەراوردکردنی بە تۆنی مۆدێرنیزەکردنی کۆمەڵگای کوردی تۆنی نومرە دوو بووە، بەبۆچوونی من ئەم مەسەلەیە پابەندی ئەو ڕاستییەیە، کە نوخبەی نوێی کوردی تا چلەکان زیاتر بەمەسەلەی مۆدێرنیزەی ڕووە کۆمەڵایەتی و کولتورییەکانی کۆمەڵگای کوردییەوە خەریکبووە تا بە چوونەپاڵ و داکۆکیکردن لەبەرنامە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکەی نوخبەی تەقلیدی. بەڵام لەدوای دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان و بەتایبەتی لەدوای دەستپێکردنی خەباتی چەکدارەوە، ئیدی ڕووە سیاسییەکانی گوتاری یەکگرتن زاڵدەبێت بەسەر ڕووە کۆمەڵایەتییەکانیدا و یۆتۆپیا کۆمەڵایەتییەکان شوێن چۆڵدەکەن بۆ بەرهەمهێنانی گوتارێکی سیاسی حەماسی. لێرەبەدوا ئیدی گوتاری یەکگرتن وردە وردە لە گوتارێکی ئەنوارییەوە، دەگۆڕێت بە گوتارێکی ڕۆمانسی سیاسی، کە حەماسەت هێڵە گشتییەکانی دەستنیشاندەکات. بەم گۆڕانەش بابەتی هەرەسەرەکی گوتاری یەکگرتن لە قسەکردن لەسەر کۆمەڵگا و کێشەکانیەوە دەگواسترێتەوە بۆ قسەکردن لەسەر شۆڕش و کێشەکانی، تادواتر وایلێدێت شۆڕش شوێنی کۆمەڵگا و لەڕاستیدا شوێنی زۆربەی بابەتە ڕۆشنبیری و فیکرییەکانی دیکەش دەگرێتەوە، بێگومان حیزبیش وەک ئەو بوونەوەرەی شۆڕش بەرپادەکات و شۆڕش بەڕێوەدەبات، دەبێتە سێنتەری گرنگیپێدان و سێنتەری کارە ڕۆشنبیرییەکان.

-۱۱-

ئەگەر لەدایکبوونی کایەی سیاسەت لەکوردستاندا بەشێکبێت لە پرۆسەی مۆدێرنیزەی سیاسی و لەوێشەوە مۆدێرنیزەی کۆمەڵایەتی، ئەوکات لەو پەیوەندییە نادیار بەڵام لەرادەبەدەر بەهێزە تێدەگەین، کە پرۆسەی مۆدێرنیزەی سیاسی لە دونیای ئێمەدا بە مەسەلەی یەکگرتنەوە گرێداوە. ئەم گرێدانەش لەدوای لێکنیزیکبوونەوەی نوخبەکان و بەرپاکردنی خەباتی چەکدارەوە وایکردووە گوتاری یەکگرتن، راستەوخۆ ببێتە سەرزەمینی باسکردنی ئەو داخوازییە پراکتیکی و واقیعییانەی کۆکردنەوەی هێز بۆ بەرەنگاری و بەگژاچوونەوە دەیسەپێنێت. لەم ساتە بەدواوە گوتاری یەکگرتن بەرگری لە شوناسێک کردووە، کە شۆڕش ویستویەتی بنیادیبنێت، نەک شوناسێک واقیع پێشکەشی کردبێت. ئەمەش وەک پێشتر هێمامانپێکرد مانای بوونی شۆڕش بە بابەتی سەرەکی گوتاری یەکگرتن نەک کۆمەڵگا. ئەم خاڵەیە وادەکات پێشمەرگە و خەباتی چەکداری ببنە گرنگترین بابەت لەدونیای رۆشنبیری ئێمەدا و خەونی راکێشانی هێڵی شەمەندەفەر بۆ هەورامان، وردە وردە جێگا چۆڵکبات بۆ گۆرانی گوتن بە شۆڕش و پێشمەرگەدا.

بێگومان کێشەی هەرە سەرەکی کۆمەڵگای ئێمە لەگەڵ گوتاری یەکگرتندا لەوەدایە ئەم گوتارە خۆی وەک بنەمای هەموو پرۆژەیەکی تازەگەرانە لە دونیای سیاسی و رۆشنبیری ئێمەدا پیشاندلوە و رۆشنبیرانی ئێمە پەیوەندییەکی راستەوخۆیان لە نێوان مۆدێرنیزم و یەکگرتندا کێشاوە. یەکگرتن بۆتە مەرجیپێشینی پیادەکردنی هەموو پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی نوێ. ئەمەش بەحەتمی مانای تەسلیمکردنی هەموو پرۆژەیەکی تازەکردنەوەی کۆمەڵگای ئێمەبووە بەو نوخبە تەقلیدییەی لەڕووی عەمەلییەوە لەهەمووان زیاتر توانای کۆکردنەوەی خەڵکی هەبووە. بێگومان ئەمە بۆخۆی چارەنووسێکی بەدە، کە پرۆسەی تازەکردنەوەی

سیاسی و لەوێشەوە کۆمەڵایەتی و کولتوری لەدونیای ئێمەدا کەوتوونەتە ناویەوە. هاوکات نابێت ئەوەمان لەیادچێت، کە گوتاری یەکگرتن هەمیشە گوتارێک بووە لەسەرەوەڕا و لە ڕێگای نوخبە سیاسی و ڕۆشنبیرییەکانەوە بەسەر کۆی کۆمەڵگای ئێمەدا سەپێنراوە، یاخود هەوڵی سەپاندنی دراوە. گوتاری یەکگرتن گوتارێک بووە لەچوارچێوەی ستراتیژی نوخبەکاندا کاریکردووە و بەحوکمی لەئارادانەبونی بونیادێکی ئابوری کۆمەڵایەتی سیاسی گەشەکردوش، کە بتوانێت سنووری دەسەڵاتی نوخبەکان دەستنیشانبکات، یاخود بونیادی دەسەڵات فراوانتربکات و جگە لە نوخبەکان هێزە کۆمەڵایەتییەکانی تریش بگرێتەخۆی، ئیدی ئەم گوتارە نەیتوانیوە گەشەبکات و ببێتە بەرنامەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی فراوان، کە چەند هێزێکی جیاواز لەسەر بنەمای پەیمانێکی کۆمەڵایەتی کاری تێدابکەن و هەوڵی پیادەکردنی بدەن. ئەم جەوهەرە نوخبەویەی گوتاری یەکگرتن خودی ئەم گوتارەی کردۆتە سەرزەمینی ململانێی و پێکدادانی باڵە جیای نوخبەکان و لەوێشەوە دروستبوونی تەوەرەی سیاسی و کۆمەڵایەتی جیاواز، کە دواتر هەریەکێکیان لەسەر نەفیکردنی تەواوی ئەویتریان کاریکردووە. بەمانایەکی تر خودی گوتاری یەکگرتن بۆتە سەرزەمینی دابەشبوون.

ئەم دەرەنجامە لەو ڕاستییەوە سەرهەڵدێنێت، کە هەریەکێک لەو نوخبانە، یان هەریەکێک لە توێژە جیاجیاکانی ناو یەکێک لە نوخبەکان ناچاربووە بۆ پاراستنی گوتاری یەکگرتن بەناوی هەمووانەوە، بەناوی هەموو نەتەوەوە قسەبکات. هەر گروپێکی کۆمەڵایەتی ویستبێتی لەدەرەوەی تێز و بۆچوونەکانی گوتاری یەکگرتندا بدوێت، مەحکوم و تاوانبار کراوە. هەرکەسێ لەو وێنانە نەچووبێت، کە گوتاری یەکگرتن کێشاونی، هەرکەسێک هەڵگری نیدی ئەو گوتارە نەبووێت، هەرکەسێک ئەمر و نەهیەکانی ئەو گوتارەی نەکردبێتە ئەمر و نەهی خۆی، کەوتۆتە دەرەوەی نەخشەی نەتەوە و نەخشەی شۆڕش و نەخشەی نیشتیمانپەروەرییەوە. مادامەکی

گوتاری یەکگرتن باس لەیەک نەتەوە و لەیەک شۆڕش و لەیەک سەرکردە و لەیەک ئایدیۆلۆژیا و لەیەک مەسڵەحەت و لە یەک دونیا دەکات، بۆیە ناکرێت لەیەککاتدا زیاد لە یەک دید و یەک بۆچوون و یەک وێناکردن و یەک فانتازیا و یەک سەرکردە هەبێت. ئەو کەس و لایەنەی لەم ستراتیژیی یەکچوونە سەرتاسەرییە پێشنیارکراوە دەرچوو بێت لەسنوورەکانی نەتەوە دەرچووە و بەزۆر خراوەتە ڕیزی ناحەزانەوە. لێرەوە هەر گروپێ بیەوێت بدوێت ناچارە پەیڕەوی هێڵە گشتییەکانی ئەم گوتارە بکات و حوکمی کافربوونی سیاسی ئەو گروپە سیاسییانە بدوێن، کە بەناوی گوتاری یەکگرتنەوە نادوێن. ئەم مەسەلەیە بارودۆخێکی وای هێناوەتەکایەوە هەر گروپێک بەناوی هەموو نەتەوەوە نەدوابێت، مەترسی مەحکومکردنی لەلایەن ئەوانی دیکەوە ڕووبەڕوو بووبێتەوە. بۆیە هەر گروپێک لەکوردستاندا لەڕووی سیاسییەوە چالاکبووبێت ناچاربووە بەناوی هەموانەوە بدوێت. بۆئەم مەبەستەش پەنابراوەتە بەر هەرشتێک ئەمکارە بتوانێت مەیسەربکات. کەم نین ئەو ئامراز و ڕێبازە ناسیاسییانەی لەمێژووی سیاسی ئێمەدا بۆ مەیسەرکردن و پیادەکردنی گوتاری یەکگرتن خراونەتەگەڕ، کە دواتر دەرەنجامی پێچەوانەیان بەدەستەوەداوە، ئامراز و ڕێبازی ناسیاسی لەبابەتی ژن و ژنخوازی، پارە و دیاری بەخشینەوە، چاوپۆشی لە کاروکردەوەی نابەجێ، تەحالوفاتی خێڵەکی کاتی و ناوچەگەریی تا بەو پرنسیپە ئایدیۆلۆژییە ساکارانە دەگات، کە بۆ یەکخستنی ئەندامانی حیزبەکان ناچار بوون هەوڵی هیچ تەفسیرکردنێکی جدییانەی دونیا نەدەن و نەوێرن گرفتە ڕاستەکانی دونیای ئێمە باسبکەن، لەپێش هەمووشیانەوە گرفتی ونبونی ڕۆحیەت و عەقڵیەتی نەتەوەیی و نەبوونی بەرنامەی تێپەڕاندن و لەناوبردنی هەموو ئەو شوناسە تەقلیدی و بەسەرچوانەی ئینسانی ئێمە لەناو کۆمەڵێک پەیوەندی بەرتەسکدا زیندانیدەکات. ئەمڕۆ لەهەموو کات ئاشکراترە، کە گوتاری یەکگرتن چ ڕۆڵێ لەدابەشبوونی کۆمەڵگای ئێمەدا دەبینێت

و چۆن لەژێر سایەی نوخبە دوژمنکارەکاندا لەباتی یەک نەتەوە و یەک چوارچێوەی گشتی و یەک هەستکردن بە مێژوو و بە داهاتوو، چەندان نەتەوە و چەندان چوارچێوەی دژیەیەک و چەندان مژدەی ناڕاست و جیاوازمان بەچەندان داهاتووی وەهمی پێدەدرێت. ئەمەش وابەستەی ئەو ڕاستییەیە، کە گوتاری یەکگرتن گوتاری نوخبەکانە، نوخبە کوردییەکانیش هیچ ساتێک لەمێژوودا بەقەدەر ئێستا دابەش و پارچەپارچە و دژیەیەک نەبوون. هەر ئەمەش وادەکات خودی گوتاری یەکگرتن لەمساتەی ئێستادا بەر لە هەمووشتێک بوویێت بە گۆڕستان بۆ ناسیۆنالیزمی کوردی خۆی.

# بەشی دووهەم

-١-

کێشەی هەرەسەرەکی گوتاری یەکگرتن لەوەدایە باز بەسەر تاکەکەس و دونیای تاکەکەس و هەموو ئەو جیاوازییانەدا دەدات، کە گروپە جیاوازەکانی دونیای ئێمە هەڵگرین. یەکگرتن دەخوازێت دابەشبوونە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان بشارێتەوە و وێنەیەکی یەکگرتوو هەم بۆ ناوەوەی کۆمەڵگای کوردی و هەم بۆ دەرەوەی ئەو کۆمەڵگایە بەرهەمبهێنێت. بێگومان دروستکردنی ئەو وێنە یەکگرتووە کارێکی گرنگە و هیچ بزاوتێکی ناسیۆنالیزمی ناتوانێت بەبێ ئەو وێنەیە بژی، بەڵام کێشەی سەرەکی ئەم وێنەیە لای ئێمە لەوەدایە، کە بەرهەمهێنانی ئەو وێنەیە لەچوارچێوەی بوون و ئامادەیی کایەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتوری وادا رووئەدات، کە ناتوانێت جیاوازییەکان عەقڵانییکات و هەلی ئەوەیان بۆ برەخسێنێت لەناو گوتاری یەکگرتندا تەعبیر لە بوونی خۆیان بکەن. هاوکێشە سیاسی و کۆمەڵایەتییە باڵادەستەکان و پەیوەندییەکانی هێز و پێکهاتی دەسەڵات لە کوردستاندا بەر لە پرۆژەیەکی لەوبابەتە دەگرن. بۆ بنیادنانی چوارچێوەیەکی کراوە، کە تیایدا جیاوازییەکان بتوانن لە سەرزەمینی گوتاری یەکگرتندا تەعبیر

لەخۆیان بکەن دەشێت بیر لە داڕشتنی پرۆژەی دابەشکردنی دەسەڵات بەسەر گروپە جیاوزەکانی ناو کۆمەڵگای ئێمەدا و فراوانکردنی سنووری ئەو هێزانەی دەتوانن بەشدارین لە مەسەلەی بڕیاردانی کۆمەڵایەتیدا، بکەینەوە. لەڕاستیدا بەبێ گۆڕینی هاوکێشەکانی دەسەڵات و بەبێ کردنەوەی پانتاییەک بۆ هەناسەدانی جیاوازییەکان ناکرێت قسە لەبوونی یەککگرتن بکەین. یەککگرتن لە ڕاستیدا بریتییە لە دانانێکی ڕاستەوخۆ بە جیاوازیەکاندا، ئاخر یەککگرتن چییە جگە لە ڕێکەوتنی کۆمەڵێک جیاوازی بەیەکەوە و کۆبوونەوەیان لە چوارچێوەیەکی گشتیدا. ئەوەی لە ئێستادا لە کوردستاندا ئامادەیە چوارچێوەیەکە تیایدا نوخبە دەسەڵاتدارەکانی کۆمەڵگای ئێمە باز بەسەر فەرد و فەردانیەت، باز بەسەر مافی بەشداربوون لە بڕیاردانی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا و باز بەسەر مافی کۆمەڵگای کوردیدا بۆئەوەی جیاوازییەکانی خۆی لەناوەوەڕا تەندروستانە بژی، دەدات. جیاوازییەکانی ناو کۆمەڵگای کوردی لەچوارچێوەی ململانێی نێوان نوخبە دەسەڵاتدارەکانی کۆمەڵگای ئێمەدا، یان دەچەپێنرێن، یاخود بەسادەیی ئینکا ردەکرێن. هەموو ئەمانەش لەژێرناونیشانی ئەوەی گوایە کورد یەکە و کۆمەڵگای کوردی گروپ و تاقمی جیاوازی تێدا نییە، یاخود ئێمە لەقۆناغێکداین نابێت باسی جیاوازییەکانمان بکەین، یاخود چەپاندنیان لەڕێگای بێدەنگکردنی هەر دەنگێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی لەدەرەوەی ستراتیژی مانەوەی نوخبە دەسەڵاتدارەکان خۆیاندا. لەهەردوو بارەکەشدا مامەڵەیەکی ناڕاست و ناماقوڵ لەگەڵ واقیعێکی مێژوویدا دەکرێت، کە بەر لەهەموو شتێک پێویستی بەخوێندنەوەیەکی واقیعییانە و ناسینی کێشە و گرفتەکانی هەیە نەک ئینکارکردن و چەپاندنیان.

گوتمان لەکوردستاندا گوتاری یەککگرتن بەناوی ناسیۆنالیزمەوە باز بەسەر بوونی تاکەکەس و دونیای تاکە ئازادەکاندا دەدات، ئەمەشمان بەستەوە بەستراتیژی نوخبەکانەوە بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی سیاسی و کۆمەڵایەتی خۆیان. ئێستا

هەنگاوێک زیاتر دەچینەپێشەوە و دەڵێین ناکرێ قسە لەبوونی بزاوتێکی ناسیۆنالیزمی تەندروست بکەین، بەبێ ئامادەبوونی تاکەکەسی ئازاد، زەحمەتە بزاوتێکی نەتەوەیی ڕاستەقینە هەبێت بەبێ ئامادەبوونی ئیرادەیەکی ئازاد کەخۆی ئینتیما و شوناسی خۆی هەڵبژێرێت نەک لەدەرەوەڕا و لەڕێگای پەیوەندییەکانی خزمخواهی، یان هەر فشارێکی چەپێنەری ترەوە، بەسەریدابسەپێت. بەڵام داخۆ بە چ مانایەک تاکەکەسی ئازاد بناغەی هەموو پرۆژەیەکی ناسیۆنالیستییە؟ ئەگەر ئەوە ڕاستبێت، کە تاکەکەسی ئازاد بناغەی پرۆژەی ناسیۆنالیزم بێت و زەحمەتبێت لەدەرەوەی بوونی ئیرادەیەکی ئازاددا باس لەنەتەوە بکەین، ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە گوتاری یەکگرتن بەو شێوازەی لەدونیای ئێمەدا ئامادەیە ماڵئاوایی بکات و لە شوێنیدا "گوتاری جیاوازی" پیادەبکرێت؟
سەرەتا با وەڵامی پرسیاری یەکەمیان بدەینەوە.

-٢-

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دەبێت سەرەتا پێناسێکی نەتەوە بکەین جیا لەو پێناسە جەبریە ئابورییەی مارکسیزم بۆ نەتەوەی دەکات، هەروەها جیاش لەو پێناسە ئیرادەگەرییە زاتیەی ڕێنان، یان ماکس ڤێبەر بۆ نەتەوەی دەکەن. مارکسیزم بوونی نەتەوە بە بوونێکی مێژوویی دەزانێ، بوونی مێژوویش مانای ئەوەی نەتەوە هەم سەرەتایەکی هەیە و هەم کۆتاییش، لەخاڵێکەوە دەستپێدەکات و لەخاڵێکدا کۆتاییدێت. مارکسیزم خاڵی سەرەتای دروستبوونی نەتەوە بەگەشەکردنی ئابوری، یان ڕاستتر بدوێین بە هەوڵدانی دروستکردنی بازاڕی نەتەوەییەوە دەبەستێتەوە و نەتەوە وەک بەرهەمێک لەبەرهەمەکانی دروستبوونی

بازاڕی سەرمایەداری ئەبینێت.(٩) بەم پێیە نەتەوە قۆناغێکی حەتمییە لەگەشەی سەرمایەداریدا بەڵام لەهەمان کاتدا قۆناغێکی کاتیشە و پڕۆلیتاریا "کە نیشتیمانی نییە" زوو کۆتایی بەم قۆناغە دەهێنێت.

لەبەرامبەر ئەم بۆچوونە حەتمیەدا ڕێنان بوونی نەتەوە لە هەموو حەتمیەتێک دادەبڕێت و ڕاستەوخۆ دەیبەستێتەوە بە ئیرادەی تاکەکانەوە، ڕێنان لە تێگەیشتنیدا بۆ نەتەوە ئەوەندە فەردگەرایە پێیوایە ئینتیما بۆ نەتەوە کارێکە تاکەکەس دەبێت هەموو ڕۆژێک سەرلەنوێ تازەییکاتەوە و بڕیاری لەسەر بداتەوە. ڕێنان پەرگیری دەکات و تائەو خاڵە دەڕوات، کە بڵێت سبەینان، کە لەخەو ڕادەبین دەبێت بڕیار لەسەر ئەوە بدەین سەر بە چ نەتەوەیەکین.(١٠) بەباوەڕی ڕێنان ئەوە تاکەکەس و بڕیاری تاکەکەسیانەیە دەستنیشانی ئەوەدەکات کەسێک سەربە چ نەتەوەیەک بێت، نەک حەتمیەتێکی ئابووری، یان کولتوری. تاکەکەس خۆی نەتەوەی خۆی هەڵدەبژێرێت نەک بۆی هەڵبژێرن.

بەکورتی لەکاتێکدا مارکس بوونی نەتەوە بەکۆمەڵی فاکتەری بابەتی و جۆرێک لە حەتمیەتەوە دەبەستێتەوە، ڕێنان بوونی نەتەوە بە بڕیارو ئارەزوو و ویستی تاکەکانەوە گرێدەدات. ئاشکرایە لەم ڕووەوە جیاوازییەکی گەورە لەنێوان بۆچوونی مارکس و بۆچوونی ڕێناندا هەیە. ئەم جیاوازییە لە تیۆرەی ناسیۆنالیزمدا وەک جیاوازی نێوان دوو قوتابخانەی جیاواز پێشکەشکراون، "قوتابخانەی بابەتی" و "قوتابخانەی خودی" لە ڕاڤەکردن و تێگەیشتنی ناسیۆنالیزمدا. قوتابخانەی بابەتی قوتابخانەی ناساندنی نەتەوەیە وەک دەرەنجامی کۆمەڵێک فاکتەری بابەتی وەک بوون و ئامادەگی زمان، ئابوری، کولتور، مێژوو و هەموو ئەو شتانەی بەر لە دروستبوونی تاکەکەس بوونیان هەیە و دەستنیشانی شوناسی نەتەوەیی تاکەکان دەکەن. هەرچی قوتابخانەی خودییە بڕیار لەسەر ئەوەدەدات، کە تاکەکەس هەردەم دەتوانێت ئەو شوناسانەی پێشوەخت بۆی دەستنیشانکراوە ڕەتبکاتەوە و

شوناسی نوێ و جیاواز هەڵبژێرێت، ئەوەشی لەدەستنیشانکردنی شوناسی تاکەکەسدا گرنگە ئەوەیە ئەو کەسە چۆن دەیەوێت خۆی بناسێنێت، چ شوناسێک هەڵدەبژێرێت و چۆن بوونی ئەو شوناسە ڕەوادار دەکات، واتە چۆن ڕەوایەتی بەو شوناسە دەدات.

-٣-

بەبۆچوونی من ئەو ناکۆکییە ئاشکرایەی مارکس و بۆچوونی مارکسییانە لە ڕێنان و بۆچوونی ڕێنانییانە جیادەکاتەوە تەنها بەشێکی هەقیقەتە، بەشەکەی دیکەی تەبایبوونێکی گەورەیە لەنێوان ئەو دوو فەیلەسوفە گەورەیەی سەدەی نۆزدەهەمدا. چۆن؟ ئەوەی جێگای سەرنجە لەپشتی بۆچوونی مارکس و بۆچوونی ڕێنانەوە نادیارێک هەیە، کە هەردوو فەیلەسوفەکە وەک پێدراوێکی لۆژیکی، وەک بەڵگەنەویستێک، کە پێویست بە ناوهێنان نەکات مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن، ئەو پێدراوەش بریتیە لە بوونی تاکەکەس، تاکەکەسی ئازاد. ئەم تاکەکەسە لای مارکس ئەو پرۆلیتاریا، یاخود کرێکارەیە، کە بازاڕی سەرمایەداری ئازادیکردووە و ئەو مافەی پێداوە هێزیکاری خۆی لەکوێ و بەکێی دەیەوێت بفرۆشێت. بەمانایەکی دیکە مارکس دەیەوێت بڵێت سەرمایەداری ئەو ئازادییە ڕێژەییە بە پرۆلیتاریا دەدات هێزیکاری خۆی لەدەرەوەی زادگای خۆیدا، لەهەر جێیەکدا هێزیکاری تێدا بوویێت بە کاڵا، بفرۆشێت. ئەمەش مانای داپچڕان و جیاکردنەوەی ئەو تاکەکەسەیە لەهەموو ئەو پەیوەندییە تەقلیدییانەی، کە شێوەی بەرهەمهێنانی پێشسەرمایەداری ئینسانی تێدا سنووریەند دەکات، ئەمەش مانای داپچڕانی ئەو کرێکارەیە لەپەیوەندییەکانی خزمخواهی، خێڵ و ناوچە و فڕێدانی بۆناو بازاڕی سەرمایەداری،

کە بـازاڕێکە هەمـوو دونیـا دەکـاتە نیشـتیمانی خـۆی، نەک تەنهـا سـنوورە بەرتەسکەکانی خێڵ و زانگای ناوچەیی و لۆکاڵی خێڵ. ئارنست گیلنەر ئەم دیدە مارکسییە قوڵتردەکاتەوە و دەڵێ: سەرمایەداری، گیلنەر سەرمایەداری بە مۆدێرنە ناودەبـات، تاکەکەسـی گەڕۆک دروسـتدەکات، تاکەکەسـێک، کە جەبـری یاسـا ئابورییەکـان کردویەتـی بە کەسـێکی گەڕۆک و بەرەو ئەو شـوێنانەی بـردووە، کە ئابووری مۆدێرن تیایدا لەکـاردایە. لای گیلـنەر مـۆدێرنە پێویسـتی بە دەستیکاری مۆبیل و ئینسانی گەڕۆک و دابڕا و لە زانگا تەقلیدییەکان هەیە. بەبۆچوونی گیلنەر مۆدێرنە هەلی ئەوە بۆ تـاکەکەس دەڕەخسـێت ڕزگاربیێـت لە ئینتیمـای بچـووک و دونیـای بەرتەسـکی نـاو ژیـنگە تەقلیـدییەکان، لەهەمانکاتیشـدا ئەو ئاسـۆیە لەبەردەمیدا دەکاتەوە بۆ بەرهەمهێنان و هەڵبژاردنی شوناسی نوێ.(١١)

لای ڕێنـانیش بەهەمـان شـێوە تاکەکەسـێک ئامـادەیە دەتوانێـت بڕیاربـدات، تاکەکەسێک خاوەن ئیرادە، کە خۆی دەستنیشانی ئەوە دەکات سەر بە چ گروپ و شـوناس و نەتەوەیەک بێـت. ئەم تاکەکەسـە ڕێنـانییە لەجەوهەردا تاکەکەسـێکە ڕزگاربووە لەو پەیوەندییە سەرەتاییانەی کەبەر بەهەموو ئینتیمـایەکی سەرپەسـت دەگـرن و ئینسـان مەحکومـدەکەن بە ئینتیمـا بچووکەکـانی بەر لەدروسـتبوونی نەتەوەوە. ئەو تاکەکەسـەی ڕێنـان باسـیدەکات بـوونەوەرێکە خـۆی دەیەوێ بڕیاربدات، نەک گروپ لەباتی ئەو بڕیاربدات، خـۆی دەخوازێـت ئیـرادەی بخاتەکـار نەک ئیـرادەی لەدەرەوەڕا بخرێتەکـار، خـۆی دەیەوێـت بـدوێت نەک لەبـاتی ئەو و بەناوی ئەوەوە بدوێن. ئەم تاکەکەسە نایەوێت بێپرسـیار ئەو شوناسـە پێشـینانە قبووڵبکات، کە گروپە جیاوازەکـان دەیانەوێـت بەسەریدابسـەپێنن. ئەم تاکەکەسـە لای ڕێنـان تاکەکەسـێکی ئیـرادەگەرە، تاکەکەسێکە توانـا و ویسـت و ئـارەزووی هەڵبژاردنی سەرپەستی هەیە. بەکورتی تاکەکەسێکە خاوەنی هەڵبژاردن.

-٤-

وەک دەبینین چ لای مارکس و چ لای ڕێنان لەوبیو پەیدابوونی نەتەوە و بزوتنەوەی نەتەوەییەوە تاکەکەسێک ئامادەیە. ئەم تاکەکەسە لای مارکس گەشەی ئابووری و لای ڕێنان ئیرادەگەرێتی ڕزگاریکربووە لە زۆربەی ئەو قەید و بەند و ڕێگرە کۆمەڵایەتی و ئابووری و کولتوورییانەی لەناو هەڵقەی بچووکی ئینتیما بەرتەسکەکانی قۆناغی بەرلەسەرمایەداری و قۆناغی بەر لە ئیرادەگەرێتی نەتەوەییدا بەندیدەکەن. ئەم تاکەکەسە ئازادە، وەک پێشتریش هێمامانپێکرد، تاکەکەسێکە چیدی نە لەپاڵ ئایینێکی کۆسمۆپۆلیتی و نەلەپاڵ شوناسێکی حەتمی بەرتەسکدا خۆی پێناسناکات. ئەم تاکە بوونەوەرێکی بزۆکی دەرەوەی جوگرافیا بەرتەسکەکانی خێڵ و خێزانە و سنووری فانتازیاکانی دەکەوێتە ئەودیوی گووند و شارۆچکەکانەوە. ئەم تاکە لەمێژووی کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکاندا وەک تاکێکی عەقڵانی، ئازاد، خاوەن بڕیار ناسراوە، تاکێک، کە کانت بەسەرچاوەی ڕۆشنگەری دەزانێت.

پرۆژەی ناسیۆنالیزم پرۆژەیەکە لەسەر ئەو تاکە ئازادانە کاردەکات، غیابی ئەو تاکە ئازادانە مانای بوونی نوقسانیەکی جەوهەری لەهەناوی پرۆژەی ناسیۆنالیزمدا.، کە تاکی ئازاد نەبوو ئەوکات ئەو پێکهاتە سۆسیۆلۆژییانەی بەر لەدروستبوونی نەتەوە ئامادەن، بۆ نموونە خێڵ و پەیوەندییەکانی خزمخواهی، ڕێنادەن بە گەشەکردنی پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکان بەرەو بەنەتەوەبوون و لە هەمانکاتدا دەبنە ڕێگر لەبەردەم گەشەکردنی هەموو ئەو ئینتیما بچووکانەی دەکەونە بەر لەدروستبوونی نەتەوەوە، بۆ ئینتیمای نەتەوەیی. لەئاستی ئایدیۆلۆژیشدا غیابی تاکەکەسی ئازاد و غیابی ئەو فانتازیا و خەونانەی ئەو تاکەکەسە هەڵگریانە دەبنە نووقسانییەکی جەوهەری لەناو سیستمی بەرهەمهێنانی مەعریفیدا و وادەکەن ئەم مەعریفەیە نەتوانێت دونیایەک

پێشـنیاریکات گەورەتـر و کراوەتـر لە دونیـای پێکهاتەکـانی بەر لەنەتەوە. غیـابی تـاکەکەس وەک یەکەیەکـی سـەرەکی نـاو گوتـاری ئایـدیۆلۆژی نەتەوەیـی مانـای هەژارییەکـی ڕۆحـی ئەوتـۆ، کە خـودی ئەو گوتـارە لەنـاوەوەڕا وێرانـدەکات. بەبـێ کردنی تاکەکەس بە بنەمـای سـەرەکی ئەو گوتـارە و بەبـێ بەخشـینی کۆمەڵێـک بەڵێنی گەورە بە ئاییندەیەکی ڕۆشن بەو تاکەکەسـە، زەحـمەتە ناسـیۆنالیزم وەک ئایدیۆلۆژیا توانای قەناعەتپێهێنان و ڕازیکردنی ئینسـانەکانی هەبێـت. ناسـیۆنالیزم چەندە پێداگرتنێکی بەردەوامە لەسـەر ڕابـوردوویەکی درێـژ و پیـرۆز و پڕشـانازی، ئەوەندەش موژدەدانێکی دڵخۆشکەرانەیە بە ئاییندەیەکی ڕووناک.

ڕاستە گوتاری یەکگرتن لەدونیـای ئـێمەدا لەیەککاتـدا هەم هەوڵـی تێپەڕانـدنی ئەو پێکهاتـانەی داوە، کە لەنەتەوە گەورەتـرن، هەم ئەو پێکهاتـانەش، کە لەنەتەوە بچـووکترن، بەڵام لەهەردوو بـارەکەدا بەبـێ ئامـادەکردنی ئەو زەمیـنە تـایبەتەی تاکەکەسی ئازادی تێـدا دروسـتدەبێت. لێـرەوە ئەم گوتـارە بەبـێ هـیچ ئەگەرێکـی مێژوویـی ڕاسـتەقینە و بەبـێ ئەو ئـامرازە سـەرەکییە کـاریکردووە، کە توانـای پیـادەکردنی پـرۆژەی ناسـیۆنالیزمی هەیە، واتە بەبـێ "تاکەکەسـی ئـازاد"، کە ئینتیمای بۆ نەتەوە لە ئینتیمای بۆ خێڵ و ناوچە و ئایینزاکـان بەگرنگتـر بزانـێ و خودی ئەو ئینتیمایەشی زادەی بڕیارێـک، یـان لانـیکەم هەڵبژاردنێکـی تاکەکەسـی ئازادانەبێـت. بەمانـایەکی دیـکە گوتـاری یەکگـرتن لە دونیـای ئـێمەدا گوتـاری کۆبـوونەوەی تـاکە ئازادەکـان و گـرووپە ئازادەکـان نیـیە لەدەوری بەرنـامەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی، کە لانیکەمی داخوازییەکانیان بـۆ دابینبکـات، بەڵکو گوتاری یەکگرتن بۆتە گوتاری موناوەرات و تەحالوفـاتی دوو نـوخبە، کە لە شەڕێکی کوشندەدان لەسەر دەسەڵات و لەسـەر پاراسـتنی مەوقیعـی کۆمەڵایەتی خۆیان. ئەمەش وادەکات ئەرکی سەرەکی گوتاری یەکگرتن، کە ئەرکی خولقانـدنی ئینتیمایەکی نەتەوەییە، بگۆڕێت بۆ ئەرکی سـەرلەنوێ بەرهەمهێنـانەوەی مەوقیعـی

نوخبەکـان و بەرگریکـردن لێیـان. لێـرەوە یەکێـک لە کـارە هەرە سـەرەکییەکانی گوتاری یەککگرتن بـۆتە ئەوەی لێنەگەڕێـت هـیچ گروهێکـی کـۆمەڵایەتی لەدونیـای ئـێمەدا هەوڵــی ئەوە بـدات بەنـاوی خـۆی و بەنـاوی مـاف و قـازانج و مەوقیعـی کـۆمەڵایەتی خـۆیەوە بـدوێت. لەبـاتی ئەمە ئەم گوتـارە هەوڵــی تێکەڵکردنێکـی بەئەنقەستی سنووری گرووپە جیاوازەکان بەیەکدی دەدات، بۆنموونە تێکەڵکردنێکی بەئەنقەسـتی دلواکـاری گروپێکـی کـۆمەڵایەتی وەک جوتیـاران بە هـی گروپێکـی کـۆمەڵایەتی دیـکە وەک مامۆسـتایان و هـی ئەمـانیش بە هـی قوتابیـان و هـی قوتابیـانیش بە هـی کرێکـاران هتـد... هەمووشـی لەنـاو سـتراتیژیەتی پاراسـتنی دەسەڵاتی نوخبەکاندا. لەم ڕووەوە گوتاری یەککگرتن هەوڵـی خولقانـدنی فەوزایەکـی کـۆمەڵایەتی گەورە دەدات، بەڵام تـاقە گروپێـک بتوانێـت لەناویـدا سـودمەندبێت، نوخبەکانن.

بێگومان ئەم بۆچوونە دووبارەکردنەوەی ئەو بۆچوونە مارکسییە نییە، کە پێیـوایە خەباتی نەتەوایەتی بەلاڕێدابردن و بەهەڵەدابردنـی خەبـاتی چینـایەتییە، یـان ئەو بۆچوونەی، کە دەڵێت خەباتی نەتەوایەتی دێت بۆئەوەی ڕێ لە خەباتی چینایەتی بگرێت. ئەوەی مـن دەمەوێـت لێرەدا پێـی لەسـەر داگـرم جیـاکردنەوەی سنور و بەرنامەی چینەکان نییە لەیەکدی، بەڵکو هەوڵدانی کردنەوەی فەزای کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی ئێمەیە تـا ئەو ڕادەیەی گروپەکـان بتـوانن بەنـاوی خۆیـانەوە بدوێن و بە ئازادی بەرگـری لە مەوقیعـی کـۆمەڵایەتی و سـود و قـازانجی تـایبەتی خۆیـان بـکەن و بتـوانن ئـازادانە دیـدی خۆیـان بـۆ دونیـا و کۆمەڵگـا و شـێوەی ئۆرگانیزەکردنی پەیوەندییەکان، پیادەبکەن.

-٥-

بەمجۆرە گوتاری یەکگرتن بەچەپاندنی ئەو جیاوازییانە و ئینکارکردنیان زەمینەی ناکۆکی و ئەگەری تەقینەوەی کۆمەڵایەتی بەردەوام سازدەکات و ئەبێتە ڤایرۆسێک و لەهەر هەلێکی لەباردا جەستەی کۆمەڵایەتی ئێمە لەناوەوەڕا دادەڕزێنێت. شەڕی ناوخۆ، لەسەرێک لەسەرەکانەوە دەرەنجامی کاری چەپێنەرانە و بێدەنگکردنی جیاوازییەکانی ناو کۆمەڵگای ئێمەیە. شەڕی ناوخۆ دێت بۆئەوەی یەکدەنگ لەباتی هەمەدەنگی و یەکدیدی لەبری هەمەدیدی ئامادە و باڵادەستبکات. بەم مانایە دەشێت بڵێین لەهەناوی گوتاری یەکگرتندا بەردەوام پرۆژەیەکی تەئجیلکراوی جەنگی ناوخۆ هەیە، کە تەنها گۆڕانێکی بچووک لە هاوسەنگی هێزی نێوان گروپە کۆمەڵایەتییەکاندا بەسە بۆ بەرپابوونی جەنگ و پێکدادانە خوێناوییەکان. بێگومان بارگاویکردنی بەردەوامی کۆمەڵگا بە پرۆژەی جەنگی تەئجیلکراو مانای بوونی ژێرخانێکی لەبار بۆ بەرپابوونی جەنگی بەردەوام. ئەمەش مانای دروستبوونی کۆمەڵگایەک، کە بەزمانی شەڕو پێکدادنی خوێناوی هاوسەنگییە کۆمەڵایەتییەکانی چارەسەر بکات، نەک لەڕێگای دۆزینەوەی کەناڵی عەقڵانی بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشانە و فەراهەمکردنی سەرزەمینی تەندروست بۆ پیادەکردنی ئەو شوناسانەی گروپە جیاجیاکان دەیانەوێت هەڵیگرن.

بێگومان ئایندە ی هەر کۆمەڵگایەک و هێزی هەر نەتەوەیەک پابەندی ئەوە نییە تاچەند ئەو نەتەوەیە لەناوخۆیدا یەکگرتووە، تاچەند گروپەکان و هێزەجیاجیاکانی لەیەکدەچن، تاچەند تاکەکەسەکانی بوونەتە کۆپییەکی مردووی یەکتری و هەموویان یەک چەپڵە و یەک هەلهەلە دەکێشن. بەپێچەوانەوە هێزی هەر کۆمەڵگایەک، بەپلەی یەکەم، پابەندی ئەو ڕاستییەیە تاچەند ئەو کۆمەڵگایە چوارچێوەیەکی عەقڵانی بۆ ئیدارەدانی جیاوازییەکانی ناو هەناوی خولقاندووە.

نەتەوە بوونبەیەکی بەزۆری کۆمەڵێ گروپی جیاواز نییە، بەڵکو چوارچێوەیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتورییە بۆ جێکردنەوەی هەموو جیاوازییەکان. نەتەوە کۆپیکردنی ئینسانەکان نییە بۆئەوەی هەریەکێکیان نوسخەیەکی شۆراوەی ئەویدیکەیان بێت، نەتەوە چوارچێوەیەکی سیاسی و کولتورییە چەندە مافی وێکچوون بە تاکەکانی دەبەخشێت، ئەوەندەش مافی جیاوازبوونیان دەسەلمێنێت. یەککگرتن ئەفسانەیەکە نوخبەکان دەیخولقێنن بۆ پیادەکردنی دەسەڵاتی سیاسی و کۆمەڵایەتی خۆیان، نەک ڕاستییەکی سۆسیۆلۆجی. نۆخی ئاسایی کۆمەڵگا نۆخی کێبەرکێ و ململانێ و دابەشبونی تاک و گروپەکانە بەسەر ئیهتیمام و سود و قازانج و شێوەژیانی جیاوازدا، نەک بێدەنگکردن و کوژاندنەوەی ئەو ناکۆکییانە. ئەوەی کۆمەڵگایەکی عەقڵانی لە کۆمەڵگایەکی ناعەقڵانی جیادەکاتەوە، لەوەدا نییە کۆمەڵگای عەقڵانی هەموو تاک و گروپەکانی کردووە بە یەک، بەڵکو لەوەدایە ئەو کۆمەڵگایە توانیویەتی ڕۆحییەتێکی هاویەش بۆ مونافەسە و کێبەرکێی کۆمەڵایەتی و تاکەکەسی بەرهەمبهێنێت. بەمانایەکی دیکە کۆمەڵگای عەقڵانی ئەو کۆمەڵگایەیە، کە تاکەکەس و گروپەکانی وەکویەک ڕێزی پرنسیپەکانی مونافەسەی کۆمەڵایەتی دەگرن و وەکویەک لە یەک خاڵی سەرەتایی یەکسانەوە دەستپێدەکەن، لەکاتێکدا کۆمەڵگای ناعەقڵانی لە غیابی هەر پرنسیپێکی کۆمەڵایەتی کێبەرکێ و ململانێکردن و لە غیابی هەر سەرەتایەکی یەکساندا دەژی. بۆیە بۆئەوەی بتوانین پێکەوە کاربکەین، چارەسەر لەوەدا نییە جیاوازییەکان ئینکاربکەین و بیانچەپێنین، یاخود ڕێبازێک، گروپێک، یان حیزبێک بێت و بەناوی هەمومانەوە بدوێت، بەڵکو چارەسەر لەوەدایە جیاوازییەکانمان ئاشکراتر و دیارتر و بەرجەستەتر بکەین و لەهەمانکاتدا چوارچێوەیەکی عەقڵانی و شەرعی بۆپێکەوە هەڵکردنیان دروستبکەین. بێگومان ئەمە بەو مانایە نییە، کە نۆخێکی تەوفیقی لەنێوان ڕێباز و گروپ و حیزبە جیاوازەکاندا بدۆزرێتەوە، ئەزموونی پەنجا بە پەنجا

لە کوردستاندا ئیفلاسی سەرتاسەری بەهەموو چارەسەرێکی تەوفیقی کرد. ئەوەی گرنگە ئەنجامبدرێت بەرهەمهێنانی عەقڵانییەت و شەرعیەتێکی نوێیە، کە وەک چوارچێوەیەکی گشتی بۆ پێکەوەهەڵکردن و ڕێکخستنی جیاوازییەکانمان دروست و قبوڵبکەین.

-٦-

گوتاری یەکگرتن بەو شێوەیەی لەدونیای ئێمەدا ئامادەیە، بەو شێوەیەی یەکێک لەبری هەمووان و بەناوی قازانجی هەموانەوە بدوێت، هەڵگری جەبرێکی سیاسی و ئایدیۆلۆژی گەورەیە، وادەکات هەر گروپێک بۆئەوەی بتوانێت بەناوی خۆیەوە بدوێت ناچاربێت بەناوی هەموو نەتەوەوە بدوێت. گوتاری یەکگرتن هەمووان ناچاردەکات، یان نەدوێین، یاخود بۆ هەموو نەتەوە و لەبری نەتەوە بدوێین. ئەمەیە بۆنموونە وا لە مارکسییەکی کورد دەکات تەنانەت لەناو ئیسلامیشدا بەناو تێزەکانی خۆیدا بگەڕێت، یاخود وا لەئیسلامییەک دەکات بڵێت پرنسیپەکانی سۆسیالیزم و دیموکراسییەت لە ناو قورئاندا هەن و سەرچاوەکەیان ئەو ئایەتانەیە لە مەککە بۆ پێغەمبەر هاتوونەتەخوارەوە. هەروەها گوتاری یەکگرتنە وادەکات لیبرالێک لەدونیای ئێمەدا لەیەککاتدا لەمارکسییەک مارکسیتر و لە ئیسلامییەک ئیسلامیتر و لە سۆسیال دیموکراتێک، سۆسیالد یموکراتتر بێت. ئەمەیە وادەکات بۆنموونە پارتی ڕۆژگارێک وایراگەیەنێت، کە سوود لە تێزی مارکسیزم لینینیزم دەبینێت و لەم دواییانەشدا لەسەر زاری سەرۆکەکەیانەوە بانگێشەی ئەوە بکات، کە کەس لەوان موسڵمانتر نییە، یان هێزێکی عەلمانی وەک یەکێتی نیشتیمانی کوردوستان سازشێکی گەورە لەگەڵ ئەو هێزانەدا بکات، کە ئایین و سیاسەت

بەیەکدی تێکەڵدەکەن. بێگومان نۆخێکی لەم بابەتە نۆخی شەڕە نەک نۆخی پێکەوەژیان و هاریکاری، نۆخی پشێویەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئایدیۆلۆژییە، کە بەئاسانی بەرە و قەیرانی خوێناوی گەشەدەکات، نەک نۆخێکی تەندروست بۆ بەرگریکردن لە ئازادی و سەرفرزای ئینسان. ئەوەی ڕێ بەم سوریالیزمە خوێناوییە دەگرێت گوتاری یەکگرتن نییە بەڵکو گوتاری جیاوازییە، گوتارێک لێنەگەڕێت وا بەئاسانی گەمە بە سنوورە ئایدیۆلۆژی و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان بکرێت، لێنەگەڕێت تێزەکان و دونیابینییەکان و سیاسەتەکان تێکەڵ بەیەکببن. لەئێستادا پێویستمان بە گوتارێکە ئەو زەمینە سیاسی و کۆمەڵایەتییە ئامادەبکات، کە تیایدا هەر گروپێک بێسڵەمینەوە جیاوازییەکانی خۆی ئاشکرابکات، بەبێئەوەی مەترسی سەرکوتکردن و بێدەنگکردنی هەبێت. لە نۆخێکی لەم بابەتەدا هەر گروپە و دونیای مادی و ڕەمزی خۆی دەژی، هەر گروپە و سەرگەرمی وەدیهێنانی ئەو سود و قازانجە کۆمەڵایەتییانە دەبێت، کە عەقڵانیەتی ئەو کۆمەڵگایە وەک ئاسۆیەک بۆ گەشەکردن دەیخاتە بەردەمی، بەبێئەوەی هەوڵینەوەبدات سنوورەکانی ئەو عەقڵانیەتە وێرانبکات. تەنها لەم ڕێگەیەوە دەکرێت هاوسەنگییەکی کۆمەڵایەتی و ڕۆحی بێتەکایەوە، کە بەزەحمەت تەقینەوەی لەپڕ و چاوەڕوانەکراوی تێدا دروستدەبێت.

-٧-

گوتاری جیاوازی گوتارێکە پێویستی بە ڕەمزی کۆیی بەناهەق پیرۆزکراو، یان ڕەمزی کاریزمی، کە بەناوی هەموو جیاوازییەکانەوە قسەبکات، نییە. گوتاری جیاوازی بۆ نموونە پێویستی بە عەرەفاتێک نییە بەناوی هەموو فەلەستینەوە

بدوێت، پێویستی بە مەسعود بارزانییەک نییە لەبری هەموو کورد بڕیاربدات، پێویستی بە ئاپۆیەک نییە بەناوی هەموو پارچەکانی کوردستانەوە بدوێت، پێویستی بە تاڵەبانیەک نییە بەناوی هەموو تازەگەرییەکەوە قسەبکات. دوا تەڵەزگەی گوتاری یەکگرتن بەرهەمهێنانی ئەو نۆخە کوشندەیەیە، کە دواجار مەهزەلەیەکی کوشندە دەخاتەوە، مەهزەلەی ئەوەی دەڵێت گەر عەرەفات نەمێنێت ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی لەناودەچێت، گەر سەدام بمرێت عێراق لەبەریەکهەڵدەوەشێتەوە، گەر تاڵەبانی نەمێنێت یەکێتی لەناودەچێت. دەشێت ئەم مەهزەلانە ڕاستنەبن و خۆیان بەشێکبن لە ستراتیجی بەرهەمهێنانەوەی مەوقیعی ئەو سەرکردە و نوخبە دەسەڵاتدارانە، دەشێت ئەم جۆرە بۆچوونانە پڕوپاگەندەی ئەو دەسەڵاتدارانەبن بۆ پاراستنی شوێنی خۆیان، بەڵام لەهەموو حاڵەتێکدا ئێمە لەکوردستاندا نموونەیەکی بەرچاوی بەواقیعبوونی ئەم مەهزەلەیەمان لەبەردەمدایە. ئەو نموونەیەش دارمانی دەستوبردی شۆڕشی چەندان ساڵەی کورد بوو لە ساڵی ١٩٧٥ دا دوای وازهێنانی بارزانی وەک سەرکردە.

-٨-

چیدی ناکرێت لەکوردستاندا ڕێبازێکی فیکری بەتەنیا، حیزبێک بەتەنیا، سەرکردەیەک بەتەنیا تەعبیر لەو هەموو جیاوازییانە بکات، کە کوردستان لە کۆتاییەکانی ئەم سەدەیەدا هەڵگریەتی. هەر هێز و گروپ و حیزب و سەرکردەیەک بیەوێت ئەم نۆخی یەکدەنگی و یەکلایەنییە بسەپێنێت، یان کار بۆ سەپاندنی بکات، دەبێت بە زەبری جەنگ و تیرۆری جەستەیی و فیکری و ئایدیۆلۆژی بیسەپێنێت. ئەمەش مانای بەردەوامبوونی شەڕ و بەردەوامبوونی توندوتیژی مادی

و ڕەمزی بۆ ماوەیەکی دیکەی درێژ لە کوردستاندا، لەکاتێکدا لەشی سیاسی وڵاتی ئێمە لەناو برینەکانیدا هەنجنەنجنە و بەسەر خوێنی خۆیدا دەکەوێت. چارەسەرەکان لەوەدانین چۆن ڕێبازە فیکرییە جیاوازەکان لەناوببرێن، یان وەک لە کوردستاندا باوە و دەگوترێت ئیحتیوابکرێن، چۆن ڕێبازە سیاسییەکان بکرێن بەیەک، بەپێچەوانەوە چارەسەرەکان لەوێوە دەستپێدەکەن ئەو ڕێباز و تێڕوانینە جیاوازانە لەچوارچێوەیەکی عەقڵانیدا نیشتەجێبکرێن و هەر هێزێکی کۆمەڵایەتیش لەو چوارچێوەیەدا بەرگری لە جیاوازییەکانی خۆی بکات و داخوازییە سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکانی خۆی تێکەڵ بە داخوازی هێزەکانی دیکە نەکات. بەناشەرعیکردنی هەر ڕێبازێک لە ڕێبازە سیاسی و فیکری و هونەرییەکان لە کوردستاندا، مانای وێرانکردنی بەشێک لە بەشەکانی کۆمەڵگای ئێمە و بەفیڕۆدانی تواناو وزە و خەونی ئەوکەسانەی هەڵگرین. وڵاتی ئێمە پێویستی بە هەوڵی هەمووان و توانای هەمووان و ئیرادەی هەمووان هەیە بۆ سەرلەنوێ بنیادنانەوە و ئاوەدانکردنەوەی، نەک بە لەناوبردن و ئیفلیجکردنی ئیرادەی هێزە جیاوازەکانی بەناوی گوتاری یەکگرتن و مەسەلەی یەکبوونەوە.

ئەوەی لەکوردستاندا گرنگە ڕوویدات "کردن بەیەکی" هێزەکان و ئایدیۆلۆژیاکان و تێڕوانینەکان نییە، چونکە ئەمە کارێکی مەحاڵە و هەرگیز جێبەجێناکرێت، ئەوەی گرنگە ڕێکخستنی ئەو پەیوەندی و ئایدیۆلۆژیا و ڕێباز و دیدە جیاوازانەیە بەیەکەوە. باڵەوە تێبگەین دەمجکردنی ئەو هەموو جیاوازییە سیاسی و کۆمەڵایەتییانەی لە کوردستاندا هەیە بەیەکەوە وەهمێکی گەورە و ترسناکە، چونکە تەنها شەڕ و پێکدادانی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەخاتەوە، بەڵام با لەوەش تێبگەین، کە دروستکردنی چوارچێوەیەکی عەقڵانی بۆ ئەو جیاوازییانە تاقە دەرفەتێکی تەندروستی کێشەکانە. چیدی ناتوانین جیاوزییەکان ئینکار، یان بچەپێنین، وەڵامی ڕاستەقینەی مێژوویی و تەندروست ئەوەیە کەناڵی تایبەت

بدۆزینەوە بۆ تەعبیرکردن لەو جیاوازییانە.

-٩-

کوردستانی کۆتایی ئەم سەدەیە کوردستانی سەرەتاو ناوەڕاست و تەنانەت کوردستانی تاکۆتایی هەشتاکانی ئەم سەدەیە نییە، زۆربەی هەرە زۆری ئەو شتانەی لە نەوەدەکاندا لە کوردستاندا ئامادەن شتی نوێن، ڕاپەڕین خۆی نوێترین داهێنانی سیاسی ئەم سەدەیەی ئێمەیە. دەتوانم بڵێم لەکۆتایی نەوەدەکاندا کوردستانی ئێمە پەیوەندییەکی ئەوتۆی بە ساڵانی بەر لەنەوەدەکانەوە نەماوە، تەنانەت شەڕەکانی کورد لەناوخۆی خۆیدا چۆتە قۆناغێکی نوێوە، کە سیفەتی هەرەسەرەکی ئەوەیە هەڵگری ئەگەری ئینتیحارێکی نەتەوەییە. پەیوەندی کورد بە داگیرکەرانەوە هیچکاتێک ئەوەندەی ئێستا پەیوەندی وێرانکردنی چارەنوسی جەماعی ئێمە وەک نەتەوەیەک نەبووە. سیاسەت لەکوردستاندا هیچکاتێک ئەوەندەی ئێستا گرێدراوی مەسڵەحەتی ڕاستەوخۆی نوخبەی دەسەڵاتدار نەبووە و هیچکاتێک ئەوەندەی ئێستا دوور لە مۆراڵ و ئەخلاق و هەستکردن بەلێپرسراویەتی کارینەکردووە. لەنەوەدەکاندا ئەو جیلە سیاسیەی کەجاران دەبوایە لەشاخەکاندا ژیانیان ببردایەتەسەر، یان لەباشترین حاڵەتدا لە ئێراندا وەک دەستبەسەرێک بژیانایە، ئێستا هەریەکێکیان هەڵگری پەساپۆرتی وڵاتێکی دیکەن و زۆریەشیان خاوەنی پرۆژەی ئابووریین لەدەرەوەی کوردستاندا. زۆربەی سەرکردەکانی کورد هەریەکەیان لەڕووی یاساییەوە هاووڵاتی وڵاتێکی دیکە و هەڵگری ناسنامەی وڵاتێکی دیکەن.

وەک دەڵێم زۆر شت لە کوردستاندا تازەیە، خودی دەسەڵاتی کوردی بەو شێوە

بەرفراوانەی ئێستای شتێکی نوێیە. بێگومان ئێمە پێویستمان بە نوێگەری دیکە هەیە جیا لەم نوێگەرییانەی ئێستا لەئارادان، پێویستمان بەسەرلەنوێ بنیادنانەوەی وڵات هەیە، پێویستمان بە بنیادنانی قوتابخانە و ناردنی منداڵان هەیە بۆ خوێندن، نەک لە چواردە و پازدە ساڵیەوە بیانکەین بە میلیشیای چەکداری حیزبەکان و رەوانەی بەرەی شەرەکانیان بکەین. ئەمرۆ لە کوردستاندا جیلێکی نەخوێندەوار لە دروستبووندایە، جیلی منداڵانی راپەرین، ئەو منداڵانەی لە رۆژگاری یەکەمی راپەریندا تەنها دە ساڵ و بگرە کەمتریش تەمەنیان هەبوو، تاقەتیان تەنها بەسەر هاویشتنی بەردێکدا رووەو داگیرکەران دەشکا. خیانەتێکی گەورەیە چ لەو نەوەیە و چ لە داهاتووی خۆمان وەک نەتەوەیەک ئەم منداڵانە، منداڵانی وەرزی ئازادی، ببنە قاچاغچی، یان پیاوکوژی ناو میلیشیاکانی حیزب. تاوانێکی گەورەیە جیلی ئازادیی لە کوردستاندا ببێتە یەکێک لە نەخوێندەوارترین جیلەکانی مێژووی هاوچەرخی ئێمە. پێویستمان بە بنیادنانی خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی، بە ئاگاداریکردنی پیران و پەککەوتە و گروپە لاوازەکانی ناو کۆمەڵگا هەیە، پێویستمان بە ئازادکردنی پەیوەندییەکانی نێوان پیاو و ئافرەت هەیە لەو رەقابە کۆمەڵایەتییە کوشندەیە، کە لە نەوەدەکاندا بە بۆنەی گەشەکردنی ئیسلامی سیاسییەوە لە کوردستاندا لەرادەبەدەر گەشەیکردووە و سەدان ئافرەت بوونەتە قوربانییەکی ناڕەوای ئەو تاوانە بێمانایانەی بە تاوانی شەرەف ناودەنرێن. لەرۆژگاری ئەمرۆدا پێویستمان بە دۆزینەوەی فۆرمی دیکەی پێکەوەژیانی گەنجانی کور و کچ هەیە لە ناو ئەو قەیرانە ئابووری و کۆمەڵایەتییە سەختەدا، کە فرسەتی هیچ پەیوەندییەکی راستەوخۆ و تەندروست ناهێڵێتەوە. گەنجانی ئێمە، کە ناتوانن ژن بهێنن و شوویکەن دەبێت دەرگای پەیوەندی دیکەی نێوان نێر و مێیان لێدانەخەین، با هەم ئینسانەکان و هەم تەندروستی جەستەیی و رۆحییان نەکەینە قوربانی پاراستنی کۆمەڵێک بەها و نۆرمی کۆمەڵایەتی کەسەر بە رۆژگار و هەلومەرجێکی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی

دیکەن. کوردستانی ئێمە پێویستی بە سەرزەمینێکی ئەخلاقی و کولتوری و مەعنەوی دیکە هەیە، ڕۆشنبیرییەکمان پێویستە ئینسان وەک بەهایەک تەماشاکات، نەک وەک پرۆژەی بوون بەئەندام لەم، یان لەو میلیشیادا، فەزایەکی ڕەمزیمان پێویستە ڕێز لە جیاوازییەکان بگرێت نەک بێدەنگ و لەناویانبات.
پێویستمان بەکارەباکردنی کوردستان هەیە نەک وێرانکردنی لە شەڕی ناوخۆدا، پێویستمان بەنیشتەجێکردنی بێماڵ و بێلانەکان هەیە نەک خولقاندنی بێماڵ و بێلانەی تر وەک دەرئەنجامی سیاسەتی دەرکردن و ڕاوەدونانی لایەنگرانی یەکدی. بە کورتی پێویستمان بە عەقڵانیەتێکی سیاسی نوێ هەیە، کە هەموومان وەک ئەندامی نەتەوەیەک ببینێت و پێناسبکات و لەهەمانکاتدا هەریەکێکمان وەک تاکەکەسێکی ئازاد و عەقڵانی و خاوەن ئیرادەی جیاواز بناسێنێت. کاتی ئەوە هاتووە کۆتایی بە سیاسەتی "بە پارتیکردن" و "بە یەکێتیکردن" ی کۆمەڵگا بهێنرێت، دەبێ هەوڵی پیادەکردنی سیاسەتی بە ئینسانکردن و بە هاووڵاتیکردن بدرێت.

-١٥-

پێویستمان بەبەرهەمهێنانی کۆمەڵێ ڕاستی دیکە هەیە، دەبێت سیاسەتێکی نوێی بەرهەمهێنانی هەقیقەت بەرهەمبهێنین، دەبێت کۆمەڵێک ڕاستی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فیکری نوێ بخولقێنین بتوانن هەم دان بە جیاوازییەکانماندا بنێن، هەم چوارچێوەیەکی شەرعی بۆ پێکەوە هەڵکردنیان بدۆزرێتەوە. ڕاستییەکان دەخولقێنرێن، کاتی خولقاندنی کۆمەڵێک ڕاستی نوێ هاتووە.

هۆڵەندا

کۆتایی ١٩٩٧

## سەرچاوەکان

١- بڕوانە:

Foucault, Michel, De orde van het vertoog. Boom, Amsterdam 1976.

٢- بڕوانە: جورج بالآندییە، لالنترۆپۆلۆجیا السیاسیە، منشـورات مرکـز الانمـاء القومی، بیروت ٦٨٩١

٣- بڕوانە:

3-Anderson, Benedict R. OG, Imagined communities, Reflections on the Origin and Spread of .Nationalism. Verso, USA 1991

٤- بڕوانە:

4-Hobsawm and Ranger, The invention of Tradition, Cambridge University Press, 1983.

٥- بڕوانە:

5-Gellner, Ernest Natie en Nationalisme. Wereldbibliotheek, Amsterdam 1994.

٦- بڕوانە:

6-Olson, Robert, The Emergence of Kurdisch Nationalism and the Sheikh Said Rebellion, 1880-1925. University of Texas press, Austin USA 1989.

٧- بڕوانە:

Gellner, Ernest Natie en Nationalisme. Wereldbibliotheek, Amsterdam 1994

٨- بڕوانە:

Anderson, Benedict R. OG, Imagined communities, Reflections on the Origin and Spread of .Nationalism. Verso, USA 1991.

٩- بڕوانە:

Stalin, Joseph, 'The nation' in Marxism and the national question, from The Essential Stalin: Major Theoretical Writings 1905-1952 ed. Bruce Franklin, Croom Gelm. London 1973.

١٠- بڕوانە:

Renan, Ernest "What is a Nation?" in Eley, Geoff and Suny, Ronald Grigor, ed. 1996. Becoming National: A Reader. New York and Oxford: Oxford University Press, 1996: pp. 41-55. See especially pp. 52-54

١١- بڕوانە:

،Gellner, Ernest Natie en Nationalisme. Wereldbibliotheek Amsterdam 1994

١٢- بڕوانە:

Verschuuren, Stan; Andr□ Gerrits; Marc Jansen; H.J.A. Hofland, Nationalisme in Europa en de Sovjetunie, emancipatie of onderdrukking in een nieuw gewaad. Van Gennep, Amsterdam 1991 .

# ئەنفال و مۆدێرنە

## ڕوداوێک لەدوامانەوە، یان ئەگەرێک لەپێشمانەوە

-١-

ئەو پرسیارە سەرەکییەی ئەم وتارە دەخوازێت وەڵامیبداتەوە ئەمەیە: ئایا ئەنفال ڕوداوێکە سەر بەمێژووە و کۆتاییپێهاتووە، یاخود ڕوداوێکە دەکرێت سەر بە ئاییندەبێت و ڕوویداتەوە، شتێکە بەسەرچووە، یاخود ئەگەرێکە و تائێستاش تێنەپەڕیوە، کارەساتێکە لە دوامانەوەیە، یاخود مەترسییەکەو هێشتا لەپێشمانەوەیە؟

لەبەر دوو هۆی تایبەت من پرسیارەکانم بەم شێوەیە دادەڕێژم:

١ـ بۆ من وەک کوردێک ئەنفال بەتەنها مادەیەکی ئەکادیمی و مەسەلەیەکی تیۆری نییە، بەڵکو بەپلەی یەکەم مەسەلەی مەرگی هەزاران ئینسانە، کە بەپێی بەرنامەیەکی دارێژراو و پێشوەخت دانرلو کۆتایی بەژیانیان هێنراوە و ڕەوانەی

گۆڕستانەکان کراون. هاوکات ئەنفال چەندە مەسەلەی ئەو مردوانەیە، کە کەس نازانێت لاشەکانیان لە چ سەرزەمینێکدا شاردراوەتەوە و بە چ جۆرێک کوژراون، بەهەمان ئەندازەش مەسەلەی ژیان و مانەوەی هەموو ئەوانەشە، کە لەدوای ئەو گۆڕەوشارە کۆییەوە ماونەتەوە و دەشێت سەرلەنوێ رووبەرووی هەمان مەترسی ببنەوە. بۆ من وەک کوردێک ئەنفال بەپلەی یەکەم ئەزموونی مەرگ و ترس لەدووبارەبوونەوەی مەرگە. ئەنفال تائێستاش لە وشیاری ئێمەدا بابەتێکی تیۆری نییە ئەوەندەی واقورمانە لەبەردەم کارەساتێکدا بوونی ئێمەی وەک نەتەوەیەک خستۆتە بەردەم هەڕەشەی نەمانەوە. ئەنفال سەرزەمینی زانستە کۆمەڵایەتیەکان نییە، بەڵکو سەرزەمینی ترسە کۆمەڵایەتییەکانە. بەڵام هەموو ئەمانە بەو مانایە نییە تیۆریزەکردنی ئەنفال کارێکی خراپ و بێبایەخ بێت، بەپێچەوانەوە تیۆریزەکردنی ئەنفال جگە لەوەی ئەرکێکی ئەخلاقییە و لەئاستی دووردا دەشێت بەشێکبێت لەداڕشتنی بەرنامەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی تەندرووست، کە هەوڵی بنیادنانی دونیایەک بدات چیدی کارەساتی لەو بابەتەی تێدا دووبارەنەبێتەوە، لەهەمانکاتدا تەحەداکردنێکی فیکریشە و بۆتێگەیشتنی ناچارماندەکات واز لە شێوە کۆنەکانی بیرکردنەوە و خوێندنەوە و ڕاڤەکردن بهێنین و بۆ دید و تیۆرە و لێکدانەوەی تازە بگەڕێین.

تیۆرەزیکردنی ئەنفال دەشێت یەکێ لەو دەروازە تیۆریە هەرە گرنگانە بێت لەرێیەوە پرۆسەی تازەبوونەوەی سیاسی و ئەخلاقی، پەیوەندی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگا، پەیوەندی دەوڵەت و گروپە ئەتنیە جیاوازەکان، مەسەلەی دەسەلات و چۆنیەتی پراکتیزەکردنی، ڕۆڵی ڕۆشنبیران لە کۆمەڵگای تۆتالیتێردا هتد... بخوێنینەوە. بەبێ تیۆریزەکردنی ئەنفال و بەبێ کەشفکردن و خوێندنەوەی ئەو هۆکارانەی ئەنفالیان دروستکرد، بەبێ ناسین و خوێندنەوەی ڕەگە قووڵ و نەدیتراوەکانی ئەم دیاردەیە، مەترسی دووبارەبوونەوەی مەترسییەکی ئامادە و بەرچاو و هەمیشەییە.،

کە دەڵێم نووسین و لێکۆڵینەوە و ناسینی ئەنفال ئەرکێکی ئەخلاقییە، ئەمە نەک بەتەنها لەبەر ئەوەیە ئەنفال دیاردەیەکی کارەساتئامێزی سەر بە ساتەوەختێکی تایبەتی مێژووی میلەتێکە و دەبێت باسبکرێت، بەڵکو ئەمە بەو مانایەشە، کە باسکردن و وەبیرهێنانەوەی ئەم دیاردەیە دەشێت رێگربێت لە دووبارەبوونەوەی، نە تەنها لەکوردستاندا، بەڵکو لەزۆر شوێنی دیکەی دونیادا، کە هاوکێشەی زۆرینە و کەمینە، هاوکێشەی دەوڵەتی تۆتالیتێر و گروپی ئەتنی جیاواز، هاوکێشەی کولتوری جیاجیا و ناسیۆنالیزمێکی ڕاسترەو، تیایدا بەهێز و بەرقەرارە. بەم مانایە خوێندنەوەی ئەنفال و شیکردنەوەی ڕەهەندە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقییەکانی دەشێت هەڵگری چەندان دەلالەت بێت، کە سنووری مێژووی کورد تێپەڕێنێت و وەک کێشەیەکی ئینسانی گەورە و بەشێک لە مێژووی هاوچەرخی بەشێک لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکان تەماشابکرێت. ڕاستە کوردبوون سیفەتێکی تایبەتی بە ئەنفال داوە، بەوەی لەپشتییەوە هاوکێشەیەکی نایەکسانی هێز و تەنیاکەوتنێکی سیاسی کوشندە ئامادەیە، بەڵام ئەنفال و ئەزموونی ئەنفالییانە ڕووداوێکە سنووری مێژووی کورد و مێژووی عێراق و مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست تێدەپەڕێنێت. ئەنفال ڕووداوێکە بێگەورەکردن دەشێت لەسیاقی مێژووی هۆڵۆکۆست و هەموو ڕەشەکوژییەکانی کۆمەڵگای مۆدێرندا تەماشایبکەین. جائەگەر هۆڵۆکۆست، وەک زیگمۆند باومان دەڵێت، بەشێکی ناوەکی و ئەگەرێک لە ئەگەرەکانی مۆدێرنە بێت، ئەوا ئەنفالیش بەهەمان مانا بەرهەمی مۆدێرنەیە، لەدونیایەکدا لەزۆر ڕووەوە لە دونیای نازییەکانی ئەڵمانیای ساڵانی سی و ساڵانی چلی ئەم سەدەیە دەچێت.(١) بەکورتی مەترسی دووبارەبوونەوەی ئەنفال مەترسییەکە ڕەگەکانی لەناو ڕابردووی ئەو پەیوەندییەدایە، کە منی وەک کوردێک بە کۆی مێژووی ئەو کیانە سیاسییەوە بەستۆتەوە کەناوی عێراقە.

٢ـ ئەگەر جینۆسـاید ئەگەرێـک لە ئەگەرەکـانی مۆدێرنەبێـت ئەوا ئەو ماشـێنەی پرۆسـەی جینۆسـاید لەزۆر ڕووەوە ئاراسـتە دەکـات و جینۆسـاید وەک هەوڵـدانی سـەپاندنی هەندەسـەیەکی کـۆمەڵایەتی دیـاریکراو بەرهەمـدێنێت، ئەو بـوونەوەرە ترسناکەیە، کە مۆدێرنە دروستیدەکات، مەبەستم لەو بوونەوەرە دەوڵەتی مۆدێرنە. دەوڵەتـی مۆدێرن هەڵگری هەمـوو ئەو توانـا و پێداویسـتییە مـادی و سیاسـی و کولتووری و ئەخلاقییەیە، کە وایلێدەکات بەئاسانی بوونی هەموو ئەو هێز و گـروپ و تاکانە وێرانبکات، کە لەگەڵ ئەو وێنانەدا یەکناگرنەوە، کە دەوڵەت بۆ کۆمەڵگای هەیە. دەوڵەتـی مـۆدێرن دەتوانێـت بـوونی هەمـوو ئەوانە بخاتەمەترسـییەوە، کە نایانەوێت لەناو پلانەکانی ئەو هەندەسە کۆمەڵایەتییەدا جێگیـربن، کە دەوڵەت بـۆ کۆمەڵگـــای دەکێشــێت. ئەم هەندەســـە کـــۆمەڵایەتییە لەفـــۆرمە پەڕگـــر و توندڕەوەکەیدا، فۆرمێک، کە لەعێراقدا ئامادەیە، خوازیاری ئەوەیە هەموو هێزێکی کۆمەڵایەتی و هەمـوو گرووپێکـی ئەتنـی و کولتـوری و ئـایینی جیـاواز لە گروهـی باڵادەسـت، واز لە شـوناس و پایەکـانی دەسـەڵاتی خۆیـان بهێـنن و ئەو شوناسـە سـەپاوە قبـوولبکەن، کە دەوڵەت لەسـەرەوەڕا بەسـەریاندا دەسـەپێنێت. ئەم هەندەسە کۆمەڵایەتییە سـەپێنراوە هەندەسـەی تواندنـەوەی جیاوازییەکـانە لەنـاو پرۆسەی دروستکردنی وێکچوونێکی سەرتاسەرید، کوشتنی فرەدەنگی و سەپاندنی تاقە دەنگە. بەم مانایە دەشێت دەوڵەتی مۆدێرن ماشێنی هەڕەشـەیەکی بەردەوام و تونـدبێت لە بـوونی هەر گـروپ و تاکەکەسـێک، کە فانتازیاکـانی دەوڵەت و وێنـاکردنە سیاسـی و کـۆمەڵایەتی و ئەخلاقـی و کەلتوورییەکـانی، چ بـۆ خـودی دەوڵەت خـۆی و چ بـۆ کۆمەڵگـا، قبووڵنەکـات. بێگومـان ئەم هەڕەشـانە لەو دەوڵەتـــانەدا ئامـــادەترن، کە لەدەرەوەی هەر پەیمـــانێکی کـــۆمەڵایەتی و هەر میکانیزمێکی چاودێریکردنی حوکمکردن و هەر پرۆژەیەکی سیاسـی و کۆمەڵایەتی دابەشـکردنی دەسـەڵاتدا، کـاردەکەن. دەوڵەتێـک لە فیکـری سیاسـی نوێـدا بە

"دەوڵەتی هۆبزی" ناونووسکراوە و لەسەرەوەڕا وێنە و هەندەسەیەکی کۆمەلایەتی و سیاسی تایبەت بەسەر کۆمەڵگادا دەسەپێنێت و لەسەرەوەڕا بڕیاردەدات کۆمەڵگا چ فۆرم و چ ناوەڕۆکێک و چ ئاراستەیەکی گەشەکردن وەریگرێت.(٢) بەکورتی ئەوەی وا لەمن دەکات پرسیارەکانم بەو جۆرە پێشنیاربکەم ئەو ترسە کیانیەیە، کە لەئەزموونی کوردبوونمەوە لەگەڵ دەوڵەتی عێراقیدا سەرچاوە دەگرێت، مەبەستم لەئەزموونی کوردبوونیش دوو شتە:

یەکەم: بوونی پەیوەندییەکی ناهاوسەنگ، کە من وەک ئەندامی گروپێکی ئەتنی جیاواز، وەک کوردێک، بەدەوڵەتی عێراقییەوە دەبەستێتەوە، پەیوەندییەکی یەکلایەن تیایدا دەوڵەتی عێراقی دەستنیشانی ئەوە دەکات من وەک کوردێک چ بوونێکی سیاسی و کۆمەلایەتی و کولتوریم هەبێت، یاخود نەمبێت، بەبێئەوەی مافی ئەوەم هەبێت شتێک لەسەر ئەو دەستنیشانکردنە دەوڵەتییە بڵێم. ئەمەش بەر لەهەمووشتێک سەندنەوەی مافی بڕیاردان و پەکخستنی ئیرادەی منە وەک ئەندامی گروپێکی ئەتنی دیاریکراو، کە بیەوێت شوناسی ئەتنی خۆی بەو شێوەیە بژی، کە خۆی دەیەوێت دەستنیشانیبکات.

دووهەمیش: مەبەستم لە کوردبوون ئەو پەیوەندییەیە من لەدەرەوەی شوناسی ئەتنیمدا واتە وەک تاکەکەسێک، بە دەوڵەتی عێراقییەوە دەبەستێتەوە، تاکەکەسێک دەوڵەتی عێراقی هەموو مافی فەردبوونێکی لێسەندۆتەوە و ڕاستەوخۆ دەستی بەناو قووڵاییەکانی ژیانیدا هێناوە و لەناوەوەڕا هەوڵی دارشتن و ئاراستەکردن و دواجاریش وێرانکردنی ئەو ژیانە ناوەکییەی داوە. ئەمە لەکاتێکدا ئەو تاکەکەسە لەڕێگای دەزگا مۆدێرنەکانی چاودێرییەوە هەموو بنەماکانی تاکبوونی لێسەندراوەتەوە و بە تۆڕە شەیتانییەکانی دەزگا و دامەزراوەکانی حیزب و دەوڵەت و هەموو ڕەهەندە چەپێنەر و کوشندەکانی تری دەسەلات، گەمارۆدراوە. لەهەردوو بارەکەدا ترسی من ترسی پێشێلکردنی دوو ڕەهەندی گرنگی شوناسی منە وەک

ئینسانێک، ڕەهەندی ئەتنی و ڕەهەندی تاکەکەسی ئەو شوناسە. بەم مانایە ئەنفال پلانێکی پێشوەختی داڕێژراوە بۆ وێرانکردن و لەناوبردنی ئەو دوو ڕەهەندە گرنگەی بوونی ئێمە وەک کورد لە عێراقدا، سیفەتی جینۆسایدییانەی ئەنفال خۆشی لەم هێرشە لەناوبەرە پێشوەخت پلانڕێژەکراوەدایە.

-٢-

ئەنفال بەتەنها هەوڵدانی وێرانکردنی ڕووکارێک لەڕووکارەکانی بوونی گروپێکی دیاریکراوی کۆمەڵگای کوردی نییە، سزایەک نییە بەتەنها ڕوو لە ڕەهەندێک لە ڕەهەندەکانی ژیان، هەڕەشەیەک نییە بەتەنها لە ژیانی ئابووری، یاخود لە ژیانی کۆمەلایەتی، یان ژیانی کولتوری گروپێکی دیاریکراو. (٣) ئەنفال هێرشێکی ڕاستەوخۆ و سیستماتیزەکراوی هەمەلایەنە بۆ سەر کۆی ژیانی کۆمەڵگایەک وەک گشتێکی دابەشنەکراو، بۆ سەر بوونی مادی و مەعنەوی خەڵکانێک تا پلەی فەناکردنی یەکجارەکیان. ئەنفال لەکاتێکدا کوشتن و بێسەروشوێنکردنی سەدان هەزار کەسە، لەهەمانکاتدا وێرانکردنی هەموو ئەو مەرجە پێشینانەیە، کە ژیان لە سادەترین شێوەیدا بۆ بەردەوامبوون پێویستیپێیەتی. وێرانکردنێکی پلانڕێژکراوی هەزاران گوندو شار و شارۆچکە و سوتاندنی دەیان دارستان و خنکاندنی سەدان کانیاو و کوشتن و تالانکردنی هەزاران هەزار ئاژەڵە. چەندە وێرانەیەکی مادییە بەهەمان ئەندازەش وێرانەیەکی مەعنەوییە. لەکاتێکدا مۆدێرنترین چەکی تێدابەکارهاتوە و فەرمانەکانی لە ناو سیستمێکی بیرۆکراتی نوێوە دەرکراوە و لەشکرێکی مۆدێرن بەناوی کۆمەڵێک پرنسیپی سیاسی مۆدێرنەوە پیادەیکردووە، لەهەمانکاتدا هەموو ئەو کەلەپورە تەقلیدی و سەلەفییە دینییەشی لەپشتە، کە

ڕەوایەتی بەم جینۆسایدە دەبەخشێت.
لێرەوە دەڵێم ئەنفال دیاردەیەکی ئاڵۆزە و بۆ لێکدانەوە و ڕاڤەکردن و تێگەیشتنی پێویستمان بەزیاد لە میتۆدێکی خوێندنەوە و شیکردنەوە هەیە. ئەو هۆکارانەی بەشدارن لەبەرهەمهێنانی ئەنفالدا هۆکاری جیاوازن، هەندێکیان وابەستەی ئەو کێشە کیانییانەیە، کە دەوڵەتی عێراقی لەڕۆژی دروستبوونییەوە وەک بوونەوەرێکی سیاسی دووچاریەتی، کێشەی نەتوانینی دروستکردنی ئیجماعی سیاسی و فەشەلی بەرهەمهێنانی بیرۆکەی هاولاتی و فەشەلی خولقاندنی "هەستێکی عێراقییانەی" سەرتاسەری لای دانیشتوانی ئەم وڵاتە. بەشێکی دیکەی هۆکارەکانی ئەنفال ڕاستەوخۆ گرێدراوی ئەو ڕێچکەیەیە، کە پرۆسەی مۆدێرنە لە عێراقدا پێیداتێپەڕیوە، مۆدێرنەیەک ئەفسەرەکانی سوپا و پیاوانی لەشکر و دەزگا چەکدارەکانی دیکە پیادەیان کردووە، مۆدێرنەیەک، کە دەشێت بە "مۆدێرنکردنەوەیەکی چەکدار" ناونووسیبکەین. هەندێک هۆکاری دیکەیان وابەستەی دیدەکانی بەعس و دونیابینی بەعسیزمی عێراقییە، دیدی ناسیۆنالیزمی عەرەبی لەچاپە پەڕگیر و سۆفی و فاشییەکەیدا. بەشێکی تری هۆکارەکان گرێدراوی کێشەی مۆراڵ و مەسەلەی بەرپرسیاریەتی ئینسانە لەبەردەم ئەمرو نەهییەکانی سیستمی بیرۆکراسیەتی نوێدا، بۆ نموونە پیادەکردنی ئەمرەکانی کوشتاری بەکۆمەڵ و وێرانکردنی هەزاران گوند لەلایەن لەشکر و دەزگاکانی تری دەوڵەتی عێراقیەوە بەناوی 'جێبەجێکردنی واجبەوە'، واجبێک، کە لەناو ماشێنی دەزگا بیرۆکراتییەکانەوە هاتوە و ڕاستەوخۆ مەرگی هەزاران کەسی نووسیوەتەوە، واجبێک، کە بناغەی کارکردنی سیستمی بیرۆکراسییەتی مۆدێرن و داماڵینی ئینسانە لەهەر بەرپرسیارییەتێکی ئەخلاقی و ویژدانی.(٤) بێگومان کولتوری سیاسی و چۆنیەتی مامەڵەکردن و دیتن و چارەسەرکردنی مەسەلەی ژیانی فرەنەتەوەیی و فرەکولتوری لەچوارچێوەی یەک دەوڵەتدا و ئەو یۆتۆپیا و وێنانەش

دەوڵەتی عێراقی هەڵگریانە بۆ ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان ئەتنیەت و کولتورە جیاوازەکان، لە هۆکارە هەرەگرنگەکانی پیادەکردنی ئەنفالە. سەرەڕای ئەمانە دەشێت سایکۆلۆژیای دیکتاتۆرێکی وەک سەدام حوسەین و پیاوانی دیکەی ناو بازنەی دەسەڵاتِ لە عێراقدا وەک فاکتەرێکی گرنگی دیکە ببینین و لە لێکدانەوەماندا بۆ ئەنفال لەبەرچاویانبگرین.

بێگومان لێکۆڵینەوەی ئەم هەموو هۆکارانە پێویستی بە وەرشەیەکی فیکری و لێکۆڵینەوەی گەورە هەیە و ناکرێت لە وتارێکدا کۆی ئەم هۆکارانە بەسەریەکەوە شیبکرێنەوە، بۆیە من لێرەدا هەوڵدەدەم بەشێکی زۆری ئەم هۆکارانە لەژێر چەتری یەک چەمکدا کۆکەمەوە و لەوێوەڕا لە ئەنفال و ڕوداوەکانی ئەنفال بڕوانم. ئەو چەمکەش، کە پێموایە دەتوانێت ئەم ڕۆڵە فرەلایەنە ببینێت چەمکی دەسەڵاتە، خوێندنەوەی میکانیزمەکانی کارکردنی دەسەڵاتە لە عێراقی سەردەمی سەدامدا. گرنگی چەمکی دەسەڵات بۆ من لەو دیدە فۆکۆییەوە هاتووە، کە پێیوایە ئینسان بوونەوەرێک نییە بەتەنها نووقم لەناو" پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان" و "پەیوەندییەکانی مانا" دا، بەڵکو لەهەمانکاتدا بوونەوەرێکە نووقمە لەناو "پەیوەندییەکانی دەسەڵاتدا". (٥) بۆ خوێندنەوەی ئەم ڕەهەندە دەسەڵاتییەی ئینسانیش لە پەیوەندیدا بە مەسەلەی جینۆسایدەوە دەگەڕێمەوە بۆ ئەو نووسینانەی فۆکۆ، کە لەسەر کارەستی هۆلۆکۆست و کوشتنی بەکۆمەڵی جولەکەکان لە ئەڵمانیای نازیدا نووسیویەتی. لەم نوسینانەدا فۆکۆ سەرەتایەکی زۆر بەهێز دادەڕێژێت بۆ خوێندنەوەی جینۆساید و توانا کوشندەکانی دەوڵەتی مۆدێرن لەپیادەکردنی جینۆسایدا. بەڵام پێشئەوەی بێمە سەر ئەو بابەتە با جارێ هێما بۆ دوو جۆر خوێندنەوەی هەڵە، یان لانیکەم ناتەولو، بکەم کەدەشێت بۆ ئەنفال و ڕوداوەکانی ئەنفال بکرێت.

یەکەمیان: خوێندنەوەی ئەنفال وەک بەشێک لە جەنگی نێران عێراق و

مامەڵەکردنی ئەنفال وەک بەرهەمێک لەبەرهەمەکانی ئەو جەنگە. دوهەمیان: سنووریەندیکردنی ئەنفال لە ناو عەمەلیاتێکدا، کە ئامانجەکانی بەتەنها تێکدان و وێرانکردنی بنەماکانی ژیانی لادێکانی کوردستان بووبێت.

-٣-

ئەنفال بەشێک نییە لە جەنگی هەشتساڵەی ئێران و عێراق و ناکرێت لە چوارچێوەی ئەو جەنگەدا لەم دیاردە ترسناکە تێبگەین. دەشێت جەنگی ئێران و عێراق رووبەک لە ڕووەکانی ڕوودانی ئەنفال لێکبداتەوە، پێمانبلێت بۆ لەو کاتە تایبەتەدا ڕوویدا، ڕوونیبکاتەوە چۆن وا خێرا و لە ماوەیەکی کورتدا نەخشەی جێبەجێکردنی پیادەکرا، بەڵام جەنگی ئێران و عێراق ناتوانێت هەموو دیاردەی ئەنفال لێکبداتەوە. دیتنی ئەنفال وەک بەشێک لە جەنگی ئێران و عێراق جگە لەوەی لەڕووی تیۆرییەوە ناڕاستە و زادەی لاوازییەکی تیۆری ئاشکرایە، لەهامانکاتدا یەکناگرێتەوە لەگەڵ ڕووداوە واقیعییەکانی جەنگی ئێران و عێراق خۆیدا. لەڕاستیدا ئەوە جەنگی ئێران عێراق نییە، کە ئەنفال لێکدەداتەوە، بەپێچەوانەوە ئەوە ئەنفالە ئەوە لێکدەداتەوە بۆ جەنگ لەعێراقدا بەرهەمێکی بەردەوامی پێکهاتەی دەسەلات و پێکهاتەی دەوڵەت و پێکهاتەی کۆمەڵگای عێراقییە. ئەنفالە لێکیدەداتەوە بۆ جەنگ دەرەنجامێکی لۆژیکی ئەو هەندەسە کۆمەڵایەتییە بەزۆر سەپێنراوەیە دەوڵەت لە عێراقدا کۆمەڵگای عێراقی لەناودا زیندانکردووە و ناچاریکردووە جەوهەرێک قبووڵبکات دژ بە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و ئەتنی و ئایینی ئەو کۆمەڵگایە خۆی، جەوهەرێک، کە ڕاستەوخۆ لەسەر ئینکارکردن و وێرانکردنی جیاوازییە زۆرەکانی ئەو کۆمەڵگایە کاردەکات.

ڕاستە بەمیلیتاریزەکردنی هەمەلایەنەی زۆر ڕەهەندی ژیانی کۆمەڵایەتی و مەدەنی لە عێراقدا و کردنی عێراق بە ئۆردوگایەکی سەربازی گەورە لە ڕۆژگاری ئەنفالدا مەسەلەی پیادەکردنی ئەنفالی ئاسانترکرد، (لەهەشتاکاندا لەدوازدە ملیۆن عیراقی نزیکەی پێنج ملیۆنیان سەرباز، یان چەکداری دەوڵەتی عێراقی بوون)، ڕاستە بۆ سەربازێکی عێراقی بەشداربوون لە ئەنفالدا و بەگژاچونەوەی کورد و لاێنشینە مەدەنییەکان لەزۆر ڕووەوە سەلامەتتربوو لە بەشداربوون لە بەرە جیاجیاکانی تری جەنگی ئێران و عێراقدا و ڕوویەڕووبوونەوەی لەشکری ئێرانی، ڕاستە جەنگی ئێران و عێراق و پاڵپشتی بێحیسابی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی بۆ عێراق مەسەلەی پیادەکردنی ئەنفالی ڕوویەڕووی بێدەنگییەکی نێودەوڵەتی کوشندە کردەوە و ئەم کۆمەڵگایە ئەنفالی لەباشترین حاڵەتدا وەک بەشێک لەجەنگی ئێران و عێراق نیشاندەدا و لەوێشەوە دەستەکانی دەوڵەتی عێراقی لەوێرانکردنی بێقەید و شەرتی کوردستاندا بەتەواوی ئازادکردبوو، بەڵام ئەم جەنگە هەشتساڵەییە ناتوانێت هەموو هۆکارەکانی ڕوودانی ئەنفالمان بۆ لێکبداتەوە. من دواتر دێمە سەر نیشاندانی ئەو بنەما تیۆرییانەی پێموایە ئەتوانێت ئەنفالمان بۆلێکبداتەوە بەڵام لە ئێستادا بۆ نیشاندانی ناڕاستی گرێدانی ئەنفال بە جەنگی ئێران و عێراقەوە دەخوازم هێما بۆ دوو ڕاستی گرنگ بکەم، کە دەیسەلمێنن ئەنفال بەشێک نییەلە جەنگی ئێران و عێراق. ئەو دوو ڕاستیەش ئەمانەن:

یەکەم: عەمەلیاتی ئەنفال ڕوویەڕووی ڕوویەرێکی جوگرافی کرابوەوە، کە زۆریەی هەرەزۆری بەشێکنەبوون لەبەرەکانی جەنگی ئێران و عێراق و لەڕووی سەربازییەوە هیچ گرنگییەکی ستراتیژی، یاخود تەکتیکشیان نەبوو بۆ ماجەرای شەڕەکە و چارەنووسی پێکدادانە سەربازییەکان. بۆنموونە تێکدانی زۆر دێی گەرمیان و تێکدانی گوندەکانی سەرجادەی هەولێر- کەرکوک، یاخود تێکدانی گوندێکی وەک "بێرکۆت"، کە بوویوو بەبەشێک لە شاری هەولێر و لەڕووی جوگرافییەوە لەزۆر

گەڕەکی تری ناو شاری هەولێر بە ناوەڕاستی شارەکە نزیکتر بوو، ئەوەمان نیشاندەدات، کە ئەنفال بەشێک نییە لەجەنگی ئێران و عێراق بەڵکو دیاردەیەکە دەبێت لە خۆیدا و سەربەخۆ لەو جەنگە بخوێنرێتەوە.

دووهەمیشیان: عەمەلیاتی ئەنفال دوای کۆتاییهاتنی جەنگی ئێران و عێراق هەر بەردەوامبوو. هەشتەمین پەلاماری ئەنفال، کە پەلاماریوو بۆسەر ناوچەی بادینان و نزیکەی سەدهەزار ئاوارەی خستەوە و بەدەیان و سەدانیشی بەچەکی کیمیاوی کوشت، مانگێک دوای تەواوبوونی جەنگی ئێران و عێراق پیادەکرا. بەمانایەکی دیکە کۆتایی عەمەلیاتی ئەنفال یەکانگیر نییە لەگەڵ کۆتایی جەنگی ئێران و عێراقدا.

-٤-

ئەو خوێندنەوەیەی دیکە، کە ناتوانێت لە ئەنفال و ڕووداوەکانی تێبگات بریتییە لەو خوێندنەوەیەی، کە پێیوایە ئەنفال بەتەنها هێرشە بۆسەر لادێکانی کوردستان و ئامانجی بەتەنها تێکدانی ژیانی لادێنشینەکانی کوردستان بووە. ئەم خوێندنەوەیە خوێندنەوەیەکە تەنها نیوەی ڕاستییەکانمان پێدەڵێت. ڕاستە زۆر گرنگە عەمەلیاتی ئەنفال بەو شێوەیەی ڕژێم پێناسیکردبوو، واتە وەک پەلامارێکی پلانرێژکراو بۆسەر ژیانی لادێنشینی کوردستان بەوردی دۆکومێنتبکرێت و باسبکرێت. زۆر گرنگە لە ئاییندەدا و لە هەموو باسکردنێکی ئەنفالدا، چ لەگەڵ ئەو ڕژێمانەدا، کە لە عێراقدا باڵادەستدەبن، یاخود لەگەڵ کۆمەڵگای نێودەوڵەتیدا، چۆنیەتی ڕوودانی پەلامارەکان و چارەنووسی قوربانییەکان، کە زۆربەی هەرەزۆریان گوندنشینەکانی کوردستان بوون، بەوردی بهێنرێتەپێشەوە و باسبکرێت. زۆرگرنگە بەردەوام باس

لە ئەنفـال وەک هێرشـی لەنـاوبردنی بەکۆمەڵی پلانرێژەکـرلو دژ بە کەرتـی لادێـی کوردستان بکەین و پێ لەسەر ڕەهەنـدە جینۆسـایدییەکەی دابگـرین، بەڵام نابێـت ئەوەمـان لەیادچێـت ئەم خوێنـدنەوەیە بـۆ ئەنفـال، گەرچـی دەشـێت دەسـکەوتی سیاسی گەورەی هەبێت، ناتوانێت پێمانبڵێت قووڵاییەکانی ڕوودانی ئەم کارەساتە لەکوێدایە و هۆکارەکانی کامانەن. ناکرێت عەمەلیاتی ئەنفال تەنهـا وەک هێرشـێکی دیـاریکرلو بـۆ سـەر لادێ و ژیـانی لادێ لەکوردسـتاندا ببینـین و لەچوارچێـوەی پەلاماردانی ژیـانی لادێدا سـنووردارببکەین. چـونکە ئەنفـال بەرهەمـی پێکهـاتێکی دیاریکراوی دەسەڵات و عەقڵیەتێکـی تـایبەتی سیاسـی و شـێوەیەکی دیـاریکراوی ئۆرگانیزەی کۆمەڵگا و پەیوەندییەکی دیاریکراوی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگایە، نەک تەنها هێرشێکی سەربازی بۆسەر لادێکان. لێکدانەوەی ئەنفال وەک هێـرش بۆسـەر لادێکانی کوردستان جگەلەوەی لەڕووی تیۆرییەوە زۆر لاوازە و ناتوانێت پێمانبڵێت پێکهـاتی ئەودەسـەڵاتە چیـیە، کە جینۆسـاید یەکێـک لەبەرهەمەکـانییەتی، لەهەمانکاتـدا ناتوانێـت ئەوەمـان پێبڵێـت ئەی وێرانکردنـی هەنـدێک لە شـارەکانی کوردستان دوای کۆتاییهاتنی عەمەلیاتی ئەنفال چۆن لێکبدەینەوە. ئەو دەسەڵاتەی، کە گونـدەکان و بنەماکـانی ژیـانی لادێـی کوردسـتانی وێرانکـرد، هەمـان ئەو دەسەڵاتەیە دوای وێرانکردنی گوندەکان شارەکانی قەڵادزە، سەیدسـادق و ڕانـیە و چەنـدان شـاری دیـکەی کوردسـتانی وێرانکـرد. بەبۆچـوونی مـن ئەو دەسـەڵاتەی لەپشـتی عەمەلیـاتی ئەنفـالەوە بـوو دەسـەڵاتێکە وێرانکـردن لەپێکهاتەکەیـدایە بەبێـئەوەی شوناسـی ئەوشـوێنەی وێرانـدەکرێت ڕۆڵێکـی ئەوتـۆی هەبێـت لە دەستنیشانکردنی پێکهات و شوناسی ئەو دەسـەڵاتەدا، ئەم خـاڵە لە درێژیـی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا زیاتر تیشکی دەخرێتەسەر. لەلایەکی دیکەوە جیاکردنەوە و دابڕینی ژیانی لادێ لە ژیانی شار جیاکردنەوەیەکی دەسـتکرد و زۆرجار ناڕاسـتە. چـونکە وێرانکردنـی لادێکـانی کوردسـتان لەزۆر ڕووەوە کـاریگەرییەکی هێجگـار خـراپ و

وێرانکەری بۆسەر ژیانی شارەکانی کوردستان هەبوو. بەلادێکردنی شارەکان و بارکردنی شارەکانی کوردستان لەدوای ئەنفالەوە بە توانایەک لەسەروی وزە و توانای دیمۆگرافی و کۆمەڵایەتی و کولتوریی خۆیانەوە، بۆخۆی تێکدانی ژیانی تایبەتی ئەوشارانە و سەندنەوەی سیفەتی بەشاربوونە لێیان. بۆیە من پێمولیە ئەو دەسەڵاتەی لە عێراقدا لادێ تێکدەدات لەهەمانکاتدا دەسەڵاتێکە لەناوەوەڕا پێکهاتەی شارەکان و ژیانی ناوەکی شارەکانیش تووشی قەیرانی کوشندە دەکات.

-٥-

پێشئەوەی بێمە سەر شیکردنەوەی چەمکی دەسەڵات، بەتایبەتی چەمکی "دەسەڵاتی جینۆسایدی" دەخوازم چەند سەرنجێک دەربارەی دەوڵەت وەک کیانێکی سیاسی مۆدێرن دەربڕم، چونکە دواجار بەشێکی زۆری پراکتیزەی دەسەڵات بەناوی دەوڵەتەوە و لەڕێی دەوڵەتەوە لەسەر کۆی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگایەکی دیاریکراو، دەکرێت. ئەنفال خۆشی لە چوارچێوەی دەوڵەتێکدا و لەژێر ناوی پاراستنی ئاسایشی دەوڵەت و کۆتایهێنان بەیاخیبوون دژ بە دەوڵەت پیادەکرا. یەکێک لە ئەرکە هەرە گرنگەکانی دەوڵەتی مۆدێرن خولقاندی وێنەیەکی هاوبەشی کۆمەڵگایە، کە لانی کەم زۆربەی هەرەزۆری ئەندامانی ئەو کۆمەڵگایە قبووڵیبکەن. لەڕێی ئەم وێنەیەوە دەوڵەت هەوڵدەدات ئەو چوارچێوە گشتییە بخولقێنێت، کە هاوڵاتییان لەناویدا خۆیان وەک هاوڵاتی ئەو دەوڵەتە پێناسبکەن و چوارچێوەیەک بۆ شوناسی ئاینی و ئەتنی و نەتەوەیی و چینایەتی خۆیان بدۆزنەوە. ئەوەشی دروستکردنی ئەم وێنە گشتییەش مەیسەردەکات کۆی ئەو توانا تەکنیکی و ئایدیۆلۆژی و مۆراڵی و دەزگاییانەیە، کە دەوڵەتی مۆدێرن هەڵگریەتی،

لە قوتابخانەی هاوبەش و لەشکر و میدیاوە بیگرە، تا بە مۆزەخانە و ئالا و ئامار و دەیەها ڕەمز و توانای مادی و مەعنەوی دیکە دەگات. تواناکانی دەوڵەتی مۆدێرن بەڕادەیەک گەورە و بەرفراوانە هەندێک تیۆریست سڵ لەوە ناکەنەوە بە توانای کۆلۆنیالیزەکردنی ناوەکی کۆمەڵگای ناو بنێن. (٦) و (٧). دوو پرۆسەی گرنگ ڕۆڵی سەرەکی لەدروستکردنی ئەو وێنە زەینیەدا دەبینن، کە دەوڵەت بۆ خۆی و بۆ کۆمەڵگای دروستدەکات و هەوڵدەدات بەسەر کۆمەڵگاشیدا بسەپێنێت، ئەو دوو پرۆسەیەش بریتین لە:

یەکەم: سێنترالیزەکردنی دەسەڵات، واتە کۆکردنەوەی هەموو دەسەڵاتەکان لە دەستی دەسەڵاتێکی ناوەندیدا و کۆتاییهێنان بەو دەسەڵاتە لۆکاڵییانەی ڕێگرن لەبەردەم کۆکردنەوەی ئەو دەسەڵاتەدا. واتە دروستکردنی دەسەڵاتێکی ناوەندی زۆربەی هەرەزۆری ئەندامانی کۆمەڵگایەک قبووڵیکەن.

دووهەم: مۆنۆپۆلیزەکردن و دەستبەسەراگرتنی ئامرازەکانی زەبروزەنگ و مافی بەکارهێنانی. ئەمەش مانای بوونی دەوڵەت بە تاقە سەرچاوەی بەکارهێنانی توندوتیژی و زەبروزەنگ و بەشەرعیکردنی بەکارهێنانی ئەو توندوتیژییە.

بێگومان دەوڵەت بۆئەوەی ئەم کارەی بۆ مەیسەربێت ناچارە وێنەیەکی تایبەتی خۆی پێشکەش بە کۆمەڵگا بکات، کە لەلایەن هەمووان، یان لانیکەم زۆربەی هەرەزۆری ئەندامانی ئەو کۆمەڵگایەوە قبووڵکرێت، دەوڵەت دەبێت کۆمەڵگا قەناعەت پێبێنێت، کە مافی ئەوەی هەیە زەبروزەنگ هەم مۆنۆپۆلیزە بکات و هەم لەکاتی پێویستیشدا بەکاریبهێنێت. سەرەڕای ئەمە دەوڵەت دەبێت کۆمەڵگا بەوە ڕازیبکات، کە کۆی دەسەڵاتە لۆکاڵییەکان لە دەسەڵاتێکی ناوەندی و سێنترالیزەکراودا کۆبکاتەوە. بێگومان دەوڵەت دەتوانێت تا ڕادەیەکی زۆر بوونی خۆی لەڕێگای ترس و ستەم و توندوتیژییەوە بسەلمێنێت و کۆمەڵگا لەناو چوارچێوەیەک لە ترس وتۆقاندنا نووقمبکات و مانەوەی خۆی لەسەر ئەو ترس و

تۆقاندنانە ڕابگرێت. بەڵام کاری سەرەکی دەوڵەتێک بێەوێت مانەوەی خۆی لەدەرەوەی ترس و تۆقاندندا پایەداربکات، لەوەدایە شەرعیەتی خۆی لەڕێگای قەناعەتپێهێنان و قبووڵکردنێکی خۆبەخۆوە مەیسەربکات. لەزانستی سیاسەتدا ئەم مەسەلەیە بەشێوەیەکی گشتی لەژێر ناوی "تیۆرەی پەیمانی کۆمەڵایەتی"دا هێماییۆکراوە. ئەم پەیمانە بناغەی کاری یەکتیقبووڵکردنێکی دوولایەنە دادەڕێژێت، تیایدا هەم دەوڵەت هاووڵاتییەکانی وەک تاکەکەسی یەکسان و خاوەن ماف قبووڵدەکات و هەم هاووڵاتییانیش دەوڵەت وەک ناوکۆییەکی کۆمەڵایەتی و دەزگایەک لەسەروی ناکۆکییەکانەوە قبووڵدەکەن. لە ئەدەبیاتی سیاسیدا هەر دەوڵەتێک نەیتوانی مەسەلەی شەرعیەت لەڕێگای قبووڵکردنی خۆبەخۆوە بسەلمێنێت بە "دەوڵەتێکی لاواز" ناودەبرێت، گەرچی خاوەنی بۆمبی ئەتۆمی و موشەک و زەخیرەیەکی گەورە لە چەکی کیمیاوی و هێزی تری ئەمنی و سەربازی، بێت. هێزی ڕاستەقینەی دەوڵەت لەو شەرعیەتە کۆمەڵایەتی و سیاسیەدایە، کە کۆمەڵگا پێیدەبەخشێت، نەک لە گەورەیی کارخانە و تفاقی شەڕ و بەربڵاویی دەزگاکانی سەرکوتکردن و تۆڕەکانی تۆقاندن.

دەوڵەت لەکاتێکدا وێنەی خۆی وەک هێزێک لەسەروی هەموو دەسەڵاتە لۆکاڵییەکانەوە و وەک دەزگایەک، کە مافی بەکارهێنانی زەبروزەنگی شەرعی هەیە دروستدەکات، لەهەمان کاتدا لە ڕێگای سیستمی خوێندن و پەروەردە و لەڕێگای سیستمی باجی یەکگرتو و لەڕێگای میدیا و سیستمی سەربازی و یاسایی هاوبەشەوە، وێنەیەکی کۆمەڵگا لەزەینی ئەندامەکانی ئەو کۆمەڵگایەدا دەچێنێت، کە سیفەتی هەرەسەرەکی ئەو وێنەیە هەستکردنە بە ئینتیما بۆ یەک نەتەوە، یان لانی کەم بۆ یەک سەرزەمین و بۆ یەک سیستمی قازانجی کۆمەڵایەتی و یەک فرسەتی گەشەکردنی یەکسان و یەک سیستمی پاراستنی مافی تاکەکەسی و دەستەیی هتد... ئەو دەوڵەتەی لەدروستکردنی ئەم هاوبەشە جیاجیایانەدا

سەرکەوتوو دەبێت "دەوڵەتێکی بەهێزە" گەرچی خاوەنی چەک و جبەخانەی گەورە و دەزگای کۆنترۆڵی مەزنیش نەبێت. بەکورتی دەوڵەتی بەهێز و سەرکەوتو دەوڵەتێکە وێنەیەکی هاوبەشی کۆمەلگا لە فانتازیای سیاسی هاوڵاتیاندا دروستدەکات، کە یەکانگیرە لەگەل پێداویستییەکانی مانەوەی خۆیدا و پێداویستییەکانی مانەوەی ئەو کۆمەڵگایەشدا، کە خۆی بە نوێنەری دەزانێت و لەگەڵ پێداویستییەکانی ئەو هێزە جیاوازانەشدا، کە لەو کۆمەڵگادا پێکەوەدەژین.

لە عێراقدا هەم وێنەی دەوڵەتە بۆ کۆمەڵگا و هەم وێنەی کۆمەڵگاش بۆ دەوڵەت لە قەیرانێکی هەمەلایەندا دەژی، قەیرانێک، کە شەرعیەتی دەوڵەتی عێراقی وەک دەوڵەت و مافی بوونی وەک ئۆرگانێک لەسەروی کۆمەڵگای عێراقییەوە دەخاتە ژێر گومان و پرسیارەوە. ئەو وێنەیەی دەوڵەتی عێراقی بۆ کۆمەڵگای عێراقی دروستیدەکات وێنەیەکە باز بەسەر هەموو ئەو جیاوازییانەدا دەدات، کە ئەم کۆمەڵگایە لەهەناوی خۆیدا هەڵیگرتوون، لە جیاوازی ئەتنی و نەتەوەیی و چینایەتییەوە بیگرە بۆ جیاوازی ئایین و زمان و کولتورو شێوازی ژیان. دەوڵەت وەک بازیشدەدات بەسەر ئەم جیاوازییانەدا و نایانسەلمێنێت، لەهەمانکاتدا هەوڵنادات هاوبەشێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و یاسایی و کولتوری دروستبکات، کە هەمووان قبووڵیکەن. لەڕاستیدا خودی ئەم بازدانە خۆی هۆکاری سەرەکی دروستنەبوونی ئەو وێنە گشتییەیە، کە هەرکەس و لایەن و گروپێک بتوانن لانیکەم ڕەهەندێک لە ڕەهەندەکانی بوونی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتوری خۆیانی تێدابدۆزێتەوە. بەمانایەکی دیکە لەکاتێکدا دەوڵەتی عێراقی هەموو مافێکی جیاوازبوون لە گروپە جیاوازەکانی ناو هەناوی خۆی دەسێنێتەوە، لەهەمانکاتدا هیچ هاوبەشێکیان پێشکەش ناکات هەمووان لەسەری ڕێکبکەون و بەیەکەوە قبووڵیبکەن. هاوبەشێک تیایدا هەر تاکەکەس و گروپێک خۆی وەک بوونەوەرێکی عەقڵانی، خاوەن ماف و خاوەن بەرپرسیارێتی یەکسان و خاوەن ئارەزوو ئیرادە و

کەرامەت، بدۆزێتەوە.

دەوڵەتی مۆدێرن، مەبەستم دەوڵەتی بەهێزە بەو مانایەی لەسەرەوە باسمکرد، کە هەموو دەسەڵاتەکان سێنترالیزە دەکات و، کە هەموو ئامرازەکانی زەبروزەنگیش مۆنۆپۆلیزەدەکات، لەهەمانکاتدا بوونیانێکی دەزگایی و یاسایی وا دادەهێنێت نەهێڵێت کۆی ئەو دەسەڵاتانە لەخاڵێکدا کۆببنەوە و نەکرێت چاودێریبکرێن. لەکۆمەڵگایەکی تەندروستدا کۆی ئەو دەسەڵاتە سێنترالیزەکراوانە لەیەکدی جیادەکرێنەوە و دابەشدەکرێن. لەهەمانکاتدا کۆمەڵگا خۆشی چەندان دەزگا و دامەزراو و کۆڕ و کۆمەڵی جیاجیا دروستدەکات بۆ چاودێریکردنی چۆنیەتی کارکردن و پراکتیزەکردنی ئەو دەسەڵاتانەی سێنترالیزەکراون. لە عێراقدا هەردوو پرۆسەی سێنترالیزەی دەسەڵات و مۆنۆپۆلیزەی ئامرازەکانی زەبروزەنگ پیادەکراون، بەڵام لەباتی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان لەیەکتری و دابەشکردنیان بەسەر زیاد لە تەوەرەیەک لە تەوەرەکانی بڕیاردانی کۆمەڵایەتی و سیاسیدا، هەموویان لەدەستی دیکتاتۆرێک و دەزگاکانی پاراستنی ئەو دیکتاتۆرەدا کۆکراونەتەوە. ئەوەی خەڵکی عێراق وەک هاوبەشێک هەیانە پەیمانێکی کۆمەڵایەتی، میکانیزمێکی دیاریکراوی دابەشکردنی دەسەڵات، بوونی سیستمێکی هاوبەشی قازانجی کۆمەڵایەتی نییە، بەڵکو بوونی دیکتاتۆرێکە، کە دەزگا ئایدیۆلۆژیەکانی دەوڵەت ئەیانەوێت وەک خێمەی هەموو عێراقییەکان نیشانیبدەن. بێگومان سەدام حوسەین خێمەی هەموو عێراقییەکانە، بەڵام ئەو خێمەیەی لەسەر مۆدێلی قەسابخانە دروستکراوە بەجۆرێک ئەوەی کەوتە ناو سنوورەکانی ئەو خێمەیەوە، ئەگەری کوشتنی لە ئەگەری مانەوەی گەورەترە.

بەدیوی ئەودیویشدا ئەو وێنەیەی کۆمەڵگای عێراقی بۆ دەوڵەتی عێراقی هەیەتی، وێنەی هێزێکی ناشەرعی و چەپێنەر و تۆقێنەرە، کە لەپەیوەندییەکی دوژمنکارانەدایە لەگەڵ هێزە کۆمەڵایەتییە جیاجیاکانی کۆمەڵگای عێراقیدا. ئەو

وێنەیە وێنەی دەوڵەتە وەک ئەو درندە هۆبزییەی هیچ پەیمانێکی کۆمەڵایەتی و هیچ میکانیزمێکی جڵەوکردنی دەسەڵات و هیچ چاودێرییەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی قبووڵناکات و کاری مانەوە و پاراستنی خۆیەتی لەڕێگای ستەم و زەبروزەنگەوە. لەنێوان وێنەی دەوڵەتی عێراقیدا بۆ کۆمەڵگای عێراقی و لە نێوان واقیعی کۆمەڵایەتی و ئەتنی و نەتەوەیی و کولتوری ئەم کۆمەڵگاییەدا ناکۆکییەکی گەورە هەیە، ناکۆکییەک دەوڵەتی عێراقی تائێستا لەڕێگای زەبروزەنگ و لەشکر و جیهازێکی گەورەی بیرۆکراسی و دەیان دەزگای پۆلیسی نهێنییەوە پاراستوویەتی، نەک لەڕێگای پەیمانێکی سیاسی، یان هاوبەشێکی کۆمەڵایەتی و کولتوری عەقڵانییەوە. هەروەها لەنێوان وێنەی کۆمەڵگای عێراقیدا بۆ دەوڵەتی عێراق و ئەو پەیوەندییەی ئەو دوولایەنە بەیەکدیەوە گرێدەدات، دابڕانێک هەیە، کە تۆڵە لە دەوڵەت و هەوڵدان بۆ لەبەریەکدی هەڵوەشاندنەوە و ڕوخاندنی دەوڵەت، لانیکەم قبووڵنەکردنی بەو شێوەیەی، کە لە ئێستدا هەیەتی، هێڵە گشتییەکانی دیاریدەکات. بێگومان بازدان بەسەر جیاوازییەکاندا و ئینکارکردنیان مانای کۆتایی هێنان بەو جیاوازییانە نییە، بەپێچەوانەوە ئینکارکردن و بازدان بەسەریاندا مانای توندکردنەوە و بارگاویکردنیانە بە ئەگەری تەقینەوەی بەردەوام، بەڵام هەڵگیراو بۆکات و سات و هەلوومەرجی گونجاو و لەبار. لەم ڕووەوە ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ نموونەیەکی ئاشکرای تەقینەوەی کۆمەڵگایەکە بەڕووی مێژوویەکی دووردرێژی بێدەنگکردن و ڕێزنەگرتنی مافی جیاوازبوون و پێشێلکردنی هەموو داوایەک بشێت ئینسان لەڕێیەوە شوناسی خۆی وەک تاکەکەس و وەک ئەندامیک سەر بە گروهێکی کۆمەڵایەتی و ئەتنی و ئایینی دیاریکراو، بژی.

کاری دەوڵەت، لانیکەم لەڕووی تیۆرییەوە، ئەوەنییە کۆمەڵگا ناچاربکات پێناسێک قبووڵکات دوور لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و ئەتنی و ئایینی خۆی، کاری دەوڵەت ئەوەیە چوارچێوەیەکی دەزگایی و یاسایی و عەقڵانی ئازاد دروستبکات، کە هەموو

شوناسە جیاجیاکان تیایدا جێگەیانبێتەوە و ئازادانە تێیدا بوونی سیاسی کۆمەڵایەتی کولتوری خۆیان بژین. چوارچێوەیەک ببێتە ناوەندی کۆبوونەوەی جیاوازییەکان بەیەکەوە.

لێرەوە دەڵێم ڕەنگە کەم دیاردە هەبێت لەژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی و کولتوری ئەو کیانەی ناوی دەوڵەتی عێراقی لێنراوە، ئەوەندەی ئەنفال ناکۆکییە کەینونییە قوڵەکانی ئەم پێکهاتە سیاسییە نیشانبدات. ئەنفال هەلی ئەوەمان بۆ دەڕەخسێنێت لە کاراکتەر و پێکهاتەی ئەو بوونەوەرە سەیرە تێبگەین، کە ناوی دەوڵەتی نەتەوەیە لە عێراقدا. ئەنفال نیشانیدەدات دەوڵەتی عێراقی دەوڵەتێک نییە حوکمی نەتەوەیەک بکات، بەڵکو دەوڵەتێکە بەبێ نەتەوە. دەوڵەتێکە تا سەرئێسقان بێتوانا لە دروستکردنی نەتەوەیەکدا بەناوی نەتەوەی عێراقیەوە، یان لانیکەم لەدروستکردنی ئەو چوارچێوە گشتییەی گروهە جیاوازەکان لە عێراقدا شوناسی خۆیانی تیا بپارێزن و وەک هاوڵاتی ئەو فۆرمەی دەیانەوێت بە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتوری خۆیانی بدەن، بە کورتی دەوڵەتی عێراقی دەوڵەتێکە لەدەرەوەی لانی هەرەکەمی هەر شێوەیەک لە شێوەکانی ئیجماعی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتوری.

بێگومان ئەم دەستنیشانکردنە گشتییەی ماهیەتی دەوڵەتی عێراقی و ئەو پەیوەندییانەی بە کۆمەڵگای عێراقیەوە دەیبەستێتەوە بەس نییە بۆ ئەوەی دیاردەی ئەنفالی لەپاڵدا بخوێنینەوە، ڕاستە ئەم ناکۆکییە لەنێوان وێنەی دەوڵەتی عێراقیدا بۆ کۆمەڵگای عێراقی و لەنێوان واقیعی کۆمەڵگای عێراقیدا کێشەیەکی کەینونی گەورە دەخاتەوە، کێشەیەک نەک تەنها بوونی دەوڵەتی عێراقی دەخاتە ژێر پرسیارەوە، بەڵکو مەسەلەی بوونی شتێک بەناوی "کۆمەڵگای عێراقی"شەوە ڕووبەڕووی گومانێکی گەورە دەکاتەوە. بەڵام وەک وتم بوونی ئەم ناکۆکییە کەینونییە بەسنییە بۆئەوەی دەسەڵاتێک دروستبکات سیفەتی جینۆسایدی

لەخۆبگێت. ئەم ناکۆکییە کەینونیە دەشێت هۆکاری چەوساندنەوە و بێدەنگکردن و سزادانێکی ئایینی و ئەتنی و کۆمەڵایەتی ئەو گروهانە بێت، کە دەخوازن جیاوازیەکانییان بپارێزن و بەرگریلێبکەن، ئەم ناکۆکیە دەشێت سەرچاوەی دروستبوونی دەسەڵاتێکی میلیتاری توندوتیژ و حوکمی میلیشیایی و مافیایی بێت، بەڵام بۆ ئەوەی دەسەڵاتێکمان هەبێت بتوانێت و بیەوێت جینۆساید پیادەبکات، دەبێت زیاد لە بوونی ئەو ناکۆکییە کەینونییە لەئارادابێت، کە باسمانکرد. لێرەوە بۆ خوێندنەوەی ئەم شێوەیەی دەسەڵات، کە من لەم نووسینەدا ناومناوە "دەسەڵاتی جینۆسایدی"، دەبێت خوێندنەوەکانمان بەتەنها لەئاستی دەوڵەت و پەیوەندی دەوڵەت و کۆمەڵگادا ڕانەگرین، بەڵکو دەبێت ئەو خوێندنەوانە بۆ ئاستێکی قوڵتر بگوێزینەوە، ئاستی کارکردنی میکانیزمەکانی دەسەڵات لە هەناوی کۆمەڵگا خۆشیدا.

-٦-

لەو چوارچێوە تیۆریەدا کەڕاستەوخۆ پەیوەندی نێوان کۆمەڵگا و دەوڵەت وەک دەروازەی شیکردنەوەکان بەکاردەهێنێت، تا ئەوشوێنەی من ئاگاداریم، نوسینەکانی کەنعان مەکییە جدیترین هەوڵی تیۆرین، کە دەخوازن لە مەسەلەی بەکارهێنانی توندوتیژی لە عێراقدا بەگشتی و لە ئەنفالدا بەتایبەتی، ڕاڤەبکەن. مەکییە لە پرۆژەی خوێندنەوەیدا بۆ عێراق و مێژووی عێراق زۆر لەسەر مەسەلەی توندوتیژی ڕادەوەستێت، تا ئەو ڕادەیەی یەکێک لە کتێبەکانی ناودەنێت "قەسوەت و بێدەنگی". (٨) مەکییە توندوتیژی و قەسوەتی دەوڵەت دەبەستێتەوە بە کارەکتەر و پرۆژەی ناسیۆنالیزمی عەرەبی و ئەو مۆدێلی دەوڵەتەی ئەم ناسیۆنالیزمە

دەخوازێت دروستیبکات. لەکتێبی "کۆماری ترسدا" مەکییە بەدرێژی لەسەر ئەو پێکهاتە دەوڵەتییە ئەدوێت، کە قەسوەت و ترس بەرهەمدەهێنێت و بوونیانێکی دەزگاییان پێدەبەخشێت. لەم کتێبەدا مەکییە گرنگییەکی گەورە بە دروستبوون و شیکردنەوەی دەزگاکانی ترساندن و تۆقاندن دەدات.(٩) لە هەمانکاتدا مەکییە لە کتێبی "قەسوەت و بێدەنگیدا" لەپاڵ درێژەدان بەهەمان هێڵی شیکردنەوەی کتێبەکەی پێشویدا، ئەمجارەیان مەسەلەی توندوتیژی و قەسوەتی دەوڵەت بەو بێدەنگییە کوشندەیەوە گرێدەدات، کە ڕۆشنبیرانی عەرەب بەرامبەر گوناه و تاوانەکانی دەوڵەتە عەرەبییەکان پیادەیدەکەن. لەم کتێبەدا مەکییە پیشانماندەدات چۆن ئەو پرۆسەی بەدەزگاییکردنەی توندوتیژی لە کتێبی یەکەمیدا باسیدەکات، لەڕووی کولتوری و سیاسییەوە لەلایەن ڕۆشنبیرانی عەرەبەوە شەرعیەتی بۆ ئەدۆزرێتەوە و تاڕادەیەکی زۆریش ئافەریندەکرێت.

گرنگیی بۆچوونەکانی مەکییە لەڕووی تیۆرییەوە لەوەدایە دەخوازێت ڕەگە قووڵەکانی دیاردەی توندوتیژی، لەوانەش دیاردەی ئەنفال و جەنگە بەردەوامەکانی تری دەوڵەتی عێراقی، لە سیاقی ساتەوەختی ڕوودانی ڕووداوەکان دەربکات و لە سیاقێکی مێژوویەکی فراوانتردا نیشتەجێیانبکات. مەکییە ئەو سیاقە مێژووییە فراوانە وەک سیاقی سەرهەڵدان و گەشەکردنی ناسیۆنالیزمی عەرەبی و فەشەلی پرۆسەی بە دیموکراتیکردنی حوکم و بێدەنگی ڕۆشنبیران بەرامبەر بە تاوانەکانی دەوڵەت، پێناسدەکات.

لە لێکدانەوەیدا بۆ ئەنفال مەکییە دەنووسێت : "ئەنفال ڕووداوێک نییە لەئاسمانەوە کەوتبێتە خوارەوە، بەڵکو مێژوویەکی درێژی مامەڵەکردنی دڵڕەقانەی کوردی لەلایەن بەعسەوە لە پشتەوەیە، کە دەکرێت ببرێتەوە بۆ ڕێکەوتننامەی جەزائیری ساڵی ١٩٧٥، تەنانەت بۆ کۆنتریش. جگەلەمەش لەئارادابوونی سیاسەتی تێکدان و وێرانکردنی بەرفراوانی گوندە کوردییەکان، کە لە ساڵی ١٩٦٨ بەدواوە

لەئـارادابووه". هەر لەم سـیاقەدا مەکیـیه بـاس له سیاسـەتی وێرانکردنـی گونـده کوردییەکـان دەکـات لەژێـر ناونیشـانی "نـاوچەی قەدەغەکـراو بەهـۆی مەسـەلەی ئەمنییەوه" و وەک دەرەنجامی ئەم سیاسەتەش دروستکردنی ئەو ناوچانەی بەعس ناوینـابوون "زۆنـی ئەمنـی". دروسـتکردنی ئەم "زۆنه ئەمنیـیه" قەدەغەکـراوانه له هەفتاکـانەوه و کێشـانی هێڵێکـی سـوور لەنێـوان دەوڵەت و ئەوانەی لەو زۆنـانەدا دەژین، تا ڕوودانی ئەنفال، بەلای مەکییەوه ئەو هۆکاره سەرەکییەیه، که زەمینەی ڕوودانی ئەنفالیان له هەشتاکاندا خۆشکرد. بەکورتی مەکییه ڕوودانـی ئەنفـال بەو قەسوەتەوه گرێدەدات، که دەوڵەتی عێراقی بەرامبـەر کـورد هەیەتـی، قەسـوەتێک دواجار بـوەته بەشـێک له کولتـوری سیاسـی لەعێراقـدا و بۆته ترادیسـیۆنێک بـۆ مـامەڵەکردنی کـورد و مەسـەلەی کـورد لەو وڵاتەدا. لەگەڵ گرنگـی بۆچوونەکـانی مەکیـیەدا دەمەوێـت بڵـێم هەم چەمکـی "قەسـوەت" و هەم چەمکـی "کولتـوری سیاسـی" نـاتوانن قوڵاییەکـانی ڕووداوێکـی وەک ئەنفـال لێکبـدەنەوه. چەمکـی قەسوەت لەگەڵ گرنگیدا لەوه تێپەڕناکات هێمایەک بێت بۆ شێوەیەکی دیاریکراو له شێوەکانی پراکتیککردنی دەسەلات، ئەویش ئەو دەسەڵاتەیه، که سزای جەستەیی و کەمەی مەرگ لەگەڵ کۆمەڵگادا دواهەمین ستراتیژیەتی. ئەو هێمایەش مەکییه بۆ کولتوری سیاسی دەیکات هێمایەکه بەرزنابێتەوه بۆ ئاستی کەشفکردنی فۆرمەکانی دیـکەی دەسـەڵات، واته ئەو فۆرمـانەی جینۆسـاید پیـادەدەکەن، میکانیزمەکـانی پراکتیککردنی. بەمانایەکی دیکه ئەو دەزگا چەمکییەی مەکییه باکاریـدەهێنێت بـۆ خوێنـدنەوەی ئەنفـال ناتوانێـت قـووڵایی ئەو دیاردەیه ببینێـت کەمـن لەم وتـارەدا ناومناوه "دەسەڵاتی جینۆسایدی". بۆیه من لێرەدا هەوڵدەدەم لەسەر هەمان هێڵی شـیکردنەوەکانی مەکیـیه بەردەوامـبم، بەڵام به ڕاڕەوێکـی دیـکەدا خوێنـدنەوەکانم ئاراستەبکەم، ئاراستەیەک، که لەتوانای دەزگا چەمکییەکەی مەکییەدا نییه ئیشـی تێدابکات.

-٧-

ئێستا ئیدی یەکەمین شتێک پێویستی بە ڕوونکردنەوەبێت چەمکی "دەسەڵاتی جینۆسایدی"یە، ئایا ئەم دەسەڵاتە چییە و کامەیە و چۆن دروستدەبێت و چۆن کاردەکات؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە جارێکی دیکە دەگەڕێمەوە بۆ تیۆری دەسەڵات لای فۆکۆ، بەتایبەتی لەو نووسینانەیدا، کە لە ئەزموونی نازیزم لە ئەڵمانیادا ئەدوێت. با جارێکی دیکەش لەو دابەشکردنەوە دەستپێبکەین، کە فۆکۆ بۆ فۆرمە جیاوازەکانی دەسەڵاتی دەکات، مەبەستم لەم فۆرمانەش ئەو سێ فۆرمەن، کە لە کۆلێژەکانی بەر لە نووسینی کتێبی "کۆنترۆڵ و سزا" دا باسیاندەکات. فۆکۆ لەیەکێک لەو وانانەدا ئەم سێ شێوەیەی دەسەڵات لەیەکدی جیادەکاتەوە:

١ـ دەسەڵاتی سزابەخش.

ئەم دەسەڵاتە دەسەڵاتێکە لەسەر سزای فیزیایی کاردەکات و ڕاستەوخۆ مەرگ دەرەنجامەکەیەتی. بە بۆچوونی فۆکۆ دەسەڵاتی سزابەخش ئەو شێوەیەی دەسەڵاتە، کە لە کۆمەڵگا تەقلیدییەکانی بەر لەمۆدێرنە و بەر لە هاتنەکایەی دونیای مۆدێرن لەئارادابووە. مەبەست و ئامانجی سەرەکی ئەم دەسەڵاتە بریتیە لە پاراستنی سەروەریی پادشا، یان ئەمیر. پادشا بۆ پاراستنی سەروەری خۆی مافی کوشتنی هەموو ئەوانەی هەیە ئەو سەروەریە قبووڵناکەن، یان بەشێوەیەک لە شێوەکان ئەو سەروەرییە بریندارئەکەن. لەم دیدە سیاسییەدا، کە دیدی سیاسەتی تەقلیدی بەر لە مۆدێرنەیە، سەروەری پاشا یەکسانە بە سەروەری هەموو سیستمی دەسەڵات، پادشا و دەسەڵات دوو شتن ناکرێت لەیەکدی جیابکرێنەوە. بۆ ئەوەی دەسەڵات سەروەربێت دەبێت پادشا سەروەربێت، بۆئەوەی دەسەڵات پارێزراوبێت دەبێت سەروەری پادشا پارێزراوبێت. وەک ئاشکرایە لێرەدا چەمکەکانی "کۆمەڵگا"

و "سەروەریی کۆمەڵگا" و بیرۆکەی "هاوڵاتی" و بیرۆکەی "پەیمانی کۆمەڵایەتی" و زۆریەی هەرەزۆری ئەو چەمکە سیاسی و کۆمەڵایەتییانەی مۆدێرنە و کایەی سیاسی مۆدێرن لەگەڵخۆیاندا دەیانهێنن، بەتەواوی ئائامادەن. سیستمی دەسەڵات و سیستمی سیاسی لەسەر بیرۆکەی پادشا و سەروەری پادشا بنیادنراون. خودی دەسەڵات خۆی نیشتەجێی ناو جەستەی پادشایە و پادشا بوونەوەرێکە دەتوانێت مافی کوشتن و مافی بەخشینی ژیان دەستنیشانبکات. لەم دیدەدا پادشا ڕەمز، یان هێمایەک نییە بۆ دەسەڵات، بەڵکو خۆی خودی دەسەڵاتە و دەسەڵاتیش جەستەی پادشا خۆیەتی. ئەوەی شوێنی سەرنجی ئێمەیە لە بۆچوونەی فۆکۆدا ئەو مافی کوشتنەیە، کە پادشا هەیەتی. لەم مۆدێلەی دەسەڵاتدا پادشا ڕاستەوخۆ لەسەر گەمەی مەرگ و ژیان کاردەکات و ڕۆڵێکی خودلوەندیانە دەبینێت بەرامبەر بە رەعیەتەکانی ناو سنووری دەسەڵاتەکەی. پادشا بۆ پاراستنی سەروەری خۆی مافی سزادانی ئینسانەکانی بەخۆیداوە، تا پلەی سەندنەوەی ژیان لێیان و سزادانیان بە مەرگ. لێرەوە مەرگ بەشێکی ناوەکی و دانەبڕاوی گەمەکانی دەسەڵات و پاراستنی سەروەرییەکانی دەسەڵاتە، هەربۆیە سزای کوشتن ڕاستەوخۆ کراوە بە مافێک لە مافەکانی پادشا، وەک چۆن لە هەمانکاتدا کوشتن خۆشی یەکێک لە گرنگترین تەکنیکێکی کارکردنی دەسەڵات خۆشیەتی.

٢ـ دووهەمین شێوەی دەسەڵات، کە فۆکۆ باسیدەکات بریتیە لە بیۆـ دەسەڵات.

بیۆدەسەڵات بریتییە لەو شێوازەی دەسەڵات، کە لەسەر بایۆلۆژیای ئینسان و خودی ژیان خۆی لەمانە بایۆلۆژیەکەیدا کاردەکات. بەباوەڕی فۆکۆ ئەم دەسەڵاتە بەرهەمی ڕۆژگاری مۆدێرنەیە و لەوکاتەدا دروستدەبێت، کە دەوڵەت بیر لە کۆمەڵگا دەکاتەوە وەک گشتێکی سەرتاسەری، وەک مەسەلەی ئۆرگانیزەکردن و بەڕێوەبردنی ژیانی ئەو هەزاران ئینسانەی، کە دەکەونە سنووری دەسەڵاتی دەوڵەتەوە. بیۆدەسەڵات ئەو فۆرمەی دەسەڵاتە، کە دەخوازێت کۆنترۆڵی ژیانی

دانیشتوان بکات و پلانی بۆدابنێت. هەم بیرۆکەی "کۆمەڵگا" و هەم بیرۆکەی "دانیشتوان" ڕاستەوخۆ وەک بابەتی بیۆدەسەڵات دێنەکایەوە و ئەرکی دەسەڵات بەرامبەر بەم دووانەش بریتییە لە پاراستن و گەشەپێدان و چاودێریکردنیان. ئیدارەدانی گەشەی ژمارەی دانیشتوان و پلاندانان بۆ مەسەلەی خۆراک و ڕێکخستنی ژیانی جنسی و ئۆرگانیزەی خێزان و مەسەلەی چۆنیەتی بەڕێوەبردنی منداڵان و ژیانی پیران و تەندروستی گشتی کۆمەڵگا وەک گشتێک هتد... هەموویان دەبنە کۆمەڵێک بابەت، کە دەوڵەت ڕاستەوخۆ لەڕێگای بیۆدەسەڵاتەوە کاریان لەسەردەکات. لێرەوە مەسەلەی سێکس و منداڵبوون و مردن و هەموو ئەو دیاردانەی تر، کە پەیوەندیان بە ژیانی بایۆلۆجی ئینسانەوە هەیە و پەیوەندییان بەپلان دانان بۆ مەسەلەی دانیشتوانەوە هەیە، دەبنە بەشێک لەسیاسەتی ڕۆژانەی دەوڵەت. فۆکۆ ئەو سیاسەتەی لە ئەنجامی پراکتیککردنی بیۆدەسەڵاتەوە دروستدەبێت ناودەنێت "بیۆسیاسەت". بیۆسیاسەت، ئەو سیاسەتەیە، کە دەخوازێت لەسەر ئینسان وەک بوونێکی بایۆلۆژی و لەسەر ژیان خۆی وەک پێدراوێکی بایۆلۆژی، کاربکات. ئامار و ژمێرە، مەعریفەی بایۆلۆژی و پزیشکی، ئابووریی دانیشتوان، ئەو ئامرازانەن ئەم شێوەیەی دەسەڵات کاریانپێدەکات و بناغەکانی بیۆ- سیاسەتیان لەسەر دادەڕێژرێت. بەکورتی بیۆدەسەڵات دەسەڵاتێکە کۆمەڵگا وەک جەستەیەکی کۆمەڵایەتی گەورە دەکاتە بابەتی خۆی و سیاسەتێک بەرهەمدەهێنێت، کە دەخوازێت ژیان وەک مەسەلەیەکی ئیداری تەماشابکات و وەک مەسەلەیەکی ئیداری بیبات بەڕێوە. ئەگەر دەسەڵاتی سزاگەر لە کۆمەڵگای تەقلیدیدا لەسەر مافی مەرگ کاریکردبێت، ئەوا بیۆدەسەڵات لە کۆمەڵگا مۆدێرندا لەسەر مافی ژیان و چۆنیەتی بەڕێوەبردن و چاککردن و چالاککردنی ژیان کاردەکات. لێرەوە ئەوەی لە بیۆ-دەسەڵات و بیۆسیاسەتدا سێنترالە سەروەری پاشا نییە، بەڵکو پاراستن و هێشتنەوە و گەشەپێدانی ئەو گشتە گەورەیەیە

کەناوی کۆمەڵگا، یان دانیشتوانە.

٣ـ شێوەی سێهەمی دەسەڵات لای فۆکۆ بریتیە لە "دەسەڵاتی کۆنترۆڵ، یان چاودێریکەر".

ئەم شێوەیەی دەسەڵاتیش، وەک شێوەکەی پێشوتر، بەرهەمی ڕۆژگاری مۆدێرنە و پرۆژەی مۆدێرنەیە. چاودێریکردنی کۆمەڵگا و چاودێریکردنی ئینسان لە شوێن و جێ و لە قۆناغە جیاوازەکانی ژیانیدا ستراتیژی سەرەکی ئەم شێوەیەی دەسەڵاتە. کۆنترۆڵ و چاودێری ئەو ستراتیژەن لەڕێگایەوە دەسەڵات دەتوانێت پرۆسەی گۆڕانکاریەکانی ناو کۆمەڵگا و چۆنیەتی ڕیزبەستن و ڕێکخستنی پەیوەندییەکان بهێنێتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. لە ڕۆژگاری بەر لە مۆدێرنەدا پادشا نەیدەتوانی سەرلەبەری کۆمەڵگا و سەرلەبەری ئینسانەکانی ناو کۆمەڵگا بخاتە ژێر چاودێری و کۆنترۆڵەوە، پادشا نە دەزگای مۆدێرنی چاودێریکردنی هەبوو، نە ئەو مەعریفەیەش، کە بتوانێت ئینسان و کۆمەڵگا شیبکاتەوە و بتوانێت بەهۆیانەوە پێشبینی ئەوە بکات داخۆ کۆمەڵگا و ئینسانەکان بە چ جۆرێک دەجوڵێنەوە و چ جۆرە گۆڕان و پەرەسەندنێک چاوەڕێیاندەکات. مۆدێرنە دەیەها دەزگا و دامەزراوی جیاجیا دەهێنێتەکایەوە، کە کاری کۆنترۆڵکردن و چاودێریکردنی ئینسانەکان فەراهەمدەکات، لە لەشکری مۆدێرنەوە بیگرە، تا بە کارخانە و بەندیخانە و قوتابخانە و خەستەخانە و پارت و ڕێکخراوی سیاسی و دەیەها دەزگای مۆدێرنی دیکە دەگات، کە تیایاندا ئینسان و کۆمەڵگا لەڕێگای بەدەیەها تەکنیکی جیاجیاوە دەکەونە ژێر چاودێرییەکی وردەوە. بێگومان لەدایکبوونی زانستەکانی سۆسیۆلۆژیا، سایکۆلۆژیا، زانستی سیاسەت، بایۆلۆژیا هتد... زانیاری زۆریان هەم لەسەر خودی کۆمەڵگا و هەم لەسەر خودی ئینسان بەرهەمهێنا، کە دەوڵەت دەتوانێت سودیان لێببینێت بۆ بەهێزکردنی تەکنیکەکانی کۆنترۆڵ و چاودێریکردن. بە بۆچوونی فۆکۆ دەرەنجامی لەدایکبوونی ئەم هەموو تەکنیکە مۆدێرنانەی چاودێری و کۆنترۆڵ،

دروستبوونی جۆرێک لە ئینسانە، کە فۆکۆ ناویدەنێت "ئینسانی ڕامکراو" و بەندکراو لەناو دەزگاکانی کۆمەڵگای مۆدێرندا. بەکورتی ئەم شێوەیەی دەسەڵات بۆیەکەمین جار لەمێژووی مرۆڤایەتیدا ئەو هەلەی ڕەخساند، کە هەم خودی ئینسان و هەم خودی کۆمەڵگا لەلایەن دەزگا جیاجیاکانی دەسەڵاتەوە تا ئەندازەیەکی ترسناک بخرێنە ناو چاودێرییەکی فرەلایەنەوە.

بەڵام داخۆ کام شێوە لەو شێوانەی دەسەڵات هەڵگری ڕەهەندی جینۆسایدیە؟ کامەیانە هێڵە گشتییەکانی جینۆساید دەستنیشان و پیادە دەکات؟

فۆکۆ ڕاستەوخۆ وەڵامی ئەم پرسیارە نەداتەوە، بەڵام لە قسەکردنیدا لەسەر ئەزموونی نازیزمی ئەڵمانی ئەو ڕاستییە ئەسەلمێنێت، کە جینۆساید بەرهەمی شێوە مۆدێرنەکانی دەسەڵاتە. لەمڕووەوە فۆکۆ سەبارەت بە نازیزم دەنوسێت: "نازیزم خاڵی کۆبوونەوە و کەڵەکەبوونی گەشەی هەموو میکانیزمە تازەکانی دەسەڵاتە، کەلەسەدەی هەژدەهەمەوە هاتوونەتەکایەوە....(مەبەستیش لەو دەسەڵاتانە) دەسەڵاتی کۆنترۆڵکەر و بیۆدەسەڵاتە". بەمانایەکی دیکە فۆکۆ دەڵێت ئەوەی نازیزم دروستدەکات ئەو شێوانەی دەسەڵاتە، کە مۆدێرنە لەگەڵخۆیدا دەیهێنێت، ئەو دەسەڵاتەی لە توانایدایە هەم چاودێریەکی وردی یەکەبەیەکەی هێز و ئۆرگانەکانی کۆمەڵگا بکات و هەم هاوکات ئەو تاکە لەیەکیدابڕاو و بەجیاواز چاودێریکراوانە، بکات بە بەشێک لەو گشتە گەورەیەی دەوڵەت وەک دانیشتوان پلانی بۆدادەنێت و لێیدەکۆڵێتەوە بەو شێوەیەش، کە دەیەوێت هەم پێناس و هەم ئۆرگانیزەی دەکات. ئەم دەسەڵاتە مۆدێرنە لەسەرێکەوە ئینسانەکان بۆ تاکەکەسی تەنیاو چاودێریکراو ورددەکاتەوە، لەسەرێکی دیکەوە کۆیاندەکاتەوە و دەیانکاتە گشتێکی ئۆرگانی و لەژێر ناونیشانی دانیشتواندا پلانی ڕێکخستن و دروستکردن و پێناسەکردن و لەقاڵبدان و ئیدارەکردنیان دادەنێت. بەکورتی نازیزم لەیەککاتدا هەم لەسەر تەکنیکەکانی بەگشتیکردن و سڕینەوەی جیاوازیی و خولقاندنی

هەندەسەیەکی کۆمەڵایەتی چوونیەک کاردەکات، هەم لەسەر تەکنیکەکانی دابڕین و ورنکردنەوەی خودی ئەو گشتە گەورەیەی دانیشتوان بۆ تاکەکەسی لێکدی دابڕاو و دەستەمۆکراو و گەمارۆدراو بە دەزگاکانی چاودێری و کۆنترۆڵکردن. ئەوەی فۆکۆ دەیەوێت بیسەلمێنێت گرێدانی توانای پیادەکردنی جینۆسایدە بە تەکنیکەکانی دەسەڵاتی مۆدێرنەوە، فۆکۆ دیەوەێت بڵێت ناکرێت بەبێ ئامادەبوونی شێوە مۆدێرنەکانی دەسەڵات و لەڕاستیشدا بەبێ ئامادەبوونی خودی مۆدێرنە خۆی وەک پرۆژەیەکی گشتگیر، قسە لە جینۆساید بکەین. بەم مانایە جینۆساید منداڵی مۆدێرنە و تەکنیکەکانی دەسەڵاتی مۆدێرنە. ئەو دەزگایانەی مۆدێرنە خەڵک و گروپە جیاجیاکانی پێدەکات بە ئەندامی یەک کۆمەڵگا و یەک نەتەوە و هەموویان لەژێر چەتری یەک کۆمەڵگادا کۆدەکاتەوە و دەینکات بە دانیشتوانی ناو سنووری دەوڵەتێک، ئیدی لە لەشکرەوە بیگرە بۆ هەموو دەزگا بیرۆکراسەکانی دیکە، هەمان ئەو دەزگایانەن، کە دەتوانن بەناوی پاراستنی نەتەوە و پاراستنی کۆمەڵگا و پاراستنی دانیشتوانەوە، سەرلەبەری بوونی ئەو گروهانە بخەنە مەترسییەوە، کە وەک دوژمنی کۆمەڵگا و وەک دوژمنی نەتەوە دوژمنی دانیشتوان پێناسەدەکرێن. بەڵام داخۆ چ میکانیزمێک لەپشتی فەراهەمکردنی توانای جینۆسایدەوەیە؟، یان ڕاستریڵێین لە چ کاتێکدا مۆدێرنە و دەسەڵاتی مۆدێرن دەبنە دەسەڵاتێکی جینۆسایدی؟

فۆکۆ کەدێتە سەر باسکردنی ئەو دونیا پڕ مەرگەی نازییەکان دروستیانکرد و ئەو فیزیای سزایەی جولەکەکانیان پێ سزادا، باس لەمیکانیزمێکی هێجگار گرنگ دەکات، کە نازییەکان لە سییەکان و چلەکانی ئەم سەدەیەدا دروستیانکرد. ئەو میکانیزمەش میکانیزمی گۆڕانی بیۆسیاسەتە بۆ "ساناتۆسیاسەت". ئێمە لە لاپەڕەکانی پێشوودا بیۆسیاسەتمان پێناسکرد و وتمان ئەو شێوەیەی سیاسەتە، کە لەسەر ژیانی بایۆلۆژی ئینسان و پاراستنی ئەو ژیانە و پلان بۆدانانی

کاردەکات، ئەو سیاسەتەی دەخوازێت تواناکانی بەرهەمهێنان و بڕ و ڕادەی وزە و چالاکی لە ئینساندا گەورەتر و بەهێزتر کات. بەڵام ئەی ساناتۆـسیاسەت چییە؟ ساناتۆـ سیاسەت ئەو سیاسەتەیە، کە ڕاستەوخۆ هەم لەسەر مەرگ و هەم لەسەر فیکرەی لەڕەگوڕیشە هەڵکەندنی هەموو ئەو شتانە کاردەکات، کە دەسەڵات وەک ڕێگر و کۆسپێک لەبەردەمی خۆیدا پێناسیاندەکات. بەمانایەکی دیکە ساناتۆـ سیاسەت ئەو جۆرەیە لە سیاسەت، کە دەخوازێت هەموو ئەو شتانە وێرانبکات، کە دەسەڵات نایەوێت بوونیان هەبێت، ساناتۆسیاسەت بریتییە لە هەڕەشە و پلانی وێرانکردنی هەموو ئەو شتانەی دەسەڵات وەک ناحەزێک پێناسیاندەکات. ئەگەر بیۆسیاسەت هەندەسەیەکی کۆمەڵایەتی تایبەت و هەندەسەیەکی تایبەت بۆ ژیان پێشنیاربکات و لەڕێگای دەزگا مۆدێرنەکانەوە بیەوێت ئەو هەندەسەیە بسەپێنێت، ئەوا ساناتۆسیاسەت ئەو کۆسپە ئینسانی و کۆمەڵایەتی و سیاسییانە وێراندەکات کەڕێگرن لەبەردەم پیادەکردنی ئەو هەندەسە کۆمەڵایەتییەدا. ئەگەر بیۆسیاسەت بیەوێت ژیان بپارێزێت ئەوا ساناتۆ سیاسەت ئەو کۆسپانە وێراندەکات، کە ڕێگرن لەبەردەم پیادەکردنی ئەو ژیانەدا. ئەو ژیانەی، کە ساناتۆسیاسەت دەیەوێت بۆنموونە لە ناو سنورەکانی دەوڵەتی نەتەوەدا وێرانیکات، زۆرجار ژیانی ئەو دەستە و گروپانەیە، کە وەک دوژمنی دەوڵەت و دوژمنی نەتەوە و دوژمنی کۆمەڵگا پێناسەدەکرێن. بە گۆڕانی بیۆسیاسەت بۆ ساناتۆسیاسەت ئیدی دەسەڵات کارەکتەری جینۆسایدی وەردەگرێت و ئەو سەرزەمینی مەرگە دروستدەکات، کە ناحەزەکانی دەوڵەت و کۆمەڵگایان تێدا سزادەدرێت، ناحەزانێک دەوڵەت وەک بوونەوەری هەڵە پێناس و دروستیاندەکات. لەژێر سێبەری ئەم لێکدانەوەیەدا دەکرێت بڵێین "دەسەڵاتی جینۆسایدی" ئەو شێوەیەی دەسەڵاتە، کە تیایدا بیۆسیاسەت دەگۆڕێت بۆ ساناتۆسیاسەت و گەمەی پاراستنی ژیان دەگۆڕێت بە گەمەی بەرهەمهێنانی مەرگ. بەڵام ئایا ئەو سیاسەتەی مەرگ بەرهەمدەهێنێت،

واتە ساناتۆ سیاسەت، جگە لە سیاسەتێک، کە دەیەوێت سزای فیزیایی کەسەکان بدات شتێکی دیکەیە؟ ئایا ئەم سیاسەتە بەشێک نییە لەو شێوەیەی دەسەڵات، کە فۆکۆ دەڵێت سەر بە ڕۆژگاری بەر لە مۆدێرنەیە، سەر بە ڕۆژگاری مافی کوشتن و مافی سەروەربوونی پادشاکانە، بە مانایەکی دیکە ئایا ئەم جۆرە سیاسەتە بەرهەمی دەسەڵاتی سزاگەر نییە؟

فۆکۆ بە نەخێر وەڵامی ئەو پرسیارانە دەداتەوە، بەباوەڕی فۆکۆ سیاسەتی کوشتن و لەناوبردنی جینۆسایدییانەی ئینسان مانای گەڕانەوەی دەسەڵاتی سزاگەر، واتە دەسەڵاتی لەسەر کوشتن کاردەکات، نییە بۆناو هەناوی مۆدێرنە. کوشتنی بەکۆمەڵ لەدونیای نازییەکاندا لەو مافە کۆنەوە نەهاتووە، کە پادشا هەیبوو بۆ لەناوبردنی ئەوانەی سەروەری پادشایان دەخستە مەترسییەوە، کوشتنی بەکۆمەڵ لە دونیای نازیزمدا لەو ڕاستییەوە دێت، کە دەسەڵاتی مۆدێرن بەهەمان ئەندازەی ئیشکردنی لەسەر ژیان، دەتوانێت لەسەر مەرگیش دەستبەکاربێت، چەند دەتوانێت ژیان بپارێزێت و گەشەپێبدات، بەهەمان ئەندازەش ئەتوانێت وێرانیکات. ئەم وێرانکارییە وەک ئەو سزایە نییە، کە دەیەوێت بەرگری لە سەروەری پادشا بکات، بەڵکو بەرگری لە وێنەی کۆمەڵگایەک، یان نەتەوەیەک دەکات، کاری ئەوە نییە شەرعیەتی پادشا بپارێزێت، بەڵکو بەناوی پاراستنی شەرعیەتی کۆمەڵگا و نەتەوەیەکەوە ئەدوێت. بەمانایەکی دیکە کوشتنی بەکۆمەڵ پابەندی پارستنی سەروەری پادشا نییە، بەڵکو بەرەنجامی فانتازیاکردنێکی نوێی شوناسی کۆمەڵگایە وەک بوونێکی هاوشێوە و وێکچوو، بەرەنجامی هەندەسەیەکی کۆمەڵایەتی دیاریکراوە، کە لەسەر بیرۆکەی ئامێزانبوون و هاوچارەنووسی ئەتنی و کولتوری دروستبووە. نازییەت خەونی دروستکردنی کۆمەڵگایەکی وێکچوو بێجیاوازییە، کە تێیدا یەک ڕەگەز سەروەر و باڵادەستە و ئەوانیدیکە خزمەتکار و بوونەوەری پلە دوو و پلە سێ و پلە چوارین. نازییەت وێناکردنێکی تازە و تایبەتی کۆمەڵگا و

فانتازیایەکی سیاسی نوێیە، کە لەسەر سڕینەوەی جیاوازییەکان و وێرانکردنی هەموو ئەو شتانە بنیادنراوە، کە ڕێگرن لەبەردەم دروستکردنی وێکچوونێکی سەرتاسەریدا، لەڕاستیدا نازیزم ترسێکی بێسنورە لە جیاوازی. لەم دیدەوە هۆلۆکۆست هەم بەرهەمی گەشەی تەکنۆلۆژیای مۆدێرن و هەم بەرهەمی کولتوری سیاسی ناسیۆنالیزمی مۆدێرنە، هۆلۆکۆست هەم بەرهەمی ژوورە مۆدێرنەکانی غازی کوشتنە هەم بەرهەمی ئایدیۆلۆژیای ناسیۆنال سۆسیالیزمە. خاڵی جەوهەری لەم بۆچوونەی فۆکۆدا ئەوەیە، کە دەسەڵاتی مۆدێرن هەم دەتوانێت ژیان بپارێزێت هەم دەشتوانێت وێرانیبکات، تەکنیک هەم دەتوانێت زیندەگی ئینسان سانابکات، هەم دەتوانێت غازی کوژەر بەرهەمبهێنێت. بۆیە ساناتۆ- سیاسەت دیوی ئەودیوی بیۆسیاسەتە، مۆدێرنە خۆشی لە یەککاتدا هەم هەڵگری ساناتۆ-سیاسەت و هەم هەڵگری بیۆ- سیاسەتە، هەم هەڵگری دونیابینیەکی شاعیرانەیە هەم هەڵگری دیدی جەلادێکیش.

بەباوەڕی فۆکۆ دونیای پڕ مەرگ و کوشتاری نازییەکان شتێک نییە دژ بە مۆدێرنە و ئەو دونیا و ئەگەرانەی مۆدێرنە پێشنیاریاندەکات. هۆلۆکۆست بەربەریەتێک نییە لەدەرەوەی مۆدێرنەوە هاتبێت و بیەوێت ڕەوتی مۆدێرنە تێکبدات، جینۆساید هەڕشەیەکی ناوەخت نییە ڕێکەوتێک دروستیکردبێت، دونیای پڕ مەرگەکەی نازییەت ئەگەرێکە لە ئەگەرەکانی مۆدێرنە و بەشێکی ئۆرگانی ئەو میکانیزمانەی دەسەڵاتە مۆدێرنە لەناوەوەڕا بەرقەراریان دەکات. ڕووە ڕووناکەکان و ڕووە تاریکەکانی دونیای هاوچەرخ هەردووکیان بەهامانئەندازە لە هەناوی پرۆژەی مۆدێرنەدا ئامادەن. ئەو ڕووەی مۆدێرنە، کە دەخوازێت کۆمەڵگا لەسەر وێنەی سەربازگە بەرهەمبهێنێت، بەهەمانئەندازەی ئەو ڕووەی دیکەیان، کە دەخوازێت کۆمەڵگا وەک دەرەنجامی پەیمانێکی کۆمەڵایەتی پێشنیارکات، ئامادەیە. دیموکراسیەت و نازیزم، ویلسۆن و هیتلەر دوو منداڵن هەردووکیان لە ڕەحمی

مۆدێرنەوە هاتونەتەدەرەوە. بێگومان ئەم بۆچوونە فۆکۆییە مانای ئەوە نییە، کە مۆدێرنە بە حەتمی ڕووی لە جینۆسایدە و بە حەتمی جینۆساید بەرهەمدەهێنێت، ئەوەی فۆکۆ دەیەوێت بیڵێت ئەوەیە جینۆساید یەکێک لە ئەگەرەکانی مۆدێرنەیە، ئەم ئەگەرە توانای بەرجەستەبوونی نابێت گەر کۆمەڵگا توانی بەر بە ڕووکارە تاریکەکانی دەسەڵاتە مۆدێرنەکان بگرێت. بۆ ئەم مەبەستەش دەبێت بەردەوام دەسەڵات چاودێریبکرێت و کۆمەڵگا دەزگا و دید و میکانیزمی تایبەتی ڕوویەڕوویوونەوەی دەسەڵات بدۆزێتەوە، کە نەهێڵێت دەسەڵات ڕووە جینۆسایدییەکانی خۆی بەهێزبکات.

مارسیل بلانچۆت لەپاڵ لێکدانەوەکانی فۆکۆدا لەسەر هەمان هێڵ دەڕوات و دەڵێت: "بۆ پیادەکردنی جینۆساید پێویستمان بەهەموو شێوەکانی دەسەڵات هەیە لەوانەش بیۆدەسەڵات کەلەسەر فیکرەی چاککردنەوە و میتۆد و دەستنیشانکردنێکی خوێنساردانە کاردەکات". (١٠) مەبەستی بلانچۆت لە مەسەلەی "چاککردنەوە" لەم پەرەگرافەدا چاککردنەوەی ئەو شتانەیە، کە دەسەڵات وەک هەڵە پێناسیاندەکات، ئەم چاککردنەوەیەش لە ڕێگای ڕیشەکێشکردن و لەناوبردنی ئەو هەڵە پێشنیارکراوانەوە دەبێت. لەدۆخی ئەڵمانیای نازیدا چاککردنەوەی هەڵەکان مانای لەناوبردنی جولەکەکان بوو وەک ڕەگەزێکی هەڵە، یان نەخۆش. جولەکەکان لەدیدی نازییەکانەوە هەڵگری خوێنێکی هەڵەبوون، کە مەترسییەکی گەورەیان بۆ پیسکردنی خوێنی ئاری بەگشتی و بۆخوێنی ئەڵمانی بەتایبەتی، هەبوو. پرۆسەی پاککردنەوەی خوێنی ئەڵمانیش مەسەلەیەک بوو نازییەکان دەیانویست بەهانە و پاشخانێکی میتۆدی و زانستی بۆ بدۆزنەوە، ئەم میتۆدەش بەوە دەستیپێدەکرد، کە بیسەلمێنێت جولەکەکان لەڕووی بایۆلۆژییەوە ڕەگەزێکی هەڵەن و ئارییەکانیش لە ڕەگەزەکانی دیکە پێشکەوتوتر و بەتواناترن. دواقۆناغیش لەم چیرۆکەدا دەرکردنی بڕیاری لەڕەگوڕیشە هەڵکەندنی ئەو هەڵە پێشنیارکراوانە

بــوو بەشــێوەیەکی بیرۆکراســی ڕۆحســارد و بێهەســتکردن بەهــیچ گوونــاه وەسوەسەیەکی ویژدانی.
ئەم دەستنیشانکردنەی بلانچۆت پڕاوپڕی ئەزموونی نازیزمی ئەڵمانییە، جینۆسـاید لە ئەزمـوونی نازییەتـدا لەپـاڵ گوتـارێکی ڕاسیسـتیدا پیـادەکرا، کە بیۆـدەسەڵات ڕۆڵێکی هێجگار گرنگی لەداڕشتنی نـاوەرۆکی ئەو گوتـارە ڕاسیستییەدا دەبینـی. فۆکۆ ئەم ڕاسیزمە ناودەنێت "ڕاسیزمی دەوڵەت"، مەبەست لە ڕاسیزمی دەوڵەتـی ئەوەیە دەوڵەت لەســەر بنـاغەی ڕەگەز هەنـدێک گـروپ دەردەکـاتە دەرەوەی ئەو شوناسە گشتییەوە، کە بۆ کۆمەڵگای دروستدەکات. دەوڵەت لە دروسـتکردنی ئەو هەندەسە کۆمەڵایەتییەدا، دەخوازێت بەسەر کۆمەڵگایـدا بسـەپێنێت، ئەو گروهـانە دەردەکاتەدەرەوە، کە لەگەڵ فانتازیاکانی دەوڵەتدا بۆ کۆمەڵگا یەکنـاگرنەوە. ئەم دەرکـردنە دەرەوەیەش لە دۆخـی جینۆسـایدا لەنـاوبردنێکی سەرتاســەری ئەو گروپانەیە، کە دەوڵەت نایەوێت بەشێکبن لە شوناسی ئەو کۆمەڵگایە. بەڵام فۆکۆ مەسەلەی ڕاسیزمی دەوڵەت تەنها بە مەسەلەی ڕەگەزەوە گرێنادات و هاوکات پـێ لەسەرئەوە دادەگرێت نابێت ڕاسیزم تەنها بـۆ مانـا بـایۆلۆژییەکەی کـورتبکەینەوە. دەوڵەت دەتوانێــت زیــاد لە گــرووپ و دەســتەیەک وەک بــوونەوەری هەڵە پێناسەبکات، بەڵام نەلەسەر ئەساسـی ڕەگەز وەک نـازیزمی کلاسیکی دەیکـات، بەڵکـو لەسـەر ئەساسـی سـێکس، وەک لەنـاوبردنی هۆمۆسێکسـواڵەکان، لەسـەر ئەساسـی ڕاو بۆچـوونی سیاسـی، وەک لەنـاوبردنی نـاحەزە سیاسـیەکان، لەسەر ئەساسـی ئەتنـیەت، وەک لەنـاوبردنی قەرەجەکـان، هتـد... بەکـورتی دەشـێت ڕاسـیزمی دەوڵەتـی بەرهەمـی فانتازیـاکردنێکی دیاریکراوی کۆمەڵگـا و بەرهەمـی هەندەســەیەکی کـۆمەڵایەتی بێـت، کە شـوێنی زۆر گـروپ و ڕەگەز و سێکســی جیـاوازی تێـدانەبێتەوە. لێـرەوە جینۆسـاید، وەک دیوێـک لە دیوەکـانی ڕاسـیزمی دەوڵەتی، دەشێت ڕوویەڕووی هەریەکێک لەو گروپانە ببێتەوە، کە دەوڵەت نایەوێت

وەک بەشێک لە فانتازیا کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتورییەکانی خۆی بیانبینن.

-٨-

لەڕاستیدا شیکردنەوەکانی فۆکۆ بۆ دەسەڵات ڕوویەڕووی کێشەیەکی زۆر گرنگمان دەکاتەوە ئەویش کێشەی بێدەنگبوونە لە دەسەڵاتی کاریزمی و کاریگەرییەکانی دەسەڵاتی کاریزمی. فۆکۆ بەدرێژایی نووسینەکانی لەسەر دەسەڵات بە هیچ جۆرێک باس لە دەسەڵاتی کاریزمی ناکات. ئەم باسنەکردنەشی، بەبۆچوونی من، وابەستەی ئەو دیدە فەلسەفییەیە، کە فۆکۆ هەڵگریەتی، مەبەستم لە باوەڕنەبوونە بە فەلسەفی زات، یان خود. لای فۆکۆ خود منداڵی قۆناغی ڕۆشنگەرییە و فەلسەفەی خودیش جگە لە ڕستێک وەهم هیچیدیکە نییە. لێرەوە کاریزما، ئەو زاتەی هەمەتوانایە، لە گوتارە فەلسەفییەکەی فۆکۆ دەرکراوە. بەبۆچوونی من ئەم دەرکردنەی کاریزما لە تیۆرەی دەسەڵاتی فۆکۆیی بەهیچ جۆرێک لەگرنگی ئەم شێوە دیاریکراوەی دەسەڵات، چ لە مێژووی دەسەڵات و چ لە پێکهاتەی دەسەڵات لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا، کەمناکاتەوە. نەک هەرئەمە بەڵکو من پێمولیە دەسەڵاتی کاریزمی تا ڕادەیەکی زۆر کاریگەرییەکی گەورەی هەبووە و هەیە لەسەر چۆنیەتی کارکردنی ئەو شێوانەی دیکەی دەسەڵات، کە فۆکۆ بەدرێژی میکانیزمی کارکردنیانی شیکردۆتەوە.

تێڕوانینێکی ورد لە چۆنیەتی کارکردنی دەسەڵات لەم سەدەیەدا نیشانیدەدات چۆن کاریگەری دەسەڵاتی کاریزمی، لەهەناوی کۆمەڵگای مۆدێرندا، لەسەر کۆی کارکردنی شێوەکانی دیکەی دەسەڵات کاریگەریەکی وێرانکەریبووە. کاریزما لەم سەدەیەدا بەشێوەیەکی گشتی ئینسان و کۆمەڵگاکانی بەر لەهەموو شتێک

ڕوویەڕووی تاریکستانەکانی ناو مۆدێرنە کردۆتەوە، نەک ڕووناکییەکانی. ڕێکەوت نییە جینۆسایدەکانی مێژوو لەئامادەگی سەرۆکێکی کاریزمیدا ڕوویانداوە، ئەتاتورک، هیتلەر، ستالین، پۆلپۆت و سەدام حوسەین، لە نموونە هەرە دیارەکانیانن. بێگومان کەدەڵێم ئەم سەرۆکانە هەڵگری دەسەڵاتێکی کاریزمین، مەبەستم نییە بەشان و باهوی ئەم دیکتاتۆرە خوێناوییانەدا هەڵدەم، مەبەستی من لە دەسەڵاتی کاریزمی مانا ئەنسرۆپۆلۆجییەکانی کاریزمایە. واتە مەبەستم ئەو شێوەیەی دەسەڵاتە، کە لە جەستەی سەرکردەیەک، یان سەرۆکێکدا جێگیرە و دەزگاکان و زانستەکان و بەرنامەکان ناچاردەکات بەشێکی گەورەی مۆڵەتی کارکردنی خۆیان لەو سەرکردەیەوە بخوازن.

بە بۆچوونی من دەسەڵاتی کاریزمی نەغمەیەکە لە نەغمەکانی دەسەڵاتی سزابەخش، بەڵام ئەم سزایە بەتەنها سزای تاکەکان و گروپەکان نییە، بەڵکو سزادانی لۆژیکی دەسەڵاتی مۆدێرن خۆشیەتی. ئاخر مۆدێرنە ئەو دۆخە سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەیە، کە تیایدا دەسەڵاتەکان لە یەکدی جیادەکرێنەوە، چاودێری دەکرێن، پانتایی کۆمەڵایەتی بۆ بەرگری دژ بەو دەسەڵاتانە فەراهەم دەبن هتد.... بەڵام کاریزما دێت بۆ تێکشکان و سزادانی ئەم لۆژیکە فرەڕەهەندەی مۆدێرنە، کاریزما دێت تا دەستبخاتە ناو میکانیزمەکانی ئیشکردنی دەسەڵاتی مۆدێرنەوە و تایبیبکرێت نەهێڵێت دەسەڵات سنوورەکانی خۆی بکاتەوە و بەسەر هێزی کۆمەڵایەتی جیاوازدا دابەشببێت. کاریزما دێت تا نەهێڵێت دەسەڵات لەدەرەوەڕا چاودێریبکرێت، تا نەهێڵێت بەرگری پانتایی تایبەتی خۆی دروستبکات. کاریزما دێت بۆ بێدەنگکردن و وەلاوەنان و سڕینەوەی جیاوازییەکان، لەکاتێکدا مۆدێرنە پرۆژەیەکی گەورەی بەرهەمهێنانی جیاوازییە، لەجیاوازی کارەوە بۆ جیاوازی سایکولۆژیا. کاریزما دەسەڵاتی ئەو پاشا، ئەمیر، یان سەرۆکە سەروەردەکات، کە دەسەڵاتەکەی لە جەوهەری گریمانکراوی ئەوەوە وەک پیاوێکی

خاوەن کاریزما سەرچاوەدەگرێت، نەک لە شەرعیەتێکی کۆمەڵایەتی و یاساییەوە.
کاریزما ئەو دەسەڵاتەیە، کە لەدەرەوەی یاسا و دەزگا و ڕێکەوتنە کۆمەڵایەتییەکاندا و لەناو جەستەی سەرکردەکاندا جێگیرە.
بێگومان نابێت کاریزما لە کۆمەڵگا هاوچەرخەکاندا وەک دەسەڵاتی تاقە سەرکردەیەک، یان ئەمیرێک، یان پادشایەک بەتەنها تێبگەین، بەپێچەوانەوە پێویستە کاریزما وەک سیستمێک ببینین. کاریزما وەک سیستم مانای ئامادەگی بەردەوامی سەرۆکە گەورە و بچووک و بچووکترەکانە لە نێو زۆربەی هەرەزۆری کایە و ناوەندە کۆمەڵایەتییەکاندا و وەرگێڕان و پەکخستنی لۆژیکی ئەو کایانەش تا ئەو ئەندازەیەی کاریزما وەک سیستم بتوانێت هەم خۆی و هەم باڵادەستبوونی خۆی بەبەردەوامی بەرهەمبهێنێتەوە. ئەوە دەسەڵاتی کاریزمییە لەیەککاتدا هەم سەدام حوسەین و هەم عودەی و هەم قوسەی و هەم عەلی حەسەن مەجید و هەم حسێن کامیل، هەم ئەو ئەفسەری ئاسایشانەش بەرهەمدێنێت، کە لە قوتابخانەکاندا چاودێری ئەوەدەکەن منداڵانی ئەو قوتابخانانە لە پشووی نێوان وانەکاندا چ سرودێک دەڵێن و چ نووکتەیەک بۆیەکدی دەگێڕنەوە. کاریزمای مۆدێرن سیستمێکە و دابەزیوەتە ناو هەموو خانەکانی ژیانی کۆمەڵایەتییەوە، لەخانەی شیعرەوە بۆ خانەی مەرگ، لە هەڵبژاردنی ڕەنگی جلوبەرگەوە بۆ هەڵبژاردنی هاوسەر. ئەزموونی عێراقی لەم ڕووەوە نموونەیەکی هێجگار گرنگە.
بێگومان بەسیستمکردنی دەسەڵاتی کاریزمی خۆی لە خۆیدا بەرهەمێکە لەبەرهەمەکانی مۆدێرنە، کاریزما چیدی بەتەنها دەسەڵاتی سیحربازێک نییە فێڵەکانی هێزی ئەوەی بدەنێ ئەوانیتر لێیبترسن و بە گوێی بکەن، یاخود نەوێرن پرسیار دەربارەی سەرچاوەکانی ئەو سیحرە بکەن. بەپێچەوانەوە کاریزمای مۆدێرن کاریزمای دانیشتووی ناو مۆدێرنە و هەڵگری تواناکانی مۆدێرنەیە.، کە دەڵێم کاریزما سیستمە و بەرهەمێکە لەبەرهەمەکانی مۆدێرنە، دەمەێت بڵێم کاریزما لەناو

پرۆژەی مۆدێرنەدا دەسەڵاتێکە شانیدادلوەتە سەر کۆی هێز و توانای ئەو فۆرمانەی تری دەسەڵات، کە مۆدێرنە بەرهەمیاندەهێنێت. کاریزما ئەو هێز و توانایانەی مۆدێرنە بەرهەمیاندێنێت دەخاتە سەر هێز و توانای خۆی و ئەمر و نەهییەکانی خۆی بە تەکنیک و میتۆد و توانای دەسەڵاتەکانی مۆدێرنە پیادە دەکات.

بەبۆچوونی من ئامادەگی کاریزما لەناو هەناوی مۆدێرنەدا هیچ لەو ڕاستییە ناگۆڕێت، کە دەسەڵاتی کاریزمی لەدوالێکدانەوەدا جگە لەدەسەڵاتی سزابەخش شتێکی دیکە نییە. دەسەڵاتی سزابەخش بەو مانایەی دەسەڵاتدار مافی کوشتن و لێسەندنەوەی ژیانی لەکەسانی تری ناو قەڵەمڕەوی دەسەڵاتەکەی هەیە. کاریزما لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بەهەمانئەندازەی قۆناغی بەر لە مۆدێرنە هەڵگر و پارێزەری مافی کوشتنە، چەندە پاشا کۆنەکان مافی کوشتن و سەپاندنی مەرگیان هەبووە، بەهەمانئەندازە کاریزما نوێکان لەژێر دروشمی پاراستنی نەتەوە و دەوڵەت و قازانجی گشتی کۆمەڵگادا هەمان مافی کوشتن و لەناوبردن پیادەدەکەن. بەڵام ئەم مافی کوشتنە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا تەنها گرێدراوی پاراستنی دەسەڵاتی پاشا نییە، بەڵکو ڕاستەوخۆ بە چەندان لەو پرنسیپە سیاسی و کۆمەڵایەتییانەوە گرێدرلوە، کە مۆدێرنە لەگەڵخۆیدا هێناویەتی. هەموومان دەزانین لە زۆر حاڵەتی باڵادەستی کاریزمادا شەرعیەت و سەروەری دەوڵەت، کە خاڵێکی گرنگی داهێنانە سیاسییەکانی مۆدێرنەیە، تاڕادەیەکی زۆر دەبەسترێتەوە بە کەسی پاشا، ئەمیر، یاخود سەرۆک خۆیەوە. بریندارکردنی سەرۆک مانای بریندارکردنی شەرعیەتی دەوڵەت و قبووڵنەکردنی سەرۆک مانای قبووڵنەکردنی سەروەری دەوڵەت و بەگژاچوونەوەی سەرۆک مانای بەگژاچوونەوەی سەروەری دەوڵەت دەگەیەنێت.

لە دەسەڵاتی کاریزمیدا مەسافەیەک نامێنێت لەنێوان جەستەی سەرۆک و جەستەی دەوڵەتدا، تەماهییەکی تەولوەتی لەنێوان سەرۆک و دەوڵەت و خودی نیشتیمان خۆشیدا هەیە. لەعێراقدا ئەو دروشمەی، کە دەیگوت "سەدام حوسەین

خـێمەی هەمـوو عێراقییەکـانە" دەربـڕی ئەو نیـازەیە، کە دەخوازێـت کاریزمـا بە مەسەلەی شەرعیەتەوە گرێبدات. لۆژیکی ئەم دەسەڵاتە دەیەوێت بڵێت شەرعیەتی دەسەڵاتی سەدام لەو ڕاستییەوە دێت، کە خێمەی هاوڵاتییان و خێمەی کۆمەڵگا و نەتەوەی عێـراقییە، سـەدام یەکسـانە بە عێـراق و جەسـتەی سـەدام و جەسـتەی عێـراق یەکشـتن و هەردووکیـان خـێمەی هاوڵاتیـانن. ئەو دروشـمەی دیـکەش، کە دەیگوت "ئەگەر سەدام وتی بەڵێ، عێراق وتی بەڵێ" تێکەڵکردنێکی بەئەنقەست و ترسـناکی ئیـرادەی دەوڵەت و ئیـرادەی کاریزمـابوو بەیەکتـری. لەهەردوو حاڵەتەکەشـدا کاریزمـا و دەوڵەت، کاریزمـا و سـەروەری و کاریزمـا و شـەرعیەت بەیەکـدی تێکەڵکـراون، گەرچـی ئەم تێکەڵکـردنە بسـت بەبسـتی دەسـەڵاتێکی هەڵئەچنی، کە ژیانی هەموومانی دەکردە بارمتەی بەڵێ وتنێکی بێقەیدوشەرت بۆ سـەدام و کارەکـانی سـەدام. هاوکـات بڕێکـی زۆری ئەوکـارانە بەنـاو مەرگـی دەستەجەمعی هەمووماندا تێدەپەڕی و هەندەسـەیەکی کۆمەڵایەتی دەسـەپاند دژ بەهەموو ڕاستییە سۆسیۆلۆژییەکانی کۆمەڵگـای عێراقـی و ئـارەزووی جیـاوازبوونی گروپە جۆربەجۆرەکانی ئەو پێکهاتە سیاسییەی ناوی عێراقە.

دەسـەڵاتی کـاریزمی سـایکۆلۆژیای دەسـەڵات لە سـایکۆلۆژیایەکی ئـاڵۆز و فـرە ڕەهەندەوە، سایکۆلۆژیای دەزگاکان و پلانەکـان و زانسـتەکان و پەیوەنـدییەکانەوە دەگۆڕێت بۆ سایکۆلۆژی ئەو پیاوە کاریزمییانەی بڕیارەکاندەدەن. سیستمی کاریزما سـایکۆلۆژیای چـڕی پرۆسـە ئـاڵۆز و جیاوازەکـانی مـۆدێرنە دەگـۆڕێتە سـەر سایکۆلۆژیای سادەی ئەفسـەرەکانی چاودێری. لـۆژیکی ئـاڵۆزی مـۆدێرنە، لـۆژیکە سیاسـی، فیکـری، ئـابووری و کولتـورییەکەی، دەکەوێـتە ژێـر جەبـری لـۆژیکی کاریزمایەک زۆرجار دونیا تەنهـا لەو دابەشـکردنە هێجگـار سـادەیەدا دەبینێـت، کە دەڵێت "کێ لەگەڵ مندایە باش" و "کێش منی قبووڵ نییە خـراپ"ە. ئەم خـاڵەیە وا لەمـن دەکـات بڵـێم دەسـەڵاتی کـاریزمی فـۆرمێکە لە فۆرمەکـانی دەسـەڵاتی

سزابەخش، بە بۆچوونی من هەم سزا و هەم کاریزما لە پەیوەندییاندا بە مەسەلەی سەروەرییەوە یەک ستراتیژیان هەیە، ئەویش ستراتیژی پاراستنی سەروەری پادشا و سەروەری سەرۆکە. دەسەڵاتی سزابەخش سەروەری دەسەڵات دەبەستێتەوە بە جەستەی ئەمیر، یاخود پادشاوە، کاریزما بوونی دەوڵەت و تەنانەت بوونی کۆمەڵگا خۆشی بە بوونی سەرۆک خۆیەوە، دەبەستێتەوە. پادشا ناحەزەکانی دەکوژێت بۆ پاراستنی سەروەری دەسەڵات، کاریزما هەموو بەرگرییەک لەناودەبات بۆ پاراستنی ئەو دەوڵەت و کۆمەڵگایەی کورتکراوەتەوە بۆ ئەو "خێمەیەی" هەم کۆمەڵگا و هەم دەوڵەت دادەپۆشێت. هەر ئەم پەیوەندییە ڕاستەوخۆیەی نێوان دەوڵەت و کاریزما لەلایەک و کۆمەڵگا و کاریزماش لەلایەکی دیکەوەیە وا لەمن دەکات دەسەڵاتی جینۆسایدی وەک دەسەڵاتێک ببینم لە پەیوەندییەکی پتەودا بە دەسەڵاتی کاریزمییەوە. نا نەک هەر ئەمە بەڵکو تائەوڕادەیەش پێدادەگرم و دەڵێم جینۆساید بەبێ کاریزما مەحاڵە. بێگومان دەبێت ئەوەمان لائاشکرابێت بەبێ ئامادەیی شێوە مۆدێرنەکانی دەسەڵات، واتە بەبێ بیۆدەسەڵات و دەسەڵاتی چاودێریکەر، کاریزما ناتوانێت هەڵگری ڕەهەندی جینۆسایدی بێت. تەنها لە ئامادەگی و لەپاڵ ئەم دوو فۆرمەی دەسەڵاتدایە کاریزما دەتوانێت بەشێکی گرنگی دەسەڵاتی جینۆسایدیبێت.

بەکورتی دەسەڵاتی جینۆسایدی ئەو شێوەیەی دەسەڵاتە، کە لەکۆمەڵگایەکی مۆدێرندا هەر سێ شێوەکەی دەسەڵاتی لە هەناوی خۆیدا کۆکردۆتەوە. مەبەستم لەو سێ شێوەیەی دەسەڵاتیش ئەو شێوانەن لەسەرەوە باسمانکردن. کۆکردنەوەی ئەم دەسەڵاتانە بەیەکەوە دەبێت کۆکردنەوەیەکبێت تیایدا کاریزما باڵادەستبێت و تاڕادەیەکی زۆر دەستنیشانی ئەوە بکات شێوازە جیاجیاکانی دیکەی دەسەڵات لەسەر چی کاربکەن و بەچ شێوەیەک کاربکەن، لەسەر ژیان، یاخود لەسەر مەرگ، بیۆدەسەڵات بن، یاخود ساناتۆ- دەسەڵات.

ئەم سێ شێوەیەی دەسەڵات بوو لە سیستمی نازییەکاندا بەیەکەوە کۆبوونەوە و ئەو دیاردەیان دروستکرد، کە ناوی هۆلۆکۆستە. واتە هۆلۆکۆست بەری کۆبوونەوەی سزا و کۆنترۆڵ و گەمەی بایۆلۆژییانەی دەسەڵاتە لە دونیایەکدا سەرۆکی کاریزمی و سیستمێکی کاریزمی ئاراستەکانی کارکردنی دەسەڵات دەستنیشاندەکان. هەر ئەم پێکهاتەیەش بوو لە کوردستاندا ئەنفالی خولقاند بەڵام لە رۆژگار و هەلومەرجێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی جیاوازدا. ئەم خاڵە دواتر دێمەوە سەری.

-٩-

کە کاریزما دێت ئەگەری وەرگەڕانی بیۆ- دەسەڵات لە ئیشکردنییەوە لەسەر ژیان بۆ ئیشکردن لەسەر مەرگ گەورەتر و فراوانتر دەبێت. فۆکۆ دەڵێت "بیۆدەسەڵات دەشێت دەسەڵاتێک بێت لەیەککاتدا هەم ژیان بپارێزێت و هەم وابکات هۆلۆکۆست لەدایکببێت". (١١) بە بۆچوونی من ئەوەی وادەکات بیۆدەسەڵات لە کارکردنییەوە لەسەر ژیان بگوازێتەوە بۆ کارکردن لەسەر مەرگ بە پلەی یەکەم پەیوەندی بە ئامادەگی دەسەڵاتی کاریزمییە هەیە بەو مانایەی لەسەرەوە بە کاریزمامان دا. چونکە کاریزما دەسەڵاتێکە نایەوێت هیچ سنوورێک بەر بە گەمەکان و خەونەکان و تەماحەکانی بگرێت، گەرچی پیادەکردنی ئەم تەماح و خەونانە بەناو دەیان گۆڕستان و ژێرزەمینی تاریکی پڕ لەڕۆحی کوژراو و شاری سوتێنراو و گوندی وێرانکراودا تێپەڕێت. کاریزما هەمیشە لەسەر کۆمەڵێک وەهم کاردەکات، کە دەشێت دەسەڵات بە ئاراستەیەکی ترسناکدا ببات. بێگومان گواستنەوە لە گەمەی ژیانەوە بۆ گەمەی مەرگ پێویستی بە ئامادەکردنی سەرزەمینێکی ئایدیۆلۆژی و

دەزگایی و سیاسی و کولتوری هەیە، تیایدا کاریزما بتوانێت هەقیقەت بەوشێوەیەی دەیخوازێت و بەشێوەیەی خەونپێوەدەبینێت بەرهەمبهێنێت. کاریزما بۆ پیادەکردنی جینۆساید و گواستنەوەی گەمەکانی ژیان بۆ گەمەی مەرگ پێویستی بە سیستمێکی بەرهەمهێنانی هەقیقەت هەیە تیایدا هەقیقەتەکانی کاریزما لە هەموو هەقیقەتە سیاسی و سۆسیۆلۆژی و کولتورییەکای دیکە گرنگترین، لەڕاستیدا مەسەلەکە مەسەلەی گرنگی هەقیقەتەکان نییە، ئەوەندەی مەسەلەی بوونی هەقیقەتێکی کاریزمییە، کە لەسەر کوشتن و لەناوبردنی هەموو هەقیقەتەکانی دیکە کاردەکات. نموونەی عێراق، دەسەڵاتێکی کاریزمی بیناندراو لەسەر گۆڕی دەستەجەمعی و گۆڕینی کۆمەڵگا بە قەبرستانێکی گەورە، لەم ڕووەوە نموونەیەکی دەوڵەمەند و پڕمانایە. لە ئەڵمانیاشدا ناکرێت کۆی ڕوودلوەکانی هۆلۆکۆست و بەکۆمەڵ کوشتنی جولەکەکان لە ئامادەگی کاریزمییانەی هیتلەر و ئەو هەزاران هیتلەرە بچووکانەی تریش دابڕین، کە بە سەر جەستەی کۆمەڵگای ئەڵمانیدا بڵاوبووبوونەوە.

بەڵام وەک پێشتریش هێماپێکرد دەسەڵاتی کاریزمی بەتەنها دەسەڵاتی تاقە پیاوێک نییە بۆخۆی و بەس، بەڵکو ئەم دەسەڵاتە دەسەڵاتی گروهێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراوە، کە کاریزما هەلومەرجی بوونی کۆمەڵایەتی ئەوان وەک گروهێکی باڵادەست بەردەوام بەرهەمدەهێنێتەوە. بە مانایەکی دیکە دەسەڵاتی کاریزمی دەسەڵاتی گروهێکە بۆ ئەوەی شوێن و جێی کۆمەڵایەتی و سیاسی خۆی بەرهەمبهێنێتەوە، ناچارە فۆرمەکانی دەسەڵات وا ڕیزبکاتەوە کاریزما تیایدا خاوەنی یەکەمین و دواهەمین بڕیاربێت، گروهێک نەتوانێت لەدەرەوەی کاریزمادا باڵادەستی خۆی بپارێزێت. شوناسی ئەم گروهە کۆمەڵایەتییە چییە؟ ئەمەیان پرسیارێکە دەشێت لە شوێن و جێی جیاواز و هەلومەرجی مێژوویی جیاوازدا، وەڵامی جیاوازی هەبێت.

لە ئەزمــوونی عێراقیــدا شوناســی ئەو گــروهە شوناســێکە ڕەگێکــی لەنــاو پەیوەنـدییەکانی خزمخـوامی و کولتـوری خێڵەکیـدایە، ڕەگەکـانی دیکەشـی لەنـاو دەزگـانی لەشـکر و ماشـێنی میلیتـاری نـوێی دەوڵەتـی عێراقیـدایە. ئەم گـروهە گـروهێکە لەنـاو دەوڵەتەوە و لەڕێگـای دەوڵەتەوە شـوێنی کـۆمەڵایەتی خۆیـان بەدەستهێناوە، بەمانایەکی دیکە ئەم گروهە لە جەوهەردا گروهێکـی سیاسییە، کە شـوێن و جێـیە سیاسـییەکەی خـۆی لەڕێگـای دەوڵەت و دەزگاکـانی دەوڵەتەوە دەکات و کردووە بە شوێن و جێیەکی ئـابووری و کۆمەڵایەتی. گروهێکە بەردەوام سەرمایە ڕەمزییەکەی، ئەو سەرمایە ڕەمزییەی مەوقیعی ئەم گروپە لەناو دەوڵەتـدا دروستیدەکات، دەگۆڕێتە سـەر سـەرمایەی ئـابووری. ئەوەی لێرەدا دەبێـت پێـی لەسەر دابگیرێت فانتازیای سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەم گروپەیە، من وتم ئەم گروپە سەدامی وەک خێمەی عێراقییەکان پێشنیاردەکرد و تەمـاهییەکی ڕاسـتەوخۆی لە نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگا و سەدامدا دروستدەکرد. ژێرخانی ئەم فانتازیا سیاسی و کۆمەڵایەتییەش بریتیبوو لە وێناکردنی کۆمەڵگا بە هەمـوو جیاوازییەکـانیەوە وەک خێڵێک، خێڵێک ئەندامەکانی ڕەعیەتێکی ملکەچ و گوێڕایەڵی سەرۆک خێڵەکە بن. ئێسـتا هەنگـاوێکی دیـکە دەچمەپێشـەوە و دەڵـێم ئەم فانتازیـا سیاسـییە ئەو سەرزەمینەیە، کە جینۆسایدی لە عێراقدا لەسەر بنیادنراوە. ئاخر سەدام حوسەین، سـەرۆک کۆمـاری دەوڵەتێکـی مـۆدێرن، چـۆن وەک خـێمەی خێڵـێک، کە هەمـوو عێراقیەکان کۆبکاتەوە، پێشنیاردەکرێت گەر لەپشتییەوە خەونـی کردنـی کۆمەڵگا بە خێـڵ و خەونــی بەرهەمهێنــانەوەی کۆمەڵگــا لەســەر مــۆدێلی خێــڵ بنەمــا فانتازییەکانی ڕەنگرێژ نەکردبێت. لەڕاسـتیدا هەوڵـدانی بەرهەمهێنـانەوەی کۆمەڵگا لەسـەر مـۆدێلی خێـڵ هەوڵـدانی ڕکێفکردنـی هەمـوو پرۆسـەکانی مـۆدێرنەیە، ئەو پرۆسـانەی وەک "ڤێـبەر" دەڵێـت بەردەوام گروهــی جیـاواز و فەردی جیـاواز و پەیوەنـدی جیـاواز و ئینتیمـای جیـاواز و ئەخلاقــی جیـاواز و دونیـابینی جیـاواز

بەرهەمدەهێنن. بەمانایەکی دیکە لە کاتێکدا مۆدێرنە بەردەوام گروهی جیاواز لە هەناوی کۆمەڵگادا دروستدەکات و بەردەوام کۆمەڵگا بە جیاوازی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتوری نوێ مەحکومدەکات، لەهەمانکاتدا دەسەڵات ناچاردەکات سنوورەکانی خۆی بۆ جێکردنەوەی ئەم جیاوازییە کۆمەڵایەتییانە واڵاکات. لەو کاتەدا، کە دەسەڵات نایەوێت و ناتوانێت سنوورەکانی خۆی بۆ ئەو جیاوازییانە واڵابکات، کە مۆدێرنە دەیانخولقێنێت، تاقە دەروازەیەک دەمێنێتەوە چەپاندنی جیاوازییەکان و ئینکارکردن و توورڕدانەوەیانە بۆ ناو ئەو مۆدیلە کۆمەڵایەتییانەی بەر لە مۆدێرنە باڵادەستبوون، مەبەستم لەو مۆدێلەش مۆدیلی خێڵ و مۆدیلی پەیوەندییەکانی خزمخواهیە.

بەڵام با ئەو خاڵەش تەواو ئاشکرابێت ئەو گروهەی لە عێراقدا هەوڵی ڕکێفکردنی کۆمەڵگا و هەوڵی ڕکێفکردنی مۆدێرنەی ئەدا خۆشی بەرهەمێک لەبەرهەمەکانی مۆدێرنەیە. ئەم گروهە گروهێکە ئەفسەرەکانی سوپا ناوەندەکەی پێکدەهێنن و ئەو گوندنشینە خێڵەکییانەی مۆدێرنە بەرەو شارە گەورەکانی بردوون، تەوەرەکەی و ئەو خوێندەوارانەش، دەرچووی زانکۆ و دەزگا نوێکانی خوێندن، ئەو خاڵی بەیەکەوە گرێدانە پێکدێنن، کە ناوەند و تەوەرەی ئەم بازنەیە بەیەکدیەوە دەبەستێتەوە. بێگومان خەونی گۆڕینی کۆمەڵگا بۆ خێڵ بەبێ فشارێکی هەمەلایەن و بەبێ هێرشێکی بەردەوام بۆسەر هەموو ئەو بەشانەی کۆمەڵگا، کە ئەم پرۆسەیە قبووڵناکەن کارێکی مەحاڵە. لێرەوە نەک تەنها جیاوازییە کۆمەڵایەتییەکان ئینکاردەکرێن، بۆ نموونە بەعس ویستی بە بڕیارێک جیاوازی نێوان کرێکاران و فەرمانبەران بسڕێتەوە، بەڵکو هەر جیاوازییەکی دیکەی ئەتنی و ئایینی و کولتوریش بەتوندی ئینکاردەکرێن و عێراق دەبوایە وەک کۆمەڵگایەکی بێجیاوازی خۆی بناسێت و پێشکەشبکات. تاقە شتێک هێنانەدی ئەم خەونەی مسۆگەردەکرد پرۆسەی بە میلیتاریزەکردنی سەرلەبەری کۆمەڵگا بوو، لەڕێگای بەرهەمهێنانی

جەنگی بەردەوامەوە. لێرەوە بەرپاکردنی جەنگی بەردەوام لە عێراقدا جگە لە بوونی چەندان هۆکاری سیاسی دەرەکی و ناوچەیی جیاواز مەحکومبووە بە کۆمەڵێک هۆکاری ناوەکیش، لەپێش هەموویانەوە هەوڵدانی ڕکێفکردنی ئەو جیاوازییە ئەتنی و کۆمەڵایەتی و کولتوری و حەیاتییانەی مۆدێرنە لەگەڵخۆیدا دەیانهێنێت. مۆدێرنە جیاوازی بەرهەمدێنێت و بەعس دەخوازێت جیاوازییەکان بسڕێتەوە، ئەمە ئەو ناکۆکییە کوشندەیە لە عێراقدا حوکمی سەرلەبەری ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەتنی و کولتوری کردووە. وەک وتم تاقە چارەسەرێک لە عێراقدا بیریلێکرابێتەوە بۆ دەرچوون لەم ناکۆکییە و هەوڵدانی بەعس بوو بەرهەمهێنانەوەی کۆمەڵگا لەسەر مۆدێلی خێڵ، یان سەربازگە، واتە لەسەر مۆدێلی خێڵێکی چەکدار. ئەم مۆدێلە وادەکات لەسەرێکەوە هەموو توانا تەکنۆلۆژی و ڕێکخراوەیی و سەربازییەکانی مۆدێرنە بخرێنەگەڕ بۆ بەرهەمهێنانی کۆمەڵگا لەسەر مۆدێلی سەربازگە. بەمانایەکی دیکە لەم مۆدێلەدا تواناکانی مۆدێرنە، توانا تەکنیکی و سیاسی و مۆراڵییەکانی، دژ بە بەرهەمەکانی مۆدێرنە خۆی، واتە دژ بە هێزە کۆمەڵایەتییە مۆدێرنەکان و داواکارییەکانیان سەبارەت بە سەربەخۆبوون و پاراستنی مافی جیاوازبوونیان، بەکاردەهێنرێت. باڵادەستبوونی خەونی بەرهەمهێنانەوەی کۆمەڵگا لەسەر مۆدێلی سەربازگە، یان خێڵێکی چەکدار وا لەمن دەکات پرۆسەی مۆدێرنە لە عێراقدا بە "مۆدێرنەیەکی چەکدار" لەقەڵەمبدەم.

هەوڵدانی گۆڕان، یاخود بەرهەمهێنانەوەی کۆمەڵگایەکی مۆدێرن لەسەر مۆدێلی خێڵێکی چەکدار، یاخود سەربازگەی، کە ئەمرو نەهییەکانی دەسەڵاتێکی کاریزمی قبووڵبکات، ئەو خاڵەیە لە عێراقدا بیۆسیاسەتی گۆڕیوە بۆ ساناتۆسیاسەت و دونیایەک، کە تێیدا دەسەڵات لەسەر ژیان کاریکات، گۆڕیوە بە دونیایەک چنراو بە مەرگ.

-١٥-

کاریزما لە کۆمەڵگا هاوچەرخەکاندا تارادەیەکی زۆر بەرهەمێکە لەبەرهەمەکانی میدیا و هۆیەکانی ڕاگەیاندن، نەک بوونی کۆمەڵێک سیفەتی دیاریکرلو لە کەسێکی دیاریکرلودا. کاریزما کالایەکە وەک کۆی کالاکانی دیکەی کۆمەڵگای مۆدێرن. میدیای هاوچەرخ لەم ڕووەوە ڕۆڵێکی گەورە دەبینێت لەبەرهەمهێنان و گەشەکردنی ئەم پیشەسازیەدا. ئەم میدیایە توانای ئەوەی هەیە پیاوکوژێک وەک کەسایەتیەکی کاریزمی گەورە، ترسنۆکترین ئینسان وەک پالەوان و گەمژەیەک وەک زانایەکی گەورە لەکات و ساتی پێویست و بۆ مەبەستی دیاریکرلو، پێشکەشبکات. ڕۆشنبیرانیش تا ڕادەیەکی زۆر ڕۆڵێکی گەورە لە بەرهەمهێنانی ئەم مەهزەلە کاریزمییەدا دەبینن، ڕۆشنبیران دێن بۆ ئەوەی ئەو وێنانە دروستبکەن، کە کاریزما پێویستی پێیانە، ئەو حیکایەتانە بگێڕنەوە، کە ئەسڵ و رەگەزێکی پیرۆز بە کاریزما دەدەن. هەموومان دەزانین چۆن لە هەشتاکانی عێراقدا شاعیرەکان دیوانە شیعرەکانیان پێشکەش بە سەدام حوسەین دەکرد، چۆن ڕۆماننووسەکان ڕۆمانیان لەسەر ژیانی سەرۆک و قارەمانیەتییە گریمانکرلوەکانی دەنوسی، بە چاوی خۆمان بینیمان چۆن نووسەرە چەپەکان شەجەرەی سەرۆک و نەسەبی خێزانەکەیان دەبردەوە سەر ئیمامی عەلی. لە هەشتاکاندا بینیمان چۆن تەنانەت هێزەکانی ئۆپۆزیسیۆن قسەیان لەوەدەکرد "سەرۆک حەکەمە" نەک "لایەنێک" لە تاوانەکاندا. تا لەمخالەدا کەنعان مەکییە سەد دەرسەد ڕاستدەکات، کە بێدەنگبوونی ڕۆشنبیران لە بەرامبەر تاوانەکاندا، تا نەک بێدەگنبوونیان بەڵکو بەشداربوونیان لە بەهێزکردنی پایەکانی دەسەلاتی کاریزمیدا، ڕۆڵێکی گەورەی لە پایەدارکردنی ئەم دەسەلاتەدا بینیوە. بەم مانایە ڕۆشنبیران ڕاستەوخۆ لەگەمەی جینۆسایدەوە ئالاون.

پیشەسازی بەرهەمهێنانی سەرکردە و بەرهەمهێنانی سەرۆکی کاریزمی وەک

زۆریەی پیشەسازییەکانی دیکە بەرهەمی کۆمەڵگای مۆدێرن و ئەو ئەگەر و توانایانەیە ئەم کۆمەڵگایە هەڵگریەتی. کاریزمای نوێ کاریزمایەکە بەتەکنیکەکانی چاودێری و گەمەی ڕاستەوخۆی دەسەڵات لەسەر ژیان کاردەکات، ئەم کاریزمایە کاریزمایەکە لەپاڵ کۆی دەسکەوتی تیۆرە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییە نوێیەکاندا کاردەکات و هاتۆتەسەر ئەو خەزێنە زانستییەی ئینسانی نوێی لەڕێگاوە دەستەمۆکراوە، لە سایکۆلۆیژیاوە بۆ سۆسیۆلۆژیا و لە زانستی کارگێڕی و زانستی ئۆرگانیزاسیۆنەوە، بۆ زانستی پەیوەندیکردن و کۆی دەسکەوتەکانی تری زانستە ئینسانییەکان .

لە مێژووی هاوچەرخدا بەشێکی گرنگی دەزگا و پرنسیپەکانی مۆدێرنە لەلایەن دەسەڵاتی کاریزمییەوە وزەی کارکردنیان وەرگرتووە. ناسیۆنالیزم، فیکرەی دەوڵەتی نەتەوە، بیرۆکەی سەروەری (السیادە)، کە قورئانی سیاسی و مانیفێستی سەرەکی مۆدێرنەن، لەڕووی مێژووییەوە لەزۆر حاڵەتدا سەرکردە کاریزمییەکان پیادەیانکردووە. لە "بسمارک " ەوە بۆ "دیگۆڵ" و لە "گاندی" ەوە بۆ "عەبدولناسر"، کاریزما فۆرمێکی گرنگی کارکردنی ئۆرگانی دەسەڵاتبووە لە ناو کۆی پێکهاتی دەسەڵاتی مۆدێرندا. کێشەی سەرەکی لێکدانەوەکانی فۆکۆ بۆدەسەڵات لە پشتگوێخستنی ئەم ڕەهەندە گرنگ و ترسناکەی دەسەڵاتی مۆدێرنەدایە. بێگومان مۆدێرنە کەدێت لۆژیکی کارکردنی دەسەڵاتی کاریزمی ڕاستەخۆ گرێدەدات بەلۆژیکی مۆدێرنە خۆیەوە، بەمانایەکی دیکە کاریزما لەناو مۆدێرنەدا کاراکتەری دەگۆڕێت و دەبێت بەبەشێک لەکۆی پرۆژە و ئەگەرەکانی مۆدێرنە. بەحوکمی ئەوەی مۆدێرنە لەیەککاتدا دەشێت هەم سەرزەمینێکی ئاسودە و دیموکراس و خۆشگوزەران و هەم هۆڵۆکۆست و ئەنفالیش دروستبکات، بۆیە کاریزماش دەشێت هەم هەڵگری پرۆژەی وێرانکردنێکی سەرتاسەریبێت هەم پرۆژەی بنیادنانێکی عەقڵانی، کە تێیدا دەسەڵاتی کاریزمی خۆی خۆی بخاتە ژێر

میکانیزمی چاودێرییەکی کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە. بەڵام هەمیشە نموونەی دووهەمیان کەمتر و دەگمەنترە لەکاتێکدا نموونەی یەکەمیان تابڵێی زۆر و بەرچاوە. کاریزمای چاودێرینەکراو لۆژیکی دەسەڵاتەکانی دیکە تێکدەشکێنێت، کایەکانی دەسەڵات لەناوەوەڕا ڕووبەڕووی میکانیزمی دیکە دەکاتەوە، کە بەرهەمی ناوەکی کارکردنی ئەو کایانە خۆیان نین. ئەم دەستتێوەردانەی کاریزما بۆناو لۆژیکی کایەکانی دیکە ڕەنگە بەرەو ئەو تەفسیرە هەڵەیامان ببات واتێبگەین دەسەڵات بەتەنها لەسەرەوەڕا دێتەخوارێ و بەتەنها لەسەرەوەڕا کاردەکات. ڕاستە کاریزما دەتوانێت لۆژیکی کایەکان وێرانکات بەڵام ناتوانێت خودی کایەکان دروستبکات. ئەوەی کایەکان دروستدەکات مۆدێرنە و لۆژیکی مۆدێرنەیە، مۆدێرنە دێت و پرۆژە و فۆرمە جیاوازەکانی دەسەڵات لەگەڵخۆیدا دەهێنێت، بەڵام دواجار کام پێکهاتی دەسەڵات دروستدەبێت و کام شێوەی کارکردنی دەسەڵات هەیمەنە پەیدادەکات، ئەمەیان ولەبەستەی ئەو هەلومەرجە مێژوویی و کۆمەڵایەتی و سیاسییەیە، کە لە ساتەوەختێکی دیاریکراوەدا هیرارکیەتێکی دیاریکراوی ڕیزبوونی دەسەڵاتاکان، دروستدەکات. دەسەڵات نە لەسەرەوەڕا نە لەخوارەوەڕا دروستدەبێت و کاردەکات، بەڵکو لەهەموو شوێنێکدا و بەهەموو ئاراستەیەکدا دروستدەبێت و کاردەکات، بێگومان هەر ساتەوەختێکی مێژووی و هەر پێکهاتێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی ڕیزبەستن و دابەشکردنێکی تایبەتی دەسەڵات بەرهەمدەهێنێت و فۆرمێکی دیاریکراوی پەیوەندی لەناو دەسەڵاتەکاندا دروستدەکات.

ئێستا دێمە سەر وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەی، کە پێشتر دەربارەی چۆنیەتی ڕیزبەستنی دەسەڵاتەکان کردم. بۆئەوەی دەسەڵاتێکی جینۆسایدیمان هەبێت دەبێت دەسەڵاتی کاریزمی بەشێوەیەک بەهێز و پارێزراوبێت بتوانێت لۆژیکی کایەکان تێکبدات. (بۆ نموونە کردنی نائیب عەریفێک بە سەرۆکی سوپا نموونەی تێکدانی لۆژیکی کایەی سەربازییە، بەپێی لۆژیکی ناوەکی ئەم کایەیە دەبێت

شارەزاترین و لێزانترین جەنەراڵ ئەو پۆستە وەربگرێت، نەک نائیب عەرفییێک، کە سەرۆک، یان حیزبەکەی سەرۆک دایبنێت. مەبەست لە تێکشکانی لۆژیکی کایەکان پیادەکردنی ئەمجۆرە سیاسەتەیە). دەسەڵاتی کاریزمی دەبێت نەهێڵێت دەسەڵات لە ئیشکردنیدا لەسەر ژیان ئەو میکانیزمانە دروستبکات، کە ژیان لە گەمە پرمەترسییەکانی کاریزما بپارێزێت. بێگومان هەیمەنەی کاریزما بەپلەی یەکەم مانای غیابی کۆمەڵگا لە بەشداربوون لە مەسەلەی دابەشکردن و چاودێریکردنی دەسەڵاتدا. مانای دانانی ئیرادەی سەرۆکەکان لە شوێنی ئیرادەی کۆمەڵگا، دانانی مافی سەرۆک بۆ کوشتنی خەڵک لە شوێنی مافی کۆمەڵگا بۆ ژیان. هەموو ئەمانەش مانای ئیفلیجکردنی توانای کۆمەڵگا لە مەسەلەی ئۆرگانیزەکردنی خۆیدا و ئیفلیجکردنی ئۆرگانە کۆمەڵایەتییەکان لە هەڵبژاردنی فۆرمی تایبەتی خۆیاندا.

لە عێراقی قۆناغی ئینتیداب و ئامادەگی ناڕاستەوخۆی دەسەڵاتی کۆلۆنیالیزمدا دەسەڵاتی کاریزمی ئەو شوێنەی نەبوو، کە لە عێراقی قۆناغی دوای کۆلۆنیالیزمدا پەیدایکرد. ئەزموونی بەعس لە عێراقدا ئەزموونی بە سەروەرکردنی دەسەڵاتی کاریزمییە، ئەزموونی خولقاندنی هەیمەنەیەکی دەستکردە لە دەرەوەی هەر رێکەوتنێکی کۆمەڵایەتیدا. ئەم هەیمەنەیە بەپلەی یەکەم هەیمەنەیەکە ڕاستەوخۆ لەو سیاسەتی پیادەکردنی مردنەوە دێتەدەر، کە کاریزما هەموو کۆمەڵگای رووبەڕوو دەکاتەوە. بەعس داهێنەری گەمەی کوشندەی کاریزمایە لەناو کایە مۆدێرنەکانی دەسەڵاتدا. بەعس ئەندازیاری وێرانکردنی لۆژیکی ناوەکی کایەکانی دەسەڵات و فرێدانەوەی سەرچاوەکانی دەسەڵاتە بۆناو جەستەی سەدام و ئامادەگی فیزیایی سەدام و ئەو سەدان و هەزاران سەدامۆچکانەی بەعس بەدرێژایی مێژووی خۆی بەرهەمیهێنابوون. ڕەنگە لەم خاڵەدابێت تاوانەکانی قۆناغی کۆلۆنیالیزم لە تاوانەکانی سەردەمانی دوایکۆلۆنیالیزم جیابکەینەوە. لە قۆناغی کۆلۆنیالیزمدا تاوانەکان بەرەنجامی تووڕەبوونی دەوڵەت بوون لەوانەی پرسیاریان

بەرامبەر شەرعیەتی دەولەت هەبوو، بەلام تاوانەکانی سەردەمانی دوایکۆلۆنیالیزم تاوانێکن بەرەنجامی تورەبوونی کاریزمایە لە دونیا، کاریزمایەک لە رووی کۆمەلایەتییەوە هەلگری پرۆژەی سەپاندنی دەسەلاتی ئەو گروهەیە، کە لە قۆناغی دوایکۆلۆنیالدا بوونە گروهی بالادەست و دەولەت و دەزگاکانی دیکەیان گرتەدەست. لەسەردەمانی ئەنفالدا دەسەلات لە عێراقدا کورتبوبوەوە بۆ ئەمر و نەهییەکانی سەرۆک و ئەوانەی لە دەوروبەری سەرۆکدابوون، هیچ دەزگایەک، گروپێک، ناوەندێکی یاسایی، سیاسی، فەرهەنگی نەبوو بتوانێت پرسیارێک بەرامبەر مۆنۆپۆلیزەی دەسەلات و پرۆژەی سەرتاسەرانەی چاودێریکردن و کۆنترۆلکردنی رووکارە جیاجیاکانی کۆمەلگا بکات. کاریزما بەیارمەتی شێوە نوێیەکانی دەسەلات لە سەردەمانی ئەنفالدا دونیایەک لە کۆیلەی دروستکردبوو، کە ئەمری جینۆسایدییانەی سەرۆکەکانیان پیادەدەکرد.

-١١-

وەک وتم لە عێراقی هەشتاکاندا ئەو فۆرمەی دەسەلات، کە هەیمەنەی بەسەر فۆرمەکانی دیکەی دەسەلاتدا هەبوو بریتیبوو لە دەسەلاتی کاریزمی. کاریزما لۆژیکی ناوەکی هەموو کایە و پانتاییەکانی دەسەلاتی لەناوەوەرا بەشێوەیەک گۆڕیبوو، کە زەحمەتە قسە لەبوونی کایە بەمانا زانستییەکەی بکەین. لەساتەوەختی ئەنفالدا کاریزما و دەسەلاتی کاریزمی بەو مانایەی لەسەرەوە باسمکرد بەتەواوی کۆی کارکردنی فۆرمەکانی دیکەی دەسەلاتی کۆنترۆلکردبوو. ئەو کایەیەی دەسەلات ڕاستەخۆ کاریزمای بەرهەمنەدەهێنایەوە، یان لانیکەم ئەو هەلومەرجەی فەراهەم نەدەکرد، کە کاریزمای تیادا بەرهەمبێتەوە، وێراندەکرا.

لێرەوە هەموو عێراق کرابوو بە گۆڕەپانێک بۆ بەرهەمهێنانەوەی دەسەڵاتی سەرۆک و هەموو ئەو ئامرازانەی سەرۆکیان وەک تاقە دەسەڵات پێناسەدەکرد. بێگومان سەرۆک تەنها فەردێک نییە و کۆتایی پێبێت، بەڵکو ئەو قسەکەر و ڕەمز و پارێزەری دەسەڵاتی گروهێکی کۆمەڵایەتییە، کە دونیا لەسنووری قازانجەکانی خۆیەوە نەبێت نایەوێت، یاخود ناتوانێت، ببینێت. لێرەوە تێکدانی لۆژیکی کایەکان بەرهەمی پرۆژە و بەرنامەیەکی سیاسی کۆمەڵایەتییە، کە گروهی باڵادەست و حاکم لە عێراقدا پیادەی دەکرد. با لێرەدا تێکشکانی لۆژیکی کایەی عەسکەری لە عێراقدا وەک نموونەیەک بهێنینەوە. ئەگەرچی کایەی عەسکەری کایەی باڵادەستی دەسەڵاتبوو لە عێراقدا بەڵام لۆژیکی کارکردنی ئەو کایەیە لۆژیکێک بوو لەدەرەوەڕا کاریزما بەسەریدا سەپاندبوو، نەک لۆژیکی ناوەکی کایەکە خۆی. هیرارکیەتی پلەکانی دەسەڵات هیرارکیەتێک بوو وابەستەی یاساکانی کایەی سەربازی نەبوون، بەڵکوو وابەستەی ئەو داخوازیانەبوون، کە دەسەڵاتی کاریزمی لەدەرەوەڕا دەیسەپاندن. بۆنموونە بڕیارێکی دەرەکی لەدەرەوەی کایەی سەربازییەوە دەهات و عەریفێکی لەشەو و ڕۆژێکدا بەرزدەکردەوە بۆ پلەی وەزیر.

ئاشکرایە عێراقی هەشتکان عێراقی کۆمەڵگایەکی مۆدێرن بوو. مۆدێرن بەو مانایەی هەموو ئەو ڕەگەزە سیاسی و کۆمەڵایەتی و دەزگایی و مەعریفی و تەکنیکییانەی مۆدێرنە بەرهەمیاندەهێنێت لە هەناوی ئەو کۆمەڵگایەدا ئامادەبوون. لەئاستی سیاسیدا فیکرەی دەوڵەتی نەتەوە و مەسەلەی سەروەری و فیکرەی دانیشتوان و ئۆرگانە حیزبییەکان لەئارادابوون، لەئاستی کۆمەڵایەتیدا هەموو ئەو هێزە نوێیانە ئامادەبوون، کە مۆدێرنە دەیانخولقێنێت، هەر لەکرێکارانەوە بیگرە تا ئەو گروهە سەربازی و گروهە ئەکادیمییانەی دەشێت هەم خەونی بەسەربازگەکردن و هەم خەونی بەمەدەنیکردنی کۆمەڵگا ببینن، لەئاستی مەعریفیدا دەیان زانکۆ و دەزگای لێکۆڵینەوە هەبوون و چەندان تیۆرە و بۆچوونی جیاواز لەئارادابوون، کە مۆدێرنە

دروستیکردبوون، لەئاستی تەکنیکیدا بەدەیان کارگە و ناوەندی بەرهەمهێنانی پیشەسازی مۆدێرن لەئارادابوون، کە دەیانتوانی دواهەمین چەکی کوشندە بەرهەمبهێنن و بەرهەمیشیان دەهێنا. کاریزما لەناو ئەم دونیا مۆدێرنەدا سیاسەتی مەرگی پیادەدەکرد.

-١٣-

لەهەشتاکاندا و بەتایبەتی لەڕۆژگاری ئەنفالدا جگە لەدەسەڵاتی کاریزمی، کە لەهەموو شوێنێکدا سەدان بەچکەی بچووکی لەسەر وێنەی کاریزمای یەکەم، سەدام حوسەین، هەڵهێنابوو، لەهەمانکاتدا دەسەڵاتی چاودێریکردن و کۆنترۆڵکردنی بەناو یەکە بە یەکەی خانەکانی جەستەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای عێراقیدا ڕۆچوبوو. بەبۆنەی جەنگی ئێران و عێراقەوە دەوڵەت زیاتر لەهەرکات دەستی خستبوە ناو ژیانی بایۆلۆژی ئینسانی عێراقیەوە، هەموومان لەبەرچاوی دەوڵەت و دەزگاکانی حوکمڕانیدا بوونەوەرێکی بینراو و دیاربووین. ڕاپەڕین ئاشکرایکرد چۆن دەزگاکانی ئەمن هەموو کۆمەڵگای عێراقیان لەناو فایلەکانیاندا کۆکردبوەوە و زانیاری زۆر وردیان لەسەر زۆربەی هەرەزۆری خەڵکی عێراق کۆکردبوەوە. لەڕاستیدا خەونی بە سەربازگەکردنی کۆمەڵگا و بەرهەمهێنانەوەی لەسەر مۆدێلی سەربازگە بەبێ بەرهەمهێنانەوەی کۆمەڵگا لەناو فایلەکاندا کارێکی مەحاڵە، ئەم خەونەبوو وایکردبوو بیرۆکراتیەت لە عێراقدا وێنەی ئەژدیهایەکی گەورە وەربگرێت، کە بتوانێت کۆمەڵگای عێراقی قووتبدات.

لەهەشتاکاندا بەعس لەهەمووکات زیاتر لە هەوڵی پیادەکردنی خەونی بە سەربازگەکردنی عێراقدا بوو. ئاخر لە هەشتاکاندا مۆدێرنە هەزاران دەرچووی

زانکۆ و خوێندەوار و هێزی مۆدێرنی تری دروستکردبوو، مۆدێرنە ژمارەیەکی زۆری خەڵکی عێراقی ڕووەو شارەکان ڕاپێچکردبوو و کەم تازۆر لەو ئینتیما تەقلیدییانە ڕزگاریکردبوون، کە بەر لە مۆدێرنە لەناویاندابوون، لە هەشتاکاندا هێزە مەدەنییەکانی عێراق لەهەمووکات زیاتر بە ژمارە گەورەتربوون. لە هەشتاکانا مۆدێرنە هەموو شێوەکانی جیاوازیی لە کۆمەڵگای عێراقیدا بەرهەمهێنابوو، لە جیاوازی کار و پیشەوە بیگرە، بۆ جیاوازی شوناس و دید و بۆچوون و ئارەزوو و چێژ. ئەم هەموو گۆڕانانە پێویستیان بە دۆزینەوەی کەناڵی تەعبیرکردن لەخۆیان هەبوو، پێویستیان بە بەخشینی فۆرم بوو بە ژیانیان، پێویستیان بە خۆڕێکخستن و خۆکۆکردنەوە هەبوو، بەکورتی پێویستیان بە شێوەیەک لە شێوەکانی دەسەڵات هەبوو و دەیانویست بەشداربن لە پرۆسەی بڕیاردانی کۆمەڵایەتیدا. بەعس نەیدەویست هیچیەکێک لەم داواکاریانە وەدیبێنێت، بەدیهێنانی ئەم داواکاریانە پێویستی بە پرۆژەی سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی دەسەڵات هەبوو، پێویستی بە فراوانکردنی سنووری نوخبەی حاکم هەبوو، پێویستی بە کردنەوەی دەرگاکانی گەشەکردن و هەڵکشانی کۆمەڵایەتی هەبوو. بەعس هەموو ئەمانەی وەک مەترسییەک دەبینی، لێرەوە لەباتی پیادەکردنی ڕیفۆرمی سیاسی و کۆمەڵایەتی، هەوڵی وێرانکردنی ئەو هێزانەی ئەدا و بە واقیعیش کەوتە وێزەیان بە ئامانجی لەناوبردنیان. جەنگە بەردەوامەکانی بەعس لەسەرێک لە سەرەکانەوە هەوڵدانی وێرانکردنی ئەم هێزانە و وێرانکردنی داواکارییە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانیانە. ئەنفال وەڵامی بەعسە بەرامبەر بەو داواکارییانە. چەندە کارێکە دژ بە کۆمەڵگای کوردی ئەوەندەش پەیامێکە بۆ هەموو کەس و لایەنێک لە عێراقدا. بۆیە ناکرێت ئەنفال تەنها وەک هێرشێک بۆسەر ژیانی لادێکانی کوردستان ببینین، بەڵکو لەڕاستیدا هێرشە بۆسەر هەموو نارەزاییەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و هەر پرۆژەیەک بیەوێت مەسەلەی دابەشکردنی دەسەڵات لە عێراقدا بهێنێتەکایەوە.

بێگومـــان بـــزوتنەوەی ناســـیۆنالیزمی کـــوردی، بەهەمـــوو بـــاڵ و لایەن و نوقسانییەکانیشیەوە، لە جەوهەردا هەڵگری پرۆژەی سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی دەسەڵاتە لە عێراقدا. چونکە ئەم بزوتنەوەیە هیچی نەوێت بڕێک لەدەسەڵاتی بۆ سەرکردەکانی بزوتنەوەکە دەوێت، ئەوەشی بەعس نایەوێت بیکات، مەسەلەی سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی ئەم دەسەڵاتە و بەشکردنیەتی لەگەڵ کەسی دیکەدا.

لە کوردســتاندا بەعــس هەمــان سیاســەت و هەمــان ســتراتیژی دابەشــنەکردنی دەسەڵاتی بەکاردەهێنا، بەعس نەیدەویست هێزە مۆدێرنەکانی کوردســتان خەونی مۆدێرنانەی خۆیان ببین و سەربەخۆ لە هێزە تەقلیدییەکانی کوردســتان کاربکەن. بەعــس نەیدەویســت پرۆســەی مــۆدێرنە ئینتیمــا تەقلیــدییەکانی ئینســانی ئــێمە تێکبشــکێنێت و لەشــوێنیدا ئینتیمــای نــوێ دروســتببێت. ئەو ســتراتیژەی بەعس لەڕێگەیەوە هێزە مۆدێرنەکانی کوردستانی ناچارانە بۆ نـاو هەنـاوی تەقلیـدییەت و هەناوی خێڵ گەڕاندەوە بریتیبوو لە دروستکردنی سیستمی موستاشارەکان. بەعس بە دروســتکردنی ئەم سیســتمە تــوانی هەزاران دوکتــۆر و پــارێزەر و ئەنــدازیار و دەرچــووی تــری زانکۆکــان تەســلیم بەســەرۆک خێڵەکــان بکــاتەوە و لەڕێگــای ئەوانیشەوە کۆنترۆڵیانبکات. سیستمی موستەشارەکان بەتەنها کۆکردنەوەی خەڵک نەبوو لە ئـامێزی ســەرەک خێـڵ و هێـزە تەقلیدییەکانـدا بەمەبەسـتی خۆپارسـتن لەوەی بدەنە پاڵ هێزەکانی ئۆپۆزیسیۆن، ئەم سیستەمە ئەو ســەرزەمینەش بــوو، کە تیایدا زۆربەی هێـزە مۆدێرنەکـانی تەسـلیم بە سـەرک خێـڵ و ئاغـا و فیـوداڵە کۆنەکان کرایەوە. بێگومـان ئەمە تـاقە سیاسـەتێک نەبوو بەعـس لە کوردسـتاندا پەیڕەوییدەکرد، چونکە بەعس بەدرێژایی مێژووی خۆی وازیَ لەو سیاسـەتی ترسـە نەهێنابوو، کە ڕۆژانە لە کوردستاندا پیادەی دەکرد. لەناوبردنی فیزیایانەی خەڵک و گـــروهە ناڕازییەکـــان نەگـــۆڕێکی بەردەوام بـــوو لە سیاســـەتەکانی بەعســـدا لە کوردســتاندا، هەم لەڕێگـای جەنگـی ئێـران و عێـراقەوە هەم بەهـۆی ئەو جەنـگە

دڕێژخایەنەی ترەوە، کە بەعس لە کوردستاندا دژ بە کورد بەرپای کردبوو.
کێشەی سەرەکی لە عێراقی هەشتاکاندا لەوەدایە کاریزما هیچ هێز و توانایەکی ڕەخنەیی لای هیچ گروهێکی کۆمەڵایەتی نەهێشتەوە، بەتایبەتی لای ڕۆشنبیران. کەمنەبوون ژمارەی ئەو ئایدیۆلۆژیست و کۆلۆمیست و شاعیر و نووسەر و ئەکادیمییانەی کاریزما و سەروەری کاریزمایان بەرهەمدەهێنایەوە. لەهەمانکاتیشدا ماشێنی گەورەی بیرۆکراسییەت تادەهات ئینسانی عێراقی ڕووتدەکردەوە لەهەر هەستێکی ئەخلاقی و نائینسانترین کاری بە ناوی واجبەوە پێ جێبەجێ دەکردن. ئەم دۆخە لەناو لەشکری عێراقیدا لە چڵەپۆپەدابوو، بەناوی جێبەجێکردنی فەرمانەکانی سەرکردایەتی حیزب و دەوڵەتەوە سەربازەکانی سوپای عێراقی خوێنی هەزاران هەزار قوربانی بێگوناهیان دەڕشت. بیرۆکراسییەت پانتایی وەسوەسە و دوودڵی ویژدانی بەرامبەر بە بڕیارەکان کەمکردبووەوە، لەڕاستیدا بیرۆکراسییەت چووبووە شوێنی ئەخلاق خۆی و مەسەلەی مەرگ و لەناوبردنی ئینسان کورتبوویووەوە بۆ کۆمەڵێک فەرمان و ئیجرائاتی ئیداری سادە، کە کەس خۆی بەرامبەریان بە بەرپرسیار نەدەزانی. ئەم پێکهاتەیەی دەسەڵات و ئەو هەلومەرجە ئەخلاقی و سیاسییە بوو ئەنفالی خولقاند، ئەنفال ئەو وێرانەیەیە، کە دەسەڵاتی کاریزمی لە سەر پایەکان و تواناکانی دەسەڵاتی مۆدێرن خولقاندی، دەسەڵاتێک هیچ پەیوەندییەکی بە گەمەی پاراستنی ژیانەوە نەمابوو و ڕاستەخۆ لەسەر مەرگ و لەڕێگای مەرگەوە کاریدەکرد. ئەو سیاسەتەی ئەنفالی خولقاند سیاسەتێک بوو سەرزەمینی بیۆسیاسەتی بەجێهێشتبوو و ڕاستەوخۆ لەناو تاریکستانەکانی ساناتۆسیاسەتدا نووقمبووبوو.

-١٣-

دەسەڵاتی کاریزمی وایکردبوو دەوڵەتی عێراقی ببێتە دەوڵەتێکی ڕاسیستی. بەڵام ئەم ڕاسیزمە ڕاسیزمێک نەبوو دونیا لەسەر بنەمای ڕەگەز و خوێن دابەشکبات، بەڵکو لەسەر بنەمای دابەشکردنی "یان ئێمە"، یان "دژی ئێمە"، یان ئەوانەی سەرۆکیان دەوێت بەرامبەر ئەوانەی سەرۆکیان ناوێت، دونیای دابەشدەکرد. ئەم دابەشکردنە شاقوڵییەی نێوان دەوڵەت و دەرەوەی دەوڵەت بەتەنها دابەشکردنێکی ئایدیۆلۆژی نەبوو، بەڵکو دابەشکردنێکیش بوو ڕەگەکانی لەناو میکانیزمێکی قوڵتری ئۆرگانیزەکردنی کۆمەڵگادا بوو، کە لەسەر بنەمای قبووڵکردنی پێناسەکانی دەوڵەت بۆ خۆی و بۆ دونیای دەرەوەی خۆی دروستبوویوو. بەڵام دەوڵەتی عێراقی لەهەشتاکاندا بەتەواوی کورتبوویووەوە بۆ دەوڵەتی گروپی حاکم و سەرلەبەری کۆمەڵگای عێراقی کرابوون بەڕەعیەتێکی دەست لەسەرسنگ و گوێڕایەڵی دەوڵەت. لەپاڵ ئەمەشدا لەهەشتاکاندا دەزگانی دەوڵەت بەجۆرێک گەشەیانکردبوو سەرلەبەری کۆمەڵگای عێراقیان خستبووە ناو چوارچێوەی سنووری تواناکانی چاودێریکردنی دەوڵەت خۆیەوە، لەهەشتاکاندا پانتاییەکی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی نەمابوو دەوڵەت ئاڵاکانی خۆی تیا هەڵنەکردبێت. گەشەی کۆمەڵگا و گەشەی دەوڵەت یەک پرۆسەبوون، ئەمەش بوویووە هۆی ئەوەی کۆمەڵگا نەتوانێت لەدەرەوەی دەوڵەتدا هەناسەی سەربەخۆی خۆیبدات. لێرەوە ئەخلاقیەتی بیرۆکراسیەتی دەوڵەتی چوویووە شوێنی ئاکار و مۆراڵی سەربەخۆی کۆمەڵایەتی. بیرۆکراسییەت و ئەو ڕۆحی تەسلیمبوونەی بیرۆکراسییەت و، ئەو سنوورەی بیرۆکراسییەت بۆ بەرپرسیاریەتی ئینسان و، ئەو هیرارکیەتەی بیرۆکراسییەت بۆ ئاستەکانی دەسەڵاتدارێتی دروستیدەکات ڕاستەوخۆ لەناو دەزگاکانی دەوڵەتەوە گواسترابووەوە بۆناو کۆمەڵگا. فیکرەی واجب و قبووڵکردنی

ئەمر و نەهییەکانی ریزەکانی سەرەوەی هەرەمی بیرۆکراسی لە ناو دەزگاکانەوە، گواسترابوونەوە بۆ ناو مۆراڵی کۆمەڵایەتی. بۆیە لە هەشتاکاندا سەرباری ئەو هەموو کوشتن و سوکایەتیکردنە بە ژیان، کەچی ئاستی بەرگری دژ بەدەوڵەت لەوپەڕی لاوازیدابوو.

بەڵام دەبێت لێرەدا هێما بۆئەو ڕاستییەش بکەین، کە بەعس لە تەکتیکی بەرەنگاربوونەوەی مۆدێرنە و هێزەکانی مۆدێرنەدا بەردەوام پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکانی بەر لە مۆدێرنەی زیندوودەکردەوە و بەهێزتریدەکردن، هەروەها شەڕی ئێران و عێراقیش بەعسی بەرەو گەڕانەوەیەکی دیماگۆگییانە بەرەو ئایین بردەوە. ئەمانە وایانکردن گەڕانەوە بۆ سەرزەمین و دونیابینی و فانتازیاکانی بەر لەمۆدێرنە لە هەشتاکاندا کارێکی ئاسایی و تاڕادەیەکیش لەڕووی ئایدیۆلۆژییەوە ئافەرینلێکراوبێت. ڕەنگە هەڵبژاردنی ناوی ئەنفال بۆ ناونانی ئەو سیاسەتی جینۆسایدەی بەعس بەرامبەر بە کورد پیادەیکرد باشترین نموونەیەک بێت ئەم سیاسەتە نوێیەی بەعس نیشانبدات. گەڕانەوەی بەعس لە هەشتاکاندا بۆ ئایین و بۆ پەیوەندییە تەقلیدییەکان بە مەبەستی هەرچی زیاترکردنی چاودێری و سانسۆری کۆمەڵایەتی بوو. بەعس دەیزانی چیدی ناتوانێت 'خۆشگوزەرانی ڕێژەیی ئابووریی' بەر لە جەنگ بۆ خەڵک دابینکات و ئابووری عێراق ئەو توانایەی نەماوە بەعس چۆنیبوێت وا هەڵسوکەوتی لەگەڵدابکات، بۆیە بەکارهێنانی ئایین و گەڕانەوە پەیوەندییە خێڵەکی و سەرەتاییەکان ئەو هەلەی بۆ بەعس دەڕەخساند لەڕێگای ژمارەیەکی کەمی پیاوانی ئایین و سەرۆک خێڵ و عەشیرەتەکانەوە، ئەو لەشکرە برسییەی پەیدادەبێت، کۆنترۆڵبکات. ئەنفال لەیەک کاتدا بەرهەمی ئەو پێکهاتە دەسەڵاتییەی مۆدێرنە و ئەو بەکارهێنانە تایبەتانەی ڕەگەزەکانی بەرلەمۆدێرنەیە، کە بەعس بۆ سەپاندنی هەیمەنەی خۆی مامەڵەی کێشەی نەتەوایەتی کوردی لە عێراقدا پێکردووە.

بەکورتی ئەنفال چەندە بەرهەمی دەسەلآتێکی مۆدێرنە کەلەسەر پایەکانی تەکنۆلۆژیای تازە و سیستمی بیرۆکراسییەت و بوونی ئامار و ئامادەگی زانست و میتۆدی مۆدێرن کاردەکات، لەهەمانکاتدا لەگەڕانەوەیەکی بەردەوامیشدایە بۆ ئەو فەزا سەلەفییە دینی و ئەخلاقیەیی شەرعیەتێکی دینی و ئەخلاقی بە پیادەکردنی ڕوداوەکانی ئەنفال دەدات و لاشەی قوربانییەکان وەک جەستەیەکی بێئیمان پێناسدەکات. لە پشتی ئەم ستراتیژەوە ئەو ئیرادە سیاسییە ئامادەیە، کە دەخوازێت کۆمەڵگا لەسەر مۆدێلی سەربازگە، یاخود لەسەر مۆدێلی خێڵێکی چەکدار بەرهەمبهێنێتەوە. ئەم ستراتیژەش ستراتیژی ئینکارکردنی هەموو جیاوازییەکانە، لە جیاوازی نەتەوەییەوە بیگرە بۆ جیاوازی ئایینی و کولتوری و ناوچەیی، هتد...

-١٤-

لە هەشتاکاندا دوو میکانیزمی زۆر گرنگ لەعێرقدا بە بەردەوامی کاریاندەکرد:
یەکەمیان: میکانیزمی بەدەوڵەتیکردنی دەسەلآتە، واتە کردنی هەموو دەسەلآتێکە بە دەسەلآتی دەوڵەت و لەناوبردنی هەموو ئەو شێوانەی دەسەلآت، کە دەکەونە دەرەوەی دەوڵەتەوە، بۆنموونە لەناوبردنی دەسەلآتی دەزگا و دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بەشێوەیەکی هەمەلایەن. کۆکردنەوەی لەڕادەبەدەرەی دەسەلآت لە دەستی دەوڵەتدا وابەستەی ئەوەبوو دەوڵەتی عێراقی لە هەشتاکاندا چیدی نەیدەتوانی لە ڕێگای بەخشینی دەسکەوتی ئابورییەوە شەرعیەتی خۆی لە کۆمەڵگا بکڕێت. هەشتاکان لوتکەی قەیرانە ئابورییەکانی دەوڵەتە و خەرجی جەنگ و دابەزینی نرخی نەوت دەرامەتی ئابووری دەوڵەتی عێراقی تەواو

کزکربـــوو. لێـــرەوە ئەو "خۆشـــنوونگەراییە"ی، (Welfaresim)، دەوڵەت لە حەفتاکانـدا خولقانـدبووی، لە هەشـتاکاندا خەریـک بـوو لە دەسـتی ئەدا. تـاقە شەرعیەتێکیش بەعس دەسەڵاتی خۆی لەسەر بنیادنابێت خۆشنودی ئابووری بوو، لە کۆتایی هەشتاکاندا ئەم بەردەوامیـدان بەم سیاسـەتی خۆشـنوودییە کەوتە ژێـر پرسیارەوە، بەمەش هیچ زەمینـەیەک بـۆ شـەرعیەتی ئەم دەوڵەتە بێشـەرعیەتەی بەعس نەدەمایەوە، بۆیە تاقە ئامرازێک بۆ پاراستن و ڕاگرتنـی دەسـەڵاتی دەوڵەت لە سـەردەمانی لاوازی ئابووریـدا بریتیبـوو لە هەرچـی زیـاتری بە دەوڵەتیکردنـی دەسەڵات و هێرشی بەردەوامی دەوڵەت بوو بۆسەر کۆمەڵگای عێراقی.

دووهەم: میکـانیزمی بە کاریزمـاکردنی هەرچیزیـاتری دەسـەڵات. واتە بەخشـینی هەمـوو تواناکـانی دەسـەڵاتی دەوڵەت بە سـەرۆک و ئەو گـروپە کـۆمەڵایەتییەی سەرۆک و هەیـمەنەی سـەرۆک بەرهەمـدەهێننەوە. ئەم میکانیزمەیـان درێژکراوەی میکانیزمی یەکەمە. لێرەدا بەعس هەوڵدەدات لەڕێی شەخسی سەدام و 'کاریزما" ی سـەدامەوە ئەو بۆشـاییە پڕبکـاتەوە، کە لەدەسـتدانی خۆشـنونگەرایی ئـابووری دروستیکردبوو.

لە میکـانیزمی یەکەمیانـدا دەوڵەت هەوڵـدەدات هەمـوو شێوەکانی دەسـەڵات لە چوارچێـوەی خۆیـدا کۆبکـاتەوە و هەمـوو ڕووکـارە جیاوازەکـانی ژیـان بخـاتە ژێـر کۆنترۆڵ و چـاودێری خـۆیەوە، لە مەسـەلەی لەدایکبـوونەوە تـا مەسـەلەی مـردن. لەدووهەمیشیاندا خودی دەوڵەت خۆی دەبێـتە مـوڵکی سـەرکردە کاریزمییەکـان و ئارەزوو و سایکۆلۆژیای کاریزما دەبێتە ئارەزوو سایکۆلۆژیای دەوڵەت. هەرئەمەشـە گەمەکانی دەسەڵاتی چ لەسەر مەرگ و چ لەسـەر ژیـان دەبەسـتەوە بە ئـارەزوو و سایکۆلۆژیای پیاوانی کاریزماوە و فەرمانی کیمیابارانکردنی کوردستان لەسەر زاری تاوانبارێکی وەک عەلی حەسەن مەجیدەوە دەرکرا.

ئەنفـال ئەو هەڵەی بە بەعـس بەخشـی لەڕێگـایەوە ئەو شـێوە هەڵسـوکەوتە بە

کۆمەڵگای عێراقی و بێگومان بە کورد خۆشی نیشانبدات، کە بەنیازە لە قۆناغی دوای کۆتاییهاتنی جەنگی ئێران و عێراقدا بەرامبەر بەهەر نارەزاییەک پیادەیکات. لەرێی ئەنفالەوە بەعس نامەیەکی کراوەی بۆ هەمووان نووسی و لەوەی ئاگادارکردنەوە، کە بەعسی قۆناغی کۆتایی خۆشنودگەرایی، بەعسی جینۆسایدە، راستە بەعسێکە توانای ئابووری لاوازە بەڵام توانای کوشتنی بەکۆمەڵ و لەناوبردنی یەکجارەکی بەهێزە. بەعس بە دۆڕاندنی توانا ئابوورییەکەی، کە بە ناوی 'مونجەزات' ەو شەرعیەتی خۆی لەسەر بنیادنابوو، تاقە ئامرازێک بۆ مانەوەی خۆی بەدەستییەوەمابوو توندوتیژی بوو، ئەنفال نموونەیەکی ئەو توندوتیژییەبوو، کە بەعس دەیویست بە هەمووانی نیشانیبدات. بەبۆچوونی من ماناکانی جینۆساید لە عێراقدا لەم گەمە ترسناکەی دەسەڵاتدا پەنهانە، هەر خودی مانەوەی ئەم گەمەیشە بەبێدەستکاری لەم ساتەی ئێستادا وام لێدەکات لەو باوەڕەدابم لە ئاسۆکانی ئاییندەدا ئەنفالی دیکە هەبێت.

ئەم دەرەنجامە گەرچی بۆنی رەشبینییەکی گەورەی لێدێت بەڵام لەهەمانکاتدا لێدانی شووتی خەتەرێکە دەبێت بەرەو وریابوونێکی بەردەوامەمان ببات، ئێمە لەدونیایەکدا دەژین بۆنی جینۆساید تائێستاش لەهەموو سوچ و کون و قوژبنێکی هەڵدەستێت، نەک لەناو باخچەیەکدا، کە چاوەڕونی گوڵی ئەفسوناوی لێبکەین. گۆڕینی قەبرسانەکانی جینۆساید بە باخچە بە پاککردنەوەی ئەم دونیایە دەستپێدەکات لە ئەگەرەکانی جینۆساید، خودی ئامادەیی ئەو ئەگەری جینۆسایدەیە لە ئێستای کۆمەڵگای عێراقیدا وا لەمن دەکات بترسم، بەڵام بێگومان نائومێد نەبم.

-١٥-

لەکۆتاییدا دەڵێم بۆ تێگەیشتن و ناسین و ڕاڤەکردنی ئەنفال بەتەنها ناسینی بەعس بەس نییە. بەڵکو، بە پلەی یەکەم، پێویستمان بە خوێندنەوەیەکی سەرتاسەری پرۆسەی تازەبوونەوە لە عێراقدا هەیە. لەم وتارەدا من ئەم تازەبوونەوەیەم بە مۆدێرنیزەی چەکدار ناونا. ئەزموونی بەعس و ئەنفال ئەزموونی دەسەڵاتێکە نایەوێت سنوورەکانی خۆی بۆ هیچ دابەشبوونێک بکاتەوە. هەر گروهێکیش داخوازی کرانەوەی ئەو سنوورانەی هەبێت، یاخود بوونی ڕێگرێک بووبێت لەبەردەم داخستنی ئەو سنوورانەدا، لە دیدی بەعسەوە پێویست بووە لە ناو ببرێت. بێگومان ئەنفال ئامانجی دیکەشی هەبووە جگە لەوانەی تا ئێستا باسمانکردن، دەکرێت لێرەدا زۆر بە خێرایی باس لە هەندێکیان بکەین

١ـ ئەنفال ئەو هەلەی بە بەعس بەخشی ئەو چەکە کیمیاوییانەی کارخانە سەربازییەکانی ساڵانێکی درێژ خەریکی بەرهەمهێنانیبوون تاقیبکاتەوە.

٢ـ ترساندنی ئێران و ڕاکێشانی بۆسەر مێزی گفتوگۆ.

٣ـ لەناوبردنی یەکجارەکی بزوتنەوەی چەکداریی لە کوردستاندا و کۆتاییهێنان بە کێشەی کورد.

٣ـ تاقیکردنەوەی کاردانەوەی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی بەرامبەر بە کار و تەماحەکانی بەعس.

٤ـ ترساندنی هێزە ناوچەییەکان.

٥ـ خولقاندنی هەستکردن بە سەرکەوتن لای لەشکری عێراقی لەکاتێکدا بەدرێژایی جەنگی لەگەڵ ئێراندا نزیکەی ملوێنێک کوژرا و بریندار و سەقەتی دابوو.

بە کورتی دەشێت بۆ تێگەیشتن لە ئامانجەکانی ئەنفال زۆر هۆکاری دیکەش هەبێت من لەم نووسینەدا باسمنەکردبێت، بەڵام لە هەموو دۆخێکدا هەموو ئەو

**هۆکارانە لەناو ئەو پێکهاتەیەی دەسەڵاتدا دەستبەکاربوون، کە لەم وتارەدا بەدرێژیی باسمانکرد.**

## سەرچاوەکان

١ـ بەبۆچوونی باومان هۆلۆکۆست، یان بەکۆمەڵکوشتنی جولەکەکان، بەرهەمێکە لە بەرهەمەکانی مۆدێرنە نەک دەرەنجامی فەشەل، یان غیاب، یان پاشەکشەی مۆدێرنە. هۆلۆکۆست و کامپەکانی کوشتن، دیسپلینی سەرتاسەرییانەی کۆمەڵگا و دواتر ئەنجامدانی کوشتاری سیستماتیزەکراو، شتانێک نین لەدەرەوەی دونیای مۆدێرن و پرۆسەی مۆدێرنیزەدا بن، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەگەرێکن لە ئەگەرەکانی مۆدێرنە و بەشێکی ئۆرگانی دونیای مۆدێرنن. هۆلۆکۆست و جینۆساید دونیایەکن بەبێ مۆدێرنە نەدەخولقان، بۆیە هۆلۆکۆست تۆڵە نییە لە مۆدێرنە بەڵکو دانیشتووی ناوماڵی مۆدێرننە و ناو لۆژیک و ناو دەزگاکانی کۆمەڵگای مۆدێرنە. مەبەستی باومان لە مۆدێرنە کۆی ئەو بوونە تەکنۆلۆژی و بیرۆکراسی و ئایدیۆلۆژی و مۆراڵییەیە، کە پرۆسەی مۆدێرنە لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت. لەشکری مۆدێرن، دەوڵەت، جیهازی بیرۆکراسی، ئایدیۆلۆژیای ڕەگەزپەرستی و ڕاسیزمی عەقڵانیکراو، ناسیۆنالیزم لەهەموو چاپە فاشیستی و نازیەکانیدا، دەزگای زیندان، ئۆردوگاکانی کوشتنی بەکۆمەڵ، چۆنیەتی ئۆرگانیزەکردن و پۆلێنکردن و پێناسکردن، فەردانیەتی دەرەوەی بەرپرسیاریەت، شاردنەوەی سزلو گواستنەوەی بۆ ناو شوێنە نهێنیەکان، هەرهەموویان بەرهەمی مۆدێرنە و کۆمەڵگای مۆدێرنن، هەر هەموویان دەربڕی ڕووە تاریکەکانی مۆدێرنەن. باومان لەم بۆچوونەیدا بەقوڵی لەژێر کاریگەری

بۆچوونەکانی فۆکۆدایە بەتایبەتی لەکتێبی، کۆنترو سزادا. بڕوانە:
Zygmunt Bauman, Modemity and Holocaust Polity Press, Cambridge UK 1989

٢ـ دەوڵەتی هۆبزی بەو خاڵە لە دەوڵەتی (لۆک) ی جیادەکرێتەوە، کە لە یەکەمیاندا کۆمەڵگا لەدەرەوەی دەوڵەتدا ناتوانێت هیچ فۆرمێکی ڕێکخستنی ژیانی کۆمەڵایەتی دروستبکات لە کاتێکدا لە دەوڵەتی لۆکیدا کۆمەڵگا خۆی خۆی بەرهەمدەهێنێت و خۆی خۆی لە ناوەوەڕا بەڕێوەدەبات. لە یەکەمیاندا شتێک نییە بەناوی کۆمەڵگای مەدەنییەوە لەدەرەوەی دەوڵەتدا، لەکاتێکدا لە دووهەمیاندا کۆمەڵگای مەدەنی بە بەردەوامی چاودێری دەوڵەت دەکات. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:
Kees van der Pijl, wereldorde en Machtspolitiek: Visie op de Intemationale Betrekkingen van Dante tot Fukuyama Amsterdam, Het Spinhuis, 1992

٣ـ دەشێت لێرەدا ئەو پێناسەمان قبوولبێت، کە ئەنفال وەک هێرشێکی جینۆسایدییانە بۆسەر ژیانی لادێ و لادێنشینەکانی کوردستان دەبینێت. بەڵام نابێت ئەوەمان لەیادبچێت، کە ئەنفال مۆدێلێکی تایبەتی دەسەڵات لە پشتییەوە دەستبەکارە، کە وێرانکردنی ژیانی لادێ و لادێنشینەکان تەنها کارێک لەکارەکانی و دەرکەوتێک لەدەرکەوتەکانی زەبری کارکردنی ئەم دەسەڵاتەیە. ڕاستە ئەنفال لە ساڵی١٩٨٨ دا هێرشبوو بۆسەر لادێکانی کوردستان، بەڵام هیچ ڕێگرێک لەئارادا نییە ئەو لۆژیک و ستراتیژیەی لەپشتی ئەنفالەوە کاردەکات، فراوانەکرێت بۆسەر هێرش بۆسەر شوێنی دیکە و بەشی دیکەی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و جوگرافی لەکوردستاندا. گەر ئەو ڕاستییەمان قبوولکرد، کە ئەنفال دەسەڵاتێکی جینۆسایدی دروستیکردووە ئەوکات مەسەلەی ئەوەی کێ و کام گرووپ جینۆسایدەکرێت، مەسەلەی کات و شوێن و ڕێکەوتە، گرنگ ئەوەیە دەسەڵات لەم دۆخەدا

سروشتێکی جینۆسایدییانەی وەرگرتووە.

٤ـ بۆ پەیوەندی نێوان بیرۆکراسییەت و مۆراڵ بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو (zygmont Baumann 1989). لەچاوپێکەوتنێکدا باومان پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت گەر بهاتایە هیتلەر جەنگی ببردایەتەوە ئەوکات تاواناکانی هۆلۆکۆست و شێوەی ئۆرگانیزەکردنی بیرۆکراسییانەی بەڕێوەبردنی ئەو تاوانانە، وەک مۆدێلێکی سەرکەوتوی بەڕێوەبردن و کارگێڕی مامەڵەدەکران و بە ولنە دەوترانەوە و دەخوێنران. باومان دەیەوێت بڵێت، کە بیرۆکراسییەت دەشێت مۆراڵ تووشی ئیفلیجبوونی تەواوەتی بکات.

٥ـ بڕوانە: Alan Milchman and Alan Rosenberg: Mitchel Foucault: Auschwitz and modernity. Philosophy and Social criticism. No 1, 1996. P 101-113) لێرەدا ئەم دوو نووسەرە ئەو خاڵە گرنگانە دەستنیشاندەکەن، کە فۆکۆ لەسە ئەزموونی نازیزمی ئەڵمانی نووسیوە. بە باوەڕی ئەم دوو نووسەرە وێنەی ئەوشەفیتز، کەمپی بەکۆمەڵکوشتنی جولەکەکان، لە دیدی فۆکۆدا ئەو وێنە گرنگەیە، کە لەپشتی تیۆرەی دەسەڵاتی فۆکۆییەوەیە. فۆکۆ لە نازیزمدا ترۆپکی تێکەڵبوونی تەکنیکەککانی دیسپلین و سزای پێکەوە دەبینی. تێکەڵبوونێک، کە ئاراستەی دەسەڵاتی لەسەر کارکردنەوە لەسەر ژیان گواستۆتەوە بۆ سەر مەرگ. هەروەها بۆ لێکدانەوەیەکی تەولوی بۆچوونەکانی فۆکۆ دەربارەی شێوە جیاجیاکانی دەسەڵات بڕوانە:

Foucault, Discipline, Toezicht en Straf, De Geboorte va De Gevangenis. Historische Uitgeverij Groningen 1989 .

٦ـ مەبەست لە "کۆلۆنیالیزەی ناوەکی" لەوەیە، کە دەوڵەت پارچە جیاجیاکانی سەرزەمینێک، دیالێکتیکە جیاجیاکانی زمانێک، کەلتوور و لقە کەلتوورە جیاوازەکان لەسەرەوەڕا ناچاردەکات، کە یەکبگرن، یان ڕاستریڵێم زۆریەی

هەرەزۆریان لەناودەبات لە قـازانجی دروسـتکردنی یەک زمـان، یەک کەلتـوور، یەک کەلەپوور هتد.. هەندێکجار ئەم لەناوبردنانە ئەوەندە بەرفراوان و توونـدوتیژدەبێت، کە دەشێت بە کۆلۆنیالیزمێکی ناوەکی ناونووسبکرێت.

٧ـ دەوڵەت لە مەسەلەی خولقانـدنی ئەو وێـنە هاوبەشـەدا توندوتیژی و زەبرێکـی زۆری لەسەر کولتـور و گـروهە لۆکاڵییەکـان بەکارهێنـا بـۆ قبـوولکردنی ئەو وێـنە گشتییە، بەڵام ئەم مەسەلەی سەپاندنە زۆر جیاوازە لە مەسەلەی جینۆساید، یـان دەسـەڵاتێک لەبـاتی هاوشـێوەکردنی کۆمەڵگـا و دروسـتکردنی کۆمەڵگـا، پـرۆژەی وێرانکردنی کۆمەڵگا پیادەبکات.

٨ـ بڕوانە:

Kanan Makiya, Verzweg en Wreedheid, nationalism, dictatuur, opstand en het Midden _ Oosten. Bulaaq, Amsterdam 1993.

٩ـ بڕوانە:

Samir al-Khalil, Republic of Fear.Berkeley and Los Angeles. University of Califomia press, 1989.

١٠ـ بڕوانە:

Alan Milchman and Alan Rosenberg: Mitchel Foucault: Auschwitz and modemity. Philosophy and Social criticism. No 1, 1996. P (103)

١١ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٠١

جاڕی گەردوونی مافی مرۆڤ.

بانگەوازێکی گەردوونییە، یاخود بەرهەمێکی ڕۆژئاواییە؟

# جاڕی گەردوونی مافی مرۆڤ،

## بانگەوازێکی گەردوونییە، یاخود بەرهەمێکی خۆرئاواییە؟

-١-

پەنجا ساڵ لەمەوبەر، واتە ساڵی ١٩٤٨، هەشت دیپلۆمات لە پاریس پێکەوە کۆبوونەوە بۆ نووسینی ئەو دەقەی، کە داوتر ناوی "جاڕی گەردوونیی مافی مرۆڤ"ی لێنرا. ئەو هەشت دیپلۆماتە لە کیشوەر و وڵات و کولتوری جیاوازەوە هاتبوون. خەڵکی ئوسترالیا، چین، فەرەنسا، شیللی، بەریتانیا، لوبنان و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوون. ئەو هەشت کەسە بەدرێژایی دوو ساڵ خەریکبوون تا ئەو سی، (٣٠)، بەندەی بانگەوازەکەیان داڕشت، سی بەند، کە بەسەریەکەوە تەنها سێ لاپەڕەیەک دەبێت.
بە پێکهاتەی گروپی دیپلۆماتەکاندا دیارە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی هەر لەسەرەتاوە ویستویەتی ڕێ لەوە بگیرێت بانگەوازەکە وەک بەرهەمی کولتورێک، یان ئایینێک، یان کەلەپورێکی تایبەت تەماشابکرێت. پێکهاتەی گروپەکە، کە پێکهاتەیەکی

هەمەڕەنگە، هەوڵدانی ئەوکاتەی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی نیشاندەدات بۆ زامنکردنی گەردوونێتی و جیهانیبوونی دەقەکە، نەک بەندکردنی لە ناو سنووری شارستانیەتێک، یان کولتورێکی دیاریکراودا بەتەنها.

خوێندنەوەیەکی وردی بانگەوازەکە نیشانیدەدات نووسەرەکانی زۆر بەباشی ئاگاداری ئەوەبوون، کە هەلومەرج و توانای پیادەکردنی مافە نووسراوەکانی ناو بانگەوازەکە و کردنیان بە بەشێک لە "کولتوری سیاسی" دەوڵەتان و کۆمەڵگاکانی ئەو ڕۆژگارە، زۆر لاواز و کەم بووە. نووسەرانی بانگەوازەکە زانیویانە ئەو بەیاننامەیە هێزی ئەوەی نییە سیستمە سیاسیەکان ناچاربکات پەیڕەویبکەن، دەزگایەک، یان لایەنێک نییە بەزۆر و لەڕێگای هێزەوە بەندەکانی ئەو بەیاننامەیە بیسەپێنێت، هەروەها هێزی یاسایەکی سەپێنراویشی نییە، کە هەمووان ناچارین پەیڕەویبکەن، ئەو سێ لاپەڕە ڕووناکە جگە لە هێزێکی مەعنەوی خاوەنی هیچ لەشکر و چەک و زەبرێک نییە دیکتاتۆر و سیستمە سیاسییە ستەمگەرەکان ناچار بە ڕێزلێنانی بەندەکانی بکەن. هەربۆیە نووسەرانی بەیاننامەکە دەقەکەیان زیاتر وەک بەرنامەیەکی ئەخلاقی و وەک ئایدیالێک دارشتووە، کە مرۆڤایەتی خەبات بۆ پراکتیککردن و پیادەکردنی بکات، نەک وەک پرۆگرامێکی سیاسی. بێگومان دیپلۆماتەکان تەواو باوەڕیان بەوەبووە ئەم بەرنامەیە دەتوانێت ڕۆژێک لە ڕۆژان ببێتە بەرنامەیەکی ئەخلاقی گشتی و مرۆڤایەتی لەهەموو کاتێک و لەهەموو وڵاتێکدا بگەڕێتەوەسەری و پرنسیپەکانی پەیڕەو و پیادەبکات. بەکورتی نووسەرانی بەیاننامەکە ویستوویانە لەسەرێکەوە بەریەوەبگرن بەیاننامەکە وەک بەرنامەیەکی سیاسی ببینرێت و لەسەرێکی دیکەشەوە هەوڵیانداوە نەهێڵن لێکدانەوەی کولتوراليستانە بۆ بەیاننامەکە بکرێت و هێزە بان ـ کولتورییەکەی لاوازبکرێت. لەهەردوو بارەکەشدا نووسەرەکان ویستویانە بەپلەی یەکەم نرخە گەردوونییەکانی بەیاننامەکە بپارێزن.

لەگەڵ ئەو هەمـــوو هەوڵانەدا بـــۆ داڕشـــتنی بەیاننـــامەکە وەک بەڵگەنـــامەیەکی گەردوونـــی و ســـنووربەزێن، کەچـــی هەر لەســـاتەوەختی یەکەمـــی بڵاوبـــوونەوەیەوە کەوتۆتە بەر ڕەخنەی جۆربەجۆرەوە و لەلایەن چەندان دەستە و گروهـی و لایەنـی جیاجیاوە و بۆمەبەستی جیاواز، دژایەتیکرا. یەکەمـین ڕەتکـردنەوەی بەیاننـامەکە هەر لە لەکاتی یەکەمین پێشکەشکردنیدا لە نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٤٨ دا دروستبوو. هەشت وڵاتـی ئەنـدامی ئەوکـاتەی نەتەوە یەکگرتووەکـان خۆیـان لە دەنگدان کێشایەوە و بەیاننامەکەیان بە بەهانەی جیاواز ڕەتکردەوە. ئەو وڵاتـانەش بریتیبوون لە سعودیە و ئەفریقای باشوور و شەش وڵاتی بلۆکی سۆشیالیستی ئەو کاتە. وڵاتە سۆشیالیستییەکان، کە هیچ جۆرە ئـازادییەکی بڵاوکـردنەوە و ئـازادیی سیاسی و ئازادی بیرکردنەوە و مافە سەرەتاییەکانی تری هاووڵاتیانیان نەدەناسی، بانگەوازەکەیان بەو بەهانەیە ڕەدکردەوە گوایە بەرنـامەیەکی بۆرژوازییـانەیە و جـگە لە هەوڵدانێک بۆ "پاراستنی ئاسایشی سیستمی سەرمایەداری" هیچی تر نییە. ئەم وڵاتانە لەبـاتی ئـازادییە سیاسـی و کولتـوری و تاکەکەسـییەکانی نـاو بەیاننـامەکە قسەیان لە ئازادی و مافی کۆمەڵایەتی دەکرد، ئەوان پێیانوابوو هەموو ئەو مافانەی لە بەیاننـــامەکەدا هـــاتووە جـــگە لە میکیـــاجکردنێکی ناشـــیرینی دەموچـــاوی سەرمایەداری شتێکی دیکە نییە.

سعودیە، کە نەیدەویسـت زیـان لە دەسـەڵاتی نـوخبە ئـایینییەکەی نـاو وڵاتەکەی بکەوێت، ئەو نوخبە دینییەی، کە ڕەوایەتی سیاسی بە دەسەڵاتدران و حوکمڕانانی سعودیە دەبەخشـی، بـانگەوازەکەی بە بەهـانەی ئـایینی و کولتـوریی ڕەدکـردەوە. سعودییەکان ڕایانگەیاند گوایە بانگەوازەکە لەگەڵ ئیسلام و ئەو دونیـایەی ئیسـلام پێشنیاریدەکات ناگونجێت. بەباوەڕی ئەوان بەیاننامەکە بەرهەمی ڕۆژئاوا و فیکـری ڕۆژئـــاوایە و دژ بەو جەوهەرە گریمـــانکراوەی ئیســـلامە، کە ســـعودییەکان وەک موسڵمان باوەڕیان پێیەتی.

ئەفریقـــای باشـــوور، کە تـــازە سیســـتمی ئاپارتهایـــدی، واتە هەڵاوردنـــی ڕەگەزپەرستانەیان، داهێنـابوو، نەیدەتوانی خۆی لە هیچ بەنـدێک لە بەنـدەکانی بانگەوازەکەدا بدۆزێتەوە، چونکە هەر بەندێک لە بەندەکانی ئەو بەیاننـامەیە دژ بەو سیستمە سیاسـی و کۆمەڵایەتییە ڕەگەزپەرستانەیە بـوو، کە ئەوان لە ئەفریقـای خـــواروودا دروســـتیانکردبوو. مـــامەڵەکردنی ڕەشپێســـتەکانی ئەو وڵاتە لەلایەن دەوڵەتەوە وەک ئینسانی پلە دوو و پلە سێ ناکۆکبوو بە تێسکت و بەند و ڕۆحی یەکسانخوازی بەیاننـامەکە. بەرگریکـردن لە بـوون و مـانەوە و بەرقەرای سیسـتمی ڕەگەزپەرستی لەو وڵاتەدا ڕاستەوخۆ گرێدراوی ڕەفزکردنی هەموو بۆچوونێـک بـوو، کە قسەی لە یەکسانی نێوان ئینسانەکان و ڕەگەزەکان دەکرد و دژی دابەشکردنی ئینسانە لەسەر بنەمای رەگەز و ڕەنگی پێست و دین و بیروبۆچوونی سیاسی.

وەک ئاشـکرایە ئەو بەهـانە هاوبەشـەی لەهەرسـێ دۆخەکەدا بـۆ ڕەتکـردنەوەی بانگەوازەکە لەئارادایە، واتە لە دۆخی وڵاتە سۆسیالیستەکان و لەدۆخی سعودیە و لەدۆخی سیستمە رەگەزپەرستەکەی ئەفریقای باشوردا، ئەوەیە گوایا ئەم بانگەوازە کاراکتەرێکی جیهانی و گەردوونی و بان ـ کولتوری نییە و ڕاستەوخۆ پابەندی دید و بۆچوون و دونیـابینی چـین، کولتـور، ئـایین، یـان شارسـتانیەتێکی دیـاریکراوە. لێرەوە لەبۆچوونی ئەم لایەنانەدا ئەم بەیاننامەیە ناتوانێت خۆی وا نیشـانبدات، کە دەقێکـی گەردوونیـیە و پێویسـتە لەسەراسـەری جیهانـدا جێـی ڕێزلێگرتنبێـت، بە پێچەوانەوە ئەو هەشت وڵاتە لایـانوایە ئەم بەیاننـامەیە دەقـێکە منـاڵی ناوەنـدێکی کولتوری و سیاسی و شارستانی تایبەتە.

ئێستاش، پەنجا ساڵ دوای دەرچوونی ئەم بانگەوازە، هێشتا ئەو جۆرە ناڕەزایی و بەرهەڵسـتییانە هەر مـاون و بەهێـزن، هێشـتا دەنگێکـی زۆرهەن، کە نایانەوێـت بەیاننامەکە و ڕۆحە یەکسانخوازەکەی بەیاننـامەکە قبـووڵکەن. بەڵام ناڕەزاییەکـانی ئێسـتا بەجـۆرێکی تـر لە زاراوەسـازی و لەچوارچێـوەیەکی تیـۆریی جیـاوازدا

پێشکەشدەکرێن. لەرۆژگاری ئەمڕۆدا رەخنە لە جاڕی گەردوونیی مافی مرۆڤ، وەک فەیەلسوفی هۆڵەندی هاری کیونێنمان، Künnenman، دەڵێت، دکرێت لە سێ شێوەدا کورتبکرێتەوە: (۱)

۱ـ رەخنەی کولتوریی

۲ـ رەخنەی تیۆرەی رێژەگەرایی، واتە تیۆرەی نسیبییەت.

۳ـ رەخنەی پۆست مۆدێرنیزم.

من لەم وتارەدا لە دوو جۆرە رەخنەی یەکەم و دووهەم دەدوێم، جۆری سێیەم، واتە رەخنەی پۆست مۆدێرنیزم، وازی لێدێنم، چونکە بەڕای من ئەم رەخنەیە هیچ شتێکی جەوهەری بۆ ئەو دوو جۆرە رەخنەیەی تر زیادناکات و لەزۆربەی کاتدا تەنها دووبارەکردنەوەی ڕەخنەکانی ئەوانە.

رەخنەی کولتوری و رێژەگەرایی لە بانگەوازەکەی مافی مرۆڤ لەوێوە دەستپێدەکەن گوایا هەر گروپێک پێشخانی کولتوریی تایبەت بەخۆی هەیە و ئەو کولتورە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆحی ئەو گروپە دادەڕێژێت و دەستنیشاندەکات. هاوکات دەڵێن ئەوەی بۆ کولتور و هەڵگرانی کولتورێکی دیاریکراو دەشێت و دەگونجێت بۆ هەڵگرانی کولتورێکی دی ناگونجێت. بۆنموونە ڕێژەگەراکان لەو باوەڕەدان ئەوەی بۆ 'کولتوری رۆژئاوایی' دەگونجێت، بۆ کولتورەکانی دیکە، بۆ نموونە بۆ 'ئیسلام' ناگونجێت. لەم دیدەدا 'کولتوری ڕۆژئاوایی' و 'کولتوری ئیسلامی' وەک دوو دونیای تەواو جیاواز وێنادەکرێن و وا نیشانئەدرێن وەک ئەوەی هەرگیز بە یەکدینەگەن، نا نەک هەر بەیەکدیناگەن بەڵکو هەم هێزە ئوسوڵییەکان لە ڕۆژئاوا و هەم هێزە ئوسڵییە دینییەکان لە ڕۆژهەڵات قسە لە 'جەنگی کولتوری' دەکەن و بۆ ئایندەی مرۆڤایەتی سەرزەمینێک پێشنیاردەکەن تەندرا و بە جەنگی کولتورە جیاجیا و دوژمنەکان. نەک تەنها سامۆئیل هینگتینتۆنی نووسەری کتێبی "بەریەککەوتنی شارستانییەتەکان"،

هەڵگری ئەم دیدە کولتورگەرایەیە بۆ مێژوو و بۆ پەیوەندی نێوان کۆمەڵگا جیاوازەکانی دونیا، بەڵکو لەشکرێک ڕۆشنبیری ئوسوڵی ئیسلامی و لەشکرێک ئیمام و ئایەتوڵا و لە ئایەتوڵا بچووکتر، هەڵگری هەمان دیدن. ئەمانە نەک تەنها جەنگ و ململانێی نێوان کولتورەکان وەک جەنگێکی ئەزەلی و ئەبەدی تێدەگەن، بەڵکو هاوکات جەوهەرێکی نەگۆڕ و جێگیر بەهەریەکێک لەو کولتورانەش دەبەخشن، کە هەرگیز قابیلی گۆڕان و تازەبوونەوە نییە.

بەباوەڕی ئەمانە هەموو کولتورێک "لۆژیکی ناوەکی" خۆی هەیە و ناکرێت لەدەرەوەڕا لۆژیکێکی دیکەی بەسەردابسەپێنرێت. لێرەدا کولتور وەک سەرزەمینێکی یەکگرتوو و وێکچووی بێناکۆکی و بێجیاوازی ناوەکی پێشنیاردەکرێت، وەک جەوهەرێکی نەگۆڕی بان ـ کات و بان ـ شوێن و وەک هێزێکی جێگیر و نەگۆڕ، کە دەستنیشانی ئەوە دەکات ئینسان چۆن بژی و چی بکات و چی نەکات. ئەم ڕەخنە کولتورییە بانگەوازەکە لەسەر بنەمای ئەوەوە ڕەد دەکاتەوە، کە گوایا ئەم بانگەوازە بەرهەمی "کولتوری ڕۆژئاوایەو" لەگەڵ پێشخانە کولتورییە جیاوازەکانی دیکەی دونیادا یەکناگرێتەوە و لە جەوهەردا دژ بە کەلەپور و بیروبۆچوون و هەموو ئەو بەها و پرنسیپانەیە، کە سەر بە کولتوری ڕۆژئاوایی نیین.

ڕێژەگەراکانیش بە هەمان هێڵی کولتورگەراکاندا دەڕۆن و بەرگری لەوەدەکەن، کە دەبێت ڕێزی لۆژیکی ناوەکی و بەها و پرنسیپی کولتورەکانی دیکە بگیرێت و بەزۆر دید و پرنسیپ و بەهای کولتورێکی دیکەیان بەسەردا نەسەپێنرێت. بەپێی ئەم لۆژیکە، بۆ نموونە، خەتەنەکردنی ئافرەت لە سۆماڵ، یان لە میسر، یان لە کوردستان، دەبێت ڕێزی لێگیرێت و ڕەخنەی لێنەگیرێت، چونکە ئەمە عادەتێکی تایبەتی ناو کولتوری ئەو وڵاتانەیە و لۆژیکی تایبەتی خۆیان هەیە و لەناو ئەو کولتورانەشدا هەم وەزیفەیەکی دیاریکراو و هەم مانایەکی تایبەتیان هەیە. لێرەوە

نابێت، بۆ نموونە لە ڕێگای ئەو بەندانەی بەیاننامەی مافی مرۆڤەوە، کە باس لە مافی سەروەری و ئۆتۆنۆمبوونی جەستە دەکات، بەگژ عادەتەی کولتوری خەتەنەکردنی ئافرەتدا بچینەوە.

هەم لە ڕۆژئاوا و هەم لەدەرەوەی ڕۆژئاوادا رەخنەی کولتوریی و ڕێژەگەرایی لە جاڕی گەردوونیی مافەکانی مرۆڤ ڕەخنەیەکی ڕەواجدارە، زۆرن ئەوانەی لەم دیدەوە و لەژێر چەتری کولتورگەرایی و ڕێژەگەراییەدا، ڕەخنە لە بەیاننامەکە دەگرن. لەدەرەوەی ڕۆژئاواشدا ڕەخنەی کولتوری، بەتایبەتی لەلایەن دەسەلاتداران و ئەو ڕۆشنبیرانەوە، کە تاڕادەیەکی زۆر لە خزمەتی دەسەلاتداراندان برەوێکی گەورەی هەیە، یاخود لەلایەن ئەو بزاوتە سیاسییە ئوسوڵییە دینی کولتوریانەوە، کە جارێک ئایین و جارێک 'ڕۆحی نەتەوەیی' وەک جەوهەرێکی جیاواز بە گژ بەندەکانی بەیاننامەی مافەکانی مرۆڤدا دەکەنەوە. ئەم ڕەخنانە بەناوی 'کاراکتەری خۆیی' و 'تایبەتمەندی کولتوری' و 'ترادیسیۆنی جیاواز' ەوە دژایەتی بانگەوازەکە دەکەن. ئەم ڕەخنانە 'جەوهەرێکی نەگۆڕ' بۆ کولتورەکان گریماندەکەن و لەوێوشەوە بە خەتێکی سوور 'جەوهەر'ی گریمانکراوی ئەم کولتور لە جەوهەری گریمانکراوی ئەو کولتور لە یەکدی جیادەکەنەوە و شوناسێکی نەگۆڕ و هەمیشەیی پێشنیاردەکەن، کە گوایە لەهەموو شوێن و کات و ڕۆژگار و سەردەمێکدا تەعبیر لەو جەوهەرە نەگۆڕەی ئەو کولتورانە دەکات.

ڕەنگە بۆ من وەک کوردێک باشترین نموونەیەک ڕەخنەی کولتوری و ڕێژەگەرایی ڕوونبکاتەوە ئەزموونی بەعس و پڕوپاگەندەی ڕۆشنبیران و ئایدیۆلۆژیستەکانی بەعس بێت لە عێراقدا بەرامبەر بە کورد. بەعس لە عێراقدا بەناوی کاراکتەری 'تایبەتی' و 'نەگمەن' و 'بێوێنە' ی نەتەوەی عەرەبەوە، بەناوی گوتارێکی هەمەلایەنەوە دەربارەی 'تایبەتمەندێتی'، واتە خسوسیەتی عەرەبییەوە، نەک هەر تەنها بانگەوازی مافەکانی مرۆڤ، بەڵکو زۆر لایەنی دیموکراسییانەی تری بیری

سیاسی مۆدێرنی ڕەدکردۆتەوە. لەهیچ شوێنێکی تری جیهانی عەرەبیدا ئەوەندەی عێراق جەخت لە مەسەلەی 'کولتوری خۆیی' و 'تایبەتمەندی' و "ڕەسەنایەتی" عەرب و نەتەوەی عەرەب نەکراوە، بەهەمانشێوە لەهیچ شوێنێکی دیکەی دونیای عەرەبیدا ئەوەندەی عێراق پرۆژەی جینۆساید و کوشتنی بە کۆمەڵ و وێرانکردنی شوناسە جیاوازەکانی دیکە ئامادەنەبووە. بەعس سنوورێکی زۆر ئاشکرای لەنێوان عەرەب و دونیای دەرەوەی عەرەبدا دەکێشا، بەعس لەڕێی گوتاری 'تایبەتمەندێتی' ەوە جۆرێک جیاوازی بەرهەمدەهێنا، کە بەرهەمی سەپاندنێکی ئایدیۆلۆژی و سیاسی و ستراتیژێکی تایبەتی دەسەڵات بوو، کە هیچ ڕێزێکی بۆ تایبەتمەندییەکان و جیاوازییەکانی ئەوانیتر دانەدەنا. بەعس عەرەبی وەک بوونەوەرێکی جیاواز و باڵا و خاوەن پەیامێکی نەمر، الرساله الخالده، پێشنیاردەکرد و هەموو ئەمانەشی لەژێر ناونیشانی کولتوری تایبەت و ڕێژەگەرایی کولتوریدا بەڕێوەدەبرد، هاوکات هیچ ڕێزێکی بۆ کولتور و کەلەپور و شوناسی هێزەکانی تری ناو نەخشەی سیاسی و کۆمەڵایەتی عێراق دانەدەنا. ئاشکرایە لەپشتی ئەم دیدە کولتورگەراییەوە گوتارێکی فاشیستی کاردەکات، کە مافی جیاوازبوون تەنها بە بەعس خۆی ئەدلو ئەو مافە لەهەموو ئەوانیتری نابەعسی دەسسێنێتەوە، لەڕاستیدا بەعس دەیویست هەموو ئەوانیدی ناچاریکات ببنە بەعس و وەک بەعس بیریکەنەوە و بژین.

دواهەمین دەرەنجامی ئەم کولتورگەرایی و ڕێژەگەراییە، وەک هەموومان دەزانین، کردنی هەموو شتێکی دونیای دەرەوەی بەعس بوو بە دوژمن. ئەم دیدە پەرگیرە لە مێژووی هاوچەرخی عێراقدا تا ئێستا دەیان ساڵ جەنگ و ملیۆنەها قوربانی بەرهەمهێناوە.

بەکورتی ڕەتکردنەوەی کولتوریی ئەم دەسەڵاتدارانە بۆ بەیاننامەکە بە بیانوی ئەوەی سەر بە کولتوری ڕۆژئاوایە لە کاتێکدایە ئەوان خۆیان بەو چەکە

کۆمەڵکوژانە بەهێز و تەیاردەکەن، کە بەرهەمی خۆرئاوان و لە خۆرئاوەوە هێنراون. لە کاتێکدا تێڕوانین و بۆچوونی دەسەڵاتدارانی عێراق و ئەوانیتری وەک عێراق بەرامبەر رۆژئاوا تێڕوانینێکی خراپە و رۆژئاوا وەک بەدبوونێکی گەورە دەناسێنن، لەهەمانکاتدا ئەو دەسەڵاتدارانە لە کۆشکەکانی خۆیاندا شتومەک و کاڵا و تەکنۆلۆژیای رۆژئاوا بەکاردەهێنن. لە کاتێکدا ئەوان بەیاننامەکە بەناوی رۆژئاوبوونەوە رەتدەکەنەوە لە هەمانکاتدا پشووی هاوینەکانیان لە کەناری دەریاکانی رۆژئاوادا بەسەردەبەن و، کە نەخۆشیش دەکەون هەر روویان لە نەخۆشخانەکانی رۆژئاوا دەکەن.

جگە لەمانەش لەو کاتەدا، کە سێ لاپەڕەی بەیاننامەی مافەکانی مرۆڤ لە عێراقدا یاساغ دەکرا، لە هەمانکاتدا لە بازاڕی رەشدا و بەبەرچاوی دەسەڵاتدارانەوە فلیمە سێکسیە رۆژئاواییەکان و گۆڤارە سێکسیەکانی وەک "Play Boy" دەفرۆشران و بڵاودەکرانەوە. لەکاتێکدا رووە دیموکراسییەکانی فیکری سیاسی نوێ بەناوی تایبەتمەندێتی کولتورییەوە رەتدەکرانەوە، لەهەمانکاتدا هەموو ئەو دەزگا دیسپلینکەر و چاودێریکەرانە کۆپیدەکران، کە لە ئەزموونی سیستمە تۆتالیتارەکانی رۆژئاواوە هاتبوون.

بێگومان ئەوە هەرتەنها دەسەڵاتداران و رۆشنبیرەکانیان نیین لە رۆژهەڵات، کە ئەم بانگەوازە وەک بەرهەمی کولتور و ترادیسیۆنی رۆژئاوایی سەیردەکەن. بەڵکو زۆر لە رۆشنبیرانی ناو رۆژئاوایش هەمان دید دووبارەدەکەنەوە بەتایبەی کاتێک بانگەوازەکە وەک بەرهەمێکی یەهودی-مەسیحی سەیر دەکەن. تازەترین دەقێک لەم ڕووەوە بەرچاوی مـن کەوتبێت و خوێندبێتمەوە، وتارێک بوو لە رۆژنامەی "Trouw"ی هۆڵەندی لە رۆژی ٢٨-١١-١٩٩٨ دا. (٢) نووسەری ئەم وتارەدا پەیوەندییەکی راستەوخۆ لەنێوان بانگەوازەکە و دە ئامۆژگاریەکەی دینی

یەهودیەتدا دەخاتەڕوو، لێرەوە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ لە نێوان بەیاننامەی مافی مرۆڤ و کولتوری یەهودی و مەسیحیدا پێشنیاردەکات و بە بەیاننامەکە ڕەگوڕیشەیەکی دینی مەسیحی یەهودی دەبەخشێت. لەڕاستیدا ئەمجۆرە دید و لێکدانەوانە هەڵگری، زۆرجار بەنائاشکرایی، تێڕوانینێکە پێیوایە کولتورەکانی دەرەوەی ڕۆژئاوا کەمتر شارستانین و ناتوانن وەک 'کولتوری ڕۆژئاوا' مرۆڤدۆست و ژیاندۆست بن. بە بۆچوونی من ئەم جۆرە لێکدانەوەیە هیچی زیاتر نییە لەو دیدە یۆنانییە دێرینەی، کە جیهانی دەکرد بە دوو بەشەوە: لەلایەک یۆنانییەکان وەک هەڵگری شارستانییەت و لەلایەکی تریشەوە هەموو ئەوانەی یۆنانی نەبوون، وەک بەربەری، ئەم دیدە کولتورگەرایە هاوچەرخە دووبارەکردنەوەیەکی کۆمیدییانەی ئەو دیدەت ڕاژیدییە یۆنانییەیە. وەک یۆنانییە کۆنەکان، کولتورگەرا هاوچەرخەکانی خۆرئاوا، دونیای ئەمڕۆ بەهەمان لۆژیکی جیاکردنەوەی شارستەنییەت لە بەربەریەت دابەشدەکەن و خۆرئاوا وەک سەرزەمینی شارستانیەت و دەرەوەی خۆرئاوا وەک سەرزەمینی بەربەریەت وێنادەکەن. کولتورگەراکان چ لە یۆنانی کۆندا بژین، یان لە خۆرئاوای ئەمڕۆدا، چ باوەڕیان بە ئیسلام بێت، یان بە مەسیحیەت، یان بودیەت، یان سۆسیالیزم هەرشتێکی دیکە، هەموویان بەهەمان لۆژیکی کولتورگەرایی بیردەکەنەوە و بەهەمان لۆژیک دونیا دابەشدەکەن. لۆژیکێک کۆمەڵگاکان بۆ یەک کولتور کورتدەکاتەوە و بەو کولتورەش جەوهەرێکی ئەبەدی و نەگۆڕ دەبەخشن.

ئەو پرسیارەی لێرەدا پێویستی بە وەڵامدانەوەیە ئەوەیە داخۆ ئەو جیاوازییە کولتورییە گرنگانە چین، کە کولتورگەراکان لەنێوان 'کولتوری ڕۆژئاوا' و کولتورەکانی دیکەدا پێشنیاریدەکەن؟ پێش ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەمەوە پێویستە تێبینییەک دەربارەی چەمکی "کولتور" بەوشێوەیەی لەم پرسیارەدا بەکاردێت، بخەمەبەرچاو. لەم جۆرە دیدەدا کولتور وەک گشتێکی نەگۆڕ و وەک جەوهەرێکی چەسپاو سەیردەکرێت، وەک ئەو ئامێری کۆپیکردنە گەورەیەی

مرۆڤگەلێک بەرهەمدێنێت لەهەموو رووپەکەوە لەیەکدەچن. کولتور لەم دیدەدا نەگۆڕێکە و جەوهەرێکی جێگیری هەیە و ئەو جەوهەرەش دەستنیشانی ئەوەدەکات ئینسان چییە و چۆنە و بە چ شێوەیەک هەڵسوکەوت دەکات؟

ئەم دیدە کولتورالیستییە دیدێکە لەنێوان رۆژئاوا و بەشەکانی تری جیهاندا جیاوازییەک پێشنیار دەکات، کە لادان لێی و تێپەڕاندنی مەحاڵە، جیاوازییەک بە بۆچوونی ئەمانە لە بوونی دوو جەوهەری گریمانکراوی لێکنەچوەوە سەردەردێنێت. هاوکات ئەم دیدە بۆ خۆرئاوا، کە خۆرئاوا لەدەیان وڵات و ملیۆنان ئینسان و سەدەها و هەزارەها گروپی جیاواز پێکدێت، یەک کولتور پێشنیاردەکات و بەهەموویان یەک ئاکار و شێوازی بیرکردنەوە و تێڕوانیان دەبەخشێت. بێگومان ئەم پیشەسازی دروستکردنی جەوهەرە بەسەدان شێوە هەڵەیە. "جەوهەری" جیاوازی گریمانکراوی نێوان خۆرئاوا و دەرەوەی خۆرئاوا زۆرجار لەو دیدە سۆسیۆلۆژیەدا ئامادەیە، کە باس لە پەیوەندی نێوان تاک و گروپ دەکات. سۆسیۆلۆژیای کولتورگەرایی پێشنیاری ئەوە دەکات گوایا 'کولتوری رۆژئاوایی' لەسەر بنەمای تاکەکەس و بەرژەوەندی تاکەکەس دامەزراوە و کاردەکات، لەکاتێکدا 'کولتوری رۆژهەلاتی' لەسەر بنچینەی گروپ و بەرژەوەندیی گروپ. وەک دەبینین لێرەدا بە "خۆرهەلات"یش یەک کولتور بەخشراوە و بەم کولتورەش یەک جەوهەر بەخشراوە، کە گوایە جەوهەرێکی دژ بە تاکەکەسە.

بۆئەوەی ئەم بۆچوونە بخەمە ژێر پرسیارەوە، جارێکی دی دەگەڕێمەوە سەر نموونەی عێراق، چونکە من بەشێکی زۆری ژیانم لە عێراقدا بردۆتەسەر. بەعس لە عێراق بەبەهانە کولتورییەکان هەموو جۆرە بیرکردنەوەیەکی دیموکراسییانە رەتدەکاتەوە. بەڵگە و بەهانەکانی بەعسیش بۆ ئەم رەتکردنەوەیە ئەوەیە بەعس هەرچی زیاتر جەخت لە گروپ و قازانجەکانی گروپ دەکات و نەتەوەی عەرەب و ئامانجەکانی نەتەوەی عەرەب پێش تاکەکەس و ئامانجەکانی تاکەکەس دەخات.

بەپێی ئەم لۆژیکە قازانجی خێزان لەسەروی قازانجی تاکەکەسەوە و قازانجی حیزب لەسەروی قازانجی ئەندامانەوە دادەنێت. بێگومان هەرکەسێک زانیارییەکی سەرەتایی دەربارەی عێراق هەبێت، دەزانێت ئەو وڵاتە وڵاتێکی فرەگروپە و هیچ گروپێکیش لە عێراقدا ئەو مافە سەرەتاییانەی نییە، کە گروپەکان لە کۆمەڵگایەکی تەندروست دەبێت هەیانبێت. بەپێچەوانەوە ئەو گروپانەی رۆژێک لەرۆژان خەونیان بەلاینکەمی ژیانێکی ئۆتۆنۆمەوە بینیوە و بیریان لە قازانجی خۆینا وەک گروپ کردۆتەوە، لە گروپە سیاسییەکانەوە بیگرە بۆ سەندیکاکان و بۆ گروپە ئەتنی و ئایینیەکان، هەرهەموویان نەک هەموو جۆرە مافێکیان وەک گروپ لێزەوتکراوە، بەڵکو گەر تەسلیمی ئەم بێمافیەش نەبووین، ئەوا بەشێوەیەکی سیستەماتیک قڕکراون. لە عێراقدا، کە گوایە هەڵگری کولتوری خۆرهەڵاتییەوە لەم کولتورەشدا مافی گروپ بەسەر مافی تاکەکەسدا زاڵە، دەبینین بەر لە مافەکانی تاکەکەس مافی گروپەکان پێشێلکراوە و بەردەوامیش پێشێلدەکرێت. هەموو ئەمانە لەکاتێکدایە وا پێشنیاردەکرێت گوایە 'کولتوری عێراقی' وەک بەشێک لە کولتوری خۆرهەڵاتی کولتورێکە گرنگی بە گروپ و مافەکانی گروپ دەدات.

بەبۆچوونی من کارێکی مەحاڵە بتوانرێت مافەکانی تاکەکەس و مافەکانی گروپ لەیەکدی جیاکرێنەوە. عەقڵیەتی پاراستنی ماف یەک عەقڵیەتە، جا چ پاراستنی مافی تاکەکەسبێت، یان هی گروپ. من ناتوانم هیچ نموونەیەکم بدۆزمەوە تیایدا ئەوە نیشانبدات، کە مافەکانی گروپ زامنکرابێت، بێئەوەی پێشوەخت مافەکانی تاکەکەس پارێزرابێت، وەک چۆن ناشتوانم بیر لە نموونەیەک بکەمەوە تیایدا مافەکانی تاکەکەس پارێزرابێت، بەبێئەوەی مافی گروهەکانیش نەپارێزرابن. لەهەرشوێنێکدا مافە تاکەکەسییەکان پێشێلکرابن، ئەوا مافە هاویەشەکانیش بە ئەندازەیەکی گەورە پێشێلکراون. لە هەرشوێنێکیش مافی گروپەکان پێشێلکرابێت مافی تاکەکانیش پێشێلکراوە. جیاکردنەوەی مافە تاکەکەسییەکان و مافە

هاوبەشەکان لەیەکتری هەمیشە بەهانەیەکی بێمانایە بۆئەوەی بەئاسانی ئازادیی تاکەکەسی لە هاوولاتییان و ئازادی دەستەجەمعی گروپەکان زەوتبکرێن.
لە ڕۆژئاواشدا لە کاتێکدا قسە و باسێکی زۆر لە جەوهەری تاکگەرایی ئەم بەشەی دونیا دەکرێت، لە هەمانکاتدا سۆسیۆلۆژیای هاوچەرخ پێماندەڵێت هیچ کاتێک کۆمەڵگاکانی خۆرئاوا بەئەندازەی ئێستا گروپی جیاجیای تێدا ئامادە نەبووە، لە ئێستادا لەو کۆمەڵگایانەدا گروپ بۆ هەموو جۆرە چالاکییەک و بۆ هەموو هەڵسوکەوتێکی ئینسانی هەیە، ئیدی لە گروپی پاراستنی ژینگەوە بیگرە بۆ گروپی بەرگریکردن لە مافی پەناهەندە و بۆ گروپی گرنگیدان بە تەندروستی ئاژەڵان، کەچۆن لە هەمانکاتدا تاکگەرایی لەوپەڕی گەشە و ئامادەگی خۆیدایە.
لە دەرەوەی ڕۆژئاواشدا، دیسانەوە بۆ نموونە لە عێراقدا، چەندە تاک و تاکگەرایی غائیبە، بەهەمان ئەندازەش بوونی گروپی جیاواز و گروپگەرایی خۆشی غائیبن. لەعێراقدا لە نێوان خێزان و دەوڵەتدا هیچ جۆرە گروپێکی دیکەی جیاواز و سەربەخۆ لە ئارادا نییە، مەگەر ئەو گروپە ساختانە نەبێت، کە دەوڵەت بۆ کۆنترۆڵکردن و چاودێریکردن و لەکاتی پێویستیشدا بۆ لەناوبردنی ئینسان و کۆمەڵگای عێراقی دروستیکردون. دەتوانم تا ئەوشوێنە پێدابگرم و بڵێم لە کوێ تاکەکەسی ئازادنەبوو گروپی ئازادیشی لێنییە، مەگەر ئەو شێوانەی گروپ نەبێت، کە وەک پێدراوێکی سروشتی ئامادەن، بۆنموونە خێزان و خێڵ و تائیفەی دینی. لەهەرشوێنێکیش تاکەکەسی ئازاد هەبوو ئەوکات کۆمەڵگا دەبێتە سەرزەمینی بەرهەمهێنانی دەیان و سەدان گروپ، کە لەسەر بنەمای ڕێکەوتن و ئازادی و پەیوەندی کراوە دروستدەبن. بەم مانایە کارێکی نابەجێ و ناڕاستە تاکەکەس و گروپ لەیەکدی جیابکەینەوە و هەریەکێکیشیان وەک دونیایەکی جیاواز و کولتورێکی جیاواز و جەوهەرێکی جیاواز پێشنیاریکەین.

-٢-

شتێک نییە ناوی مافی مرۆڤی رۆژئاوایی و مافی مرۆڤی رۆژهەڵاتی بێت، یەک ماف هەیە ئەویش مافی مرۆڤە و هیچیدی. گرنگترین پەیامی جاڕی گەردوونی مافەکانی مرۆڤ، وەک فەیلەسوفی ئیسپانی "Fernando Savater" لە کتێبەکەیدا "کۆمەڵگایەکی باش" دەڵێت، بریتیە لە: "مافە گەردوونییەکانی مرۆڤ پێشنیاری ئەوەدەکەن مرۆڤەکان سەرەڕای جیاوازی نێوان گروپەکانیان مافەکانی یەکدی بسەلمێنن، هەروەها پێشنیاری ئەوەشدەکەن گرنگترین شتێک بۆ ئینسان ئەوەیە تاکێکی ئینسانی بێت نەک کەسێک سەر بە رەگەز، نەتەوە، یان کولتورێکی تایبەت". هەر لەم دیدەوە من پێموایە مافەکانی مرۆڤ کۆمەڵێک مافن، کە ڕاستەوخۆ وابەستەی بوونی ئینسانن وەک تاکەکەسێک، کە بە کۆمەڵێک مافەوە دەچێتە ناو سەرزەمینی کولتورە جیاجیاکانەوە.

-٣-

بەبۆچوونی من مافی هاوولاتیبوون و مافە سیاسییەکان بەشێوەیەکی باش لە بانگەوازەکەدا دارێژراون. زۆر رێکخراو و دامودەزگا هەن چاوەدێری بڕی ڕێزگرتنی ئەم مافانە، یان پێشێلکردن و ئەتککردنیان لە وڵاتە جیاجیاکاندا دەکەن، لەوانەش سازمانی لێبووردنی نێونەتەوەیی "Amnesty International". ڕەنگە ئەو خاڵەی، کە قابیلی ڕەخنەبێت لە بەیاننامەکەدا مافە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان بێت، کە بە بۆچوونی زۆر کەس بە باشی دانەڕێژراون. لەم ڕووەوە ڕەخنەکانی

جیهانی سێ لەم خاڵە ڕەوایە، ئاخر ژیانی سەگێک لە هۆڵەندا لە زۆر ڕووەوە لە ژیانی ئەندازیارێک لە سودان باشترە. وەک قەشەی هۆڵەندی بەناویانگ "Muskens" دەڵێت: "هەژارکردنی نەخشە بۆکێشراو کەمتر توندوتیژ نییە لە سەرکوتکردنی سیاسی". بێگومان ئەم ڕەخنانە لە بەیاننامەی مافی مرۆڤ مانای ئەوە نییە بەیاننامەکە بەناوی کولتورگەرایی و ڕێژەگەرابیەوە ڕەفزبکرێت، کاری ڕاستەقینەی ڕۆشنبیران ڕەتکردنەوەی بەیاننامەکە نییە بەناوی کولتورگەراییەوە، بەڵکو دەوڵەمەندکردنیەتی بە پرنسیپ و ماف و داواکاری نوێ. ژنە فەیلەسوفی فەرەنسی، جولیا کریستیڤا، نموونەیەکی باشی ئەو جۆرە ڕۆشنبیرانەیە، کە مامەڵەیەکی تەندروست لەگەڵ بەیاننامەکەدا دەکات، ئەم خانمە داوای ئەوەدەکات و تا ئەوشوێنە دەڕوات، کە بڵێت دەبێت ئەم بەیاننامەیە دەوڵەمەندکرێت بە "پرنسیپی مافی هەڵبژاردنی نەتەوە". بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم داوایە جولیا کریستیڤا ئەڵێت: "من بە ڕێکەوت لە هەنگاریا لەدایکبووم و کەس پرسی پێنەکردووم لەکوێ لەدایکبم. بۆیە دەخوازم ئەو مافەم بدرێتێ خۆم نیشتیمان و ناسنامەی نەتەوەیی خۆم هەڵبژێرم". لە میانەی هەمان لۆژیکەوە هەندێک لەدۆستانی ژینگە دەخوازن مافێکی دیکە بۆ بەیاننامەکە زیادبکەن: هەر مرۆڤێک مافی ئەوەی هەیە لە ژینگەیەکی خاوێندا بژی. لە هۆڵەندا بە بۆنەی یادی پەنجاساڵەی لەدایکبوونی ئەم بەیاننامەیەوە یەکێک لە گۆڤارە فەلسەفییەکان داوای لە منالآنی ئەم وڵاتە کرد، کە مافی نوێ بۆ بەیاننامەکە زیادبکەن، لەکاتێکدا لە دونیای ئێمەدا بەدەیان سیاسی و ڕۆشنبیری کولتورگەرا هەن بەناوی تایبەتمەندێتی و ڕەسەنایەتییەوە دژ بەم بەیاننامەیە دەقیژێنن و دەیانەوێت ئەو ئاوازە ئینسانییە مەزنە نەبیستین، کە لە دێڕ بە دێڕی ئەم بەیاننامەیەوە دەڕژێت.

بەهەرحاڵ هەنووکەییبوونی ئەم بەیاننامە مێژووییە، لەئێستادا زۆر گەورەترە لە هەنووکەییبوونی سەرجەمی ئایدیۆلۆجیاکانی تر. جاڕی گەردوونی مافەکانی مرۆڤ

سەرەڕای هەموو سەختییەکان بەڕێوەیە بۆ ئەوەی ببێتە بەرنامەیەکی ئەخلاقی گەردوونی، کە ئامانجی پاراستنی بەها و کەرامەتی هەر مرۆڤێکە لەهەر شوێکی دونیادا. (٣)

# پەراوێز

* ئەم وتارە بۆ یەکەمینجار بە هۆڵەندی نوسراو و بڵاوکرایەوە، هاورێی ئازیزم گۆران بابا عەلی ئەرکی وەرگێڕانی بۆ کوردی خستە سەر شانی خۆی.

١ـ بڕوانە:
Harry Kunneman, van theemutscultuur naar walkman-ego. Contouren van postmoderene individualiteit. Boon Amsterdam 1996.

٢ـ ڕۆژنامەی Trouw یەکێک لە ڕۆژنامە سەرەکییەکانی هۆڵەندایە.
ئەم وتارەی بۆ یەکەمجار وەک موحازەرەیەک لە "٧-١٢-١٩٩٨" لە هۆڵی "Vrijhof" لە زانکۆی "توێنتە" لە هۆڵەندا پێشکەشکراوە. ئەم موحازەرەیەش یەکێک بووە لەو زنجیرە موحازەرانەی بە بۆنەی تێپەڕیوونی پەنجا ساڵ بەسەر نووسینی "جاڕی گەردوونیی مافی مرۆڤ" لە هۆڵەندا پێشکەشکران. دواتر ئەم موحازەرەیە لە گۆڤاری "Inter Disciplinair" ی کۆلێژی ئیدارەی زانکۆی "توێنتە" دا، ژمارە ١، ساڵی دەیەم، لە شوباتی ١٩٩٩ بڵاوکرایەوە.

# ئەخلاقناسی جیاوازیی
# لە دونیای پۆست مۆدێرندا

-١-

لەژیانی ڕۆژانەیدا ئینسان تەنها لە دەرەوەڕا و بێلایەنانە لە شتەکان و دیاردەکان ورددنابێتەوە. ئینسان بوونەوەرێک نییە بێ پرسیار بەپاڵ دونیادا تێپەڕێت و هەوڵنەدات بیناسێت و ڕاڤەیبکات و دوا جاریش دەرکەوتە جیاوازەکانی ئەو دونیایە نەکاتە کۆمەڵێک چەمکی فیکریی و فەلسەفی و ئەدەبی. بەپێچەوانەوە ئینسان بوونەوەرێکە دەپرسێت و دەشخوازێت وەڵام بۆ پرسیارەکانی بدۆزێتەوە، دەڕوانێت و دەیەوێت ڕوانینەکانی بکاتە ڕاڤەکردن و فیکر، گوماندەکات و دەخوازێت گومانەکانی بکاتە هەڵسەنگاندن و نرخاندن. ئینسان بوونەوەرێکە ناتوانێت بێدەنگ بەرانبەر بەو دونیایەی لەناویدا دەژی و دەبزوێ و ماناکانِ بەرهەمدەهێنێت، دانیشێت. ئەوشتانەی دەیانبینێت لێیاندەکۆڵێتەوە، هەڵیاندەسەنگێنێت و حوکمیان بەباشە و بەخراپە بەسەرداندەدات. ئەو کایە فیکرییەی ئینسان تیایدا حوکمی باش و خراپ بەسەر دیاردە و ڕووداو و ئینسانەکانی دیکەدا دەدات، لە فەلسەفە و

زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا بە کایەی ئیتیک، یاخود ئەخلاقناسی ناونووسکراوە.
ئەم وتارە دەخوازێت لە ئەخلاقناسی بدوێت، بەتایبەتی لەو شێوەیەی ئەخلاقناسی ئەمڕۆکە لە "ڕۆژئاوادا" بە "ئەخلاقناسی پۆست مۆدێرن" ناودەبرێت و گفتوگۆیەکی بەرفراوان و هەمەلایەنی لەسەردەکرێت. بێگومان ئەم وتارە هەوڵدانێکی سەرەتایی و شەرمنە بۆ ئاشنابوون بەو دیالۆگە گەورەیە؛ دیالۆگێک تائێستا دەیان و بگرە سەدان کتێبی لەسەر نووسراوە و بەبەردەوامیش دەشنوسرێت و بەسەدان کۆڕ و سیمینار و کۆبوونەوەی ئەکادیمی بۆ سازکراوە و بەردەوامیش بۆی سازدەکرێت. هەر لەم سەرەتایەشدا دەمەوێت ئەو ڕاستییە بە خوێنەر بڵێم ئەم دیالۆگە ئەوەندە بەرفراوان و هەمەلایەن و فرەدەنگە زەحمەتە لەسنووری وتارێکدا تەنانەت هێڵە گشتییەکانیشی دەستنیشانبکرێت. بۆیە من لێرەدا بەناچاری هەوڵدەدەم لە ڕوویەک لە ڕووەکان و لە ڕەهەندێک لە ڕەهەندەکانی ئەو دیالۆگە بدوێم. مەبەستم لەو ڕووەش ئەو دیدە گەشبینەیە، کە هەندێک فەیلەسوف و زانای کۆمەڵایەتی دەربارەی مۆراڵی پۆست مۆدێرن و دونیای پۆست مۆدێرن هەیانە. لەو دیالۆگەشدا تەنها لەچەند لایەنێکی زۆر دیاریکراوی ئەم بابەتە ئەدوێم، کە دەشێت بەشێوەیەک لەشێوەکان لەکۆمەڵگای کوردیشدا ببێتە مایەی کردنەوەی دەرگایەک لەسەر سەرلەنوێ هەڵسەنگاندنەوەی ئەو سیستەمی بەها و سیستەمی نرخاندنەی لەم کۆمەڵگایەدا بۆ دەستیشانکردن و جیاکردنەوەی باش لە خراپ و ڕاست لە هەڵە و جوان لە ناشیرین بەکاردەهێنرێت. بە مانایەکی دیکە من لەم وتارەدا تەنها لەو بەشەی دیالۆگە فەلسەفی و فیکرییەکان ئەدوێم، کە دەخوازن جارێکی دیکە بە پێناسەکانی ئەخلاقناسیدا بچنەوە و لەژێر کاریگەری گۆڕانە گەورەکانی ئەم نیوسەدەیەی دواییدا، چوارچێوەیەکی نوێ بۆ نرخاندنی هەڵسوکەوت و چالاکییە ئینسانی و کۆمەڵایەتییەکان پێشنیاربکەن. لەمەشدا من زیاتر گرنگی بەو بەشەی ئەم دیالۆگە دەدەم، کە پێموایە دەشێت کاریگەری بۆسەر ئەو سیستمانەی دیکەی

ئەخلاقناسی هەبێت، کە لە دەرەوەی "ڕۆژئاوا" دا ئامادەن و ئینسان لەپاڵیاندا دەخوازێت وەڵامی ئەو پرسیارە ئەرستۆییە هەمیشەییە بداتەوە، کە دەپرسێت: چۆن بژین؟

ئەو هەڵوێستەی من لەم وتارەدا هەڵیدەبژێرم بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم باسەدا هەڵوێستێکە دوور لە هەموو ڕەشبینییەکی کولتوری. ئاشکرایە کارێکی زەحمەتە لە دونیای ئەمڕۆدا هەڵوێستێکی گەشبینانەی دوور لە پاسیڤیزمی کولتوری هەڵبژێرین و بەڕەحەت بخەوین وەک ئەوەی لە بەهەشت و یۆتۆپیایەکی وەدیهاتوودا نیشتەجێبین. ئامارە جیاوازەکانی زانستی سیاسی و زانستی ئابووری و سۆسیۆلۆژیا و بەشەکانی تری زانستە کۆمەڵایەتییەکان قسە لە کارەساتی ئینسانی گەورە و نایەکسانییەکی بێوێنە دەکەن، لە هەموو ڕووەیەکەوە لەنێوان بەشە جیاجیاکانی دونیای هاوچەرخدا. جگە لەمانەش لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا قسەکردن لەسەر دونیای پۆست مۆدێرن و مۆراڵی پۆست مۆدێرن وەک خراپترین و نائینسانیترین و پڕمەترسیترین قۆناغێک لەژیانی مرۆڤایەتیدا، بۆتە مۆدە و زۆربەی زۆری ئەخلاقگەر و کرۆپگەرا و ئایینخواز و ئایدیۆلۆژیستەکان بەشدارن لە سازدانی ئەم کۆراڵە غەمگینەدا. جگە لەمانە و بەباوەڕی ڕۆسیانو،Rosenau، دەشێت خودی بیریار و نووسەرە پۆست مۆدێرنەکان خۆشیان لەژێر سایەی هەڵوێستیان لە ڕەشبینی و گەشبینی کولتوریدا بکرێن بەدوویەشەوە، ئەوانەی بەدگومانن بەرامبەر بە دونیای ئەمڕۆ و بەرمبەر بە تواناکانی ئینسان و بەرامبەر بە ئەگەرەکانی گۆڕانی بەرەوباشتر، بەرامبەر ئەوانەی بنیادنەر، یان سەلمێنەری بیدێکی گەشبینن و باوەڕیان بە گۆڕان و باشترکردنی شوێن و جێی ئینسان لە دونیای هاوچەرخدا، هەیە. دیدی یەکەمیان باس لە پارچەپارچەبوون، قەیران، فەوزا، بێهیوایی، پوچی، مەرگی مانا و نەمانی ئەخلاق و کولتور دەکات، لەکاتێکدا دووهەمیان، بەبێ نکوڵیکردن لە گەورەیی و فرەڕەهەندی گرفتەکانی دونیای هاوچەرخ، بەشێوەیەک

لەشـێوەکان هیـوادار و گەشـبینە بەرامـبەر بەم دونیـایە و بەرامـبەر بەو ئەگەرە ناوەکییانەی ئەم دونیایە لە هەناویخۆیدا بۆ بەرپاکردنی گۆڕانی گرنگ و تەندروست و بەسـەمەر، هەڵیگرتـووە. یەکەمیـان بـاوەڕی بە هـیچ سیاسـەت و بزاوتێکـی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی نەماوە بۆ گۆڕان و بەرهەمهێنـانی مانـای نـوێ، لەکاتێکدا دووهەمیـان کـراوەیە بـۆ پراکتیکـی سیاسـی دیـاریکراو و گرێـدراو بە مەسـەلەی کۆمەڵایەتی و پـرۆژەی لۆکـاڵی تـایبەتەوە (Rosenau 1992: 14). لەم سـیاقەدا زیگمۆند باومان وەک پۆست مۆدێرنێکی گەشبین باس لەوەدەکـات، کە کۆمەڵگـای پۆسـت مـۆدێرن "دەشـێت لە کۆمەڵگـای قۆنـاغی مـۆدێرنە ئەخلاقیترێـت، بەڵام بێگومـان ئەم مەسـەلەیە تەواو دڵنیـا نیـیە. ئەمە تەنهـا ئەگەرێـکە و بەس" (Bauman 1998: 111)

ئەم وتارە دەخوازێت خـۆی لەو مـۆدە ڕەشـبینییە فیکـرییە بپارێزێـت و ناخوازێـت دونیـای هـاوچەرخ وەک جەهەنەمێکـی ئەخلاقـی ببینێـت و ناشـیەوێت ئینسـانی هـاوچەرخیش وەک بـوونەوەرێکی بـێ ئەخـلاق پێشـنیاربکات، لەهەمانکاتیشـدا هەوڵدەدات ئەو لایەنە ئیجابیانە دەستنیشانبکات، کە دەشێت ئەخلاقیاتی هاوچەرخ هەڵگریانبێـت. بە کـورتی ئەم وتـارە ناخوازێـت داوەتێکبێـت بـۆ گریـان، بەڵکـو دەیەوێـت پێشـنیارێک بێـت بـۆ ئومێـد، ناخوازێـت تاریکسـتانەکانی نـاو دونیـای بێئومێدیی هەندێک لە پۆست مۆدێرنەکان نیشاندات، بەڵکو دەخوازێت ئەو ڕێچـکە بچکۆلە و ڕۆشنانە بدۆزێتەوە و نیشانبدات، کە دەشێت دونیـای پۆسـت مـۆدێرن و فیکری پۆست مۆدێرن نیشـاندەریانبن. ئەم وتـارە دەیەوێـت ئەو ئەگەرە بچووکـانە ببینێت، کە زیگمۆند باومان لەسەرەوە هێماپێدەکات و وەک دەروازەیەک بۆ ئومێد پێشنیاریدەکات.

بینینـی دونیـا وەک ماکۆناڵـدێکی گەورە ئەو وێنـاکردنە ڕەمـزییەیە، کە لەپشـتی زۆربەی هەرەزۆری ئەو دیـدە کولتـورییە ڕەشـبینانەوە ئامـادەیە، کە لەدونیـای

هاوچەرخدا ئاهەنگی گریان و لە باشترین حاڵەتدا نۆستالجیایەکی ڕۆمانسییانە بۆ ڕۆژگار و سەردەم و ساتەوەختێکی تێپەڕیو و لەدەستچوو دەگێڕن. لەم دیدە گریاناویەدا "بەماکدۆناڵدکردنی دونیا" بەپلەی یەکەم مانای "بەئەمریکایکردنی دونیا" و بە ئەمریکایکردنی دونیاش یەکسانە بە نائینسانیکردنی دونیا. بێگومان دیوی ئەودیوی ئەم ماکدۆناڵدە گەردوونییە ئەو جیهادە ئایینییە، کە نەک تەنها ئیسلام بەڵکو زۆربەی زۆری ئایینەکان و چەندان بزاوتی ناسیۆنالیزمی توندڕەویی داخراو و دۆگمایی و چەندان بزاوتی ڕاسیزمی ڕەگەزپەرستانەش دەگرێتەوە، کە لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا بەرامبەر بەم ماکدۆناڵدە گەردوونییە بپێشنیارکراوە ئاڵای جیهادیان بەرزکردۆتەوە. لەهەردوو دۆخەکەشدا، هەم لەدۆخی بە ماکدۆناڵدبوون و هەم لە دۆخی جیهاددا، قسە لە نەمانی ئەخلاق و نەمانی ئەو چوارچێوە ئەخلاقییانە دەکرێت، کە دەشێت باش لە خراپ و ئەشێ لە ناشێ و ئینسان لە دڕندە و ڕاستی لە درۆ جیابکاتەوە. لەم وتارەدا من دەمەوێت خۆم لەم ڕەشبینییە کولتورییە و هەموو ئەو نرخاندنە ئەخلاقییە نێگەتیڤانە بپارێزم، کە لە پشتی ئەم دیدە ساکارەوە بۆ دونیا و بۆ دیاردەکان ئامادەیە. لەڕاستیدا هەڵبژاردنی ئەم هەڵوێستە بۆ قسەکردن لەسەر ئینسان و لەسەر ئەخلاق و لەسەر کۆمەڵگای هاوچەرخ لەو ڕاستییەوە سەرچاوەدەگرێت، کە ناکرێت دونیای هاوچەرخ و ئەخلاقی هاوچەرخ کورتکبرێتەوە بۆ پرۆسەی بەماکدۆناڵدکردنی دونیا و بۆ ئەو جاڕی جیهادەش، کە دژ بەم دونیا بە ماکدۆناڵدکراوە، ڕادەگەیەنرێت. لەنێوان ماکدۆناڵد و جیهاددا ڕووبەری دیکە و پرۆژەی دیکە و ئەگەری دیکەی ڕاڤەکردن و بەرگری و بنیادنانی ئەلتەرناتیڤی فیکری و کۆمەڵایەتی هەیە، کە من پێموایە ڕەهەندێک لە ڕەهەندەکانی فیکرد و کۆمەڵگای پۆست مۆدێرنە دەشێت هەڵگری بەشێک، ڕەنگە بەشێکی زۆر بچووکی، ئەو ئەلتەرناتیڤانە بێت.

بێگومان پرۆژەی بەماکدۆناڵدکردنی دونیا و پرۆژەی جیهاد دوو پرۆژەن

هەردووکیان ئامادەن و بەشێکن لە دونیای ئەمڕۆمان و هەریەکێکیشیان ستراتیژی تایبەت و شێوازی ئیشکردن و کولتور و دەزگا و هێزی تایبەتی خۆی هەیە. بەڵام ئەم دوو پرۆژەیە تاقە پرۆژە و دواهەمین پـرۆژە و دواهەمـین ئەگەری نـاو دونیـای هـاوچەرخ نیـین. لێـرەوە مـن لەم وتـارەدا هەوڵـدەدەم لەو ڕووە ڕووناک و ئەگەرە ئینسانییە گرنگانە بدوێم، کە قۆناغی پۆست مۆدێرنە و ئەخلاقیاتی پۆست مۆدێرنە هەڵگرین و لەهەمانکاتیشدا بەشێکن لەو وشیارییە ڕەخنەییەی ئەمڕۆکە لە "ڕۆژئاوا" و زۆر شوێنی دیکەشدا ئامادەیە. قسەکردن لەسەر ڕووە تاریکەکانی فیکر و لەسەر جەهەنەمەکانی دونیای هاوچەرخ بۆ ئەوانە بەجێدەهێڵم، کە چێـژ لە سـەفەری نـاو تاریکی دەبینن و لەهەموو بستێکی ئەم سەر زەمینەدا لەبـاتی ئەگەرێـک، گەرچـی زۆر لاوازیشبێت بۆ گۆڕان، کوورەی داخراو و کراوەی جەهەنەمێک دەبینن.

-٢-

مەسەلەی گەڕانەوەی ئەخلاقناسی بەشێوەیەکی بەرباڵو بۆ ناو کـایەی فەلسـەفە و کایەکانی تری ناو زانستە کۆمەڵایەتییەکان و بۆ سەر لاپەڕەی گۆڤار و ڕۆژنامەکان بەتەنهـا دیـاردەیەکی "ڕۆژئـاوایی" نیـیە. مەسـەلەی سـەرلەنوێ پێـداچوونەوە و ڕاڤەکـردنەوەی سیسـتمە ئەخلاقییەکـان لەزۆربەی زۆری کۆمەڵگاکـانی دونیـادا لە ئارادایە و ئەمڕۆکە ئەخلاقناسی لەبەردەم خوێنـدنەوەی نـوێ و پێـداچوونەوەیەکی نـوێ و سەرتاسـەریدایە. زەحـمەتە لەدونیـای ئەمـڕۆدا کۆمەڵگـایەک بـدۆزینەوە داخراوبێت، واتە بەشـێوەیەک لەشـێوەکان، یـان بەشـێکنەبێت لە گۆڕانکارییەکـانی دونیـای ئەمـڕۆ، یـاخود پریشـکی ئەو گۆڕانکاریـانەی بەرنەکەوتبێـت. نە تەنهـا لە ئەمستردام و پاریس و نیویۆرکدا ئەم سەرلەنوێ هەڵسەنگاندن و پێداچوونەوەیە بە

ئەخلاقناسیدا لەئارادایە، بەڵکو لە بێروت و کابول و تارانیشدا ئەم مەسەلەیە هاوچەرخە و یەکێکە لەگرنگترین ئەو ڕەهەندانەی، کە ململانێ کۆمەڵایەتی و کولتوری و سیاسییەکانی تێدا بەرجەستەدەبێت. بێگومان لەهەریەکێک لەم شوێنانەدا گوتاری جیاواز سەبارەت بە ئەخلاقناسی بەرهەمدێت و بەرهەمهاتووە، ئەوەی گرنگە جەختی لێبکەین ئەوەیە لەهیچ شوێنێکدا بێدەنگی بەرامبەر بە بابەتە لەئارادانییە. لەکاتێکدا لە کابول هەموو فەلسەفەی ئەخلاق تەسلیم بە ڕاڤەکردنێکی بەرتەسک و دۆگمایی و کوشندەی دەقە ئایینییەکان دەکرێتەوە و دونیای هاوچەرخ کورتدەکرێتەوە بۆ ئەو وێنانەی لە خەیاڵی ئاخوندە دینییە وەهابییەکاندا ئامادەیە، لە ئەمستەردام قسە لە ئەخلاقناسی پۆست مۆدێرن دەکرێت و ئەخلاق لەدەستی هەموو حیکایەتێک لە "حیکایەتە گەورەکان" و لە هەموو ناچاری و حەتمیەتێکی ئەخلاقی دەرەوەی هەڵبژاردنە تاکەکەسییەکان دەسێندرێتەوە. لەکاتێکدا لە کابول ژیان لەناو سنووری تەسکی فەتوا ئایینییەکاندا دەکوژرێت و ئەخلاقناسی ڕاستەوخۆ دەدرێتەوە دەستی لێکدانەوە تاریکەکانی ناو دین، لە ئەمستەردام ئەو دواهەمین تابو و حەرامانە دەشکێنرێن کەڕێگرن لەبەردەم هەرچی فراوانتربوونی سەرزەمینی ئازادییەکانی ئینساندا. لەکاتێکدا لە کابول بەردەوام حیکایەتی گەورە بەرهەمدەهێنرێت، حیکایتی دینی دۆگمایی، بۆ کوشتنی حیکایەتە بچووکەکانی ئینسان خۆی، لە ئەمستەردام حیکایەتە گەورەکان یەک لەدوای یەک دەمرن و فەزای کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی لێوانلێودەبێت لە حیکایەتە بچووکەکان، کە تاکەکەسە ئازادەکان نووسەر و بکەرەکانیانن.

مەبەست لە حیکایەتە گەورەکان هەموو ئەو دید و ئایدیۆلۆژیا و بۆچوونە گشتگیر و تۆتالیتاریانەن، کە هەڵگری گشتییەتێکی ئەوتۆن دەخوازن وەڵامی هەموو پرسیارەکانی ئینسان بدەنەوە و پێشیان وایە هەڵگری دواهەمین هەقیقەتن (Rosenau 1992: 6). مەسیحیەت، ئیسلام، مارکسیزم نموونەی ئەو حیکایەتە

گەورانەن، کە مۆنۆپـۆلیزەی هەقـیقەت دەکەن و پۆسـت مۆدێرنەکـان پێیـانوایە ڕۆژگاریان بەسەرچووە و کۆتاییان پێهاتووە و ئینسـان دەبێـت لەدەرەوەی ئەوانـدا حیکایەتی تاکەکەسانەی خۆی هەبێت و بنووسێتەوە.

-٣-

بێگومـان بـوونی جیـاوازی لەنێـوان ئەم شـوێنە جیـاوازانەی دونیـادا نابێـت بەرەو ئەوەمـان بەرێـت واتێـبگەین، کە "ڕۆژئـاوا" و "ڕۆژهەڵات" دوو پێکهـاتن لە ڕووی جەوهەرەوە لەیەکـدیجیاوازن و دوو دونیـان لە هـیچ ڕوویەکەوە لەیەکـدیناچن، دوو شتن لە هەمووشتێکدا لەیەکتر جیاواز و بەیەکتر نامۆ. من لەم وتارەدا دەستەواژەی "ڕۆژئاوا" بەردەوام لە نێوان دووکەوانەدا بەکاردەهێنم و دەمەوێت ئەم دەستەواژەیە بـخەمە ژێـر پرسـیارەوە و وەک پێـدراوێکی لـۆژیکی، کـۆمەڵایەتی، فەرهەنگـی و سیاسی مامەڵەی لەگەڵدا نەکەم. ئەم مەسـەلەیە بـۆ مـن مەسـەلەیەکی مەنهەجـی هێجگار گرنگە و سـەرچاوەکەی دەگەڕێـتەوە بـۆ بەرگریکـردن لەو دیـدەی پێیـوایە هەڵەیە چەمکـی "ڕۆژئـاوا" بـۆ دەستنیشـانکردنی جەوهەرێکـی جیـاواز لە جەوهەرەکـانی دیـکە بەکـاربهێنین، یـاخود وەک چەمکێـک بـۆ شـیکردنەوە و لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەی واقیعی ژیـانی ملیۆنەهـا ئینسـان و دەیەهـا کۆمەڵگـا و چەندان سیستمی ئابووری و سیاسی و فەرهەنگی جیاواز بەکاربهێنین. بەبۆچوونی مـن چەمکـی ڕۆژئـاوا لە دەرەوەی هێمـاکردنێکی زۆرگشـتیدا بـۆ سـەرزەمینێکی جوگرافی بەرفراوان و تایبەت، هیچ گرنگییەکی زانستی و مەنهەجـی دیـکەی نییـە. هەموو بەکارهێنانێکی ئەم زاراوەیە بۆ کردنی بە چەمکێکی فیکری دەمانخـاتە نـاو سـەرزەمینی جەوهەرگەرایـیەکەوە، کە دونیـا و کوولتـوور و شارسـتانیەت و

ئینسانەکان وەک جەوهەری نەگۆڕ و جیاواز و ناکۆکبەیەک پێناسەدەکات، جەوهەرێک، کە لە "غەریبیبوون"، یان "شەرقیبوون" ێکی گریمانکراوەوە هەڵدەقوڵێت و سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بەزۆر سەپاندنی جیاوازییەکی ئەنتۆلۆژی بانمێژوویی جەوهەرگەرای نەگۆڕ بەسەر سیاقە کۆمەڵایەتییە جیاجیا و پڕ گۆڕان و پڕ جوڵە هەمەجۆرەکاندا. بێگومان هەر سیاقێک هەڵگری هەلومەرج و تایبەتمەندی و خەسڵەتی تایبەتی خۆیەتی، هیچ سیاقێکیش نییە لەناوخۆیدا جێگیر و نەگۆڕ و میتافیزیکی بێت. هەر سیاقێک بریتییە لە سەرزەمینێکی پڕ ناکۆکی و پڕ جووڵە و پڕ ئەگەری تایبەتی گۆڕان، کە لەساتی جیاجیادا پێناسی جیاجیا و شێوەی جیاجیا دەگرێتەخۆی و وەڵامی جیاجیاش بە کێشە کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتورییەکان دەداتەوە. بەڵام ئەم جیاوازییانە سەرچاوەکەیان ناگەڕێتەوە بۆ بوونی جەوهەری جیاواز، کە گوایە لە بوونی کولتوری جیاوازەوە سەرچاوەیگرتووە. هەڵەی گەورە لەوەدایە بۆ بوونی ئەم جیاوازییانە لێکدانەوەی کولتوریی بکەین و کولتور بکەینە ئەو هۆکارەی پێمانبڵێت بۆ لە کابولدا ئەخلاقناسی بە کۆنەپارێزترین و نائینسانیترین و ناشیرینترین دەموچاوەکانی ئیسلام دەسپێردرێت و بۆ لە ئەمستردامدا بە عەقڵیەتێکی پۆست مۆدێرنی کراوە بۆ شێوازی جیاوازی ژیان و بۆ ئەخلاقیاتی لێبوردن و کۆتایی حیکایەتە گەورەکان لەئارادایە. کولتور ئەو ئامێرە گەورەیەی کۆپیکردنە نییە، کە ئینسانی لێکچوو و وەک یەک بەهەمانشێوە بەرهەمبهێنێت. لەڕاستیدا دەبێت ئەو خاڵە مەنهەجییەمان لا ئاشکرابێت، کە کولتور ئینسان دروستناکات، بەڵکو ئینسان کولتور دروستدەکات. ئەوەی جیاوازیی دەخولقێنێت، بەپلەی یەکەم، بوونی هێزی کۆمەڵایەتی جیاواز و ئامادەگی ستراتیژی جیاوازی دەسەڵات و بوونی پرۆژەی کۆمەڵایەتی جیاوازن، کە بەسەریەکەوە فۆرمێکی تایبەت بە مێژوو و ڕووداو و کێشەکانی ناو واقیعێکی دیاریکراو، ئەدەن، نەک کولتورێک، کە دەستنیشانی ئەوە

بکات ئینسان چی لەناو مێژوودا پیادەبکات و وازیش لەچی بهێنێت. بەمانایەکی دیکە بۆ تێگەیشتن لە بەشە جیاوازەکانی دونیای هاوچەرخ لەباتی گەڕاندنەوە بۆ کولتور و گریمانکردنی جەوهەری کولتوری جیاواز، دەبێت بگەڕێینەوە بۆ ناو پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و ستراتیژییەکانی دەسەڵات و جۆری ئەو پرۆژە سیاسییانەی هێزە کۆمەڵایەتییە جیاجیاکان لە ساتێکی مێژوویی دیاریکراودا هەڵگریانن.

چەندە وەهمێکی گەورەیە پێمانوابێت دەتوانین بەهۆی ئەتڵەسەکانەوە دونیا و کۆمەڵگا و سەرزەمینە جیاوازەکان بناسین، بەهەمان ئەندازەش هەڵەیە وابزانین لەڕێی ئەو دروستکراوە جەوهەرگەراییانەوە، کە بە کولتور ناودەبرێن لە دونیا تێبگەین. وەک چۆن بۆ ناسینی دونیا سەفەری واقیعی بۆ ئەو دیوی ئەتڵەسەکان پێویستە، ئاواش بۆ ناسینی کۆمەڵگاکان خوێندنەوەی ژیانی ڕۆژانە و هەڵسووکەوتی ئینسانەکان لە ناو پەیوەندییەکانی هێز و مانا و بەرهەمهێناندا پێویستە. کولتور لەباشترین دۆخدا ڕەگەزێکی زۆر بچووکی ناو ئەو کشتە ئاڵۆزەیە.

-٤-

گەڕاندنەوەی بەرفراوانی ئەخلاقناسی بۆناو دیالۆگە فەلسەفی و بۆناو زانستە ئینسانییەکان وابەستەی ئەو کۆمەڵە گۆڕانکارییە گەورانەیە، کە لە هەفتاکانەوە لە دونیای هاوچەرخدا بەرپان و تائێستاش لە بەرپابووندان. ئەم سەرزەمینی گۆڕانکارییانە لە ئەدەبیاتی فەلسەفی و لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا ناوی جیاجیایان لێنراوە و لەهەمانکاتیشدا بە دەگمەن ڕێدەکەوێت چەند فەیلەسوف و زانایەکی کۆمەڵایەتی بدۆزینەوە لەسەر جەوهەری ئەو گۆڕانکارییانە هاوڕابن و یەک

نید و بۆچوونیان دەربارەیان هەبێت. ڕاستە ڕێکەوتنێکی گەورە لە نێوان فەیلەسوفان و بیریاران و زانایانی کۆمەڵایەتیدا لەسەر قووڵی و بەربڵاوی و فرەڕەهەندی گۆڕانکارییەکان لەئارادایە، بەڵام ڕێکەوتنێکی ئەوتۆ لەسەر سروشت و ناوەڕۆک و شوناسی ئەو گۆڕانکارییانە لە ئارادانییە. هەندێکیان باس لە دروستبوونی کۆمەڵگا و هەلومەرجی پۆست مۆدێرن دەکەن، ئەوانیدیکەیان قسە لە قۆناغی درەنگ-کاپیتالیزم، یان کاپیتالیزمی درەنگوەخت دەکەن، سێیەم قسە لە جیهانگیریی دەکات و چوارەمیش باس لە قۆناغی کۆمەڵگای زانیاری و گوندی گەردوونی ئەکات، پێنجەمیش دونیای هاوچەرخ وەک دونیای دوای - پیشەسازی ناونووسدەکات، شەشەمیش باس لە بە ماکدۆناڵدبوونی دونیا و حەوتەم باس لە فراوانبوونی گوتاری جیاوازی دەکات. لەکاتێکدا هەندێک قسە لە هاوشێوەبوون و وێکچوونێکی ترسناکی بەشە جیاجیاکانی دونیا دەکەن، بە تایبەتی مەسەلەی بە ئەمریکاییکردنی دونیا، کەسانێکی دیکە هەن باس لەهەرچی زیاتر دروستبوونی جیاوازی و پەرەسەندنی گوتاری لۆکاڵە جیاجیاکان و هاتنەکایەی دونیایەکی فرەڕەنگ و فرە دەنگ دەکەن (Bauman 1998: 149).

بەهەرحاڵ کۆی ئەم گۆڕانکارییانە ئەوەندە گشتگیر و هەمەلایەن و قووڵن ئینسان ناچاردەکەن بەکۆی پێناسە و مانا و مەنهەجە کۆنەکانی ناسینی دیاردە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئەخلاقیەکاندا بچێتەوە. لەپێش هەمووشیانەوە پێداچوونەوە بە سیستەمەکانی ئەخلاق و ئەو چوارچێوە مۆراڵیانەی لە کۆمەڵگایەکی دیاریکراودا دەستنیشانی ماناکانی باشە و خراپە دەکەن و پێشنیاری ئەوە دەکەن ئینسان چۆن بژی. مۆراڵ، یان ئەخلاق بەشێوەیەکی گشتی بریتییە لە کۆی ئەو مانا و پرنسیپانەی، کە لە دەرەوەی تاکەکەس دان و دەکەونە سەرەوەی کۆمەڵگا و بوونێکی دەرەکی موفاریقیان هەیە. مۆراڵ لەشوێنێکدایە لە نێوان وشیاری و شتەکاندا. پێکهاتوە لە زنجیرەیەک نۆرم و بەها و حوکمی

ئەخلاقی و ئیستاتیکی و کولتوری. ئەم بەها و نۆرمانە نابینرێن، هەستەکان ناتوانن بیانگرن و بەشێوەیەکی فیزیکی بەرجەستەیانبکەن، بەڵام ئەوان ئامادەن و واش قسەیان لەسەردەکرێت وەک ئەوەی لەپشتی زۆربەی هەرەزۆری بڕیارەکانەوەبن و لەودیوی هەڵبژاردنەکانی ئینسانەوە ئامادەبن. تیۆرەکانی ئەخلاق پێماندەڵێن، کە فەزای بەهاکان فەزایەکی نەدیتراوە، بەڵام فەزایەکە وشیاری دەتوانێت پێناسیبکات و بیناسێت و ماناکان و داواکارییەکانی بدۆزێتەوە.

مادامەکی بەها ئەخلاقییەکان، لەوانە بۆ نموونە بەهاکانی باشە، خراپە، جوانی، ناشیرینی، ڕەحم و بەزەیی دڵڕەقی و بێدەربەستی هتد.. بوونەتە بەشێک لەپێکهاتی زمان و لەناو دەستەواژەکاندا جێگیرن، بۆیە بوونەتە بەشێک لە پێکهاتی وشیاریش. لێرەوە زەحمەتە قسە لە بوونی کۆمەڵگای بێبەها و ئینسانی بێبەها بکەین. مادامەکی زمان بوونێکی گەردوونی و هەمیشەیی هەیە و مادامەکی بەهاکانیش بوونەتە بەشێک لە پێکهاتی زمان بۆیە پێناچێت مرۆڤایەتی چاوەڕوانی دروستبوونی کۆمەڵگایەکبێت تیایدا بەهاکان کۆتاییانهاتبێت. بەهاکان لەناو ناچن، بەڵام ماناکانیان و شوێنیان لەناو سیستەمە ئەخلاقییەکاندا و کاریگەرییەکانیان لەسەر ئینسان و کۆمەڵگا دەگۆڕێت. لەدونیای ئەمڕۆدا مانای کۆنی بەهاکان و شوێنی مۆراڵ خۆی وەک سیستمێکی ئەخلاقی گشتگیر کەوتونەتە بەر ڕەشەبای گۆڕانێکی سەرتاسەری و واقیعێک هاتۆتە کایەوە، کە بەهاکان تیایدا بەردەوام پێویستیان بە پیاچوونەوە و سەرلەنوێ پێناسەکردنەوە هەیە.

سۆسیۆلۆژیای سەدەی ڕابردوو پێماندەڵێت بەهاکان ئەو شتانەن، کە ئینسان و هێزە کۆمەڵایەتییە جیاجیاکان لەناو کۆمەڵگایەکی دیاریکراودا بەیەکدیەوە گرێدەدەن. لەم دیدە سۆسیۆلۆژییە تەقلیدیەدا کۆمەڵگا بەبێ سیستمێک بۆ بەهاکان بوونی نییە و کۆمەڵگا خۆشی، بە مانایەک لەماناکان، بریتییە لە مەسەلەی بەشداریکردن هەموو ئەندامەکانی ئەو کۆمەڵگایە لە بەهاکاندا. لەم دیدەدا

کۆمەڵگا ئەو پێکهاتەیە، کە تاکەکان و گروهەکانی یەک سیستمی بەهای هاویەشیان هەیە، لەکوێشدا بەهای گشتی و ناوکۆیی نەما لەوێدا پشێوی و فەوزا باڵادەستدەبێت و شتێک بەناوی کۆمەڵگاوە بوونی نامێنێت، یاخود بوونی دەکەوێتە بەردەمی مەترسی گەورەوە.

ئەخلاقناسی لەمانا گشتییەکەیدا لەو سەرەتا سۆسیۆلۆژییەوە دەستپێدەکات، کە پێیوایە تاکەکانی ناو کۆمەڵگا تەنها لەڕێگای بەها و پرنسیپە ئەخلاقییەکانەوە دەشێت بەیەکدیەوە ببەسترێنەوە. لەم دیدەدا نەبوونی سیستمێکی ئەخلاقی هاویەش یەکسانە بە نەبوونی کۆمەڵگا. تاکەکان لەڕێگای بەهاکانەوە خۆیان بەیەکدیەوە گرێدەدەن و لەڕێگای بەهاکانەوە دەبنە ئەندامێکی ئەخلاقی کۆمەڵگا. لە سەدەی ڕابوردوودا و لەژێر کاریگەری سۆسیۆلۆژیای دۆرکهایمدا ئەم دیدە سۆسیۆلۆژییە بۆ ئەخلاق دەچەسپێت و بوونی کۆمەڵگا ڕاستەوخۆ بە بوونی سیستمێکی ئەخلاقی ناوکۆیی هاویەشەوە، گرێدەدرێت. لێرەدا بەهاکان وەک "چیمەنتۆیەکی کۆمەڵایەتی" پێشنیاردەکرێن و کۆمەڵگاش خۆشی وەک پێکهاتێکی یەکگرتوو و چوونیەکی ناو ئەو چیمەنتو کۆمەڵایەتییە پێناسکدەکرێت (Bauman 1998: 129-140). لە لاپەڕەکانی داهاتوودا جارێکی دیکە لەم دیدە دۆرکهایمییەوە و کێشەکانی ئەم دیدە ئەدوێین.

بێگومان گۆڕانە تەکنۆلۆژییەکان، بەتایبەتی تەکنۆلۆژیای جینەکان و لەبەریەکدی هەڵوەشاندنەوەی فۆرمە کۆنەکانی پەیوەندی و ئەو گروپانەش، کە لەژێرسایەی ئەو پەیوەندیانەدا دروستبووبوون، بۆنموونە لاوازبوونی سنوورە کۆنەکانی خێزان و دروستبوونی دەیان گروپی نوێی، کە دەکەونە ئەودیو خێزانەوە، لەدایکبوونی "کۆمەڵگای شەبەکەیی"، کە تیایدا ئینسان لەیەککاتدا بەسەدان پەیوەندی ئاسۆییەوە بەدەرووبەرییەوە بەستراوەتەوە، بەبێئەوەی لایەنێکی باڵادەست بەناوی کولتور، ئایدیۆلۆژیا، یان ئاینەوە هێزی ئەوەی هەبێت دەستنیشانی ئەوەبکات

ئینسان چۆنبژی و شوناسی خۆی چۆن دیاریبکات، هەرەسی یەقینە کۆنەکانی ئـایین و ئایـدیۆلۆژیا گشـتگیرەکان، کە ڕاسـتەوخۆ و ناڕاسـتەوخۆ ئینسـانیان ڕێنماییـدەکرد بـۆ ئەوەی بەپێـی نەخشـە فیکـری و ئەخلاقییەکـانی ئەوان بـژی، بڵاوبوونەوەی ڕۆحانیەتی ئیستیهلاکی و لەدایکبـوونی کولتـوری سـەفەر و دیدگای سـەیرانکەر، هاتنەکـایەی ماکدۆناڵـد و مادۆنـا و مایکـل جاکسـۆن و دروسـتبوونی ئیمامی ناو تەلەفزیۆنەکان هتد.... هەموو ئەم گۆڕانکارییانە وایانکردووە ئینسان لە دونیـایەکی نوێـدا بـژی جیـاواز لەو دونیـایەی جـاران ئایـدیۆلۆژیا و ئـایین وەک یەکەیەکی یەکگرتوو و ڕێکچووی دروست، یـاخود پێشـنیاریاندەکرد. دروسـتبوونی ئەم دونیـا جیـاوازەیە وایکـردووە لەدونیـای ئەمـڕۆدا جـارێکی دیـکە بە توونـدی ئەخلاقناسی ببێتە یەکێک لە بابەتە سەرەکییەکانی خوێندنەوە و تێڕامان.

لەڕاسـتیدا پرۆسـەی جیهـانگیری، عەولەمە، کە پرۆسـەیەکە تیایـدا ئابوورییەکـان، کولتورەکان، ئینسانەکان، ئامێرەکان و زانیارییەکان لە تێکەڵبوونێکی هەمەلایەندان، وایکـردووە چوارچێـوە کۆنەکـانی ئینتیمـای ئینسـان و چوارچێـوە کۆنەکـانی پێناسـەکردنی چـاکە و خـراپە و ڕەهەنـدە جیاوازەکـانی شـوناس بـکەونە ژێـر پرسیارەوە. لەڕێگای پرۆسە ئاڵۆزەکانی جیهانگیرییەوە دونیـایەک دروسـتبووە ئەو پێناسـە کۆنـانەی ئینسـان بـۆ ئیتیـک و کێشـە ئەخلاقییەکـانی دەکـرد لە ڕوویەڕووبوونەوەی دونیای ئەمڕۆدا و لە دیـاریکردنی ئەو چوارچێوە گشـتییەدا، کە ئینسـان لەناویـدا ماناکـان و شوناسـەکان و هەڵسـوکەتەکانی بەرهەمـدەهێنێت، کورتبهێنێـت و پێویسـتی بەپێـداچوونەوەیەکی سەرتاسـەری هەبێـت. لە دونیـای جیهانگیریدا ئینسان ناچـارە بەدوای دیـدی دیـکە و بۆچـوونی دیـکە و هەڵوێسـتی دیکەدا بگەڕێت هەم لەبەردەم ژیان و کۆمەڵگـادا و هەم لە بەرامـبەر ئینسـانەکانی دیکەشدا. دونیای پۆست مۆدێرن و مـۆراڵی پۆسـت مـۆدێرن بەشـێکن لەو پرۆسـە قووڵ و هەمەلایەنەی گۆڕانکاری ئەمڕۆ لە دونیادا ئامادەیە. پێشنەوەی بێینە سـەر

دەستنیشانکردنی ماناکانی ئەم چەمکی دونیا پۆست مۆدێرن و ئەخلاقی پۆست مۆدێرن، با جارێک سەرنجێکی گشتی لە ماناکانی ئەخلاقناسی بدەین.

-٥-

لەم باسەدا هەردوو چەمکی "ئیتیک" و "مۆراڵ" بەیەک مانا بەکارهاتوون، بە مانای ئەخلاق، گەرچی لە ئەخلاقناسیدا ئەم دووچەمکە لەیەکدی جیاوازن و هەریەکێکیان مانای تایبەتی هەیە و بۆ مەبەستی تایبەتیش بەکاردێن. بەکارهێنانی ئەم دوو چەمکەش بەهەمان مانا لەم وتارەدا بە مەبەستی ئەوەیە، کە وێنەیەکی گشتی دیالۆگە زاستی و فەلسەفییەکان سەبارەت بە ئەخلاقناسی نیشانبدەم، نەک ئەو هەموو وردەکاری و جیاکارییە چەمکییەی فەلسەفەی ئیتیک قسەی پێ لەسەر ئینسان و کۆمەڵگا و کارو کردەوەی تاک و گروپەکان دەکات. ئەمەی دواییان کاری بەشەکانی فەلسەفە و ئەو کەسانەن، کە ئیتیک سەرزەمینی کارکردنی رۆشنبیرییانە.

لەفەلسەفە و زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا زیاد لە پێناسێک و زیاد لە بۆچوونێک بەرامبەر ئەخلاقناسی هەیە، رەنگە تا ئەو شوێنەش پێدابگرین و بڵێین هەر فەیلەسوف و زانایەکی کۆمەڵایەتی تیۆرەیەکی تایبەت و تێگەیشتنێکی دیاریکراوی بۆ ئەخلاقناسی هەیە. لەم رووەوە ئەخلاقناسی ئەفلاتوون جیاوازە لە ئەخلاقناسی ئەرستۆ و ئیتیکی هۆبز ناکۆکە بە ئیتیکی کانت. لە ئیسلامیشدا ئەخلاقناسی موعتەزیلە زۆر جیاوازە لە ئەخلاقناسی ئیسلامی سوونەتی و لە نێوان ئەخلاقناسی ئیبن روشد و ئەخلاقناسی غەزالیدا دەریایەک جیاوازی هەیە. من لێرەدا کات و شوێنی ئەوەم نییە ئەم جیاوازییانە نیشانبدەم، بەڵام خوێنەر دەتوانێت راستەوخۆ

بۆ هەر کتێبێکی سەرەتایی دەربارەی ئەخلاقناسی بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەم جیاوازییانەی بۆ دەربکەوێت.

بەشێوەیەکی گشتی پێناسەی ئێتیک چ لە فەلسەفە و چ لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا بریتیە لەو چوارچێوە و پرنسیپە گشتییانەی بەهۆیانەوە هەم ئینسان و هەم کۆمەڵگا بڕیاری ئەوە ئەدەن چی بە باش و چی بە خراپ، چی بە جوان و چی بە ناشیرین، چی بە بەرپرسیار و چی بەبێدەرپەست، کێ بە زۆردار و کێ بە داوەر، کێ بە بەڕەحم و کێ بە بێڕەحم و چی بە ئینسانی و چی بە نائینسانی، دابنێن. بەمانایەکی دیکە دەکرێت بڵێین ئێتیک، یان ئەخلاق، بریتیە لەکۆی ئەو پرنسیپانەی لە کۆمەڵگایەکی دیاریکراودا یاساکانی ڕەوشت و هەڵسوکەوتکردن دەستنیشاندەکەن. ئەم چوارچێوە گشتییەش هەمیشە لەلایەن پرنسیپێک، یاخود کۆمەڵی پرنسیپەوە بەڕێوەدەچێت، کە پرنسیپی ترانسێندالن، واتە موفاریقن و دەکەونە ئەودیوی هەڵسوکەوتەکان خۆیانەوە ( De Graaf1979: 1).

بێگومان مەبەست لە پرنسیپە گشتییەکانی ڕەوشت بە تەنها ڕەوشتی تاکەکان نییە بەرامبەر بە یەکتری بەڵکو هاوکات مەبەست لەو ڕەوشت و هەڵسوکەوتە بەئاگا و بێئاگایانەشە، کە ژیانی تاکەکان لە گەڵیەکدا، لە بەرامبەر گروپەکاندا ڕێکدەخات، هەروەها ژیانی گروپەکان بەرامبەر بە تاک و بەرامبەر بە گروپەکانی تر ڕێکدەخات و بەڕێوەیدەبات. کەوابوو ئەخلاقناسی بریتییە لە چوارچێوەی ژیانی ئەخلاقی کۆمەڵگایەک، کە تیایدا تاک و گروپەکان لەسەر ئەو یاسا و ڕێسا و سەرەتایانە ڕێدەکەون، کە لەسایەیاندا ئەو لایەنانە لەگەڵیەکدیدا و لەگەڵ دونیای دەرەوەدا هەڵسوکەوت بکەن و بڕیاری ئەوەبدەن چۆن بژین.

لەڕاستیدا جەوهەری ئێتیک، یان مۆراڵ، یان ئەخلاق بەو شێوەیەی لە فەلسەفە و سۆسیۆلۆژیای بەر لە پۆست مۆدێرنەدا پێناسکراوە، گەڕانە بەدوای ئەو پرنسیپ و

بنەما ئەخلاقییە رەهایە، بان کات و بان شوێنە گشتییانەدا، کە خەڵک بەیەکەوە گرێدەدات. ئەو شتانەی، کە وادەکات گروپێکی دیاریکراو بەیەکەوە کۆبکاتەوە و بەیەکەوەبژین و بەیەکەوە ماناکانی چاکە و خراپە دابەشبکەن. بیرکردنەوە لە ئیتیک بیرکردنەوەیە لە ڕەوشتی ئینسان و هەڵسوکەوتەکانی لەژێر سایەی پرنسیپەکانی چاکە و خراپە، بەها و نرخەکان، هەڵبژاردن و بەرپرسیاریدا. بەم مانا تایبەتە ئەتیک لەمێژە لەیەککاتدا هەم بابەتی فەلسەفە و هەم بابەتی تیۆلۆژیا، واتە خوداناسی، و سۆسیۆلۆژیا و ئەنترۆپۆلۆجیای کولتوریشە. لەهەموو ئەم بەشانەشدا هەمیشە تیۆرەی ئیتیک پشتئەستوور بووە بە پرنسیپێک، یان چەند پرنسیپێک، کە رەهان، واتە بان کات و بان شوێنن، پرنسیپی ترانسێندالی موفاریق، کە تێپەرینی کات و جیاوازی شوێن کاریگەری لەسەر مانەوە و لەسەر هەقیقەتی ئەو پرنسیپانە دروستناکات. .

با چەند نموونەیەک بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو بۆچوونانەی سەرەوە بهێنینەوە.

بۆ نموونە بیرۆکەی چاکەکاری لەئاییندا بیرۆکەیەکە وابەستەی شوێن و کات نییە، بەڵکو وابەستەی جەوهەرێکی بان مێژووی نا ئەرزیە، کە لە ڕاستیدا جەوهەری خوداوەند خۆیەتی. خوداوەند چاکەیەکی موتڵەقە و مۆراڵی ئینسان لەو چاکەکاریە بان مێژوویەوە سەرچاوە دەگرێت و دەبێت لەژێر مەرج و داواکارییەکانی ئەو چاکەکارییە ڕەهایەدا کاربکات. لە سۆسیالیزمدا ئەخلاق وابەستەی بیرۆکەی عەدالێتێکی سەرتاسەریە، کە بوونێکی بابەتی هەیە و عەقڵ تەنانەت لە حاڵەتی نائامادەگی ئەو عەدالەتەدا دەتوانێت هەستیپێبکات و بیناسێت، ئەم بیرۆکەی عەدالەتە لەدەرەوەڕا دەستنیشانی ئەوەدەکات چی باشەو چی خراپە، چی بکرێت و چی نەکرێت. مۆراڵی سۆسیالیزمی ئەو مۆراڵەیە، کە مەرج و داواکارییەکانی گەیشتن بەو عەدالەتە قبووڵدەکات.

گەر بۆ یۆنانی کۆن بگەڕێینەوە دەبینین ئەرستۆ پێیوابوو، کە تەنها ئینسان

خاوەنی ئەو دەستەواژە سەرەکییانەیە، کە لەڕێگەیەوە ئەخلاقناسی تەعبیر لەخۆی دەکات. بۆ نموونە دەستەواژەی یەکسانی و داوەری دوو دەستەواژەن، کە نە ئاژەڵ و نە خواوەندەکان هەستپێناکەن و نایناسن. ئاژەڵ نایناسێت چونکە ناتوانێت بیریکاتەوە و ئەم شێوە ئامازانە بەرهەمبهێنێت، خوداوەندەکانیش چونکە نامرن و سنورێک بۆ تواناکانیان لەئارادانییە، بۆیە ناتوانن ئەو چوارچێوەیەیان هەبێت، کە لە ناویدا ئەخلاق لەدایکدەبێت. قسە لە ئیتیک لەو ناوەندانەدا دەکرێت، کە هەڵبژاردنەکانی ئینسان سەرتاسەر ئازادانە بێت و ئاراستەیەکیش پڕ گرفتبێت. (Martha Nussbaum 1999: 27) خوداوەندەکان مادامەکی گرفتیان نییە ناتوانن بوونەوەری مۆراڵی بن. لای ئەرستۆ کۆمەڵێ خیبرە هەن لە ژیانی ئینساندا، کە خیبرەی ئەساسین و لە هەموو شوێن و جێیەک هەن بەڵام دەشێت کولتورەکان فۆرم و شێوەی جیاواز بەم خیبرانە بدەن. بەباوەڕی ئەرستۆ ئەو خیبرانە خیبرەی بەرکولتورین. خیبرەی ئەو ڕاستییەن، کە ئینسان ئینسانە، ئەمەش وادەکات ئەم خیبرانە گەردوونی بن. بوونی جەستە و سنوور و تواناکانی جەستە، بوونی مەرگ، بوونی ئازار، بوونی چێژ، بوونی توانای تێگەیشتن، توانای پرسیارکردن و گەڕان بە دوای وەڵامدا، خیبرەی حەز، خەم، دۆڕاندن، هاوڕێیەتی و پەیوەندی کۆمەڵایەتی، پێویستی بە پێکەنین و پێویست بە خۆشی و بەختەوەری، هەموویان کۆمەڵێک خیبرەن، کە لەهەناوی ژیان خۆیدا ئامادەن گەرچی کولتورە جیاوازەکان شێوە و فۆرمی جیاوازیان پێدەبەخشن. (Martha Nussbaum 1999: 25-30)

لە ڕاستیدا هەرخودی ئەم خیبرانەن، کە مۆراڵی پۆست مۆدێرنە بۆیاندەگەڕێتەوە و دەخوازێت بەرگریانلێبکات، بەڵام لەچوارچێوەیەکی تیۆری و فەلسەفی و کۆمەڵایەتی جیاواز لەوەی ئەرستۆ و جیاواز لە سەردەمی شارە یۆنانیە کۆنەکاندا. هەر ئەمەشە وایکردووە ئەخلاقی پۆست مۆدێرنە ئەخلاقێک بێت لە گەڕانەوەیەکی بەردەوامدابێت بۆ یۆنان، بەڵام یۆنانی بەر لە ئەفلاتوون و بەر لە دروستبوونی ئەو

ئایدیایانەی دەکەونە ئەودیوو ژیان خۆیەوە. لەگەڵ ئەفلاتوندا بەهاکان لە ژیان دەسێندرێتەوە و دەدرێتە دەستی وێکچوونێکی بەزۆری دیاردەکان لەگەڵ ئەو دونیا ئایدیالیەدا، کە ئەفلاتوون لەو دیوی واقیع و لەودیووی ژیانەوە بەرقەراریدەکات. لێرەوە ئەخلاقناسی پۆست مۆدێرن تا سەر ئێسقان ئەخلاقناسییەکی دژ بە ئەفلاتوون و هەموو شێوە کۆن و تازەکانی ئەفلاتوونیەتە.

-٦-

بۆئەوەی مەسەلەی گەردوونیبوون و بان ـکات بوونی ئەخلاقناسی لە قۆناغی بەر لە پۆست مۆدێرنەدا زیاتر ڕوونبکەمەوە هەوڵدەدەم کەمەکێک لەسەر ئەخلاقناسی لای کانت بووەستم. کانت پێیوابوو ناکرێت ئەخلاق، یان ئێتیک لەسەر بناغەی ئەو پرنسیپانە دابمەزرێن، کە کاتین و ناکرێت لەهەموو شوێنێکدا پراکتیکبکرێن. بۆنموونە ئەخلاقناسی ناتوانرێت لەسەر بنەمای چێژ و لەزەت دروستبکرێت چونکە هەم چێژ و هەم لەزەت دوو شتی کاتین و بەردەوام لە گۆڕاندان، لەکاتێکدا ئەخلاق پێویستی بە بوونی پرنسیپی نەگۆڕ هەیە. کانت پێیوایە ناتوانین ماناکانی باشە و خراپە لەپاڵ ماناکانی چێژ و لەزەتدا دەستنیشانبکەین و بڵێین ئەوەی چێژی ئینسان زیاددەکات باشە و ئەوەی ئەم چێژە کەمدەکاتەوە، یاخود ئینسان تووشی ئازاردەکات، خراپە. هۆکەشی ئەوەیە چێژو و لەزەت هەردووکیان پەیوەندیان بەخیبرەی ئینسانەوە هەیە و خیبرەی ئینسانیش هەمیشە لەگۆڕاندایە و وابەستەی کات و شوێنی دیاریکراوە، بۆیە ناکرێت تیۆرەیەکی ئێتیکی نەگۆڕمان هەبێت لەسەر بنەمای ئەم دوو پرنسیپە، کە خۆیان بەردەوام دەگۆڕێن. بەمانایەکی دیکە کانت دەیەوێت بڵێت ئێمە ناتوانین تیۆرەیەکمان سەبارەت بە ئێتیک هەبێت، کە

پشتئەستووربێت بە پرنسیپێک، کە خۆی هەمیشە لە گۆڕاندابێت( De Graf 1979: 29). پرنسیپی هەمیشە گۆڕاو ناتوانێت کۆمەڵێک بەهای نەگۆڕ دروستبکات، کە هەمووان ناچاربین پەیڕەویبکەین. ئەو پرنسیپەی، کە موتڵەق، یان ڕەها نییە و بۆ هەموو شوێن و جێی و ڕۆژگارێک دەستنادات، ناتوانێت چوارچێوەیەکی نەگۆڕمان پێشکەشبکات، کە بەهۆیەوە بتوانین دەستنیشانی ژیانی ئەخلاقی خۆمان بکەین و بڕیاربدەین چۆن بژین. لێرەوە کانت لەباتی لەزەت بیرۆکەی ئەرک، یان واجیب، دەکاتە بنەمای فەلسەفەی ئەخلاقناسی. کانت ئەڵێت ئیرادەی چاکەکەر، یان چاکەخواز ئەو ئیرادەیەیە لە بیرۆکەی لەزەتەوە دەستپێناکات، بەڵکو لە بیرۆکەی ئەرکەوە دەستپێدەکات. بە باوەڕی کانت ئەرکی ئینسانە ئەوەیە چاکەکارییکات بێئەوەی چاوەڕوانی چێژ، یان لەزەتێکی دیاریکراوبێت لەو چاکەکردنەی. کانت وەک ڕۆشنگەرێک باوەڕی تەواوی بەوەبوو ئینسان بە حوکمی ئینسانبوونی، بەحوکمی عەقڵانیبوون و بەحوکمی توانای وەگەڕخستنی عەقڵی پێویستە کۆمەڵێک ئەرک جێبەجێکات، بەبێئەوەی چاوەڕوانی ئەوەبێت ئەو جێبەجێکردنە ئامانجێکی دیاریکراوی بۆ بهێنێتەدی(De Graf 1979: 29). لەڕاستیدا (کاتاگۆریە ئیمپریتیفەکان)، یاخود گوتراوە بابەتییەکانی کانت کۆمەڵێ پرنسیپن، کە وابەستەی هیچ ئامانجێک و وابەستەی هیچ داواکارییەک و هیچ ئارەزوویەک نین، بەڵکو وابەستەی بەهاکان و ئەرکەکانن. کانت کۆمەڵێک ئەرکی دیاریکراو و موفاریق دەستنیشاندەکات و دەڵێت ئەم ئەرکانە گەردوونین و بریتین لەکۆمەڵێک پرنسیپ، کە ئینسان بەر لە هەڵسان بە کار و کردەوەکانی، پێویستە ئاگاداریانبێت تا وریابێت لەوەی کاری هەڵە و کاری خراپەکارانە نەکات.

بە کورتی کانت بیرۆکەی ئەرک دەکاتە تاقە سەرچاوەی ئەخلاق و هەموو فەلسەفەی ئەخلاقناسی خۆی. بەڕای هەندێک فەیلەسوف کانت ئەوەندە پێ لەسەر فیکرەی ئەرک، واتە واجیب، دادەگرێت ئیدی هیچ شوێنێک بۆ مامەڵە و

هەڵسوکەوتی ئەخلاقـی خۆبەخـۆ و خۆڕسـک نـاهێڵێتەوە (De Graf 1979: 30). کانت بیرۆکەی ئەرک دژ بە بیرۆکەی مەیل، یاخود ئارەزوو دادەنێت. بەڕای کانـت ئارەزوو بەشێکە لە سروشتی مرۆڤ، بۆیە ناتوانێت لەڕووی ئەخلاقییەوە باشبێت، چونکە لەدیدی کانتەوە ئەخلاق سەر بەسروشتی ئینسان نییە، بەڵکو پیادەکردن و شوێنکەوتنی کۆمەڵێک پرنسیپن کەدەکەونە ئەودیوی سروشتی ئینسـان خۆیەوە. کانت باوەڕیشی وابوو، کە ئینسان لە نیازی کردنی چاکەوە نابێت بە بوونەوەرێکی ئەخلاقـی، بەڵکـو لەوکـاتەوە دەبێـتە بـوونەوەرێکی ئەخلاقـی، کە لە ئـازادییەوە دەستپێبکات و چاکەکاری بکات. بەمانایەکی دیکە ئینسان کاتێک بـوونەوەرێکی ئەخلاقیـیە، کە لەپشـتی چاکەکـارییەکەیەوە هـیچ حەتمیەتێکـی کـۆمەڵایەتی و بـایۆلۆجی ئامادەنەبێـت ناچاریکـات چـاکە بکـات، بەڵکـو چـاکەکردن دەبێـت لە ئازادییەکەوە هەڵقوڵابێت، کە بە ئەرکی خۆی بزانێت چاکەبکات، نەک بەشێوەیەک لە شێوەکان ناچارکرابێت چاکەکاری بکات. ئینسـان دەبێـت هەمووکـات پەیـڕەوی ئەم پرنسیپانە بکـات، بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی ئەنجامەکانی ئەم پەیڕەویکـردنەی بێت (De Graf 1979: 29).

مەترسی ئەم جۆرە تێگەیشتنە بۆ ئەخلاق لەو پێداگرتنە پێشـینەییە قورسـەدایە لەسەر کۆمەڵێک بەها و پرنسیپ، کە پێش بینینی دەرەنجامی کـار و کردەوەکـان جەبرەکانی خـۆی پیـادەکردووە (De Graf 1979: 30). بیـرۆکەی ئەرک دەشـێت دواجار کۆمەڵێک بەها و ئەنجام بخاتەوە، کە بەهۆیانەوە بەر لەهەموو شتێک وزەی چێژوەرگرتن لە ژیان بکوژرێت. جگەلەمەش ڕەنگە یەکێک لە مەترسییە گەورەکانی بیرۆکەی ئەرک ئەوەبێت ئینسان بکاتە بوونەوەرێکی دەسـتەمۆ و گـوێڕایەڵ. جـگە لەمە گـوێگرتن بـۆ ئەو ئەرک و پرنسـیپانە، کە بەهیچجۆرێـک دەربەسـتی ئەو دەرەنجامـانە نیـیە، کە دەشـێت بیانخـاتەوە، دەشـێت مەترسـی دیـکە بخـاتەوە. بۆنموونە مەرجنییە ئیـرادەی کردنـی چاکەکـاری هەمیشـە دەرەنجـامی چاکەکـارانە

بدات بەدەستەوە، دەشێت ئیرادەیەکی چاکەخواز کاری خراپەکارانە بەرهەمبهێنێت. کەوابوو مەرجنییە دەرەنجامی کارەکان هەمیشە یەکانگیرنین لەگەڵ ئیرادەی بەر لە ئەنجامدانی کارەکاندا، لێرەوە مەرجنییە بیرۆکەی ئەرک بەردەوام ئەو دەرەنجامە باشانە بخاتەوە، کە کانت لێی چاوەڕواندەکرد (De Graf 1979: 31).

بەکورتی، لای کانت یاساکانی ئەخلاق، یاساکانی چاکەکاری و فەزیلەت، یاسای بان ـمێژوویی و بان ـشوێن و بان ـکاتن. ئەم یاسایانە گەردوونین و نەگۆڕیشن و دەکەونە دەرەوەی ئینسان و دەرەوەی کۆمەڵگاشەوە. لەزەت، کە لەدیدی کانتدا کاتییە سەر بەم کاتاگۆریانە نییە. کانت وەک ڕۆشنگەرێک باوەڕی تەواوی خۆی بە عەقڵ دابوو بۆ دۆزینەوە و داڕشتنی پرنسیپە ئەخلاقییە بابەتییەکان، ئەو پرنسیپانەی دەستنیشانی ئەوەدەکەن چی چاکە و چی خراپ، ئینسان چیبکات و چۆن بژی.

ئەو دژایەتییەی کانت لەنێوان ئارەزوو و ئەرکدا دەیکات دواتر لەسەردەستی هیگڵدا لەناودەبرێت. هیگڵ دێت و جیاوازیی نێوان ئەرک و ئارەزوکرد، کە جیاوازییەکەی جەوهەرییە لای کانت، لەناو یەک پێکهاتەدا کۆدەکاتەوە. هیجڵ هەم ئەرک و هەم ئارەزوو وەک ساتەوەختێکی دیاریکراوی گەشەی دیالەکتیک دەبینێت. کانت پراکتیکی چاکەکارانە و ئایدیالەکانی چاکەکاری لێکدادەبڕێت لەکاتێکدا هیگڵ ئەم دووانە بەیەکەوە دەبەستێتەوە و لە فۆرمێکی واقیعییانەدا جێگیریاندەکات. لەلای هیگڵ چاکەکاری خۆی بەشێکە لە ماهیەتی عەقڵ، یان ڕۆحی ڕەها خۆی و لەناو دیاردە کۆمەڵایەتی و کولتورییەکاندا بەرجەستەدەبێت. ئەم ماهیەتەی عەقڵی ڕەهاش ماهیەتێکی جێگیرە گەرچی دەرکەوتەکانی لە ساتەوەختی جیاوازدا گۆڕانیان بەسەرداتێت و بەشێوەی جیاواز دەردەکەون. لێرەوە هیگڵ لەباتی فیکرەی ئەرک لای کانت، فیکرەیەکی دیکەی بان ـکات و بان ـمێژوو دەکاتە بنەمای مۆراڵ، ئەویش فیکرەی ڕۆحی ڕەهایە.

-٧-

ئەخلاقناسی پۆست مۆدێرن لە خاڵی داڕمان و بزربوونی ئەو بنەما بان ـکات و بان ـشوێن و ڕەهایەوە دەستپێدەکات، کە لەسەرەوە کانت و هیگڵ و، لەبوای ئەوان و لەپێش ئەوانیشەوە بە دەیان فەیلەسوف و زانای کۆمەڵایەتی دیکە، بە بنەمای هەموو تیۆرەیەکی ئەخلاقناسییان زانیوە. ئەو بنەمایانە، کە پێوەرێکی ڕەها بۆ چاکەکاری و خراپەکاری پێشنیاردەکەن و لادان لەم پێوەرە بە نەشیاو و نەکردە دەزانن. زۆرجار ئەم پێوەرە رەهانە جگە لە خەونێک، یان وەهمێک زیاتر نەبوون. لەم ڕووەوە قۆناغی پۆست مۆدێرنە، وەک زیگمۆند باومان دەڵێت، بریتیە لە خودی مۆدێرنە، بەڵام بەبێ وەهمەکانی مۆدێرنە (Bauman 1998: 105). بەمانایەکی دیکە دونیای پۆست مۆدێرن هەمان ئەو دونیایەیە، کە مۆدێرنە هێناویەتیەکایەوە، بەڵام بەبێ ئەو مژدە و خەون و وەهمانەی، کە ڕۆشنگەری، وەک گرنگترین ساتەوەختی مۆدێرنە، جاڕی هاتنیان ڕادەگەیەنێت. پۆست مۆدێرنە قۆناغی مۆدێرنەیەکی شەرمن و دروستبوونی عەقڵێکی شەرمنە، کە هەردوکیان سنوور و تواناکانی خۆیانیان بۆ ئاشکرابوە و لەو مەترسییانەش ئاگاداربوونەتەوە کەدەشێت هەردووکیان بەرهەمیبهێنن.

بەر لە ڕۆشنگەری تیۆرەکانی ئەخلاق تیۆرەی ئایینی بوون و لەپاڵ خوداناسیدا ئامادەبون، ئەفلاتوونیەتی نوێ چ لەدونیای مەسیحیەتدا و چ لەدونیای ئیسلامدا ژێرخانی زۆریەی هەرەزۆری تیۆرەکانی ئەخلاقناسی بوو. ئایین دەستنیشانی مەسەلەکانی چاکە و خراپە و ئەشێ و ناشێکانی دەکرد، هەروەها پێناسی ئەو دیاردە و ڕووداو و سەرزەمینەشی دەستنیشاندەکرد، کە ئینسان پێویستە لەڕووی ئەخلاقییەوە لەناویاندا بجوڵێت و بژیت. لە قۆناغی بەر لە ڕۆشنگەریدا ئایین ئابووری کۆمەڵگا و ئابووری ئەخلاقناسیی بووە و بەناوی بوونی هەقیقەتێکی بان ـ

کاتی و بان ـ شوێنەوە ئینسانی بەدەیان جەبر و ناچاری و داواکاری ئەخلاقی و ڕۆحییەوە بەستۆتەوە. قۆناغی ئایین، کە بێگومان تا ئەمڕۆش بەشێوەی جیاواز و بە توانا و هێزی جیاوازەوە لە کۆمەڵگا جیاجیاکاندا ئامادە و بەردەوامە، ئاراِدەیەکی زۆر قۆناغی بەندکردنی ئینسانە لەناو زیندانی ئایەت و گوتە و ئەمر و نەهییەکانی ئەولەنەی بەناوی خوداوە و بەناوی دەسەڵاتێکی پیرۆزەوە لەباتی خوداوەند دواون. لەم قۆناغەڵدا ئەخلاقناسی ئایینی ئاراِدەیەکی زۆر ئەخلاقناسی چەپاندن و بەرگرتنبووە لە ئارەزو و لە ویست و خواستە جیاوازەکانی ئینسان. لەدوای ڕۆشنگەریشەوە عەقڵ و ڕاڤەکردنی عەقڵانییانە ڕۆڵی ئەو ژێرخانەیان بینیوە، کە تیۆرە جیاجیاکانی ئەخلاقناسیان لەسەر بنیادنراوە. عەقڵ گەورەترین و گرنگترین گوتراوێکی ڕۆشنگەرییە. لای کانت ڕۆشنگەری مانای توانای وەگەڕخستنی عەقڵ بۆ ناسینی دونیا و ناسینی خۆی، ڕۆشنگەری مانای ئازادبوونی عەقڵ لە هەموو ئەو جەبرە دەرەکییانەی، کە بەناوی سیستمێکی بان ـ عەقڵی و پیرۆزەوە دەیانەوێت عەقڵ قووفڵبدەن و بە ناوی جەبری جیاوازەوە مەحکومیبکەن. ڕۆشنگەری مانای جێگرتنەوەی عەقڵ بۆ خوداوەند. لێرەبەدوا لەباتی ئەوەی ئایین ژێرخانی ئەخلاقناسی بێت، عەقڵ دەبێتە ئەو ژێرخانە.

پۆست مۆدێرنەکان لە رەفزکردنی ئەو دوو شێوە ئایینی و ڕۆشنگەرییەی ئەخلاقناسییەوە دەستپێدەکەن. بۆ پۆست مۆدێرنەکان نە ئایین و نە هەموو ئایدیۆلۆژیا گشتگیرەکانی ترش، نە عەقڵ خۆشی سەرچاوەی گەیشتن بە هەقیقەت نیین. ئەو هەقیقەتەی عەقڵ ئەیدۆزێتەوە لەدیدی پۆست مۆدێرنەکانەوە تەنها ڕاڤەکردنێکە لەپاڵ ڕاڤەکردنەکانی دیکەدا و وەک بەشێک لەگەمەی دەسەڵات و گەمەی زمان تەماشایدەکەن. بەمەش پۆست ـ مۆدێرنەکان ئەو بنەما ڕۆشنگەرییەی ئەخلاقناسی قۆناغی مۆدێرنەی لەسەر بنیادنرابوو، لەبەریەکدی هەڵدەوەشێننەوە و بنەما فەلسەفی و "زانستی" یەکانی ئەم ئەخلاقناسییە، ڕوویەڕووی نیشانەی

پرسیاری گەورە دەکەنەوە. بەمانایەکی دیکە ئەخلاقناسی پۆست مۆدێرنە چیدی هەڵگری ئەو بنەما موفاریقە نییە، کە رۆشنگەری لە عەقڵدا هەڵیگرتبوو، لەهەمان کاتیشدا ئەم ئەخلاقناسییە لەدوای کەوتنی عەقڵەوە هیچ بنەمایەکی دیکەی موفاریق و بان کاتی قبووڵنیە، چ لەشێوە ئایینیەکەیدا، بۆنموونە مۆراڵی مەسیحییانە، یاخود ئیسلامییانە، چ لەچاپە ئایدیۆلۆژییە یۆتۆپییەکەیدا، بۆنموونە مۆراڵی ئەو فەلسەفانەی قسە لەبوونی بابەتیبوونێک دەکەن، کە لەناو مێژوودا پەنهانەوە مێژوو بەرەو چارەنووسێکی دیاریکراو دەنێرێت و لەسەر ئینسان پێویستە وەک پێوەری ئەخلاقی قبووڵیانبکات. بەباوەڕی پۆست مۆدێرنەکان ئێمە لەرۆژگاری کۆتایی دڵنیاییەکان و یەقینەکادا دەژین، تەنانەت یەقینی زانستیش نەماوە و زانست خۆشی بۆتە راڤەکردنێک، حیکایەتێک لەپاڵ حیکایەتەکانی دیکەدا (Bauman 1998: 48-72).

ئەم وەرچەرخانە گەورەیەیە وادەکات چەندان دەنگ لە کۆتاییەکانی ئەم سەدەیەدا بەرزببنەوە و جاڕی نەمانی ئەخلاق و کۆتایی ویژدان و لەدایکبوونی بەربەریەت بدەن. تاچەند ئەم جاڕە راستە و تاچەند ئەخلاقناسی پۆست مۆدێرن ئەخلاقناسی نەمانی ئەخلاق و سڕبوونی ویژدان و هاتنی بەربەریەتە، هەوڵدەدەم لەلاپەڕەکانی دیکەدا وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەمەوە. بەڵام با بەو راستییە دەستپێبکەین، کە لەقۆناغی گۆڕانە ڕیشەیی و قووڵەکاندا ئەم شێوە جاڕدانە و ئەم جۆرە شووتی مەترسی لێدانە، کارێکی ئاساییین و بەشێکن لەو داچڵەکینە ناوەختەی گۆڕانکارییە چاوەڕواننەکراوەکان لەناو ئینسانەکاندا دروستیدەکەن. با سەرەتای هاتنەکایەی مۆدێرنە خۆی وەک نموونە بهێنینەوە، کە تێیدا کۆتایی مۆراڵ و ترس لە لەبەریەکهەڵوەشاندنەوە و پارچە پارچە بوونی کۆمەڵگا بابەتی سەرەکی زانستە کۆمەڵایەتییەکان بوو.

-٨-

سەرەتای سۆسیۆلۆژیا لەسەدەی ڕابردوودا بە پرسیار دەربارەی مەترسی نەمان و کۆتاییهاتنی ئەخلاقی کۆمەڵایەتی دەستپێدەکات. ئەخلاق لە دیدی سۆسیۆلۆژیای ئەو سەدەیەدا بریتیبووە لەو "چیمەنتۆ کۆمەڵایەتییەی" پارچە جیاواز و ناکۆکەکانی کۆمەڵگای بەیەکەوە ڕاگرتووە، نەیهێشتووە شیرازەی کۆمەڵگا لەبەریەکدی بترازێت و کۆمەڵگا لە فەوزایەکی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی کوشندەدا نووقم ببێت و کۆتایی پێبێت. بەمانایەکی دیکە ئەو سۆسیۆلۆژیایە وێنەیەکی کۆمەڵگای دروستکردووە گوایە ئەوەی بەشە جیاوازەکانی بەیەکەوە گرێدەدات ئەخلاقێکی هاوبەشە، نەمانی ئەم ئەخلاقە مانای نەمانی کۆمەڵگا. سۆسیۆلۆژیای سەدەی ڕابوردو لەوە ئاگاداربوو، کە هاتنی مۆدێرنە شێوە کۆنەکانی شوناس و ئەو پەیوەندییانەی تاکەکانی ئینسانەکانی لە کۆمەڵگادا بەیەکەوە دەبەستەوە و ئەو چوارچێوە ڕەمزیەش لەپاڵیدا ئینسان ماناکانی بوونی خۆی و بوونی کۆمەڵگای بەرهەمدەهێنا، هەرهەموویان ڕووبەڕووی گۆڕانکاری ڕیشەیی قووڵ و هەمەلایەن کردۆتەوە. ئەو سۆسیۆلۆژیایە دەیزانی ئایین چیدی ناتوانێت ڕۆڵی ئەو ژێرخانە ببینێت، کە دەستنیشانی چوارچێوەکانی مانا و شوناس و پەیوەندییەکانی دەکرد و بەسەریەکەوە ئەو دونیا ڕەمزی و ئەخلاقییەی دروستدەکرد، کە ئینسانەکانی بەر لە مۆدێرنە لەناویدا دەژیان و ماناکانیان بەرهەمدەهێنا.

کە ئایین ڕوو لەلاوازی دەکات وەک چوارچێوەی ئەخلاق و چوارچێوەی سەرەکی کۆکردنەوەی کۆمەڵایەتی، مۆدێرنە وردە وردە دونیایەکی نوێ دروستدەکات لەدەرەوەی نەخشەکانی ئاییندا. یەکەمین پرسیارێک، کە سۆسیۆلۆژیا لەم ڕەوتەدا دەیکات ئەوەیە چی جێگای ئایین لە بەیەکەوە گرێدانی پارچە جیاجیاکانی کۆمەڵگادا دەگرێتەوە؟ کامە ئەخلاق دەچێتە شوێنی ئەو ئەخلاقە دینییەی

لەئارادابوو؟ ئەگەر خودا نەما چیدەبێتە ناوەند و سێنتەری بەرهەمهێنانی ماناکان؟ چی ڕۆڵی ئەو هاوبەشە دەبینێت، کە بەر لەمۆدێرنە ئایین دەیبینی؟، کە ئایین نەما چۆن و لەکوێدا بەدوای خوداوەندێکی دیکەدا بگەڕێین ماناکانمان پێببەخشێت؟ بەمجۆرە لەسەرەتای دروستبوونی کۆمەڵناسیدا وەک زانست پرسیاری دەربارەی ئەخلاق دەبێتە یەکێک لە گرنگترین پرسیارەکانی فیکر لەسەدەی ڕابردوودا.

بەکورتی یەکێک لە گرنگترین پرسیارەکانی سەدەی نۆزدەهەم بریتییە لەوەی ئایا دەشێت ئەخلاقی ڕۆژانە لەدەرەوەی ئاییندا بوونی هەبێت. ئەم پرسیارە لەهەمانکاتدا یەکێکە لە گرنگترین پرسیارەکانی سۆسیۆلۆژیای دۆرکهایمیش. دۆرکهایم دەیزانی ڕۆژگاری ئایین وەک سێنتەری ئەخلاقناسی بەسەرچووە، بەڵام باوەڕیشی وابوو، کە فەردگەرایی مۆدێرنە نابێتە ئەلتەرناتیڤی ئایین. بۆیە دۆرکهایم بەدوای هاوبەشێکی کۆمەڵایەتی نوێیدا دەگەڕا، کە ئەو وێنەیەی ئەو لە سەدەی نۆزدەهەمدا بۆ کۆمەڵگای هەبوو لەڕێگایەوە بپارێزرێت. مەبەستیش لەمە بوونی کۆمەڵگایەکە وەک یەکەیەکی یەکگرتوو و هاوبەش، کە تاک و گروپەکان یەکگرتووانە لەناویدابژین.

بە باوەڕی دۆرکهایم لە کۆمەڵگای نوێدا نە خودا و نە تاکەکەس ناتوانن ببنە بنەمای کۆمەڵگا، ئەوەی دەتوانێت ئەم ڕۆڵە ببینێت بریتییە لە بیرۆکەی پێداویستی "پێکەوەبوون"ی کۆمەڵایەتی، کۆمەڵگا خۆی ببێت بە چوارچێوە، خۆی ببێت بەو شتەی لەهەموو شتەکانی دیکە گرنگتر، ئەو شتەی، کە ئینسان بتوانێت لەپێناوی مانەوەی خۆیدا بیپەرستێت. دۆرکهایم باوەڕی وابوو ئینسان دەبێت لە نێوان خودا و کۆمەڵگادا یەکێکیان هەڵبژێرێت، سۆسیۆلۆژیای دۆرکهایم خۆی خودا هەڵنابژێرێت، بەڵکو بیرۆکەی "کۆمەڵگا" هەڵدەبژێرێت. ئەمەش مانای ئەوەی ئەخلاقی نوێ بەلای دۆرکهایمەوە دەبێت شاندابداتە سەر ئەو ڕۆحی دەستەییبوون

و پێکەوەبـــوونە نـــوێیەی لە فـــۆرمی کۆمەڵگـــادا و لە بیـــرۆکەی کۆمەڵگـــادا دروستدەبێت (دۆرکهایم ١٧٧٩: ٣٨)، بۆ مانەوەی خۆی وەک ئینسان بە کۆمەڵگا هەمـان شـوێنی خوداوەنـد لە دینەکانـدا ببەخشـێت. بائەوەشـمان لەیادنەچێـت کەسەدەی ڕابـردوو سـەدەی بنیادنـانی نەتەوە و دەوڵەتـی نەتەوەیە لە خۆرئـاوادا، لێرەوە کەنارگیرکردنی خوداوەنـد لەلایەن دۆرکهـایمەوە لەجەوهەردا وابەسـتەی ئەو پرۆسەی بنیادنانەی نەتەوەیە، کە نەک لەسەر بنەمای ئایین بەڵکو لەسەر بنەمـای فانتازیایەکی سنورداری نەتەوەیـی تـایبەت بنیاددەنرێـت، فانتازییـایەک دەکەوێتە ئەودیوی فانتازیا گەردوونییەکانی ئایینەوە (Anderson 1983).

بەکورتی دۆرکهایم باوەڕی وایە، کە ئایین ناتوانێت ببێـتە چوارچێوەی کۆمەڵگای مـۆدێرن و ناکرێـت بنەماکـانی ئەخلاقـی نـوێ لە ئایینـدا بـدۆزرینەوە، لەبـاتی ئەمە دۆرکهایم بیرۆکەی پێکەوەبوونی دەستەجەمعی و بیرۆکەی کۆمەڵگا خـۆی دەکـاتە ئەو چوارچێوە ئەخلاقییەی تاکەکەس و گروپەکانی قۆناغی مـۆدێرنە تیایـدادەژین. بەمانـایەکی دیـکە دۆرکهـایم ئـایین لادەبـات و لەشـوێنی ئەودا جـۆرێکی نـوێ لە وشـیاری دەکـاتە بنـاغەی ئەخلاقناسـی، کە لەسـەر بیـرۆکەی گروپگەرایـی و پێکەوەبوون و هاوچارەنووسی دروستبووە. دۆرکهایم دەیەوێت بڵێت ڕاسـتە ئـایین ڕۆژگـاری بەسـەرچووە و ناتوانێـت ڕۆڵـی چوارچێـوەیەکی ئەخلاقـی کـۆمەڵایەتی ببینێـــت، بەڵام بـــا لەوە نەترســـین، کە کۆمەڵگـــا پارچەپـــارچە ببێـــت و لەبەریەکهەڵبوەشێتەوە و نەمێنێت، چونکە لە قۆناغی مۆدێرنەدا بیرۆکەی کۆمەڵگا خۆی دەبێتە ئەو بیرۆکە موفاریق و ئەو ئامانجە سەرەکییە، کە کۆمەڵگا لە دارمان دەپارێزرێت (Hans Boutellier1994: 18). ئەمەش ئەو وەڵامە دڵنیاکەرەیە، کە سۆسیۆلۆژیای سەدەی ڕابردوو بەو دڵە ڕاوکێ و نائارامییە گەورەیەی دەداتەوە، کە لاوازبوونی چوارچێوە ئایینیەکانی ئەخلاقناسی لەو سەدەیەدا دەیهێنێتەکایەوە.

وەک گوتمان سۆسـیۆلۆژیای سـەدەی ڕابـردوو سۆسـیۆلۆژیای بنیادنـانی دەوڵەتـی

نەتەوەیە، بۆیە لە قووڵاییدا سۆسیۆلۆژیای وێکچوون و هاوشێوەییە، یان لانیکەم سۆسیۆلۆژیای گەڕانە بەدوای وێکچوون و یەکبوونی کۆمەڵایەتیدا. ئەمەش وابەستەی ئەو ڕاستییەیە، کە نەتەوە هەمیشە وەک دەستە، یان دونیایەکی یەکگرتوو و لێکچوو پێناس و وێنەکراوە. ئەم ڕاستییەیە وادەکات سۆسیۆلۆژیای ئەو سەدەیە بەبەردەوامی قسە لە بوونی یەک سیستمی کۆمەڵایەتی و لەپێش هەمووشیانەوە لە بوونی یەک سیستمی بەهای هاوبەش و هاوشێوە بکات. ئاشکرایە بوونی نەتەوە، وەک پێکهاتێکی وێکچوو، لە فانتازیای سیاسیدا، هەمیشە لەسەر مۆدێلی لادێ و لادێنشینان بنیادنراوە، لەکاتێکدا نەتەوە خۆی بەرهەمی شار و گەشەی شارە. بەڵام چونکە فیکری سیاسی هەمیشە نەتەوەی لەسەر مۆدێلی لادێ نیشانداوە، ئەمە بۆتەهۆی ئەوەی زانستە ئینسانییەکانی دیکەش بەهەمان زاراوە و وێناکردنەکانی لادێوە لە شار و لەو پێکهاتە مۆدێرنانەی دیکەش بدوێن، کە بۆ ناسینیان پێویستمان بە دیدێکی جیا هەیە لە دیدی ناسینی گوندنشیان. لادێناسی ناتوانێت بچێتە شوێنی شارناسی و لەهەمانکاتیشدا ناتوانێت لۆژیکی شار و کێشەکانی شار بخوێنێتەوە. بەم مانایە بەشێکی زۆری سۆسیۆلۆژیای قۆناغی مۆدێرنە، کە تاڕادەیەکی زۆر سۆسیۆلۆژیای دروستبوون و پاراستنی پایەکانی نەتەوەیە، سۆسیۆلۆژیایەکە هەڵگری فانتازیای لادێیە و لە لادێناسییەوە دەستپێدەکات، بۆ ناسینی دونیای شار. ئەمەش ناکۆکییەکی سەرنجڕاکێشە، لەکاتێکدا سۆسیۆلۆژیا لەسەدەی نۆزدەهەمدا شایەتی لاوازبوونی ڕۆڵی دینە لەوەدا وەک چوارچێوەی ئەخلاق و پێکەوەبوونی کۆمەڵایەتی کاربکات، هەروەها شایەتی دروستبوونی دونیایەکی نوێ و جیاوازە، بەڵام ئەو وێنە سەرەکییانەی بەکاریاندەهێنێت بۆ ناسینی ئەو دونیایە وێنەی بەر لە هاتن و دروستبوونی ئەو دونیا تازەیەن. مەبەستی من لێرەدا ئەوەیە ئەگەر لادێ سەرزەمینی وێکچوون و پەیوەندی کۆمەڵایەتی ڕاستەخۆ و ڕوویەڕوو بێت و لێرەوە دونیای لادێ لەسەر

وێکچوون و هاوشێوەیی دروستبوو‌بێت، بەکورتی مۆدێلی خێزانبێت و گەورەکرابێت، ئەوا شار مۆدێلی جیاوازیی و مۆدێلی ئەودیوی خێزانە (De Vries 1999). ئەمە وادەکات سۆسیۆلۆژیای هاتنی مۆدێرنە تا ڕادەیەکی زۆر سۆسیۆلۆژیایەک بێت وێنەکانی لادێ ئاراستەبیکات، بەڵام سۆسیۆلۆژیای پۆستمۆدێرنە سۆسیۆلۆژیای شارە، سۆسیۆلۆژیای جیاوازی، یان هەمەڕەنگی و فرەڕەهەندی و فرەدەنگییە، ئەم سۆسیۆلۆژیایە قسە لە بوونی دەنگی جیاواز و شوناسی جیاواز و مۆراڵی جیاواز دەکات، باس لە لەیەکنەچوون و یەکنەگرتن و فرەپارچەیی دەکات. لێرەوە ئەگەر بە مانایەک لە ماناکان سۆسیۆلۆژیای مۆدێرنە سۆسیۆلۆژیای داخرانبێت ئەوا سۆسیۆلۆژیای پۆست مۆدێرنە سۆسیۆلۆژیای کرانەوەیە. لە یەکەمدا بیرۆکەی جەوهەر، وێکچوون و یەکێتی، باڵادەستە لە دووهەمدا بیرۆکەی دەرکەوت، جیاوازی و نەمانی سێنتەر و ناوەندێکی هاوبەش باڵادەستە.

ئەو هەڵە سۆسیۆلۆژییە بنەڕەتییەی سۆسیۆلۆژیای بنیادنانی دەوڵەتی نەتەوە دەیدات، پێشنیارکردن و سەلماندنی بوونی یەک کولتور و یەک شوناس و یەک مۆراڵە لەناو کۆمەڵگایەکی دیاریکراودا. ئەم گوتاری وێکچوون و هاوشێوەییە فاناتازیای تایبەتی بنیادنای نەتەوە دەیخولقێنێت، نەک ڕاستییەکی سۆسیۆلۆژی واقیعی. واقیع هەمیشە فرەجۆر و فرەدەنگە، بەڵام خەیاڵی نەتەوەیی دەیکات بە واقیعێکی وێکچو و بێجیاوازی و هاوبەش. لە فانتازیای نەتەوەییدا هەموو ئاڵۆزییەکان کورتدەکرێنەوە بۆ یەک فیکرە و، هەموو جیاوازییەکانیش بۆ وێکچوونێکی گریمانکراو، هاوکات هەموو هێزێکی دابەشکردنیش دەگۆڕدرێت بۆ وەهمی یەکگرتنێکی سەرتاسەری. بەم مانایە سۆسیۆلۆژیای سەدەی ڕابردوو تاڕادەیەکی زۆر سۆسیۆلۆژیای کووشتنی جیاوازییەکانە.

دیکارت و سپینۆزا بەر لە دورکهایم و لەسەدەی هەقدەهەمدا عەقڵی فەلسەفییان لەژێردەستی عەقڵی لاهوتی دەرهێنا و لەڕووی فەلسەفییەوە شەپازلەی یەکەمیان

لە ڕوخساری ئایین وەشاند. پرۆژەی ڕۆشنگەری بەم مانایە پرۆژەی ئازادکردنی عەقڵە لە ئایین و باوەڕهێنانە بە توانکانی عەقڵ لەگەیشتن بە هەقیقەتدا. لە سەردەمی "لۆک" یشەوە چیدی ئینسان بوونەرێک نییە بە ئەخلاقەوە لەدیک بوویێت، بەڵکو بونەوەرێکە دەبێت ئەخلاق فێرببێت. ئەم دیدە لۆکییە بۆ ئەخلاق دژ بەو دیدە ئایینیە مەسیحییەی ئۆگستینە، کە پێیوایە هەموو ئینسانێک بە نووری خودابیەوە، واتە بە دیدێکی تایبەتەوە دەربارەی چاکە و خراپە، لەدایکدەبێت(De Vries 1999: 59). بەباوەڕی لۆک ئەوەی ئینسانیش فێری ناسینی ئەخلاق دەکات و ئەم ناسینە دەرەخسێنێت عەقڵە (هـ س پ).
ئاشکرایە ئەو بوونەوەرە عەقڵانییەی لۆک باسیدەکات ئەو تاکەکەسەیە، کە لە زەمانی ڕۆشنگەرییەوە تا ئێستا هەم بابەتی سەرەکی مۆدێرنە و هەم بەرهەمهێنەری مۆدێرنەیە، ئەو عەقڵانییەتەش، کە لۆک باسیدەکات ژێرخانی زۆربەی هەرەزۆری تیۆرە جیاجیاکانی ئەخلاقناسی قۆناغی مۆدێرنەیە.

-٩-

پۆست مۆدێرنە قۆناغی غیاب، یان کۆتایی عەقڵ نییە وەک زۆر کەس پڕوپاگەندەی بۆدەکەن، بەڵکو ئەو قۆناغەیە، کە تیایدا عەقڵ سنوورەکانی خۆی دەزانێت و لە ڕێژەیبوونی خۆی و سنوری تواناکانی خۆی تێدەگات. عەقڵ لەقۆناغی پۆست مۆدێرنەدا لەپاڵ دەسکەوتە مەزنەکانیدا، تاوانەکانی خۆی و ئەو کارەساتەنەش دەبینێت، کە لە ڕۆشنگەرییەوە تا ئەم ساتەی ئێستا دروستیکردوون. ناسیۆنالیزمی پەرگیر و ڕاسیزم و جینۆساید و کۆلۆنیالیزم و جەنگی تەکنۆلۆژی و ئیستیهلاک، یان بەرخۆرییەکی ترسناک و هەژارییەکی

پلانرێژەکراو و تێکدانی سروشت و هتد... هەرهەموویان بەرهەمی کارکردنی عەقڵی مۆدێرنن لەناو دونیای مۆدێرنەدا. هەموو ئەمانە بەشێکن لە پرۆژەی مۆدێرنە و بەشێکن لەو ئەگەرانەی مۆدێرنە لەناوەوەڕا و وەک بەشێکی دانەبڕاو لە خۆی بەرهەمیاندەهێنێت. لە کتێبی "مۆدێرنە و هۆلۆکۆست" دا کۆمەڵناسی بەناوبانگ زیگمۆند باومان زۆر بەوردی ئەو میکانیزمانە شیدەکاتەوە، کە وادەکات ڕووە تاریکەکانی مۆدێرنە ببنە هۆی کوشتاری بەکۆمەڵ و پیادەکردنی جینۆساید (Bauman 1987).

هەر لەم ئاستەدا فەیلەسوفی فەرەنسی جان فرانسوا لیوتار لەیەکێک لەکتێبە گرنگەکانیدا دەپرسێت: ئایا دەکرێت لەدوای هۆلۆکۆستەوە قسە لە بوونی مێژوو بکەین؟، (هۆلۆکۆست کوشتنی بە کۆمەڵ و پلان بۆدارێژراوی جولەکەکان بوو لە ژوری پڕکراو لە گازی ژەهراویدا لەلایەن نازییەکانەوە). بەباوەڕی لیوتار هۆلۆکۆست نیشانیداین، کە مێژوو بەو شێوەیەی ڕۆشنگەری بیری لێدەکردەوە کۆتاییهاتوە. لەدوای هۆلۆکۆستەوە مێژوو چیدی مێژووی بەرەوپێشەوەچوونی بەردەوامی ئینسان و کۆمەڵگاکان نییە، هۆلۆکۆست نیشانیداین، کە مێژوو نەک لە پرۆسەی بەرەوپێشەوەچوونێکی بەردەوامدا نییە و عەقڵ نەک ئینسان بە بەهەشتی سەرزەمینی ناگەیەنێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەشێت مێژوو ببێتە قەبرستانی مەرگی بە کۆمەڵ و ژووری پڕ گازی خنکێنەر و دروستکردنی بیرۆکراتییەتێک، کە ئیمزاکردنی مەرگی هەزاران ئینسان و ئیمزاکردنی چەکێکی سەد دۆلاری وەکویەک ببینێت. بەباوەڕی لیوتار ئەو ئیدەی ڕۆشنگەری، کە پێیوایە مێژوو پرۆسەیەکە و بەردەوام کۆمەڵگاکان بەرەو پێشەوەدەبات و ئینسان بەدونیایەکی عەقڵانیتر و ئازادتر دەگەیەنێت، جگە لە وەهمێکی ڕۆشنگەرییانە شتێکی دیکە نییە. بەم مانایەیە لیوتار دەڵێت ناکرێت لەدوای هۆلۆکۆستەوە قسە لە بوونی مێژوو بکەین. بێگومان هۆلۆکۆست یەکەمین و دواهەمین تاوانێکی عەقڵانییەتی

پلانرێژەکراوی دونیای مۆدێرن نییە، لەدونیای ئێمەدا عەمەلیاتی ئەنفال بەرهەمی مۆدێرنەیەکە، کە دەیویست کۆمەڵگا لەسەر مۆدێلی سەریازگە بەرهەمبهێنێتەوە (مەریوان ١٩٩٩).

عەقڵی پۆست مۆدێرن عەقڵێکی شەرمن و گومانکەر و ڕێژەییە، لەکاتێکدا عەقڵی ڕۆشنگەری عەقڵێکی دڵنیا، هێرشبەر و ڕەهایە. عەقڵی مۆدێرن عەقڵی مژدە ئایدیۆلۆژیە گەورەکانە، لەکاتێکدا عەقڵی پۆست مۆدێرن عەقڵی دوای دارمانی پرۆژە ئایدیۆلۆژییە گەورەکان و ئاشکرابوونی وەهمە ترسناکەکانی مۆدێرنە و کۆتایی حیکایەتە گەورەکانی ڕۆشنگەرییە. جیاوازی نێوان سپینۆزا و دیکارت و کانت، لەگەڵ فۆکۆ و لیوتار دا لەوەدایە، کە ئەمانەی دواییان عەقڵ لەدەرەوەی گەمەکانی دەسەڵات و زماندا نابینن، هەقیقەت وەک پێدراوێکی بابەتی و وەک جەوهەرێک لەدەرەوەی ئیرادەی دەسەڵات و سیاسەتێکی دیاریکراوی بەرهەمهێنانی مەعریفە و مانادا نابینن، بۆیە هەم فۆکۆ و هەم لیوتار عەقڵ وەک ئامرازی بەرهەمهێنانی ڕاستییەکی موتڵەق تەماشاناکان، بەڵام دیکارت و سپینۆزا عەقڵیان وەک تاقە سەرچاوە و دواهەمین سەرچاوەی هەقیقەتی ڕەها دەبینی و لەدەرەوەی هەر گەمەیەکدا و وەک سەرچاوەیەکی بێغەشی گەیشتن بە هەقیقەت تەماشایاندەکرد.

پۆست مۆدێرنەکان لەو باوەڕەدان مادامەکی عەقڵ شتێک نییە لەدەرەوەی گوتارەکانیدا بوونی هەبێت، بۆیە کردنی بە بنەمایەکی جێگیر بۆ ئەخلاقناسی بەکارێکی ڕاست و لە ڕاستیدا بەکارێکی ئەخلاقیشی ناناسن. مادامەکی عەقڵ لەهەموو لایەکەوە لە ڕێگای ستراتیژەکانی دەسەڵات و جەبرەکانی زمانەوە کاریلێکراوە و ئاراستەکراوە، بۆیە ناکرێت وەک ناوبژیوانێکی بێلایەن و وەک قسەکەرێک بەناوی هەقیقەتێکی ڕەهاوە قبووڵبکرێت. لەم دیدە پۆست مۆدێرنەدا نۆڕاندنی عەقڵ بۆ شوێنی خۆی وەک ناوبژیکەرێک لەدەرەوەی گەمەکانی

دەسەڵاتدا ئەو مافەی لێدەسێنێتەوە ببێتە بنەمای ئەخلاقناسی، لێرەوە لیوتار لەباتی عەقڵ پێشنیاری چەمکی جیاوازی دەکات بۆ کردنی بە بنەمای ئەخلاقناسی. پێشئەوەی ئەم خاڵە بەدرێژی باسبکەین باجارێ سەرنجێک لەهەندێک لەو ڕەخنانەبدەین، کە لە نیوەی دووەمی ئەم سەدەیەدا ڕووبەڕووی عەقڵ کراوەتەوە.

-١٥-

عەقڵی ڕۆشنگەریی، وەک فەیلەسوفانی قوتابخانەی فرانکفۆرت دەڵێن، لەمێژە لە گەشەی بەردەوامی خۆیدا گۆڕاوە و بووە بە "عەقڵێکی ئامرازیی" یەکڕەهەند، کە کاری سەرەکی سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی ستراتیژەکانی دەسەڵات و گەمەی ئاڵۆزی گوتارەکان و بەقسەی مارکۆزە بەرهەمهێنانەوەی بنەماکانی سیستمی سەرمایەداری خۆیەتی. ئەو ئامرازە سیاسیەش، کە ئەم عەقڵە دروستیکرد بۆ چاودێریکردنێکی عەقڵانی کۆمەڵگا، مەبەست دەوڵەتە، ئەویش، وەک هابرماز دەڵێت، کورتبۆتەوە بۆ عەقڵانیەتێکی ئابووری بەرتەسک (Habermas 1989). بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەم چارەنووسە تایبەتەی عەقڵ با لێرەدا سەرنجێک لەو تابلۆ خەمبارە بدەین، کە هێربێرت مارکۆزە لەشەستەکاندا بۆ عەقڵ بۆیکێشاوین. بێ دوودڵی دەتوانین فیکری مارکۆزە وەک قەسیدەیەک بۆ ئازادی پێناسبکەین. دوو کتێبی "ئیرۆس و شارستانیەت" و "کۆمەڵگای تاک ڕەهەند" دوو قەسیدەی خەمباری بەر لە گەردەلولی شەستەکانن، کە زۆر ڕەهەندی جیاوازی کۆمەڵگاکانی لە "ڕۆژئاوادا" ناچار بە گۆڕانی ڕیشەییکرد. مارکۆزە بەدوای دونیایەکدا دەگەڕا، کە ئینسان تیایدا لە بوونەوەرێکی ئیشکەرەوە بکاتە بوونەوەرێکی گەمەکەر. مارکۆزە

لەنێـوان ئـیش و گەمەدا جیـاوازییەکی ئەنتۆلـۆژی پێشـنیاردەکات، کە لەسـەر کۆمەڵێک بنەمای ئیستاتیکی ڕاوەستاوە. مرۆڤی گەمەکەر مـرۆڤێکە دژ بە لـۆژیکی مرۆڤی ئیشکەر کاردەکات و لەباتی ئەوەی ئابووری مەسـەلەی سـەرەکی ژیانیبێـت ئیسـتاتیکا مەسـەلەی سـەرەکی ژیـانیەتی. لەم گەشـتەیدا بەرەو ئـازادی مرۆڤـی گەمەکەر ئـازادی سـێکس و ئـازادی پەیوەنـدی نێـوان نێـر و مـێ وەک وێسـتگەی هەرەگرنگی ژیان پێناسدەکات(Weiland 1999: 286).

بە باوەڕی مارکۆزە و زۆربەی فرانکفۆرتیەکانی دیکەش، پرۆژەی ڕۆشنگەری مرۆڤی لە دەسـتی سروشـت ڕزگـارکرد، بەڵام نەیتـوانی ئازادیبکـات، چـونکە دوای ئەم ڕزگـارکردنە لەسروشـت ئینسـانی کـردە کـۆیلەی کۆمەڵگـا. ڕۆشـنگەری ئینسـانی لەدەستی باران و ڕەهێڵە و هەورەبروسکەکان سەندەوە، بەڵام کـردیە کـۆیلەی نـاو کارگە و توونەکانی خەڵوزی بەردین و سیستمی بیرۆکراسیەتی نوێ.

مارکۆزە بۆ دیاریکردنی مەبەستی خۆی لە گۆڕان لە مرۆڤی ئیشکەرەوە بۆ مرۆڤـی گەمەکەر، باس لە کەسایەتی ئۆرفیۆس دەکات. بە باوەڕی مارکۆزە ئۆرفیـۆس ئەو دەنگەیە، کە ئەمر ناکات، بەڵکو گۆرانی دەڵێت، ئاسایش و ڕژێم بەرقەرار دەکـات، بەڵام کەس ناچەوسێنێتەوە(Weiland 1999: 286). جگە لە ئۆرفیۆس، مارکۆزە لە نیتشـەوە فیکـرەی دینۆیسیسـزم وەردەگرێـت و دەیکـاتە بەشـێک لەو گوتـارە فەلسەفییەی، کە بەرگری لە تاکەکەس دەکـات لەبەرامـبەر کۆمەڵگـادا. جـگە لەمە بیرۆکەی دینۆسیسزم لای مارکۆزە دەربڕی پەیوەندیەکی ئیرۆتیکییە لەگەڵ ژیانـدا. ئیرۆتیک لێرەدا بەمانای ئازادی لاشەیە لە باوەشـکردنەوەیدا بـۆ ژیـان، ئـازادکردنی غەریزەکان لەهەموو چاودێرییەکی چەپێنەرانە و لەوێشەوە بەجەستەییکردنی خودی ژیـان. مـارکۆزە ئەم پەیوەنـدییە ئیـرۆتیکیە لەگەڵ ژیانـدا دەخـاتە شـوێنی ئەو پەیوەندییە عەقڵانییەی ڕۆشنگەرەکان ئینسـانیان پـێ مەحکـوم کـرد. بەمانـایەکی دیکە مارکۆزە پێشنیاری بوونی پەیوەندییەکی ئیرۆتیکی، واتە جەستەیی جنسـی،

لەگەڵ ژیاندا دەکات لەباتی پەیوەندییەکی عەقڵانی، ئەمەش یەکانگیرە لەگەڵ ئەو هەوڵەی مارکۆزەدا، کە دەخوازێت مرۆڤ لە بوونەوەرێکی ئیشکەرەوە بگوڕێت بۆ بوونەوەرێکی گەمەکەر. بەکورتی پرۆژەی مارکۆزە بریتییە لە پرۆژەی بە ئیرۆتیزێرەکردن و بە ئیستاتیکاکردنی ژیان لەبەرامبەر پرۆژەی ڕۆشنگەریدا، کە پرۆژەی بە عەقڵانیکردنی ژیان بوو. بۆ تێگەیشتن لەم دەرەنجامە فەلسەفییە دەبێت لەوە تێبگەین، کە فرانکفۆرتییەکان لەویاوەڕەدابوون، کە عەقڵ لە ئامرازێکی ڕزگارکەرەوە گۆڕاوە بۆ ئامرازێکی چەپێنەر، لە هێزێکی نەفیکەر و یاخیبووەوە، گۆڕاوە بۆ هێزێکی سەپێنەر و تۆتالیتێر، واتە شمولی.

بەباوەڕی مارکۆزە لە کۆمەڵگای مۆدێرندا چیدی تاکەکەس ناوەوەیەکی نییە دەستی تەکنیک و دەستی کۆمەڵگای نەگەیشتبێتێ. هیچ ڕەهەندێکی سیاکۆلۆژی ناوەکی لە ئینساندا نەماوەتەوە کۆمەڵگای نوێ دلواکارییەکانی خۆی پێنەگەیاندبێت. کۆمەڵگای تەکنیک بەوە ڕازینابێت ڕەهەندێکی ناوەکی لە ئینساندا بمێنێتەوە ئەو دەستی تێوەرنەدات و بەو ئاراستەیە پرۆگرامی نەکات، کە لە سود و قازانجی تەکنیک و کۆمەڵگای تەکنیکدا نەبێت (Weiland 1999: 288).

ڕەهەندی ناوەکی ئینسان، کەسەرچاوەی بەرگری و ڕەفز و یاخیبوون و هێزە ڕەخنەییەکانی عەقڵ و تواناکانی نەفیکردنە، لە کۆمەڵگای مۆدێرندا لەناوەوەڕا پرۆگرامکراوە و لە هەر وزەیەکی نەفیکەرانە بەتاڵکراوەتەوە. لێرەوە بەباوەڕی مارکۆزە هیچ گوترلوێک، واتە مەقولەیەکی، سایکۆلۆژی نەماوەتەوە، کە نەبووبێتە مەقولەیەکی سیاسی، دونیای ناوەکی ئینسان لە قۆناغی مۆدێرنەدا دونیایەکی سەرتاسەر سیاسییە و لەهامانکاتیشدا کۆنترۆڵکراوە. تەنانەت ئەو یاخیبوونانەش کەدەشێت دروستببن، پێشوەخت دەستەمۆکراون و سنوور و ئاست و مەوداکانیان دەستنیشانکراوە. لەم دۆخەدا ئەوە ئینسان نییە ئیرادە و یاساکانی خۆی بەسەر دونیادا دەسەپێنێت، بەڵکو دونیایە یاساو ئیرادەی خۆی بەسەر ئینساندا

دەسەپێنێت. لێرەوە مۆراڵی ڕاستەقینە لای مارکۆزە لە بەرفراوانکردنی دەسەڵاتی عەقڵ و کردنی عەقڵ بە ناوبژێکەر، یان بە پرنسیپێکی موفاریق نییە، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەخلاقی تازە دەبێت دژ بە عەقڵ و دژ بە عەقڵانیەتێک بێت، کە کورتبۆتەوە بۆ عەقڵانیەتێکی ئامرازی. بەباوەڕی مارکۆزە دەبێت بۆ ڕزگارکردنی ئەخلاق و لەوێشەوە بۆ ڕزگارکردنی ئینسان، ژیان خۆی بکرێت بە هونەر و بە گەمە. چەند زەحمەتە هونەر و گەمە یەک پێناسیان پێبدرێت و لەیەک یاسا و یەک خوێندنەوەدا بەندبکرێن، ئاواش دەبێت ئینسان ببێتە ئەو سەرزەمینی جیاوازییەی لەهەرساتێکدا هێزی ئەفیکردن تیایدا بتوانێت شوناسێکی موێی پێببەخشێت، کە ئەکرێت کورتبکرێتەوە بۆ هیچ پێدراوێکی پێشین. لەڕاستیدا دیدی پۆست مۆدێرنەکان لەسەر جیاوازی و شوناس درێژکراوەی ئەم دیدە مارکۆزییەن بەڵام لەچوارچێوەی تیۆریزەکردنی خودی جیاوازی خۆیدا، نەک لەچوارچێوەی تیۆرەیەکدا بۆ شۆڕشی کۆمەڵایەتی، کە مارکۆزە لە حیکایەتە گەورەکانی مارکسیزم و فرۆیدیزمێکی چەپانەوە دەیهێنێت.

مارکۆزە جیاوازییەکی زۆر گرنگ دەستنیشاندەکات لەنێوان نامۆبوون لەسەدەی نۆزدەهەم و نامۆبوون لەم سەدەیەدا، لەسەدەی ڕابردوودا کرێکاران دەیانزانی، کە سەرمایە نامۆی کردوون و ئینسانیەتی لێسەندونەتەوە. ئەوان هەستیان بەئازاری ئەم نامۆبوونە دەکرد و دەشیانزانی، کە دونیا دەبێت بگۆڕدرێت و سیستەمێکی دیکە بێتەکایەوە بۆ کۆتاییهێنان بەم نامۆبوونە. لەمەش گرنگتر کرێکاران دەیانزانی ئەوان خۆیان دەبێت ئەمکارە جێبەجێکەن و خۆیان بۆ مافە کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتورییەکانی خۆیان بجەنگن. بەم مانایە مارکسیزم وەڵامی کرێکارانی سەدەی نۆزدەهەمە بە نامۆبوونیان لە دونیا و لەپێش هەمووشتێکیشەوە، لە ئینسانیەتی خۆیان. بەڵام مارکۆزە پێیوایە، کە دونیای ئەمڕۆ و کرێکارانی ئەم سەردەمە دونیا و کرێکارانی سەدەی نوزدەهەم نیین، کرێکاران چیدی نایانەوێت دونیابگۆڕن،

چونکە سودی زۆریان لەمانەوەی ئەم دونیایەی ئێستادا و لە بەرقەراربوونی پایەکانی ئەم عەقڵانیەتە ئامرازیەدا هەیە، کە هەیە. بە قسەی مارکوزە، کرێکاران قازانج و سودێکی گەورەیان هەیە لەمانەوەی سیستمی ئێستادا. کرێکاران دەیانەوێت ئەم سیستمە ڕیفۆرمبکەن، باشتریبکەن نەک بیگۆڕن و لەشوێنی ئەودا سیستمێکی تازە دروستبکەن. لەبەرئەمە نامۆبوون لەدونیای ئەمڕۆدا تەنها نامۆبوونی ئینسان نییە لە ئینسانیەتی خۆی، بەڵکو نامۆبوون بۆتە نامۆبوونی ئینسان لە هەموو وجودی دەرەوەی خۆی بەهەموو ئەو ئەگەرانەشەوە، کە دەشێت ئەم وجودە لەناو مێژوو هەڵگریانبێت. لەم دیدەدا تەکنیک تەنها ئێستای تووشی نامۆبوون نەکردووە، بەڵکو تەنانەت ئاییندەشی تووشی نامۆبوون کردووە (Weiland 1999: 288).

لە ساڵی ١٩٦٤ دا مارکوزە لە کتێبی " ئینسانی تاک ڕەهەند" دا کۆتایی خود، ڕادەگەیەنێت. دووساڵ دوای ئەو میشێل فۆکۆ کۆتایی مرۆڤ ڕادەگەیەنێت. بەرلەمان لە پەنجاکاندا میرلۆپۆنتی باس لەوەدەکات، کە ئینسان لە سێنتەردا نەماوە ( بێگومان لەپشتی ئەم دیدە جیاوازانەوە هایدگەر وەستاوە، کە دەڵێت ئینسان بۆتە فەرمانبەری تەکنیک. هەموو ئەم بۆچوونانەش قسە لە ونبونی ئینساندەکەن لەناو سیستەمدا، ئەو سیستمەی، کە کۆڵەکەکانی لەسەر پێناسەکانی ڕۆشنگەری بۆ عەقڵ و هیواکانی ڕۆشنگەری بەکارکردنی عەقڵ لەناو مێژوودا بنیادنابوو (Weiland 1999: 290-91).

-١١-

بەشێکی گەورەی فیکری پۆست مۆدێرن لەسەر هەمان هێڵی فرانکفۆرتییەکان و هەمان رەخنەی مارکۆزە لە عەقڵ کاردەکات، بەڵام رەنگە جیاوازی سەرەکییان لەوەدابێت، کە دیدی رەخنەیی پۆست مۆدێرن دەشێت ستراتیژی جیاوازی گۆڕانکاری لێبکەوێتەوە، لەکاتێکدا فرانکفۆرتیەکان هەڵگری یەک ستراتیژیوون بۆ گۆڕان. فرانکفۆرتییەکان بەحوکمی پەیوەستبوونیان بە مارکسیزمەوە هەمیشە گۆڕانەکانیان لە شێوەی شۆڕشی کۆمەڵایەتیدا دەبینی و هەمیشە بەدوای هێزێکی کۆمەڵایەتیشدا دەگەڕان شۆڕشیان بۆ پیادەبکات. لێرەوە کاتێک لەوە تێگەیشتن، کە کرێکاران ئەم ئەرکەیان بۆ جێبەجێناکرێت و ناتوانن ببنە ئامراز و بکەری شۆڕشە کۆمەڵایەتییەکان لەدونیای ئەمڕۆدا، ئیدی هەموو پرۆژەیەکی گۆڕانیان لا بوویوو بە یۆتۆپیا. بە مانایەکی دیکە فرانکفۆرتییەکان بە پرۆژەی شۆڕشی کۆمەڵایەتی دەستیانپێکرد و بە یۆتۆپیا کۆتاییان بە پرۆژەکەیان هێنا. بەلێکدانەوەی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی دەستیانپێکرد و دواجار بە ئیستاتیکا کارە فیکرییەکانیان قوفڵدا. بەڵام پۆست مۆدێرنەکان چونکە هەڵگری هیچ حیکایەتێکی گەورە نەبوون دەربارەی رزگاربوونی یەکجارەکی و سەرانسەری و هەمیشەیی، بۆیی بۆ پرۆژەی گۆڕان ستراتیژی دیکەیان پێشنیاردەکرد لەشوێنی ستراتیژیی شۆڕشی کۆمەڵایەتی. بۆ نموونە، لەکاتێکدا میشێل فۆکۆ پرۆژەی گۆڕان وەک شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی سەرتاسەری نابینێت و بەدوای هێزێکدا ناگەڕێت دەسەڵات لە هێزێکی دیکە بسێنێتەوە و خۆی بچێتە شوێنی ئەو و بۆ هەتاهەتاییە کۆتایی بەنامۆبوون و چەوساندنەوەی ئینسان لەلایەن ئینسانەوە بهێنێت، دەبینین پرۆژەی گۆڕان لای ئەم دەبێتە پرۆژەی جەنگ و بەرگرییەکی بەردەوام دژ بە فۆرمە جیاوازەکانی دەسەڵات لەناو هەموو خانە کۆمەڵایەتییە جیاجیاکاندا. لای

فۆکۆ گۆڕان دەرەنجامی ئەو شەڕە بچووکانەیە، کە ئینسان ڕۆژانە هەریەکە و لەئاستی خۆیەوە لەگەڵ دەسەلاتدا دەیکات، نەک شەڕێکی گەورەی یەکجارەکی. پرۆژەی گۆڕان بریتییە لە هەوڵدان بۆ گۆڕانی بەردەوامی هەلومەرج و ژینگە لۆکاڵییەکان و خانە بچووکەکان، کە دەسەلات بەردەوام ستراتیژیەتەکانی خۆی تیایاندا بەرهەمدەهێنێتەوە، نەک گۆڕانێکی ژێرەوژوورکەری کۆمەلایەتی یەکجارەکی پێشنیارکراو، کە تیایدا حیکایەتێکی گەورە بچێتە شوێنی حیکایەتێکی گەورەی دیکە.

ئەم دیدە فۆکۆییە بەپلەی یەکەم ڕزگاربوونە لە سۆسیۆلۆژیای مارکسیزم بەومانایەی، کە باس لەوەدەکات پێویستە چینێک هەڵگری پرۆژەی ئازادبیێت بۆ هەموو مرۆڤایەتی. لەڕاستیدا ئەم سۆسیۆلۆژیایە، کە سۆسیۆلۆژیای وابەستەبوونە بە هێزێکی کۆمەلایەتی و پەیامەکەیەوە، فرانکفۆرتییەکانی بە دەروازەیەکی داخراو گەیاند. تێزەی فرانکفۆرتییەکانیش دەربارەی بە ئیستاتیکاکردنی بوون و ڕزگاربوون لەبونیادە چەپێنەرەکانی عەقڵ و گەڕاندنەوەی ڕەهەندی ئیستاتیکی بۆ ئینسان، لە جەوهەردا تەعبیر لە فەشەلی پرۆژەی ئەو گۆڕانکارییە کۆمەلایەتییانە دەکات، کە فرانکۆرتییەکان نەخشەی فیکریان بۆ دروستدەکرد و نائومێدانە چاوەڕوانی پیادەبوونیاندەکرد. ئەم پرۆژەیە لە فەشەلیدا بۆ گەڕان بەدوای ئەو "چین" ە کۆمەلایەتیدا، کە بتوانێت ستراتیژە فیکرییەکانیان پیادەبکات، دەکەوێتە باوەشی ئەو بوونیادە یۆتۆپییەوە، کە دواجار هەموو وزەکان بە ئیستاتیکا دەدات و یۆتۆپیای ئیستاتیکا دەخاتە شوێنی یۆتۆپیای شۆڕشی کۆمەلایەتی. لێرەوە فرانکفۆرتییەکان شوێن و جێی حیکایەتە گەورەکانی سیاسەت لە فیکریاندا دەدەن بە حیکایەتە گەورەکانی هونەر و ئەدەب.

بە باوەڕنەمان بە عەقڵ وەک بەرهەمهێنەری هەموو هەقیقەتەکان، ئیدی گومانیش لەو پرۆژە ئایدیۆلۆژییە سەرتاسەری و گشتگیرانە پەیدابوو، کە عەقڵانیەتێکی

تۆتالیتاری لەپشتی بنەما فەلسەفی و سیاسییەکانیانەوە بوو. ئەم باوەڕنەمانەی فرانکفۆرتییەکان بە عەقڵ ئەرکی پۆست مۆدێرنەکانی لەوەدا سوکترکرد، کە جاڕی کۆتاییهاتنی حیکایەتە گەورەکان ڕاگەیەنن. لەناو فرانکفۆرتییەکاندا تەنها هابرماز باوەڕی بە مۆدێرنە و بە ئیمکاناتە ڕزگارکەرەکانی عەقڵ ماوە لە چارەسەرکردنی ئەو کێشانەدا، کە دەشێت مرۆڤایەتی ڕووبەڕوویان ببێتەوە. هابرماز لەو باوەڕەدایە، کە ڕۆژگاری عەقڵ کۆتایی نەهاتووە و مۆدێرنە هەڵگری ئەو دینامیکیەت و وزە ناوەکییەیە، کە بەهۆیانەوە دەتوانێت قەیرانەکانی خۆی چارەسەریکات و کۆمەڵگایەکی کراوە و ئازاد و ئەخلاقیاتێکی بەرپرسیار و ئینسانذۆست بەرهەمبهێنێت.

هابرماز، کە سەر بەنەوەی دووهەمی قوتابخانەی فرانکفۆرتە ئەو عەقڵە گەورە و ڕەخنەیەیە، کە ئەمرۆکە بەناوی عەقڵ و تەواونەبوونی پرۆژەی مۆدێرنەوە، ناکۆکییەکانی خۆی بەرامبەر بە فیکری پۆست مۆدێرن و ئەخلاقناسی پۆست مۆدێرن ڕادەگەیەنێت. لەم بەشەی ئەم نووسینەدا چەند سەرنجێکی زۆر گشتی لەو دیالۆگەی نێوان هابرماز و پۆست مۆدێرنەکان ئەدەین، بۆ ئەمەش دەگەڕێمەوە بۆ ئەو دیالۆگەی فەیلەسوفی هۆڵەندی هاری کوونەمان لەگەڵ هابرمازدا هەیەتی و هەوڵدەدەم لەڕێگەی ئەو دیالۆگەوە بنەما تیۆرییەکانی ئەخلاقناسی پۆست مۆدێرن ڕوونبکەمەوە.

-١٣-

لە جەوهەردا پرسیاری هابرماز بەرامبەر بە دونیای ئەمرۆ زۆر نزیکە لە پرسیاری مارکس لە دونیای سەدەی نۆزدەهەم. پرسیاری مارکس بریتیبوو لە چۆنیەتی

دروستبوون و سەرچاوەکانی بەرپابوونی شۆڕشی کۆمەڵایەتی، لەکاتێکدا پرسیاری هابرماز بریتییە لەوەی داخۆ ڕزگاربوون لەکوێوە دەستپێدەکات (Weiland 1999: 293). ڕەنگە جیاوازی هەرەسەرەکی لەنێوان مارکس و هابرمازدا لەوەدابێت، کە پرۆژەی هابرماز پرۆژەی شۆڕش نییە، پرۆژەی ژێرەوژوورکردنەوەیەکی کۆمەڵایەتی سەرتاسەری نییە تیایدا چینێک دەسەڵات لە چینێکی دیکە بسێنێتەوە، بەڵکو پرۆژەی گۆڕانێکی ڕادیکاڵانەی دەزگاکانی دەوڵەت و ئەو پەیوەندییانەیە دەوڵەت و کۆمەڵگا بەیەکدیەوە گرێدەدات، ئەمەش بە ئاراستەی هەرچی زیاتر دیموکراتیزەکردنی ئەو دەزگایانە و ئەو پەیوەندییانەی لەوساتەدا لەئارادان. سەرەڕای ئەمە هابرماز داکۆکییەکی گەورە لە مەسەلەی بەشداربوونی ڕاستەوخۆی خەڵک لە بەکارهێنانی ئەو ئیمکاناتانە دەکات، کە ئەم سیستەمەی ئەمڕۆ ئەیخاتە بەردەستیان بۆ ئەوەی خۆیان ژیانی خۆیان دروستبکەن و خۆیان ئەو فۆرمەی دەیانەوێت بە ژیانی خۆیان بیبەخشن (Weiland 1999: 295). کێشەی کۆمەڵگا هاوچەرخەکان لە دیدی هابرمازدا لەوەدایە، کە دەوڵەت لە بوونەوەرێکی عەقڵانییەوە، کە کاری پیادەکردنی عەقڵە لەناو کۆمەڵگادا، گۆڕاوە بۆ بوونەوەرێکی ئابووری، کە تەسلیمی یاسا ئابوورییەکان و لۆژیکی قازانجە ئابوورییەکان بووە. دەوڵەت لەباتی ئەوەی کۆمەڵگا وەک سەرزەمینێک بۆ کرانەوە و بەشداریوون و پەیوەندی هاوسەنگ و کراوە ببینێت، وا مامەڵەی کۆمەڵگا دەکات وەک ئەوەی بازاڕ، یان سوپەرمارکێتێکی گەورەبێت و هیچیدی، هابرماز پێیوایە لە دەوڵەتی ئێستادا عەقڵانیەتی ئابووری چۆتە شوێنی هەموو شێوەکانی دیکەی عەقڵانیەت. گرنگترین مەسەلەیەک لە فیکری هابرماز دا لە پەیوەندیدا بەم باسەی ئێمەوە ئەو جیاکارییە گرنگەیە، کە هابرماز لە نێوان سیستەم و دونیای دەرەوەی سیستەم، واتە "ژیانگە"دا دەیکات. سیستەم، وەک سەرزەمینی ئابووری و شوێنی کاکردنی کۆمپانیا و بیرۆکراتییەتی دەوڵەت. دونیای دەرەوەی سیستەم، واتە " ژیانگە "،

وەک ئەو پانتاییە کۆمەڵایەتی و ئینسانیانەی دەکەونە دەرەوەی سیستەمەوە. واتە شوێنی ژیانی ئینسانەکان پێکەوە لەدەرەوەی ئەخلاق و جەبرەکانی سیستمدا. (بۆ ڕوونکردنەوەی بۆچوونەکانی هابرماز پشتێکی تەواوم بەستووە بەم دوو کتێبەی هاری کوونەمان) :

1- Harry Kunneman, postmoderne moraliteit, Boom 1998 Amsterdam.

2- Harry Kunneman, van theemutscultuur naar walkman-ego. Contouren van postmoderene individualiteit Boom 1996 Amsterdam

هابرماز جیاوازیەکی جەوهەری لەنێوان سیستم و ژیانگەدا دەبینێت و پێشیوایە لە هەریەکێکیاندا لۆژیکێکی جیاواز و ئەخلاقیەتێکی جیاواز و ستراتیژێکی جیاواز و شێوازی جیاوازی پەیوەندی و هەڵسوکەوتی ئینسانی لەئارادایە. لە یەکەمیاندا یاساکانی فشاردانان و بەدەستهێنانی قازانج و گەورەکردنی سوودەکان کاردەکەن و ئینسانەکان لە پەیوەندییەکی ڕەسمی و بیرۆکراسیانەدان لەگەڵیەکدیدا. لێرەدا هاوڕێیەتی، کارلێککردنی چەندلایەنە و پەیوەندی کراوە و ئازاد لەوپەڕی لاوازی و کەمیدایە. یاساکان شێوازی مامەڵە و شێوازی پەیوەندییەکانیان دەستنیشانکردووە و ئینسان ناتوانێت لە پەیوەندییەکی یەکساندا لەگەڵ ئەویدیکەدابێت و ناتوانێت مافی وتنی نەخێری هەبێت گەر هاتوو بیرۆکراتیەت پێشوەخت ئەو مافەی پێنەبەخشیبێت. لە سیستمدا مەسەلەی بوونی نۆرم و بەهای تایبەت و بوونی خاوەندارێتی ئینسان بۆ دونیای خۆی و بوونی ئارەزوو و ئەخلاقیاتی تایبەت ئامادەنییە و ئینسان مەحکومە بەوەی یاساکان و ئەخلاقیات و داواکاری و ئامانجەکانی سیستم قبووڵبکات. لێرەدا پەیوەندی ئینسانەکان لەگەڵیەکدیدا بۆ کردنەوەیان بەڕووییەکدیدا و بۆ قبووڵکردنی دونیای یەکدی و قبووڵکردنی جیاوازییەکانی یەتری نییە، بەڵکو ئەم پەیوەندییانە بەمەبەستی وەدیهێنانی

مەبەست و داوا و ئامانجەکانی سیستەمە. ئینسانەکان ناتوانن ئامانجەکان و یاساکانی سیستم بگۆڕن، ئەوەی هەیانە گوێڕایەڵیکردنیانە بۆ ئەو یاسایانە.
لەناو سیستمدا گەشەی تەکنیک و گەشەی ئابووری بونەتە هۆی دروستبوونی بازاڕی سەربەخۆ وَ هاتنەکایەی بیرۆکراسیەتی سەربەخۆی دەوڵەت، کە خۆیان یاساکانی خۆیان دەستنیشاندەکەن و دەشخوازن ئینسان ناچارکەن لۆژیکی ئەوان قبووڵکات و بەپێی ئەو لۆژیکە هەڵسوکەوتبکات. هابرماز جۆری ئەو پەیوەندی و مامەڵەیەی لە سیستمدا لەنێوان ئینسانەکان خۆیاندا و لەنێوان ئەوان و دەزگاکاندا دروست دەبێت، ناودەنێت، "هەڵسوکەوتی ستراتیژی". "هەڵسوکەوتی ستراتیژی" هەڵسوکەوتێکی ڕەسمی و وشک و بیرۆکراتییە، کە لۆژیکی سیستم دەیسەپێنێت و ئینسانەکان تیایدا یەکدی وەک بەشێک لەسیستەمی بیرۆکراسی دەبینن و مامەڵەدەکەن، واتە بیرۆکراسیەت پێشوەخت ڕەوتی چۆنیەتی پەیوەندییەکان و مامەڵەکردنەکانی بۆ پێناسکردوون.

-١٣-

بەڵام لە "ژیانگا" دا ئینسانەکان بە پێچەوانەی "سیستم" ەوە هەڵسوکەوتی دیکەیان لەگەڵیەکدیدا هەیە، هابرماز هەڵسوکەوتەکانی ئینسان لەناو "ژیانگا" دا ناودەنێت " هەڵسوکەوتی پەیوەندیخواز". بە پێچەوانەی "هەڵسوکەوتی ستراتیژیەوە" ئینسانەکان لە "هەڵسوکەوتی پەیوەندیخوازدا" ئازادانە لە گەڵ یەکدیدا هەڵسوکەوتدەکەن و پێکەوە و بە ڕەزامەندی هەردوولایان ڕەوتی چۆنیەتی پەیوەندییەکان دیاریدەکان. بەمانایەکی دیکە لەمجۆرە پەیوەندیەدا ئینسانەکان خۆیان دەستنیشانی هەلومەرجی پەیوەندییەکانیان دەکەن و خۆیان لەسەرئەوە

ڕێدەکەون چۆن و بە چ شێوەیەک لەگەڵیەکدیدا بجوڵێنەوە. لەهەمانکاتدا هەریەکێک لەو تاکانەی لەگەڵیەکدا دەچنە پەیوەندیەکی پەیوەندیخوازەوە، مافی ئەوەیان هەیە پێناسەکانی ئەویدی بۆ ڕەوتی پەیوەندییەکان ڕەتبکەنەوە وئەو هەقیقەتانەی یەکێکیان هەڵگریەتی ئەم وەرینەگرێت و بیخاتە ژێر پرسیار و گومانەوە. هەموو ئەمانە بەبێئەوەی ئەم ڕەتکرنەوەیە ببێتە هۆی کۆتاییپێهاتن و لەبەریەکدی هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندییەکان و گۆڕانی مامەڵە و هەڵسوکەوتەکان بە "هەڵسوکەوتی ستراتیژی".

لەمجۆرە پەیوەندییەدا ئینسانەکان خۆیان خۆبەخۆ بەهای چۆنیەتی پەیوەندییەکانیان دەستنیشاندەکەن، نەک لەدەرەوە و لەڕێی یاسا، یان ئیرادەیەکی دەرەکییەوە بەسەریاندا بسەپێنرێت. ئینسانەکان لەم جۆرە پەیوەندییەدا پانتایی پێویست بەیەکدی دەبەخشن بۆئەوەی هەرکەسە و بە ئارەزوو و ویست و پێناس و هەقیقەتی خۆیەوە بێتەمەیدانی پەیوەندییکردنەوە و شتەکانی خۆی بڵێت. لەم جۆرە پەیوەندییەدا ئینسانەکان بەبێ هیچ فشارێک بەدەم یەکدیەوە دەچن و یارمەتی یەکدی دەدەن و لەگەڵیەکدیدا دەدوێن. هەریەکێک لە کەسەکان هەوڵدەدات پانتایی تەواو بەویدیکە بدات بۆئەوەی تێگەیشتنی خۆی و ماناکانی خۆی پێشنیارکات. بێگومان دەشێت ئەم پێناس و مانایانە جیاواز و بەیەکدی ناکۆک بن، بەڵام کەسەکان ئامادەن لەسەر بنەمای ڕاڤەکردن و گفتوگۆیەکی عەقڵانی بگەنە بەرهەمهێنانی پێناسێکی هاوبەش و قبوولکراو لەلایەن هەریەکێکیانەوە. بەباوەڕی هابرماز عەقڵ و دیالۆگی عەقڵانییانە ئەو هێزەن وادەکەن ئینسانەکان لەئەنجامی گفتوگۆ و گۆڕینەوەی هەقیقەتەکانەوە لەگەڵیەکدیدا، بگەنە ڕێکەوتن و پێکەوە هەقیقەتێکی هاوبەش بەرهەمبهێنن. ئەم هەقیقەتە هاوبەشە بەرهەمی دیالۆگێکی ئازادە، کە تیایدا هەر تاکێک لەتاکەکەن کەرامەت و ئازادی و تاکایەتی خۆی پاراستووە. بەکورتی هابرماز دەیەوێت بڵێت

ئەگەر لە دونیای "سیستم" دا سیستم لەباتی ئینسان بدوێت و سیستم یاساکانی خۆی بەسەر ئینسانەکاندا بسەپێنێت، ئەوا لە "ژیانگادا" ئینسانەکان ئازادانە بۆ یەکدی و لەگەڵ یەکدیدا دەدوێن. "سیستم" سەرزەمینی ئابووری و بیرۆکراسییەتە، لەکاتێکدا ژیانگا سەرزەمینی سیاسەت و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و مەجالی گشتی و پەیوەندی تایبەتی کەسەکانە لەگەڵیەکدا.

بەباوەڕی هابرماز هەم شێوازی "سیستمیانە"ی پەیوەندی و هەم شێوازی "ژیانگایانە"ی پەیوەندییەکان، هەردووکیان بۆ بەرقەراری کۆمەڵگایەکی تەندروست پێویستن. واتە کۆمەڵگا هەم پێویستی بە سیستم و هەم پێویستی بە ژیانگایە. "هەڵسوکەوتی ستراتیژی" پێویستە بۆئەوەی کۆمەڵگا بتوانێت لەڕووی ئابوورییەوە گەشەبکات و بەباشترین و بەکارترین و چالاکترین شێوە مەسەلەی بەرهەمهێنان گەشەپێبدات. "مامەڵەی ستراتیژی" وادەکات کۆمەڵگا لەڕووی ئابووری و سامانەوە بەئاستێکی پێشکەوتووی گەشەکردن بگەیەنێت و تا ڕادەیەکی زۆر کۆمەڵگا لە مەسەلەی نەبوونی و هەژاری مادیی چارەسەربکات. هاوکات "مامەڵەی پەیوەندیخوازیش" پێویستە بۆئەوەی ئینسان بتوانێت ئینسانیەتی خۆی بپارێزێت و کۆمەڵگایەکی کراوە و ئازاد و هاریکار دروستبکات، کۆمەڵگایەک بتوانێت ئینسانەکان لە هەژاری ڕۆحی بپارێزێت. هابرماز پێیوایە ئەو دوو شێوەیەی ئەخلاقیش، کە لە ناو "سیستم" و "ژیانگادا" دروستدەبن هەردووکیان پێویستن و یەک ئەویدیکەیان تەواودەکات.

ئەگەر ئەمەی هابرماز باسیدەکات ڕاستبێت، ئەوکات ئەو پرسیارە دێتە کایەوە: ئایا کێشە و گرفتەکان لەکوێوە دروستدەبن و چۆن دەستپێدەکەن؟ هابرماز لە وەڵامدا ئەڵێت: کێشەکان لەوێوە دەستپێدەکەن، کە "سیستم" بیەوێت یاسا و بەها و ئەخلاقیەتی خۆی بەسەر "ژیانگادا" بسەپێنێت و سنوورەکانی نێوان ئەو دونیا جیاوازانە بسڕێتەوە. بەکورتی کێشەکان لە داگیرکردنی سیستمەوە بۆ ژیانگا

دەستپێدەکات. لای هابرماز ئەرکی "ژیانگا" ئەوەیە، کە نەهێڵێت کارتێکردنەکانی سیستم بۆناو ژیانی کۆمەڵایەتی و ژیانی سیاسی و ژیانی کولتوری ئینسان درێژبێتەوە. ئەم بەشەی ژیان دەبێت توانای ئەوە پەیداکات، کە نەهێڵێت لۆژیکی گەشەی ئابووری و سیاسی و حەز و ویست و دەستدرێژیەکانیان شۆڕببنەوە بۆناو ژیانی ڕۆژانە و ئەم ژیانە کۆنترۆڵبکەن و بیخەنە ژێر چاودێریەکی میعیارییەوە. هابرمز دەڵێت کێشەی کۆمەڵگا هاوچەرخەکان و لەوێشەوە کێشەی مۆدێرنە لەوێوە دەستپێدەکات، کە سیستم ئەوەندە گەشەی کردووە و ئەوەندە بەهێز بووە، وایلێهاتوە بەردەوام فشاردەخاتە سەر "ژیانگا". تێکچوونی ئەم هاوکێشەیە بە قازانجی سیستم ئەو قەیرانە گەورەیەیە، کە مۆدێرنەی تێکەوتووە. ئەم پەیوەندییە ئەوەندە تێکچووە هابرماز قسە لە داگیرکردنی سیستم بۆ ژیانی ڕۆژانە دەکات بەباوەڕی هابرماز دەربازبوونی مۆدێرنە لەم قەیرانە و دۆزینەوەی چارەسەر بۆ کێشەی تێکچوونی ئەو پەیوەندییانەی لەسەرەوە باسکرا، لەوەدا نییە واز لە عەقڵانیەت بهێنین و چیدی باوەڕی خۆمان بە عەقڵ نەدەین، بەڵکو بەپێچەوانەوە مۆدێرنە پێویستی بە تەواکردنی پرۆژەی عەقڵ و بەڕادیکاڵکردنی پرۆژەی عەقڵانیەت هەیە. هابرماز لەمخاڵەدا جیاوازی خۆی لەگەڵ دیدی پۆست مۆدێرن و لەگەڵ ئەخلاقناسی پۆست مۆدێرندا ڕادەگەیەنێت.

بەباوەڕی هابرماز مۆدێرنە لەناو "ژیانگادا" پەیوەندییەکانی عەقڵانیکردووە و هیرارکیەتە کۆنەکان و ئەو بەها و ئەخلاقیاتە بەسەرچووانەی لەناوبردووە، کە بەریان بە دروستبوونی پەیوەندی ئازاد و "هەڵسوکەوتی پەیوەندیخوازانە" لەنێوان ئینسانەکان و لەنیوان ئەوان و دەزگاکاندا، دەگرت. بەمانایەکی دیکە مۆدێرنە لێرەدا ئەو چوارچێوە تەقلیدییانەی لەناوبردووە، کە مانایان بە ژیان ئەدا و لەشوێنی ئەواندا ئەخلاقناسییەکی مۆدێرنی هێناوەتەکایەوە، کە ئازادی بنەماکەیەتی. بەباوەڕی هابرماز لە "ژیانگا"ی مۆدێرندا ئینسان زیاتر مافی قسەکردن و مافی

دەربڕینی هەستی خۆی بەدەستهێناوە بەبەراورد بە دونیای بەر لە مۆدێرنە. ئەو دەسەڵاتانەی بەر لە مۆدێرنە نەدەکرا هیچ جۆرە گومانێکیان بەرامبەر بکرێت، مۆدێرنە ڕووبەڕووی دەیان پرسیاری کوشندەی کردوونەتەوە. بۆ دەرچوون لە قەیرانە تازەکانییش مۆدێرنە پێویستی بە بەرفراوانکردنێکی عەقڵانی ژیانگا و چاودێریکردن و کۆنترۆڵکردنی زیاتری سیستم و عەقڵانیەتی سیستم هەیە.
وەک وتمان هابرماز لۆژیکی سیستم ناودەنێت "لۆژیکی سەرمایە و دەسەڵات" و لۆژیکی دونیای ژیانگاش "لۆژیکی هەڵسوکەوتی پەیوەندیخواز". ئەم دولۆژیکە هەم ناکۆکن بەیەکدی هەم هەریەکێکیشیان دەخوازێت دەستبخاتە ناو سەرزەمینی ئەویدیکەیانەوە. ئەم دوو لۆژیکە دوو لۆژیکی دەستدرێژیکەرن و هەریەکێکیان دەیەوێت ئەو دیکەیان پەکبخات و بێدەنگیبکات. بەڕای هابرماز لەم ململانێیەدا دواجار سیستم دەدۆڕێت و لۆژیکی ژیانگا دەیباتەوە. هۆی ئەم بردنەوەیەش ئەوەیە، کە لۆژیکی ژیانگا گرنگترە بۆ ژیان تا لۆژیکی سیستم. بۆیە سیستم دواجار ناچارە خۆی لەسەر لۆژیکی ژیانگا بیناببنێتەوە. بۆ سەلماندنی ئەم دەرەنجامە هابرماز باس لەوەدەکات، کە هێزی دژ بە سیستم و دژ بە فشارەکان و بە لۆژیکی سیستم بەردەوام لەناو دونیای ڕۆژانەی خەڵکدا لە فراوانبووندایە و باوەڕیشیوایە دواجار ئەم هێزە فشارهێنانەن وادەکەن ژیانگا و لۆژیکی ژیانگا بەسەر سیستم و لۆژیکی سیستمدا زاڵبێت و هەردوو دونیاکە یەک لۆژیک کۆیانبکاتەوە و بەڕێوەشیانببات، کە ئەویش لۆژیکی ژیانگایە.، کە لۆژیکی ژیانگاش سەرکەوت ئەوکات هەقیقەت شتێکی بابەتی، یاخود سەپێنرلو نابێت، بەڵکو دەبێتە دەرەنجامی ڕێکەوتنی کۆمەڵایەتی، کە خودی ئەو ڕێکەوتنە لەسەر بنەمای ئاڵوگۆڕی ئەرگومێنت و دیالۆگ دروستدەبێت.
تیۆرەی ڕێکەوتن دەربارەی هەقیقەت لای هابرماز لەسەر ئەو فیکرەیە دامەزراوە، کە دەڵێت هەموو کەس لەڕووی پرنسیپەوە بۆی هەیە هەم خیبرەکانی و هەم

بۆچوونەکانی بخاتە ناو پانتایی گفتوگۆوە. لێرەدا بابەتی بوون و ڕاستەقینەییبوونی خیبرەکـان بنـاغەی پرۆسـەی فێربـوونە عەقلانیەکـان نـین، بەڵکـو ئـاڵوگۆڕی ئەرگومێنتەکان دەستنیشانی هەقیقەت دەکات. بەمانایەکی دیکە هەقیقەت شتێکی پێشـوەخت پێـدرلو و بـابەتی نیـیە، بەڵکـو دروسـتکرلوێکی کـۆمەڵایەتییە، کە پەیوەندی و ئاڵوگۆڕی ئازادی ئەرگومێنت دروستیدەکات.

-١٤-

فەیلەسوفی هۆڵەندای، هاری کوونەمان، لە ڕەخنەکردنیدا بۆ بۆچوونەکانی هابرمـاز دەڵێـت کێشـەی ئەو بۆچوونـانە لەوەدایە هـیچ گـرنگییەک بە مەسـەلەی جەستەییبوون، ئارەزو، هەستەکان و ئەو هەڵوێستە وجودییانە نادات، کە ئینسـان ناتوانێت تیایاندا خۆی بە شێوەیەکی عەقلانییانە پێناسبکات. هابرماز ئینسان وەک بـوونەوەرێکی عەقلانـی پێناسـدەکات، کە دەتوانێـت دونیـای نـاوەکی و کێشـە ڕۆحییەکانی هەم لە پەیوەندییەکانیـداو هەم لە زمانـدا بەرجەسـتەبکات. بەبـاوەڕی هابرماز ئینسان بۆچارەسەری هەموو کێشەکانی دەتوانێت ڕاسـتەوخۆ بـۆ عەقـڵ و ئەرگومێنتی عەقلانییانە بگەڕێتەوە. کوونەمان پێیوایە خاڵی ناکۆکی نێوان هابرمـاز و پۆست مۆدێرنەکان ئالێرەوە دەستپێدەکات. ئەم متمـانە ڕۆشـنگەرییانە گەورەیە بە عەقڵە، کە پۆست مۆدێرنەکانی وەک لیوتار و فوکۆ بەرپـەرچینەدەنەوە، ئەمـانە پێیانوایە عەقڵ ناتوانێت هەموو ڕەهەندە جیاوازەکانی ئینسان بەرجەستەبکات. لای هابرماز ئینسان بکەرێکی زمانزانە، زمانیش بنەمای عەقلانیەت و بنەمای تەعبیـرە، بـۆیە دەکرێـت سـەرجەمی دونیـای نـاوەوەی ئینسـان لەڕێـی زمـانیەوە بناسرێت. هابرماز لەم وێنەیەیدا بۆ ئینسان، ئینسان وەک بوونەرێکی بێجەستە، بێسـێکس و

بێڕەگەز، واتە لەدەرەوەی نێر و مێبووندا، دەبینێت.
کوونەمان دەڵێت هابرماز ئەو چاڵانە نابینێت، کە لەناو زماندا هەن، ئەو بۆشاییانەی ناو زمان نابینێت، کە بەهیچ وزەیەکی عەقڵانی ناتوانرێت پڕبکرێنەوە. بە مانایەکی تر ئەو دەستکورتییەی زمان هەیەتی لە توانای دەربڕینی دونیای ناوەکی ئینساندا، شتێکە لە فیکری هابرمازدا نابینرێتەوە، هابرماز ئینسان کورتدەکاتەوە بۆ بوونەوەرێکی عەقڵانی زمانزان و قسەکەر. بێدەنگی و جەستەیبوون، کە دوو ڕەگەزی سەرەکی ئینسانن، هابرماز بێبایەخیان دەکات و دەریاندەکاتە دەرەوەی لێکدانەوە فەلسەفی و کۆمەڵایەتییەکانی خۆیەوە. هابرماز چارەسەری کێشە ڕۆحی و دەروونییەکانی ناو دونیای ژیانگا دەداتە دەست سایکۆلۆژیا و چارەسەری کلینیکیانەی دەزگاکانی دەروونناسی، واتە هابرماز تەندروستی ڕۆحی و دەروونیانەی ئینسان دەداتە دەستی دەزگاکانی بواری پزیشکی دەروونی و تیۆرەکانی سایکۆلۆژیا و باوەڕی وایە ئەم دەزگا و تیۆریانە دەتوانن وەڵامی عەقڵانی و زانستییانە بە کێشە سایکۆلۆژی و ناوەکییەکانی ئینسان بدەنەوە. ئەمە لەکاتێکدا فۆکۆ لەمێژە ئەوەی سەلماندووە، کە هەم سایکۆلۆژیا خۆی وەک زانست و هەم دەزگاکا سایکۆلۆژییەکان لەڕێگای ستراتیژە جیاوازەکانی دەسەڵاتەوە پاوانکراون و دەسەڵاتی مۆدێرن لەناو خودی ئەو "زانست" و دەزگایانەدا ئامادەیە. فۆکۆ پێیوایە کاری سایکۆلۆژیا و دەزگا سایکۆلۆژییەکان گەڕاندنەوەی عەقڵانییەت نییە بۆ ئینسانێک، کە بەپێی پێناسە باوەکانی ناو کۆمەڵگا وەک نەخۆش تەماشادەکرێت، بەڵکو کاریان ئەوەیە ئینسان بگێڕنەوە سەر دۆخی "ئینسانێکی ئاسایی"، ئاسایی بەو مانایەی بۆچوونە باڵادەستەکانی ناو کۆمەڵگا دەربارەی ئاساییبوون قبووڵ و پیادەبکات و بەپێی ئەو پێناسانەی ئاساییبوون و نائاسایی بجوڵێتەوە، کە دەسەڵاتی مەعریفە و دەزگاکان و سیاسەت کردوونی بەپێناسی باڵادەست. فۆکۆ نیشانیداین، کە سایکۆلۆژیا بەشێکە لەو

ستراتیژە ئاڵۆزەی دەسەڵات، کە کاری ئەوەیە ئینسان لە کۆمەڵگا هاوچەرخەکاندا چاودێری و کۆنترۆڵ و دەستەمۆبکات. بەباوەڕی کوونەمان هابرماز لەقسەکردنیدا لەسەر ئەم ڕەهەندە گرنگەی کۆمەڵگای مۆدێرن وا قسەدەکات وەک ئەوەی نە ڕەخنەی فۆکۆ و تەنانەت نە بەشێکی گرنگی ڕەخنەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرتیش، بوونیاننەبێت. هابرماز لەم خاڵەدا پۆزەتیڤیست و عەقڵانییەکی ڕۆشنگەرانەی تەقلیدییە و باوڕی بە بێلایەنی عەقڵ و بێلایەنی مەعریفە هەیە.
خاڵێکی دیکەی ڕەخنەی کوونەمان لە هابرماز بریتییە لە مەسەلەی کورتهێنانی "تیۆرەی پەیوەندیکردن" لای هابرماز و یەک ڕەهەندییوونی ئەو پەیوەندییانە لەو تیۆرەیەدا. کوونەمان پێیوایە بیرۆکەی پەیوەندی لای هابرماز تەنها لەو پەیوەندییانە ئەدوێت، کە ئینسان لەگەڵ ئەویتردا هەیەتی، لەکاتێکدا پەیوەندی ئینسان لەگەڵ ناوەوەی خۆیدا، کە بەهەمان ئەندازەی پەیوەندی لەگەڵ ئەوانیتردا گرنگە، لای هابرماز بەتەواوی لەیادکراوە. کوونەمان لێرەدا جەخت لەسەر کۆی ئەو شتانە دەکاتەوە، کە زمان ناتوانێت دەریانبڕێت و لەڕێی پەیوەندیەکی دەرەکییەوە بەرجەستە و فۆرمیولەیان بکات. کوونەمان تا ئەوڕادەیە پێدادەگرێت و دەڵێت چۆنایەتی و جۆری ئەو پەیوەندییانەی ئینسان لە کۆمەڵگادا دروستیاندەکات، بەتەنها وابەستە نییە بەو پەیوەندییانەی لەگەڵ دونیای دەرەوەدا دروستیدەکات، بەڵکو وابەستەشە بەوە پەیوەندییانەوە، کە لەگەڵ ناوەوەی خۆشیدا دروستیدەکات. ئینسان گەر پەیوەندییەکی تەندروستی لەگەڵ ناوەوەی خۆیدا نەبێت، ناتوانێت پەیوەندییەکی تەندروستی لەگەڵ دونیای دەرەوەدا هەبێت. ئەم پەیوەندییەش بەناوەوە نە زمان دەتوانێت بە تەواوی بەرجەستەییکات و نە عەقڵ و عەقڵانیەتیش دەتوانێت هەموو دەرکەوت و قوڵاییەکانی ببینێت.
لێرەوە کونەمان ڕەخنەی هابرماز لە فۆکۆ و لە نیتشە ڕەتدەکاتەوە و دەڵێت: هەوڵی نیتشە بۆ وازهێنان لەوە بەجێهێشتنی ئەو بەها کۆمەڵایەتییانەی، کە

کۆمەڵگا دروستیاندەکات و هەوڵی فۆکۆ بۆ هێنانەکایەی ئەخلاقناسی "بەتەنگ خۆوەهاتن" هەوڵدانی نەهلیستی و ناعەقڵانی نین، وەک هابرماز رایدەگەیەنێت، بەڵکو بریتین لە بەرجەستەکردنی ئەو ڕەهەندە ناوەکییەی ئینسان، کە لەسەرەوە باسکرا. بەباوەڕی کوونەمان، فۆکۆ کاتێک قسە لە ئەخلاقی "پاراستنی تاکایەتی ئینسان" دەکات و پێیوایە ئینسان دەبێت بوونی خۆی بکاتە کارێکی هونەری کراوە بەڕووی هەموو ئەگەرێکدا و هاوکات ڕاپەڕیویش بەڕووی هەر پێناسێکی پێشین و سەپاودا، ئەمە ناعەقڵانیەت و نەهلستیەت نییە، بەڵکو پێشنیارکردنی ئەخلاقناسییەکی تازەیە، کە وابەستەی گۆڕانەکانی ناو دونیای پۆست مۆدێرنە و زادەی ئەو مافەیە، کە ئەخلاقناسی پۆست مۆدێرن ناویدەنێت "مافی جیاوازبوون". بەباوەڕی کوونەمان پەیوەندی کراوە و "هەڵسوکەوتی پەیوەندیخواز"، کە هابرماز باسییاندەکات، پێویستیان بەوپەڕی ئاشکرایی و ڕوونیی عاتیفی و وجودییانە هەیە، کە ئینسان وەک تاکەکەس دەبێت هەڵگریانبێت. ئەم ڕوونییەش بەرامبەر بە ئەویتر و بەتایبەتی بەرامبەر بە خود خۆی، سەرچاوەکەی تەنها لەو ئەرگومێنتە عەقڵانییانەدا نییە، کە ڕێکەوتن لەنێوان ئینسانەکاندا دروستدەکات، بەڵکو لە پەیوەندیکردن و ڕووناککردنەوەی ئەو شتانەدایە، کە ئینسان دەکاتە تاکەسێکی دەگمەن و تەنیا و بێوێنە. بەمانایەکی دیکە ئینسان بۆئەوەی ببێتە بوونەوەرێکی ڕوون لە ڕووی سۆز و هەست و ئارەزووەکانییەوە، پێویستی تەنها بەناسینی ئەویدیکە نییە، بەڵکو پێویستی بە ناسینێکی ورد و قووڵی خۆشی هەیە. ئینسان بوونەوەرێکی فرەڕەهەند و فرەخودە، کە تەنانەت خۆشی بۆ خۆی تەولو ئاشکرا نییە و ژیانی بریتیە لە هەوڵدانێکی بەردەوام بۆ ناسین و ئاشنابوون بەو هەموو ئەگەرانەی لەناوەوەڕا و لە قووڵاییەکانی خۆیدا هەڵیگرتووە. ناسینی ئەم فرەڕەهەندی و ئاڵۆزییە ناوەکییە بەبێ سەلماندنی ە ، جیاوازبوون و بەبێ *ئەخلاقناسی لێبووردن، کارێکی مەحاڵە. بەکورتی ئی ...ن بەتەنها بوونەوەرێکی*

قسەکەر نییە بەڵکو جەستەیەکی چێژپشکن و داواکەرە، جەستەیەکی ئازارچێژە، بوونەوەرێکی هەستکەر و قابیلی تێکشکانە، وەکچۆن ئیشکەر و بێدەنگیشە. لەکاتێکدا هابرماز ئینسان کورتدەکاتەوە بۆ بوونەوەرێکی قسەکەر، کە توانای دۆزینەوەی ئەرگومێنت و زمانێکی عەقڵانی هەیە بۆ دەربڕینی ناوەوەی خۆی لەوکاتەدا ئەخلاقناسی پۆست مۆدێرن باس لە ئاڵۆزی و کورتهێنانی عەقڵ و ئەرگومێنتی عەقڵانی دەکات لە ناسین و نیشاندان و نرخاندنی هەڵسوکەوت و ئاکارەکانی ئینساندا.

-١٥-

هاری کوونەمان پێیوایە بۆ ئەوەی "هەڵسوکەوتی پەیوەندیخواز" جێبەجێ و پیادەبکرێت بەو مانایەی هابرماز بەم چەمکەی دەدات، پێویستە تیۆرەکەی هابرماز بە دوو تەوەرەی تر دەوڵەمەندکرێت. یەکەمیان پێداگرتن لەسەر ئەو ڕاستییەی، کە جەستە بەقەد زمان گرنگە و لێرەوە لۆژیکی چێژ و ئازار و ئارەزوو و توانای تێکشکانی جەستە، هێندەی ئەو توانا عەقڵانییانە گرنگە، کە زمان هەڵگریەتی. دووهەمیش پێداویستی بنیادنانی ئەخلاقناسییەکی تایبەت بە تاکەکەس، کە ڕاستەوخۆ بەبەرجەستەکردن و دابینکردنی چێژ و ئارەزوو و داواکارییە جەستەییەکانەوە گرێدراوە، کە لەدەرەوەی ئەخلاقناسی ئایینی و ئایدیۆلۆژی و گرووپگەراییەوە، کاریکات.

بەباوەڕی کوونەمان ئەم دوو ڕەهەندە زۆرگرنگن بۆ دروستبوونی ئەو شێوە هەڵسەکەوتەی هابرماز ناویدەنێت "هەڵسەکەوتی پەیوەندخواز" و پۆست مۆدێرنەکان لەژێر دەستەواژەکانی جیاوازی و مافی تاکبوون و ئەخلاقناسی

تاککەریدا ناونووسیدەکەن. بەباوەڕی کوونەمان لە خاڵی یەکەمیاندا جەستە هەموو مافەکانی خۆی وەردەگرێتەوە، لە مافی چێژوەرگرتنەوە بۆ مافی قسەنەکردن و بێدەنگبوون. لە دووهەمیشیاندا ئەو ئەخلاقناسییە تاککەرابیە لەدایکدەبێت، کە ئامادەیە کۆی جیاوازییەکانی ئینسان بسەلمێنێت و هەموو ئەو شوناسانە قبووڵبکات، کە لە شوناسی باڵادەستی ناو کۆمەڵگا ناچن. کوونەمان پێیوایە "تیۆرەی ڕێکەوتن" وەک بنەمای دروستکردنی کۆمەڵگایەکی ئینسانی، نابێت تەنها وێکچوونەکانمان نیشانبات، بەڵکو دەبێت جیاوازیەکانیشمان بە شێوەیەکی ڕوون بەرجەستەبکات، نابێت تەنها دەرەنجامی وتنی "بەڵێ" کانمان بۆ یەکتری، بەڵکو دەبێت ئەنجامی هەموو ئەو "نەخێر" انەش بێت، کە دەشێت بەیەکتری بڵێین. بەباوەڕی کوونەمان ئەم دۆخەش کاتێک دێتەکایەوە ئێمە بێدەنگییەکانی ناوخۆمان و ئارەز و ئازارەکانمان بناسین و مافی ئەوەشمان هەبێت دەریانبڕین بەبێئەوەی بترسین لەوەی سەرکوت و سەرزەنشت بکرێن و لەڕووی ئەخلاقییەوە خراپ بنرخێنرێن و خراپ داوەرییکرێن.

ئەم مافی جیاوازیبوونەیە بنەمای ئەخلاقناسی پۆست مۆدێرن دەستنیشاندەکات، گەر بکرێت باس لە بوونی بنەمایەکی گشتی بۆ ئەخلاقناسی پۆست مۆدێرن بکەین. ئەم مافە ئەوە دەسەلمێنێت هەرکەسێک ئارەزووەکانی، ئەگەرەکانی ناو خۆی، لەژێر سایەی خیبرە حەیاتییەکانی خۆیدا بەرجەستەبکات و خۆی دەستنیشانی ئەوەبکات چی لە ژیانیدا گرنگترین شتە و دەخوازێت چ فۆرمێک بەو شتانەبدات و بە چ شێوەیەک پراکتیکیانبکات. بێگومان هەموو ئەمانە دژ بەو گوتارە باڵادەستەی ئەخلاقناسییە، کە دەخوازێت ئینسان لەناو پرۆسەکانی بەکۆمەڵایەتیکردن و بەسروشتیکردنی ئەخلاقیدا بەندبکات. واتە ئەخلاق بکات بە دیاردەیەکی سروشت، یان کۆمەڵایەتی لەدەرەوەی هەڵبژاردنی تاکەکەسیدا. هەروەها ئەم پرۆسەیە دژ بە هەموو ئەو فۆرمانەی ئەخلاقناسییە، کە بەناوی

بوونی کۆمەڵێک بەهای بابەتی و موفاریقەوە دەخوازن سنووری هەڵسوکەوتەکانی ئینسان و سنووری هەڵبژاردنەکانی بەرتەسکبکەنەوە، ئیدی هەر لەوانەوە، کە بەناوی خودلوەند و ئایین و بەها پیرۆزەکانەوە ژیان بەرتەسک و هەڵبژاردنەکانی ئینسان گوناهبار دەکەن، تا بەوانە دەگات، کە بەناوی مژدەی ناو ئایدیۆلۆژیا گەورەکانەوە ئینسان بە کۆمەڵێک هەڵبژاردنی تایبەت و بە شێوازێکی تایبەتی بیرکردنەوە و هەڵسووکەوت مەحکومدەکەن. بەمانایەکی دیکە ئەخلاقناسی پۆست مۆدێرن ناتونێت ئەو دونیایە قبووڵکات، کە داوا لە ئینسان دەکات مانا باوەکان و پێناسە باوەکان و شوناسە باوەکان قبووڵکات، کە لە جەوهەردا بۆ دەستەمۆکردن و ڕامکردنی ئینسان دارێژراون و هاتوون بۆئەوەی قوفڵێک لە ئازادی ئینسان بدەن.

-١٦-

بەباوەڕی کوونەمان لەپاڵ ئەو دوو زۆنەی، کە هابرماز لە یەکدیان جیادەکاتەوە، مەبەست "سیستم" و "ژیانگا"یە، دەبێت زۆنێکی دیکە بکەینەوە، کە بکەوێتە نێوان سیستم و ژیانگاوە، ئەویش "زۆنی تێکەڵبوونە". "زۆنی تێکەڵبوون" بریتییە لەو زۆنەی سیستم بە ژیانگاوە دەبەستێتەوە و بەیەکتریان تێکەڵدەکات. کوونەمان لێرەدا دانشگا وەک نموونەیەک بۆ زۆنی تێکەڵبوون دەهێنێتەوە. بەبۆچوونی ئەو دانشگا ئەو زۆنەیە، کە سیستم، واتە دەسەڵاتی ئابووری و بیرۆکراتیەت، ڕاستەوخۆ گرێدەدات بە ژیانگاوە، واتە بەو پەیوەندییانەوە، کە لەنێوان قووتابییان و مامۆستایاندا و لەنێوان قووتابییان خۆیان لەگەڵیەکدا دروستیدەکەن. بەم مانایە زانکۆ لەیەککاتدا بەشێکە لە دونیای ئابووری و لە دونیای ژیانگاش لەهەمانکاتدا. کوونەمان پێیوایە ئەو دابڕینە شاقووڵییەی هابرماز لەنێوان سیستم و ژیانگادا

دروستیدەکات، پێویستی بە پێداچوونەوە هەیە، چونکە واقیعی کۆمەڵایەتی ئینسان و پێکهاتەی ناوەکی کۆمەڵگا لەو دوو لایەنەی هابرماز باسیاندەکات، ئاڵۆزترە.

بە باوەڕی کوونەمان بەناویەکداچونی ڕۆنەکانیش مانای ئەوەی هەریەکێکیان برێک لە کاراکتەری خۆی بەویدیکەیان دەبەخشێت و هەریەکێکیان بەشێک لە ڕەگەزەکانی خۆی تێکەڵ بە ڕەگەزەکانی ئەویتریان دەکات. بۆ نموونە ئیستیهلاک، کە بەشێکی گرنگە لە لۆژیکی ئابووری و لەوێشەوە لە لۆژیکی سیستم، دەشێت لە ژیانگادا مانای پۆزەتیڤ بگرێتەخۆی، بەپێچەوانەی بۆچوونی هابرمازەوە، کە پێیوایە ئیستیهلاک بەدرێژایی خەت شتێکی خراپە. کوونەمان ڕای وایە ئینسان دەتوانێت بەشێک لە شوناسی خۆی لەپاڵ ئەو شتانەدا بنیادبنێت، کە هەیەتی و بەکاریاندەهێنێت. ئەو شتانەی، کە ئارەزوویاندەکات و دەخوازێت بەدەستیانبهێنێت و لەدەرەنجامیشدا بەکاریانبهێنێت، دەشێت بەشێک لە شوناسی ئینسان دروستبکەن لەدەرەوەی ئەو داواکارییە ئەخلاقیانەدا، کە کۆمەڵگا داوا لە تاکەکان دەکات، پەیڕەوییبکەن. بە مانایەکی دیکە کوونەمان دەیەوێت بڵێت لەکاتێکدا هابرماز عەقڵانیەتی ئابووری و ئیستیهلاک و بیرۆکراسییەت نێگەتیڤانە دەنرخێنێت و لە عەقڵانیەتی کراوە و پەیوەندخوازی ژیانگای دادەبڕێت، پۆست مۆدێرنەکان دەیانەوێت ئەم عەقڵانیەتانە بەیەکتری تێکەڵبکەن و هەوڵیشنەدەن لایەنە پۆزەتیڤەکانی ئەم تێکەڵبوونە نیشانبدەن.

ئەوەی زۆر گرنگە لێرەدا جەختی لێبکرێت، کوونەمان دەڵێت، ئەوەیە، کە لۆژیکی هەریەکێک لەو سێ کایەیە، یان ئەو سێ ڕۆنە، وەک لۆژیکی فرەڕەهەند، یان ڕاستتر بلوێین وەک فرەلۆژیک ببینین. هەریەکێک لەو کایانە بارگاوین بە ئەگەری گەشە و ئازادی، بەڵام لەهەمانکاتیشدا بە ئەگەری جەنگ و توندوتیژیش.

[illegible]

گشتی هەموویان بەیەکەوە گرێدەدات و یەکیەتییەکی ناوەکی لەنێواندیاندا دروستدەکات. بە پێچەوانەی فیکری مۆدێرنەوە، کە هەمیشە ڕای وابووە لۆژیکێکی گەورە هەیە هەموو لۆژیکەکانی دیکە لە خۆیدا کۆدەکاتەوە، یاخود وەک ژێرخانی هەموو لۆژیکەکانی تر دەستبەکارە، لۆژیکی پۆستمۆدێرن ئەو لۆژیکەیە، کە باوەڕی بەم لۆژیکە سەرتاسەرییە ژێرخانییە نییە، کە هەموو لۆژیکەکانی دیکەی لەسەر بنیادبنرێت. بەباوەڕی کوونەمان هەریەکێک لەوکایانە چەندان لۆژیکی جیاوازیان تێدایە، کە دەشێت لە هەریەکێکیاندا بونیادێکی سەرەکی هەبێت بۆ کارکردونیان، بەڵام نە بونیادێکی سەرەکی و نە لۆژیکێکی گشتی نییە ئەو هەموو جیاوازییانەی لەناو ئەو سێ کایەدا هەیە، بەیەکەوە کۆکاتەوە. لێرەوە ناکرێت قسە لە بوونی تیۆرەیەکی گشتی ئەخلاقناسی بکەین، کە لەهەموو ئەو کایانەدا دەستبەکاربێت و دەستنیشانی ئەوەبکات ئێمە چۆن بژین و چۆن هەڵسوکەوت بکەین.

جیاوازی لۆژیکەکان بەرەو گرنگترین بابەتی ئەخلاقناسی پۆست مۆدێرنەمان دەبات، کە بریتیە لە جیاوازی و مافی جیاوازیبوون. کوونەمان پێیوایە، کە تاکەکەسی پۆست مۆدێرن تاکەکەسێک نییە بەدوای ڕێکەوتندا بگەڕێت وەک هابرماز دەڵێت، بەڵکو تاکەکەسێکە بەدوای وەدیهێنانی خودی خۆی و دونیای تاکانەی خۆیدا دەگەڕێت. ئەمەش مانای ئەوە نییە، کە قۆناغی پۆست مۆدێرنە قۆناغی غیابی ئەخلاق و غیابی بەرپرسیاریەتە، بەڵکو مانای ئەویە قۆناغی گۆڕانی ئەخلاق و گۆڕانی مەسەلەی بەرپرسیاریەتە. چیدی مانا کۆنەکانی ئەخلاق ناتوانن ببنە ئەو سەرزەمینەی هەڵسوکەوتی ئینسان لە ئێستادا دەستنیشان بکەن، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە، کە ئینسانی هاوچەرخ لە هەڵسوکەوتیدا هەڵگری هیچ سەرەتاگە و پرنسیپێک نییە. بەرپرسیاریەت بەرامبەر بە ئازادی خود و بەرامبەر بە ئازادی ئەوانیتر، یەکێکە لەو پرنسیپە گرنگانەی، کە ئەخلاقی ئەم قۆناغە لە ئەخلاقی قۆناغەکانی دیکە جیادەکاتەوە.

-١٧-

لەناو هەموو سیستمێکی ئەخلاقیدا سیستمێکی دیاریکراوی یاساغکردن و کوشتنی ئارەزووەکان لەئارادایە، کوونەمان پێیوایە بۆ ڕزگارکردنی ئینسان و ڕزگارکردنی ئەخلاق خۆشی دەبێت ئارەزووەکان ئازادبکرێن. لەم دیدەدا ئەخلاقی پۆست مۆدێرنە ئەخلاقێکە تێیدا تاکەکەس خۆی سنوورەکانی کرانەوە و داخرانی خۆی دەستنیشاندەکات، خۆی ئارەزووەکانی خۆی ڕەنگڕێژدەکات و خۆی شوناسی خۆی هەڵدەبژێرێت. لەدونیایەکی ئاوادا ئەوەی لەبەریەکدی هەڵدەوەشێتەوە کۆمەڵگا و پەیمانی کۆمەڵایەتی نییە، بەڵکو شێوەیەکی تایبەتی ئەخلاقە، کە لەسەر بنەمای ئایدیۆلۆژی، یان ئایینی دروستبووە، ئەخلاقێک چیدی ناتوانێت ڕۆڵی ئەو سیستمە ڕەمزییە ببینێت، کە ئینسان ماناکانی ژیانی لێوە هەڵدەهێنجێت.

لەم دۆخەدا ئەوی لەبەریەکدی هەڵدەوەشێتەوە ئەخلاق نییە و کۆمەڵگاش نییە، بەڵکو سیستمێکی دیاریکراوی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتییە. بۆ نموونە ئەوەی لە ئەفغانستاندا ڕوودەدات پاراستنی ئەخلاق و پاراستنی کۆمەڵگا نییە، بەناوی پاراستن، یان پیادەکردنی ئیسلامەوە، بەڵکو پاراستنی ئەو سیستمی کۆنترۆڵەیە کەنایەوێت هیچ جیاوازییەک بۆ هیچ کەس و لایەنێک بسەلمێنێت تەنها بۆ ئیمامەکان و ئایدیۆلۆژیستەکانی خۆیان نەبێت. لە "ڕۆژئاوا" خۆشیدا ئەخلاقگەراکان تاکەکەس بەوە تاوانباردەکەن، کە بوونی کۆمەڵگایان خستۆتە بەر مەترسی گەورەوە و تاکگەرایی هەڕەشە لە کۆمەڵایەتیبوون دەکات، کەچی لە شەستەکان و سەرەتای هەفتاکاندا قسە لە دەستدرێژی کۆمەڵگا و سیستم بۆسەر تاکەکەس دەکرا و دەگوترا کۆمەڵگا و سیستم تاکەکەس و ئازادی تاکەکەسیان وێرانکردووە.

-١٨-

جان فرانسوا لیوتار، باوکی پۆست مۆدێرنەکان، دەیویست تیۆرەیەکی نوێ دەربارەی ئارەزوو بەرهەمبهێنێت، کە دەشێت بە تیۆرەی ئارەزووی سەردەمی پۆست مۆدێرن ناویبنێین. لیوتار باوەڕی وابوو، کە دونیای ئەمڕۆ پێویستی بە تیۆرەیەکە دەربارەی ئارەزوو بتوانێت بکەوێتە ئەودیوی فرۆیدیزمەوە. لیوتار ڕای وایە بۆ تێگەیشتن لەکۆمەڵگا دەبێت بەوە ڕازینەبین، کە تەنها تەماشای ڕەهەندی نوێنەرایەتی دەزگاکان بۆ خەڵک بکەین، واتە تەنها تەماشای ئەوە نەکەین ئایا دەزگاکان نوێنەرایەتی خەڵک دەکەن، یان نا، بەڵکو دەبێت تەماشای ئەوە بکەین ئەو دەزگایانە چۆن وزەی ئینسان و ئارەزووەکانی ئۆرگانیزە دەکەن( van Peperstraten 1995: 44). بەباوەڕی لیوتار هەموو سیستمێکی کۆمەڵایەتی شوێن و جێیەکی دیاریکراو بۆ ئارەزوو لە هەناوی خۆیدا هەڵدەگرێت. هەموو سیستمێکی کۆمەڵایەتی لەڕاستیدا هاوشانە بە پیادەکردنی ئابورییەکی دیاریکراوی لیبیدۆ. ئەوەی لای لیوتار گرنگە ئەوەیە، کە ئارەزوو وەک دژەدیوی سیستم تەماشانەکەین، پێمان وانەبێت سیستم دژ بە ئارەزووە، چونکە هەموو سیستمێک شێوەیەکی تایبەتی تێرکردنی ئارەزووەکانی هەیە. بەڵام هاوکات هەمیشە ڕەهەندێکی هێز لە ئینسان و کۆمەڵگادا هەیە، کە سیستمەکان ناتوان دەستەمۆ و کەنالیزەی بکەن و نەهێڵن نەبنە هۆی دروستبوونی "ڕووداو" ( van Peperstraten 1995: 44). چەمکی "ڕوداو" لای لیوتار مانایەکی تایبەتی هەیە ئەویش بریتییە لەو شتەی، کە چوارچێوە جێگیرەکانی بیرکردنەوەی ئێمە لەبەریەکدی هەڵدەوەشێنێتەوە و ئیدی لەدوای ئەوەوە ناتوانرێت لەو چوارچێوەیەدا شتەکان و ماناکان نمایشبکرێن و بیر لە دونیا بکرێتەوە ( van Peperstraten 1995: 33).

لیوتار باوەڕی وابوو پێویستمان بە کۆمەڵێک "ڕووداو" هەیە وابکات لیبیدۆ خۆی بدوێت، نەک یەکێک بەناوی ئەوەوە بدوێت و نوێنەرایەتی ئەوبکات (ه. س. پ ل ٥٤). بۆ جێبەجێکردنی ئەم ستراتیژە لیوتار باوەڕی وابوو لەناو هەر سیستمێکدا خاڵی بەرگری هەن، کە کاری ئەو وەک فەیلەسوف بریتیە لە دۆزینەوەی ئەو خاڵانەی بەرگریکردن و دۆزینەوەی شێوازی دیکەی پەیوەندی تازە، کە ئەو ناویدەنێت "جیاوازی". بەمانایەکی دیکە لیوتار لەدایکبوونی سیستمێکی نوێ تیایدا لیبیدۆ خۆی بدوێت نەک نوێنەرایەتی بکرێت، دەبەستێتەوە بە لەدایکبوونی کۆمەڵێک پەیوەندی نوێوە، کە لەسەر بیرۆکەی جیاوازی دروستببێت، چونکە جیاوازی ئەو شتەیە کەناکرێت نوێنەرایەتی بکرێت (ه. س. پ. ل٤٢). جیاوازی بۆیە جیاوازییە، چونکە کەس ناتوانێت نوێنەرایەتی بکات، ئەو خۆی نوێنەرایەتی خۆی دەکات.

یەکێک لەو چەمکە گرنگانەی تر، کە لیوتار بۆ لەدایکبوونی جیاوازی باسیدەکات بریتیە لە چەمکی "تەعبیرلێنەکراو"، دەشێت ئەم چەمکە بەمانای "لە هیچ شوێنێکەوە نەهاتووش" بگەیەنێت. "تەعبیرلێنەکراو"، وەک کوونەمان دەڵێت، دەکەوێتە ئەودیوی هەموو ئەو ڕێکەوتنانەی ئینسان لە ژیانی ڕۆژانەیدا لەسەر بنەمای ئەرگومێنتی عەقڵانی و پەیوەندی دولایەنە و پەیوەندی پەیوەندیخواز، بەدیاندەهێنێت (Kunneman1998). "تەعبیرلێنەکراو" دەکرێت وەک ئەو منداڵەی ناو هەر ئینسانێک ببینین، کە ڕازینابێت گەورەبێت و بە لۆژیکی عەقڵ و عەقڵانیەت تەعبیر لەخۆی بکات. "تەعبیرلێنەکراو" ئەو ڕەهەندەی کەسایەتی و ڕۆحیەتی ئینسانە، کە لەدەستی هەموو لێکدانەوەیەکی عەقڵانی و کلینیکی و سایکۆلۆژی دەربازدەبێت و ئینسان زۆر بەزەحمەتی دەتوانێت بیناسێت، واتە بزانێت چییە و لەچی پێکهاتوە. ئەم پانتاییە ناوەکییە ئەو پانتاییە، کە زمان دەرەقەتی نایەت و کراوەیە و داگیرنەکراوە، دەستی هیچ هێزێکی نەگیشتوتێ و

لەهەمانکاتیشدا بەڕووی هەموو ئەگەرێـک و هەمـوو فـۆرمێکی نـوێی شوناسـدا، کە ئینسان بیەوێت هەڵیبژێرێت، کـراوەیە. بەڵام بێگومـان ئەم پانتـاییە نـاوەکییە، کە ناکرێـت تەعبیـری لێبکرێـت، بەتەواوی داخـراو نیـیە بەڕووی ئینسـاندا، بەڵکـو بەپێچەوانەوە ئینسان دەتوانێت هەندێکجار پەیوەندی پێوەبکات و مانا و هێماکانی بخـوێنێتەوە. بەڵام ئەم پەیوەنـدییە پەیوەنـدییەکە دەکەوێـتە ئەودیـوی ئەو "هەڵسـوکەوتە پەیوەنـدیخوازەوە" بەو مانـا هابرمـازیەی لەسـەرەوە باسـمانکرد. بەکورتی ئەم پەیوەندییە پەیوەندییەکی ناوەکییە لەگەڵ خـود خۆیـدا، نەک لەگەڵ ئەویدیدا، ئەجگە لەمەش پەیوەنـدییەکی زمـانی نییە و لەزماندا بەرجەستەنابێت. هاوکـات ئەم پەیوەنـدییە پەیوەنـدییەکە لەنـاو جەسـتەدایە، ئەو جەسـتەیەی لە یەککاتـدا جەسـتەیەکی گەڕۆکە بەدوای چێـژ و وەدیهێنـانی ئـارەزودا، وەک چـۆن جەستەیەکە دەشێت لەناوبچێت و کۆتایی پێبێت و نەمێنێت.

ئەم ئەخلاقی لیبیدۆیە، کە لیوتار باسـیدەکات ئەخلاقـی جیـاوازی و گەڕانـدنەوەی بەهاکانە بـۆ تـاکەکەس و بـۆ جەسـتە خـۆی، ئەخلاقـی هەرچیزیـاتر چـالاککردنی جیاوازییەکـانە بەئاراسـتەی ئـازادکردنی ئینسـان لەو سیسـتمە ئەخلاقییـانەی لەدەرەوەی ئینسان خۆیدا و وەک بوونێکی بان کاتی و بان شوێنی پێشـنیارکراوە. بێگومان زۆرن ئەوانەی ئەم شێوە ئەخلاقە بە گەورەترین مەترسی بۆ لەبەریەکـدی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵگا و پارچەپارچە بوونی تێدەگەن، زۆرن ئەوانەی پێیانوایە ئەمە سەرەتای هاتنی بەربەریەت و سەرەتای کوشتنی بەرپرسیاریەت و سـەرەتای لەناوبردنی هەموو شتێکی جـوانە لەدونیـادا. ئەم دیـدە ئەخلاقـگەرایە پێیـوایە ئەم ئەخلاقی پۆست مۆدێرن ئینسانەکانی ناو کۆمەڵگا لە یەکدیدادەبڕێت و هەریەکەیان دەکـاتە دوورگەیەکـی دابـڕاو لەویـدیکەیان. بەڵام وەک زیگمۆنـد باومـان دەڵێـت لە قۆنـاغی پۆسـت مـۆدێرنەدا ئەگەری بـوونی کۆمەڵگـا بە کۆمەڵگـایەکی ئەخلاقـی ئەگەرێکـی ئامـادەیە و دەکرێـت یەکێـک لە ئەگەرە گرنگەکـانی قۆنـاغی پۆسـت

مۆدێرنە دروستبوونی دونیایەکی ئەخلاقی پڕ لەبەرپرسیاریەت بێت. گەر ئەم بۆچوونەی باومانیش جۆرێک لە گەشبینی تێدابێت، کە ئەخلاقفرۆش و گرووپگەراکان نەیانەوێت قبوولێیبکەن، ئەوا لەهەموو دۆخێکدا دەکرێت بڵێین ئەوەی ئینسانەکانی ناو کۆمەڵگایەک بەیەکدیەوە گرێدەدات ئەخلاق نییە وەک سۆسیۆلۆژیای سەدەی رابردوو پێماندەڵێت، بەڵکو بازاڕ و دەوڵەتی مۆدێرنە. چ بازاڕ و چ دەوڵەتیش لەسەر بنەمای ئەخلاق بنیادنانرێن و کارناکەن، بەڵکو لەسەر بنەمای یاسا و پەیوەندی یاسایی کاردەکەن. لێرەوە فرمێسکرِشتن بۆ لەبەریەکدی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵگا و نەمانی بەرپرسیاریەت جگە لە گریان و قورپێوانێکی کۆمەڵایەتی تایبەت بۆ دید و وێناکردنێکی دیاریکراوی کۆمەڵگا زیاتر نییە، دید و وێناکردنێک، کە هەم ستالینیزم و هەم نازیزم و هەم ئەنفال و هەم کوشتار و جەنگە دینییەکانی بەرهەمهێناوە و بەرهەمدەهێنێت.

-١٩-

بەکورتی ئەخلاقی پۆست مۆدێرنە لەسەر سێ کۆڵەکەی گەورە وەستاوە

یەکەم: داواکاریەکانی سیستم

دووهەم: دلواکاریەکانی بە تاکبوون.

سێهەم: بیرۆکەی بەرپرسیاریبوون.

بەناویەکداچوونی ئەم سێ لایەنەش هێڵە گشتییەکانی ئەخلاقی پۆست مۆدێرن دەنەخشێنێت. بێگومان ئەم سێ لایەنە دەشێت لەسیاقی جیاجیادا ناوەرۆکی جیاجیا بگرنەخۆیان. بۆ نموونە دەشێت دلواکارییەکانی سیستم ئەوەندە بەهێزبێت، کە دوانەکەی دیکەیان وێرانبکات، دەشێت پێویستی بەتاکبوون

ئەوەندە پەرگیرانە ئامادەبێت هەرچی هەستێک بە بەرپرسیاریەتە لەناوببات، دەشێت هەستکردن بەرپرسیاریەتیش لە کات و شوێنی جیاوازدا ئەوەندە لاوازبێت، کە جینۆساید لەدایکببێت، یان ئەوەندە بەهێزبێت ژیان بکوژێت. چۆنیەتی کارکردن و کارلێکردنی ئەو لایەنانە پێکەوە و لەسەریەکتری پابەندی ئینسان و خەباتی ئینسانە بۆ خولقاندنی دونیایەکی ئازنتر لەوەی لەئارادایە.

ئەوەی گرنگە بیزانین ئەوەیە شتێک بەناوی تاقە هەقیقەت و دواهەمین هەقیقەتەوە بوونینییە، هەقیقەت هەمیشە پارچەپارچەیە. بۆئەوەی کۆمەڵگایەکی یەکگرتوومان هەبێت دەبێت سیستمێکی پارچەپارچەی هەقیقەتمان هەبێت. ناکرێت بمانەوێت کۆمەڵگایەکی پڕ هێز و تاکەکەسی جیاجیا و ناکۆک لەدەوری یەک هەقیقەت کۆبکەینەوە، مەترسی پارچەپارچەبوونی کۆمەڵگا لە بوون و سەپاندنی یەک هەقیقەتدایە بەزۆر بەسەر هەمووانداا، ئارامی و یەکپارچەیی کۆمەڵگایەک وابەستەی ئامادەگی سیستمێکی هەقیقەتە بتوانێت لەهەناویدا چەندەها هەقیقەتی جیاواز و چەندەها ئەخلاقناسی جیاواز و فۆرمی ژیانی جیاواز و شوناسی جیاوازی هەڵبگرێت و لەیەککاتدا هەمووشیان مافی بوون و گەشەکردن و هاتنەقسەشیان هەبێت. لێرەوە ئەوەی لە کۆمەڵگایەکدا پێویستە ئامادەبێت حیکایەکتێکی گەورە نییە دەربارەی ئەخلاق و ئەخلاقناسی، بەڵکو دروستکردنی چوارچێوەیەکە جێگای هەموو حیکایەتەکانی تێدا ببێتەوە.

دونیای کۆمەڵایەتی ئینسان بریتییە لە زنجیرەیەک تێکست، کە دەبێت بۆ لێکدانەوە و خوێندنەوەیان تاڕادەیەکی زۆر لە پەیوەندیاندا بە تێکستەکانی دیکەوە ببینرێن. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە دونیا بوونێکی یەکگرتووی هاوشێوە و لێکچوو نییە، بەڵکو بریتییە لە تێکستی پارچەپارچە و جیاجیا، کە لەنێوانیاندا پەیوەندی فرەجۆر هەیە، نەک یەکگرتن و هاوشێوەیی، ناکۆکی هەیە نەک هارمۆنیەت، ململانێ هەیە نەک بێدەنگی. ئەخلاقی پۆستمۆدێرن ئەو ئەخلاقەیە

لەم ڕاستییە سۆسیۆلۆژی و فیکریانەوە دەستپێدەکات، نەک لەو سیستمە ئەخلاقییە گریمانکراوانەوە، کە دەکەونە دەرەوەی ئینسان و دەرەوەی کۆمەڵگاوە. ئەم سەردەمە سەردەمی بەقسەهاتنی چیرۆکە لۆکاڵی و بچووکەکانە. قۆناغی کۆتایی تاقە تیۆریەکە هەموو شتەکان لێکبداتەوە و ڕاڤەبکات، ئەخلاقناسی پۆستمۆدێرنە ئەخلاقناسی فرەتیۆرەییە.

-٣٥-

پێش کۆتاییهێنان بەم باسە دەخوازم لەهەمان دیدی تیۆرییەوە چەند وشەیەک لەسەر ئەخلاقناسی لە دونیای کوردیدا بڵێم بەو هیوایەی لە داهاتوودا بەشێوەیەکی بەرفراوانتر لەم بابەتە بدوێم. سەرەتا لەم پرسیارەوە دەستپێدەکەم: ئەو دەزگایانە کامانەن لە دونیای ئێمەدا بەهاکان بە تاکەکەس دەبەخشن و دەخوازن ئینسان بکەنە بوونەوەرێکی بەرپرسیار؟ پێموایە خێزان و قوتابخانە لە دونیای ئێمەدا سەرچاوەی سەرەکی بەخشینی ئەخلاقن، یان دەزگا گۆڕینی ئینسانن بۆ بوونەوەرێکی ئەخلاقی. بەڵام ئەمە هەموو حیکایەتی ئەخلاق لەدونیای ئێمەدا نییە، چونکە لەو کاتەدا، کە خێزان و قوتابخانە بەسەرچاوەی بەخشینی ئەخلاق دادەنرێت و وەک بێشکەی پەروەردەکردنی ئەخلاقییانەی ئینسان تەماشادەکرێت، لەهەمانکاتدا زۆربەی شوێنەکانی دیکە وەک شوێنی دژە ئەخلاق، یان بەدئەخلاقی تەماشادەکرێن. سەرجادە، شوێنی ئیش، شوێنی یاری، چاخانەکان، سینەما هتد... هەموویان وەک شوێنی بەهەڵەدابردنی ئینسان و بەدئەخلاقی دەنرخێنرێن. لەڕاستیدا ئەوەتەی گوتاری ئیسلامی سیاسی لە کوردستاندا تەشەنەیکردووە، مەیلێک هاتۆتەکایەوە بۆ سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی قوتابخانە و جادە و

شــوێنەکانی دیــکەش لەســەر مــۆدێلی مــزگەوت و گەڕانــدنەوەی ســەرلەبەری ئەخلاقناســی لەدونیــای ئــێمەدا بــۆ بــاوەش و ســەرزەمینی دیــن. بێگومــان ئەم مەســەلەیە لە جەوهەردا وابەســتەی دەســەلات و ســەرلەنوێ بەرهەمهێنــانەوەی مۆدێلێکی تایبەتی دەسەلاتە لە دونیــای ئــێمەدا، کە تێکەڵــێکە لە کاریزمــا و ڕووە تاریکەکانی مۆدێرنە. دەسەلاتێک، کە هەڵگری وزەیەکی لەئەندازە بەدەری چەپاندن و زەلیلکردنی ئینسانە. ئەم پێکهاتەیەی دەسەلات هیرارکییە، باوکانەیە، سزادەرە، ترســێنەرە، ســەرکوتکەرە، دەسەلاتێکیشــە کاریزمــا و کۆپییەکــانی کاریزمــا بەڕێوەیــدەبەن. ئەو ئەخــلاقەی ئەم پێکهــاتە تــایبەتەی دەســەلات دەیبەخشــێت ئەخلاقی تەسلیمبوونێکی هەمەلایەنی و ونکردنێکی قووڵی تاکایەتی ئینسانە، نەک ئەخلاقی هەڵبژاردنێکی ئازاد و عەقلانیــانە. ئەم ئەخــلاقە ئەخلاقێکــی سەپێنراوە، نەک هەڵبژێــردراو، ئەخلاقــی هێزانێکــی نــادیموکرات و نــا عەقلانیــیە، نەک هــی هێزگەلێک کــراوە و دیمــوکرات. لەنــاو تاریکســتانەکانی مێــژووەوە هــاتووە، نەک لە پرۆژەیەکی هاوچەرخ و نوێوە، کە هەڵگری پرۆژەی ئازادییێت.

بیرۆکەی چاکەکــاری لەنــاو ئەم شــێوە چەپێــنەرانەیەی ئەخلاقناســیدا لە دونیــای ئــێمەدا لەســەر دوو کــۆڵەکە بەنــدە: یەکەمیــان گــوێڕایەڵیەکی سەرتاســەری و پڕوکێنەر، دووهەمیان ئینتیمایەکی سەپێنراو و بەزۆری بێپرســیار و تۆتــالیتێر. ئەم دوو پرنســیپەش نەک ئینســانی ئــازاد و بەرپرســیار، هــاوڵاتی لێبــورد و ڕێزگــر لە ئازادی یەکتری دروستناکەن، بەڵکو خۆیان سەرزەمینی کوشتنی هەموو ئازادییەک و زەلیلکردنی ئینسانن.

ئێمە ناتوانین ئەم ڕاستییە سۆسیۆلۆژیانە ئینکاربکەین بەبێئەوەی بەشێکی هێجگار گەورەی ژیــانی خۆمــان ئینکــارنەکەین. سیســتیم لە دونیــای ئــێمەدا ژیانگــای ئیفلیجکردووە و لەگەڵیشیدا ئینسانەکانیش. دونیای ئێمە جەهەنەمێکی ئەخلاقییە و هێــزە دەســەلاتدارەکانی نــاوی دەیانەوێــت وەک بەهەشــتێکی ئەخلاقیــی پێمــان

بفرۆشن.

حەسەن تورابی لە سیاقێکی لەم بابەتە دەڵێت، ئێمە بارودۆخمان لە هی ڕۆژئاواییەکان باشترە، چونکە لای ئێمە خوداوەند ماوە لەکاتێکدا لای ئەوان لە کونجی چەند کەنیسەیەکدا شاردراوەتەوە. بێگومان دەشێت لەدونیای حەسەن تورابی و لە دونیای ئێمەشدا زۆرشت هەبێت، بەڵام بەهیچ شێوەیەک خوداوەندی تیانەماوە. دونیای ئێمە لەباتی خوداوەند پڕە لەو هەموو ئەو تورابیانەی بەناوی خودا و لەبری خودا دەدوێن و فەتوا دەردەکەن. فەتوای سووتاندنی کتێبەکان، کووشتنی ئافرەتان، پارچەپارچەکردنی ئینسان و سووتاندنی لەسەر بیرکردنەوەی جیاواز. لە دونیای ئێمەدا سەدەها تورابی هەن، کە کاری سەرەکییان دەرکردنی خوداوەندە لەناوماندا. خودا دانیشتووی شوێنی "پیرۆز" و ناودڵی ئینسانی زاهیدە، ناو دڵی تورابییەکان هەرچییەکبێت نە شوێنی پیرۆز و نە شوێنی زوهدە.

لەم ڕووەوە ئەرکی ڕۆشنبیران بەپلەی یەکەم پێشنیارکردنی سیستمێکی دیکەیە بۆ هەقیقەت، پێشنیارکردنی ئەخلاقناسییەکی کراوەیە بەو مانایانەی کەم تا زۆر لەم وتارەدا باسکران، ئەخلاقناسییەک ڕێزگرتنی جیاوازی بنەما سەرەکییەکەیبێت. بۆ بنیادنانی ئەخلاقناسییەکی لەوجۆرە دەبێت زۆر شت ئەنجامبدرێت. بەر لەهەمووشتێک دەبێت ئەو ڕاستییە فێرببین، کە سیاسەت سەرزەمینی بەها هاوبەشەکان نییە، بەڵکو سەرزەمینی ڕا و بۆچوونە جیاوازەکانە، سیاسەت مانای دۆزینەوەی ناوەندێکە بۆ پێکەوەژیانی جیاوازییەکان لەگەڵیەکدا، نەک ناچارکردنی هەمووان بە دووبارەکردنەوەیەکی تووتییانەی بۆچوونەکانی حیزب و سەرکردە و سەرکردۆچکەکان. دەبێت فێرببین لەم سەرزەمینە پڕ جیاوازیانەدا ڕێزی یەکدی بگرین و ئامادەبین بەم ڕێزەوە لە کۆمەڵگا و چالاکییە کۆمەڵایەتییەکاندا بەشداربین. ئەبێ لەوە تێبگەین، کە چارەسەری هەمیشەیی بۆ هیچ کێشەیەک بوونی نییە، کێشەکان دەبێت بەردەوام پێناسەبکرێنەوە و سەرلەنوێ لەژێر

کاریگەری گۆڕانی کات و شوێندا بنرخێنرێنەوە و جارێکی دیکە دیموکراسییانەتر چارەسەریکرێنەوە.

قوتابخانە و خێزان دەبێت منداڵان فێربکەن، کە هیچ کەس و لایەن و فیکرێک هەموو ڕاستییەکانی پێنییە، دەبێت منداڵان فێربکرێن بتوانن بدوێن و ئەرگومێنت بۆ بۆچوونەکانیان بهێننەوە، فێربین پرسیار بکەن، فێربین لەسەر بنەمای جیاوازیوونیان ڕێکبکەون، نەک لەسەر وازهێنان لە تاکیەتی خۆیان و پشتکردنە بیروبۆچوونی تایبەتی خۆیان. قوتابخانە بۆ ئەوە نییە فێرمانبکات هەموومان لەیەکبچین و وەکویەک بیریکەینەوە و یەک سیستمی بەها قبووڵبکەین، قوتابخانە بۆ ئەوەیە فێرمانبکات ڕێزی فرەدەنگی و فرەبۆچوونی و ناکۆکبوونمان لەگەڵ یەکیدا بگرین. منداڵان دەبێت فێربین ڕێژەیبین لە بۆچوونەکانیاندا، ئامادەبن هەقیقەتی ناو بۆچوونەکانی دیکە ببینن. دەبێت منداڵان لەوە تێبگەن، کە ژیان مانای هاتوچۆیەکی بەردەوامە بەناو ناکۆکی هەمەجۆردا، کاری کۆمەڵگا بێدەنگ و سەرکوتکردنی ئەو ناکۆکییانە نییە، بەڵکو بەخشینی فۆرم و شێوەی تایبەتە بەو ناکۆکییانە و دۆزینەوەی کەناڵی تەعبیر و بەرجەستبوونە بۆیان. بەهەموو بارێکدا کۆی ئەو چەپاندن و سەرکوتکردنەی لە کۆمەڵگای کوردیدا هەیە زۆر لەوە زیاترە، کە ئەو سیستمە فەرهەنگی و سیاسی و کۆمەڵایەتییە باڵادەستە پێویستیپێیەتی بۆ پاراستنی خۆی. بێگومان من ناتوانم بۆ خەڵکانی دیکە بڕیاربدەم و مافی ئەوەشم نییە لەباتی ئەوان وەڵامی پرسیاری چۆن بژیم بدەمەوە، بەڵام تەواو باوەڕم وایە، کە پانتایی ئازادی لە کۆمەڵگای ئێمەدا دەبێت فراوانتربکرێت و ئینسانی ئێمە ماف و هەلی ئەوەی پێبدرێت خۆی فۆرمی ژیانی خۆی دیاریبکات، نەک حیزب و مزگەوت و باوک و سەرکردەکان بۆی دیارییبکەن.

چۆن بژین؟ دیسانەوە ئەو پرسیارە سوکراتییەی، کە جارێکی دیکە و هەزاران جاری تریش ڕووبەڕومان دەبێتەوە. پۆست مۆدێرنەکان پێیانوایە ناکرێت وەڵامێکی

گشتی و یەکجارەکی بەم پرسیارە بدرێتەوە، چونکە چاکە و خراپە بەشێوەیەکی ماتماتیکییانە نەدەپێورێن، نەدەکێشرێن و نەبەیەکتریش بەراوردەکرێن.

هاوینی ١٩٩٩

هۆلەندا ئەمریکا

## سەرچاوەکان

1- Gerard de Vries, Zeppelins, Over filosofie technologie en cultuur. 1999 Uitgeverij Van Gennep Amsterdam

٢- محمد اركون، قضايا فى نقد العقل الدينى، كيف نفهم الاسلام اليوم، دار الطليعة بيروت. ترجمه هاشم سالح ٨٨٩١

3- Hans Boutellier, Solidariteit en slachtofferschap De morele betekennis van criminiliteit in een postmoderne cultuur. Nijmegen 1993.

٤- بڕوانە، مەریوان وریا، ئەنفال و مۆدێرنە، ڕوودلوێک لە دوامانەوە، یان ئەگەرێک لەپێشمانەوە، ڕەهەند ژمارە حەوت ١٩٩٩.

5- Jurgen Habermas, De nieuwe onoverzichtelijkheid en andere opstellen. Boom Amsterdam 1989.

6- Harry Kunneman, postmoderne moraliteit, Boom Amsterdam 1998.

7- Anderson, Ben imagined community, london 1983.

8- Harry Kunneman, van theemutscultuur naar walkman-ego. Contouren van postmoderene individualiteit Boon, Amsterdam1996.

9- J.Sperna Weiland. de mens in de filosofie van de twintigste

eeuw. Meu;enhoff Amsterdanm 1999.

10- Zygmunt Bauman Leven met veranderlijkheid verscheidenheid en onzekerheid Boom. Rein Munters redactie. 1988 Amsterdam.

11- Zygmunt Bauman, modernity and Holocaust, polity press, Cambridge Uk 1989.

12- Martha Nussbaum: De onvevreemdbare eigenschappen van het lachende dier. Filosofie magazine, nummer drie jaar 8 april 1999

13- De Graaf, Elementaire begrip van de ethiek Scheltema en Holkema1979 Utrecht

14- Rosenau, Pauline Marie, Post-Modernism and the Social

15- Sciences. Princeton University Press, New Jersey 1992